# مباحث في علوم القرآن

## بەكوردی



نووسینی: مناع القطان

وەرگێڕانی: مەلا مەحمودی گەلاڵەیی

چاپی یەکەم - ٢٠١٥م

بسم الله الرحمن الرحيم

# علوم القرآن


- نووسینی: مناع القطان
- وەرگێڕانی: مەلا مەحمودی گەلاڵەیی
- چاپ: چاپی یەکەم
- دیزاین و هەڵەبڕی: سامان محمدأمین
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردن (١٥٩٩)ی ساڵی (٢٠١٥)ی زایینی پێدراوە.



- نرخی (١٢) هەزار دینار.

# پێشەکی

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ زاتی پاکی پەروەردگار، درووودو ڕەحمەت بۆسەر گیانی پاکی حەزرەتی موحەممەد (درووودی خودای لەسەر بێ) هەروا بۆسەر گیانی یارو یاوەرانی، خزم و کەس وکارو خێزانی.

ئەمجار دەمەوێ بڵێم: کتێبی (مباحث فـی علـوم القـرآن) دانـراوی (د. مناع القطان) دەبوایە زۆر پێش ئێستا بکرایە بە کوردی و بەم زوبانە ڕوناکی بدیبایە، چونکە لە ڕاستی‌دا ئەم کتێبە لە هەرە کتێبە باشەکانی بواری زانستەکانی قورئانە، لە زۆربەی زانکۆکانی جیهاندا – بە کوردستانیشەوە – مەنهەجەو دەخوێندرێ، تائێستا چەندجار دەقە عەرەبیەکەی بەچاپی جۆراوجۆر چاپ کراوەو پاش ماوەیەك لە کتێبخانەکاندا نەماوە.

بەندە ساڵی(٩٩٣)ی ز، دەستم دایە ویستم وەری گێڕمە سەر زمانی کوردی و بیکەمە پێشەکی بۆ تەفسیری ڕەوان، ماوەیەك خەریکی بووم و دوایی پوختەیەکی زۆر کەمم لێ هەڵبژاردو لەپێشەکی تەفسیری ناوبراودا ئەو پوختەیە چاپ کرا.

ساڵی (٢٠١٤)ی ز، سەرلەنوێ دەستم دایەوە، لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، بەو شێوەیەی لەبەردەستدایە خستمە سەر زمانی کوردی!

هەڵبەتە کتێبخانەی کوردی لەبواری زانستەکانی قورئاندا زۆر هەژارەو بەدەگمەن نەبێ بەزمانی کوردی لەم بوارەدا هیچ نەنووسراوەو لەزمانی تریشەوە

هیچی وا وەرنەگێڕدراوە لەکاتێکدا ئەم بوارە لەهەرە پێشەوەی بـوارە گرنگـەکانی زانستە ئیسلامییەکانە، چونکە باس لەسەرچاوەی یەکەمی ئایینی ئیـسلام دەکـا بـە ئوصول و فروعیەوە، ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە پێش هەموو شتێك گرنگـی بـەم زانستە بدەن و شارەزایی تێدا پەیدا بکەن.

بۆیە من خۆم بە بەختـەوەر دەزانم: کـە تـوانیم ئـەم کتێبـە نایابـە بکەمـە کوردیو بەم قەوارەو شێوە نووسین و چـاپە پێـشکەشی هاوزمـانی خـۆمی بکـەم، هیوادارم جێگای ڕەزامەندی خوێنەران بێ و کـەلێنێك لـە کتێبخانـەی کـوردی پـڕ بکاتەوە.

**مەلا مەحمودی گەلالەیی**

قورئانی پیرۆز موعجیزەی نەمرو سەرئاسای ئیسلامی پیرۆزە، هەتا زانستو زانیاری پێش بکەوێ، سەرئاسایی قورئان باشتر دەچەسپێو زیاتر رسوخ دەکا، قورئان ئەو نامە ئاسمانییەیە پەروەردگار نازڵی کردووە بۆ سەر پێغەمبەرمان حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ)، بۆ ئەوەی بیکاتە بەرنامەی خۆی، ئادەمیزادی پێ رزگار بکا لە تاریکایی کوفرو بێدینی بۆ گۆڕەپانی نورو ڕوناکی، شارەزاییان بکا بۆ ڕێگای راستو سەرەنجام بەختەوەری دونیاو قیامەت.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە نیگای ئاسمانی بۆ دەهاتو خۆی تێی دەگەیی‌و هەزمی دەکرد، بۆ هاوەڵانی دەخوێندەوەو پێی ڕادەگەیاندن، ئەوانیش عەرەبی خالص‌و پاڵفتەبوون، زمانەکەیان بە پاکی مابووەوە، بە سەلیقەی خۆیان لێی حاڵی دەبوون‌و مەبەستەکەیان دەزانی، خۆ ئەگەر لە ئایەتێك حاڵی نەبوونایە پرسیاریان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکردو ئەویش بۆی رون دەکرنەوە.

هەردوو پیری فەرمووده: بوخاری‌و موسلیم‌و هی تریش لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموون: کە ئایەتی ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ – الأنعام/٨٢﴾ نازڵ بوو، بە مانایەك لێی حاڵی بوون کە لەسەر شانیان گران بوو هاواریان لێ هەڵساو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جا کێمان لەمە رزگاری دەبێ، کێمان هەیە ستەم لە نەفسی خۆی نەکا؟؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵنەوایی کردن‌و فەرمووی: «إِنَّهُ لَيْسَ الَّذِى تَعْنُونَ أَلَمْ تَسْمَعُوا مَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ ( يَا بُنَىَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ) إِنَّمَا هُوَ الشِّرْكُ»[1] نەخەیر ئەو مانایەی نیە: کە ئێوە لێی تێگەیشتوون، ئەی ئەوەتان نەبیستووە بەندەی صالح‌و راستاڵی خودا؛ حەزرەتی لوقمان ئامۆژگاری

---

[1] البخاري ٦٩٣٧ ومسلم ٣٢٧ وأخرجه أحمد/٣٥٨٩.

کوڕەکەی دەکا دەڵێ: ڕۆڵەکەم نەکەی هاوەڵ بۆ خودا بڕیار بدەی، بێگومان هاوەڵدانان بۆ خودا ستەمێکی گەورەو سامناکە، کەوابێ وشەی (ظلم) لە ئایەتەکەدا بە مانا شیرك و هاوەڵدانانە بۆ خودا.

هەروا جاری وادەبوو پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) هەندێ ئایەتی بۆ هاوەڵان تەفسیر دەکردو ماناکەیانی بۆ ڕون دەکردنەوە، ئیمام موسلیم و هی تریش لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێ: ژنەوتم لە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەر مینبەر دوانی دەداو دەیفەرموو: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ – الأنفال/٦٠﴾ ئەمجار مانای ووشەی (قوة)ی بۆ کردین فەرمووی: «أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ»[1] بزانن مەبەست بە (قوة) لێرەدا تفەنگچێتی و تیرهاوێژییە.

هەڵبەتە هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بە تاسوخ و تامەزرۆ بوون بۆ بیستنی قورئان و وەرگرتن و لەبەرکردن و تێگەیشتنی، خۆتەرخانکردنیان بۆ ئەم کارانە بە شەرەف و سەربەرزی دەزانی.

لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: «وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ جَدَّ فِينَا»[2] ئەگەر پیاوێك لەئێمە بیتوانیایە سورەتی (البقرة) و (آل عمران)ی بخوێندایە لەپێش چاومان زۆر گەورە دەبوو ڕێزی تایبەتیمان لێ دەنا.

ئەمجار وێڕای تامەزرۆییان بۆ فێربوون و تێگەیشتنی قورئان، زۆر سوربوون بۆ کارپێکردنی و پابەندبوون بە ئەحکامەکانی.

لە ئەبو عبدالرحمن (السلمی)یەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: ئەوانەی: کە قورئانیان فێر دەکردین ئەمثالی عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، بۆیان دەگێڕاینەوە دەیانگوت: ئێمەمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا

---

[1] مسلم/٤٩٤٦ وأخرجه أحمد/١٧٤٣٢.

[2] رواه أحمد فی مسنده/١٢٢١٥ وأخرجه البخاری/٣٦١٧ ومسلم/٧٠٤٠.

(دروودی خودای لەسەر بێ) کە (دە) ئایەت لە قورئان فێردەبووین، وازمان لێ نەدەهێنا هەتا باش باش نەمانزانیایە چییان تێدایە لە زانیاریو چۆن کاریان پێ بکرێ، دەیانگوت: ئێمە ئەو ڕۆژگارە قورئان فێردەبووینو تێی دەگەیشتینو کارمان پێ دەکرد واتە: هەرسێ پرۆسەکەمان بە یەکەوە دەستەبەر دەکردن[1].

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا لەژیاندا بوو، ڕێگەی نەدا هاوەڵان جگە لە قورئان هیچ فەرموودەیەکی خۆی بنوسنەوە، نەبادا قورئان تێکەڵاوی شتی تر ببێ، یان بڵێین: قسەی تر تێکەڵاوی قورئان ببنو وابزاندرێ قورئانە، ئەوەتا ئیمامی موسلیم لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتی کردووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی «لاَ تَكْتُبُوا عَنِّى وَمَنْ كَتَبَ عَنِّى غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ وَحَدِّثُوا عَنِّى وَلاَ حَرَجَ وَمَنْ كَذَبَ عَلَىَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».[2] جگە لە قورئان هەرچی لە منی دەبیستن مەینووسنەوە، هەرکەسێك لە زوبانی من شتێکی بیستووە نووسیویەتی جگە لە قورئان با بیسڕێتەوە، ئەوەی لە منی دەبیسن، بۆ خەڵکی باس بکەن، هیچ حەرەجی تێدا نیە، کەسێکیش درۆ بە دەم منەوە هەڵبەستێ بە ئەنقەست با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا بگرێ.

جا ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەدوا ڕێگەی داوە بۆ هەندێ لە هاوەڵانی فەرموودە بنووسنەوە، ئەوە بەبێ گومان بۆ ئەو فەرموودانە ڕێگەی داوە کە پەیوەندییان بە قورئانەوە نەبووە، بە تەئکید ئەوەی پەیوەندی بە قورئانەوە هەبووە هەر دەماودەم گێڕدراونەوەو نەنووسراونەوە، ئەم حاڵەتە بەردەوام بووە لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی

---

[1] رواه عبدالرزاق فی مصنفه/٦٠٢٧ وأخرجه إبن أبی شیبة/٢٩٩٢٩.

[2] رواه مسلم/٧٥١٠ وأخرجه أحمد/١١٠٨٥.

خـوداى لەسـەر بـێ) خـۆیداو لـە ڕۆژگـارى خەلافـەتى حـەزرەتى ئەبوبـەكرو حەزرەتى عومەریشدا (رەزاى خودایان لێ بێ).

هەڵبەتە – وەكوو لەمەودوا بە درێـژى باسـى دەكـەین – لەسـەردەمى حەزرەتى ئـەبو بـەكردا (رەزاى خـوداى لێ بـێ) دواى شـەڕى یەمامـە، قورئـان كۆكرایەوەو لەچەند نوسخەیەكدا نووسرایەوە.

سەردەمى خەلافەتى عوسمان (رەزاى خوداى لێ بـێ) هـات، داخـوازىو زەروورەتـــى واهاتنـــە كایـــەوە – وەكـــوو لەمـــەودوا ڕونـــى دەكەینـــەوە – موسـولْمانانیان هـەڵنا بـۆ ئـەوەى سـەرلەنوێ لەسـەر یـەك شـێوازو تـەرتیب قورئان بنووسنەوە، بە چاودێرى ئیمام عوسمـان (رەزاى خـوداى لێ بـێ) ئـەم پرۆسـەیە تـەواوكراو چـەند نوسـخەیەكى لێ نووسـرایەوە، نوسـخەیەكى لاى ئیمام عوسمـان هـەلگیراو چـەند نوسخەیەكى لێ نێـردرا بـۆ شـارە گـەورەكانى ئەوكاتـە كـە لـەژێر كـۆنترۆڵى فـەرمانڕەواى موسـوڵماناندا بـوون، شـێوە نووسینەوەكەش ناونرا بە (الرسم العثمانى) لـەم ڕووەوە ئـەم پرۆسـە گرنگـە بە فەرمانى ئیمام عوسمانو بە چاودێرى ئەو ئـەنجام درا، ئەمـە سـەرەتایەك بوو بۆ زانستى شێوەى رەسمى موصحەف.

ئـەمجار لـە ڕۆژگـارى حـەزرەتى عـەلىدا (رەزاى خـوداى لێ بـێ) بـە فەرمانى ئەو ئەبولئەسوەدى (الدؤلى) یاساى زانستى نەحوى داهێنا، بۆ ئەوەى بـە سـەلامەتى نوتـق بـە وشـەو ڕسـتەكانى قورئـان بكـرێو هەڵـە لـە خوێندنەوەیدا نەكرێ، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ زانستى ئیعرابى قورئان.

ئیتر هاوەڵان بەردەوام بـوون لـە خوێنـدنى قورئـانو فێركـردنو مانـا لێدانەوەى بەگشتىو تەفسیركردنى بڕێ ئایەتى بە مانـاى جیـاواز بـەگوێرەى توانـاو تێگەیـشتنیان لـە ئایەتەكـەو زۆرو كـەم مانـەوەیان لـە خزمـەت پێغەمبـەردا (درودى خـوداى لەسـەر بـێ) ئـەمجار چـینى (تـابیعین) كـە لـە خزمەت هاوەڵانى پێغەمبـەردا (درودى خـوداى لەسـەر بـێ) فێـرى قورئـانو

تەفسیری بوبوون لەناو خۆیاندا دەستاو دەستیان بەم ماناو تەفسیرانە کردو بە خەڵکی تریشیان راگەیاندو بە جیهاندا بڵاویان کردەوە.

لە موفەسیرە مەشهورەکانی هاوەڵان: چوار خەلیفەکانی پێغەمبەرو ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەبباس‌و ئوبەی کوڕی کەعب‌و زەیدی کوڕی ثابیت‌و ئەبو موسای ئەشعەری‌و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوون (رەزای خودایان لێ بێ).

بێگومان زۆر ڕیوایەت دەربارەی تەفسیری قورئان لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعب گێڕدراونەوە، وەلێ ئەو ڕیوایەتانە هەموو تەفسیری قورئانیان لەخۆ نەگرتووە، بەڵکوو مانای بڕێ ئایەت‌و تەفسیری هەندێ وشەو جوملەی غامیض‌و بڕێ ڕونکردنەوەی ئایاتی (مجمل)یان کردووە، لەچینی تابیعین (واتە: چینی دوا هاوەڵان) کۆمەڵێکی زۆریان لێ پەیدابوون‌و دەرکەوتن: کە زانست‌و زانیاری ئایینیان لە هاوەڵان وەرگرتبوو: کەوتنە ئیجتیهادو توێژینەوەو ڕادەربڕین دەربارەی تەفسیری هەندێ ئایەتی قورئان.

لە مەککە لە قوتابیەکانی ئیبنو عەبباس کۆمەڵێك تابیعی ناوبانگیان دەرکرد، لەوانە: (سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عەکرەمە (ئازادکراوی ئیبنو عەبباس) طاوسی کوڕی کەیسانی یەمەنی، عەطای کوڕی ئەبی رەباح).

لە مەدینەش قوتابیانی ئوبەی کوڕی کەعب مەشهور بوون لەوانە: (زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و ئەبولعالیەو موحەممەدی کوڕی کەعبی القرظی).

لەعێراقیش لە قوتابیەکانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ئەمانەیان ناوبانگیان دەرکرد (عەلقەمەی کوڕی قەیس، مەسروق، ئەلئەسوەدی کوڕی یەزید، عامیر الشعبی‌و الحسن البصری‌و قەتادەی کوڕی دعامە السدوسی).

لەم بارەوە ئیبنو تەیمییە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: زاناترین خەڵك لەبواری تەفسیری قورئاندا ئەهلی مەککەن، چونکە ئەو زانا

مەككەییانـە قوتـابیو هـاوەڵی ئیبنـو عـەبباس بـوون (رەزای خـودای لێ بـێ) لەناویاندا زانای وەكوو موجاهیدو عەطای كوڕی ئـەبو رەباحو عەكرەمـە – ئازادكراوی ئیبنـو عـەبباس – و كەسـانی تـری وەكـوو ئـەوانیان تێـدابوو، كـە هـەموویان قوتـابیو شـاگردی ئیبنـو عـەبباس (رەزای خـودای لێ بـێ) بـوونو بەهرەیان لەو وەرگرتووە، ئـەمثـالی طـاوسو ئـەبو الشعـساءو سـەعیدی كـوڕی جوبەیرو هی تریش.

هەروا ئەهلی كوفە لە هاوەڵو قوتابیانی ئیبنـو مەسـعود: كـە بـەهۆی مانەوەیان لە خزمەتیدا بەهرەمەندبوونو لـە زانایـانی تـر جیـا دەكرێنـەوە، هـەروا زانایـانی ئـەهلی مەدینــە نموونــەی زەیـدی كـوڕی ئەسـلەم: كــە (عبـدالرحمن)ی كـوڕیو ئیمـام مالیـك، زانـستی تەفـسیریان لـەو وەرگرتـووە، هەروا عەبدوڵڵای كوڕی وەهەب[1].

ئـەو عـیلمو زانـستانەی لـەوان ڕیوایـەتكراوە بریتییـە لـە عیلمـی تەفسیرو زانستی (غریب القرآن) عیلمـی ئەسـبابی نـزولو زانیـاری دەربـارەی مـەككیو مـەدەنیو ناسـیخو مەنـسوخ، بـەڵام ئـەم عـیلمو زانیاریانـە هـەر بەشێوەی تـەلقینو ڕیوایـە دەگوترانـەوەو دەگوێزرانـەوە ئیعتیمادیـان لەسـەر لەبەركردنو موشافەهە بوو.

چەرخی دووەم هاتو دیاردەی تەدوینو نووسینەوەی عیلمو زانیـاری سەری هەڵدا، دەست كرا بە نووسینەوەی فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە هـەموو بـوارە جیاجیاكـانیدا، بـە تەئكیـد ئـەم نووسینەوانە بواری تەفسیریشی گرتـەوە، بـڕێ لـە زانایـان دەسـتیان كـرد بـە كۆكردنـەوەی ئـەو حـەدیثـانـەی دەربـارەی تەفـسیری قورئـان لـە پێغەمبـەر خۆیـەوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ)، یـان لـە هـاوەڵانی، یـان لـە چـینی تابیعینـەوە ڕیوایـەتكرابوون، لـەم زانایانـەی چـەرخی دووەم چـەند كەسـێك

[1] مقدمة فی اصول التفسیر إبن تیمیة ص١٥.

ناویان مەشهورو باوە لەوانە: یەزیدی کوڕی هارونی السلمی (ت ١١٧)ی کۆچی، شوعبەی کوڕی الحجاج (ت ١٦٠)ی کۆچی، وەکیعی کوڕی (الجراح) (ت ١٩٧)ی کۆچی، عبدالرزاقی کوڕی هومام (ت ٢١١)ی کۆچی، ئەمانە هەموویان لە پێشەوایانی فەرموووده بوون، کەوابێ کۆکردنەوەیان بۆ تەفسیر، کۆکردنەوەی بابێك بووە لە بابەکانی تەفسیر، بەداخەوە لە بەرهەمی ئەم زاتانە دەربارەی تەفسیر هیچمان پێ نەگەیشتووە جگە لە دەستنووسێکی (عبدالرزاق)ی کوڕی هومام دەربارەی تەفسیر.

ئەمجار ئەم چینە بەرێزە پیرۆزەی بواری تەفسیر، کۆمەڵێك پەیدابوون و شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرت و پەرەیان بەم بوارەدا، تەفسیری تەواویان بۆ قورئان نووسی بەگوێرەی ڕیزبەندی ئایەتەکانی، لەناو ئەم ڕاڤەکەرانەدا ئیبنو جەریری طەبەری (ت ٣١٠)ی کۆچی، ناوو شۆرەتی دەرکردو تەفسیرەکەی بە جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بۆوەو تا ئێستاش بە تەفسیرێکی ناوازەو موعتەمەد دەژمێردرێ و گرنگی خۆی لەدەست نەداوە.

بەڵێ بەو جۆرە تەفسیرکردنی قورئان دەستی پی کرد، سەرەتا بە نەقڵ و وەرگرتنی دەماودەم و موشافەهەو ڕیوایە، ئەمجار نووسینەوەی هەندێ بواری لەم ڕووەوە کە بەشێکە لەبەشەکانی حەدیث، پاشان نووسینی تەفسیری سەربەخۆو موستەقیل سەری هەڵدا چەند زانایەك تەفسیریان نووسی بەشێوەی (التفسیر بالمأثور)و هەندێکی تر لەوەپاش تەفسیریان بەشێوەی (التفسیر بالرأی) نووسی، هاوکات لەگەڵ ئەم هەوڵانە هەندێ کەس لەبوارێکی تایبەت بە بوارەکانی پەیوەند بە قورئانەوە کتێبیان نووسین کە بۆ تەفسیری قورئان گرنگی خۆیان هەیەو هەرکەسێ لە بواری تەفسیردا کاربکا پێویستی بەو کتێبانە هەیەو لێیان بێ ئاتاج نابێ، ئەوەبوو (علی بن المدینی) مامۆستای شێخی بوخاری، کۆچکردوی ساڵی/٢٣٤ی کۆچی، کتێبێکی دانا دەربارەی ئەسبابی نزول.

ئـەبو عوبەیـد (القاسـم بـن سـلام) کۆچـکردوی سـاڵی/٢٣٤ی کۆچـی، کتێبێکی دانا لە بارەی (الناسخ والمنسوخ)و قیرائاتەوە.

ئیبنــو قوتەیبــە؛ کۆچــکردوی ســاڵی/٢٧٦ی کۆچــی، کتێبێکــی دانــا لەبواری (مشکل القرآن)دا، ئەم زانایانە هەموویان زانایانی چەرخی سێیەمی کۆچین.

ئـەمجار موحەممـەدی کـوڕی خەلـەفی کـوڕی (المرزبـان) کۆچـکردوی ساڵی/٣٠٩ی کۆچی، کتێبی (الحاوی فی علوم القرآن)ی دانا.

ئەبوبــەکر موحەممــەدی کــوڕی (القاســم الأنبــاری) کۆچــکردوی ساڵی/٣٢٨ی کۆچی لە (علوم القرآن)دا کتێبێکی نووسی.

ئەبوبـەکری (السجـستانی) کۆچـکردوی سـاڵی/٣٣٠ی کۆچـی لـەبواری (غریب القرآن)دا کتێبی دانا.

موحەممەدی کـوڕی عـەلی (الأدفوی) کۆچـکردوی سـاڵی/٣٨٨ی کۆچـی کتێبێکی نووسی بەناوی (الأستغناء فی علوم القرآن).

ئەمانەش هـەموویان لـە زانایـانی سـەدەی چوارەمی کۆچـین، ئـەمجار دوای ئەوان کتێب دانان بەردەوام بوو پـەرەی سـەند، ئـەبو بـەکر (البـاقلانی) کۆچکردوی ساڵی/٤٠٣ی کۆچی، کتێبێکی نووسی لە (إعجاز القرآن)دا.

عــەلی کــوڕی ئیبراهیمــی کــوڕی ســەعیدی (الحــوفی) کۆچــکردوی ساڵی/٤٣٠ی کۆچی، لە (إعراب القرآن)دا کتێبی نووسی.

ئیمامی الماوردی کۆچکردوی سـاڵی/٤٥٠ی کۆچـی، لـە (أمثـال القـرآن)دا کتێبی دانا، (العز بن عبدالسلام) (ت ٦٦٠)ی کۆچی، کتێبێکی نووسی لە (مجاز القرآن)دا.

(علم الدین السخاوی) (ت ٦٤٣) لەبواری زانستی قیرائاتـدا کتێبـی دانـا، ئیبنو لقەیمی (الجوزیة) کتێبی لەبواری (أقسام القرآن)دا دانا.

ئەم نووسینو کتێبانە، هەریەکەیان لایەنێکی (علوم القرآن)ی لەخۆ گرتووە، باسێك لە باسەکانی پەیوەست بەو کتێبە پیرۆزەی موعالەجە کردووە، بەڵام هەموو، یان زۆربەی ئەو باسو نووسینو کتێبو نامیلکانە کۆکراونەوەو لێك دراونو کتێبێکی گەورەیان لێ پێك هاتووە بەناوی (البرهان فی علوم القرآن).

شێخ محمد عبدالعظیم الزرقانی لەکتێبی بەناوبانگیدا (مناهل العرفان)دا دەڵێ: من لە (دار الکتب المصریة)دا دەست نووسێکم دەست کەوت بەناوی (البرهان فی علوم القرآن) دانراوی: عەلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سەعیدی مەشهور بە (الحوفی) ئەم کتێبە لە (٣٠) بەرگ پێکهاتووە، ئێستا لەو کتێبخانەدا (١٥) بەرگی نامورەتەب لەو (٣٠) جڵدە دەست دەکەون، ئوسلوبی ئەم کتێبە بەم جۆرەیە دانەر دێ ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان بەگوێرەی ڕیزبەندی موصحەف دەخاتە بەر توێژینەوە.. دەربارەی (علوم القرآن) لێی دەدوێ، بۆ هەر جۆرێك لە جۆرە زانستەکانی قورئان عینوانێکی تایبەتی بۆ داناوە، سەرەتا عینوانێکی گشتی بۆ داناوە، بۆ نموونە دەڵێ: (القول فی قوله عزوجل)ئەمجار ئایەتەکە ذیکر دەکا، پاشان دێنێ لەژێر ئەو عینوانە گشتییە عینوانی نەوعی دادەنێ بۆ نموونە دەڵێ: (القول فی الأعراب) ئیتر لەڕوی زانستی نەحوو زمانەوانییەوە ئایەتەکە شی دەکاتەوە، ئەمجار عینوانێکی تر دادەنێو دەڵێ: (القول فی المعنی والتفسیر) ئیتر ئایەتەکە بەشێوەی تەفسیر (بالمأثور) و (بالمعقول) شی دەکاتەوە.

ئەمجار عینوانێکی تر دادەنێو دەڵێ: (القول فی الوقف والتمام) ئیتر هەرچی وەقفی دروست بێ، یان نادروست بێ شی دەکاتەوە، جاری واهەیە بۆ باسی (القرآت) عینوانێکی سەربەخۆی داناوەو دەڵێ: (القول فی القراءة) جاری وایش هەیە باسی ئەو حوکمانە دەکا کە لە ئایەتەکەوە وەردەگیرێنو شییان دەکاتەوە.

شێخی (الحوفی) بەم نەهجو پرۆگرامەی پەیڕەوی کردووە بە یەکەم کەسو یەکەم دانەر دادەنرێ: کە لەبواری (علوم القرآن)دا ئەسپی خۆی هەلینگ داوەو زانیاری پەرتەوازەو جۆراوجۆری لەو کتێبە مەوسوعییەدا کۆکردۆتەوەو تەدوینی کردووە.

پاشان ئیبنو لجەوزی کۆچکردوی سالّی/٥٩٧ی کۆچی، شوێن پێی ئەوی هەلگرتووەو چاوی لەو کردووەو کتێبێکی داناوە بەناوی (فنون الأفنان فی عجائب علوم القرآن).

ئەمجار (بدرالدین الزرکشی) (ت/ ٧٩٤) هاتووە کتێبێکی بەرفراوانی لەو بوارانەدا داناوە ناوی ناوە (البرهان فی علوم االقرآن)[١].

پاشان (جلال الدین البلقینی) (ت/ ٨٢٤)ی کۆچی، هەندێ زانیاری زیادەی خستە سەرو ناوی نا (مواقع العلوم من مواقع النجوم) پاش ئەمانە هەموو، (شێخ جلال الدین السیوطی) (ت/٩١١)ی کۆچی، کتێبێکی لەم بوارەدا دانا ناوی نا (الإتقان فی علوم القرآن).

لەسەردەمی رابونو تازەگەری ئەدەبی عەرەبیدا زانستەکانی پەیوەست بە قورئان پاشگوێ نەخرانو گرنگی خۆیان پێ دراو شان بەشانی پێشکەوتنو تازەگەریو داهێنان لەبوارە جیاجیاکانی دونیای زانست (علوم القرآن)یش گرنگی پێ دراو زانایانی ڕۆشنبیری موسولّمان کتێبیان تێدا دانانو توێژینەوەیان تێدا کرد، ئەوەبوو زانایانی سەر بە بزوتنەوەی فیکری ئیسلامی لە عەصری تازەدا ڕێبازێکی زانستیانەیان گرتەبەر بۆ موعالەجەی باسە قورئانیەکانو شێوازو ئوسلوبی سەردەمیانەیان رەچاو کرد، بۆ نموونە کتێبی (إعجاز القرآن) دانراوی مصطفی صادق الرافعی کتێبی (التصویر

---

[١] محمد ئەبولفەضل ئیبراهیم تەحقیقی ئەو کتێبەی کردووە لە چوار بەرگدا چاپی کردووە.

الفنى فى القرآن)و (مشاهد القيامة فى القرآن): كه هەردووكيان بەرهەمى نايابى شەهيد (سيد قطب)ن.

هەروا كتێبى (ترجمة القرآن) دانراوى محمد مصطفى المراغي، هەروا بەحثيكى (محب الدين الخطيب) كه دەربارەى تەرجەمەى قورئان نووسراوە، كتێبێكى تر هەر لەژێر ناوى (ترجمة القرآن) دانراوى مصطفى صبرى، كتێبى (النبأ العظيم) دانراوى دكتۆر (عبدالله دراز)و پێشەكى تەفسيرى (محاسن التأويل)ى محمد جمال الدين (القاسمى)، شێخ طاهيرى (الجزائرى) لەم بوارەدا كتێبێكى نووسيوە ناوى ناوە (التبيان فى علوم القرآن) هەروا شێخ محمد عەلى (سلامة) كتێبێكى داناوە بەناوى (منهج الفرقان فى العلوم القرآن) ئەو باس‌و مەوادانەى تێدا كۆكردۆتەوەو كه مەنهەجى بڕيار دراون بۆ كۆلێژى (أصول الدين) لە وڵاتى ميصر كه ئەو كۆلێژە تايبەتە بە (دەعوەو ئيرشاد).

ئەمجار بەشوێن ئەودا شێخ (عبدالعظيم الزرقانى) كتێبێكى دانا بەناوى (مناهل العرفان فى علوم القرآن).

پاشان شێخ (أحمد أحمد على) نووسراوێكى نووسى بەناوى (مذكرة علوم القرآن) وەكوو محاضره بەسەر قوتابيانى كۆلێژى (دەعوەو ئيرشاد)دا بە چەند وانەيەك ئاراستەى كردن.

لەم ساڵانەى دوايش‌دا دكتۆر صوبحى صالح كتێبى (مباحث فى علوم القرآن)ى بڵاو كردەوە، (ئەحمەد محمد جمال)يش (أبحاث على مائدة القرآن)ى نووسى.

ئەم باس‌و لێكۆڵينەوانە هەموويان بريتين لە زانستێك پێيان دەگوترێ: (علوم القرآن) بووەتە ناوو عەلەم بۆ ئەو زانستەو پێى مەشهور بووە.

هەڵبەتە (علوم القرآن) لە دوو وشە پێکهاتووە:

(علوم + القرآن)

علوم: کۆی (علم)ە، عیلمیش بەمانا تێگەیشتنو هەستکردنو زانینە، دوایی لەم مانایەوە گواستراوەتەوە بۆ مانای چەند مەسەلەیەکی کۆنترۆڵکراو دیاریکراوو بەشێوەیەکی زانستی.

مەبەست بە (علوم القرآن) ئەو زانستو زانیارییەیە کە ئەو باسانەی لەخۆ گرتوون کە پەیوەستن بە قورئانەوە، وەکوو زانستی ئەسبابی نزولو کۆکردنەوەی قورئانو تەرتیبو ڕیزبەندی سورەتو ئایەتەکانیو ناسینی سورەتو ئایەتی مەککیو مەدەنیو ناسیخو مەنسوخو موحکەمو موتەشابیهو گەلێ شتی تری وا کە پەیوەندی بە قورئانەوە هەبێ.

وادەبێ ئەم عیلمە پێی دەگوترێ: (أصول التفسير) لەم ڕووەوە ئەم عیلمە باسی وای لەخۆ گرتووە: کە ئەو کەسەی خەریکی تەفسیر نووسینە پێویستی پێی دەبێ، دەبێ لە تەفسیرکردندا پشتی پێ ببەستێ.

## > قورئانی پیرۆز

پەروەردگار لە ڕوانگەی فەضلو گەورەییو ڕەحمەتی بەسەر ئادەمیزاددا، وای بڕیار نەداوە ئیهمالی بکاو لێی بگەڕێ بەهۆی ئەو عەقڵو هەستەی پێی داوە ڕێبازی ژیان بدۆزێتەوەو پەیڕەوی بکاو خێرو خۆشی بۆخۆی دەستەبەر بکا، هەر بەوەندە وازی لێ نەهێناوە، بەڵکوو ناوەناوە پێغەمبەرانی بۆ ناردونو نامەی ئاسمانی پێدا ناردونو فەرمانی پێکردون بانگەوازی مەردومگەلەکەی بکەن بۆ خوداپەرستیو ناسینی بە تاكو تەنهایی بەندایەتی بۆ کردنی بە دڵسۆزیو ڕاستاڵانە، موژدەی بەهەشتو دوا ڕۆژی بەختەوەرییان بدەنێ ئەگەر بەپیر بانگەوازیو پەیامەکەیانەوە بێن، لە ئاگری دۆزەخ بیانترسێنن ئەگەر سەرپێچی فەرمانو نەهیەکەیان بکەن.

ناردنی ئەم پێغەمبەرانە بۆ ئەوەیە ئیقامەی حوججە لەسەر گەلو نەتەوەکان بکرێو بەلگەیان لەسەر بچەسپێ ﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ – النساء/١٦٥﴾.

ئادەمیزاد بەردەوام بوو لە گەشەکردنو پێشکەوتنی ژیارو شارەستانیدا لە ڕۆشنبیریو کرانەوەی عەقڵو هۆشیدا، نیگای ئاسمانی ڕێبازی روناکیو بەختەوەری نیشان دەدا، موشکیلەو چورتمە کاتیەکانی لەچوارچێوەی گەلو نەتەوەی هەر پێغەمبەرێکدا بۆ حەل کردوون، تا سەرەنجام مرۆڤایەتی گەییشتە ئاستێك، خودای میهرەبان ئایینێکی سەرتاسەریو گشتگیرییان بۆ بنێرێو ئیرادەی کرد کە پەیامی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو تیشکی خۆر بوونەوەر ڕۆشنا بکاتەوە، بەڵێ پەروەردگار ویستی وابوو: کە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر نەهاتنی پێغەمبەراندا، حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بکاتە فروستادەی خۆیو پەیامی گشتیو سەرتاسەری پێدا بنێرێ بۆ ئەوەی تەلاری پێغەمبەرانی پێش خۆی تەواو بکا، بە شەریعەتە گشتیو نەمرەکەی، بەهۆی ئەو قورئانەی بۆ سەری نازڵ کراوە، پەیامی پێغەمبەران تەواو بکا.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی دەفەرموێ: «إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ ، إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ ، وَيَقُولُونَ هَلاَّ وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ قَالَ فَأَنَا اللَّبِنَةُ ، وَأَنَا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ»[1] نمونەی منو نمونەی پێغەمبەرانی پێش من وەکوو نمونەی پیاوێك وایە باڵەخانەیەکی بنیات نابێ، جوان رایبەستبێو ڕازاندبیەتیەوە، جێگای سەرەنجی ئادەمیزادان بێو کەموکوڕی تێدا نەهێشتبێ، تەنها لە سوچێکەوە جێگای خشتێکی مابیتەوەو دانەنرابێ،

---

[1] أخرجه البخاری/٣٥٣٥، ومسلم/٥٩٦١، وأحمد/٧٣٢٢.

خەڵکی بە دەوریدا بێنو بچنو پێی سەرسام بنو بڵێن: ئای کە ئەم تەلارە جوانو ڕازاوەیەو چەند تەواوو کامڵ دەبوو ئەگەر ئەو خشتەی لێ دابنرایە، ئەمن نمونەی ئەو خشتەمو من خاتەمی پێغەمبەرانم.

قورئان بەرنامەی پەروەردگارە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی، دەقو نەصی زۆرو زەبەندە هەن لە کیتابو سوننەتدا ئەوە دووپات دەکەنەوە: کە پەیامی پێغەمبەری ئیسلام گشتییەو بۆ هەموو ئادەمیزادە ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا - الأعراف/١٥٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا - الفرقان/١﴾.

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً ، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً»[1] هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی پێش من ڕەوانە کراوە بۆلای نەتەوەی خۆی بە تایبەتی، من ڕەوانەکراوم بۆلای ئادەمیزاد بە گشتی، دوای ئەم پەیامەی من ئیتر پەیامی تری ئاسمانی نایە ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ - الأحزاب/٤٠﴾.

هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە: کە قورئان هەرچی یاسای پێداویستی ژیانی ئادەمیزادە لەخۆی گرتبێو هیچ شتێکی پاشگوێ نەخستبێو دەستورێکی تەواوو گونجاو بێ بۆ ژیانی مرۆڤ، بەڵکوو یاساو دەستوری کەونەو هەر لە ذەڕە تا مەجەڕە بچوكو گەورەی فەرامۆش نەکردووە.

پەروەردگار ئەم دەستورو ئایینەی لەسەر بنەمای ئایینەکانی پێشو بنیات ناوەو تەشریعی کردووە، ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ

[1] اخرجه البخاری/٣٣٥، ومسلم/١١٦٣ من حديث جابر.

كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاء وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ – الشورى/١٣﴾.

بەم قورئانە پیرۆزو سەرئاسایە پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خودای لەسەر بێ) تەحەدای لە عەرەب کرد کە بتوانن وێنەی ئەو کەلامە بخەنە ڕوو، وەلحال بە زوبانی ئەوان نازڵ بووەو لەو پیتو وشانەی ئەوان ئاخاوتنی پێ دەکەن پێکهاتووە، ئەوانیش بۆخۆیان سوارچاکی ئەو مەیدانە بوونو شانازییان بە بەلاغەتو ڕەوانبێژی خۆیان دەکرد، کەچی لە بەرامبەر موعجیزەو سەرئاسایی ڕەوانبێژی قورئاندا بۆڕیان خواردو نەیانتوانی وێنەی قورئان بخەنە ڕوو.

تەنانەت نەیانتوانی دە سورەت، بەڵکوو سورەتێك وەکوو سورەتێکی قورئان دابنێنو تا ئێستاش نەك هەر قورەیش بەڵکوو ئادەمیزاد بە عەرەبو ناعەرەبەوە، نەیانتوانیوە ئەو تەحەدایەی قورئان ئاراستەی کردوون بەگژیدا بچنەوەو خۆیان لەو شەرمەزارییە ڕزگار بکەن، بە تەئکید لەمەدواش ناتوانن، کەوابوو سەرئاسایی قورئان چەسپاو بە چەسپانی سەرئاساییەکەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) چەسپاو جێگیر بوو.

قورئان کەلامی پەروەردگارەو خودا بۆخۆی پارێزگاری دەکاو بە نەقڵی موتەواتەرو بەبێ گۆڕانکاری تێیدا بەبێ کەمو کوڕیو تەحریف بەئێمە گەیشتووە، ئەو زاتەی لە خوداوە قورئانی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هێناوە بە (ڕوحولئەمین) وەصف کراوە ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ – الشعراء/١٩٣﴾ هەروا وەصفی ئەوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا کراوە ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ، ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ، مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ، وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ، وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ، وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ

بِضَنِينٍ – التكوير/١٩ – ٢٤﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ، فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ، لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ – الواقعة/٧٧ – ٧٩﴾.

ئەم میزەو تایبەتمەندییانە بۆ هیچ نامەیەکی تری ئاسمانیو غەیری ئاسمانی نەبووەو نەچەسپاوە.

هیچ کتێبێکی تری نازڵبووی ئاسمانی، ئەم صیفەتانەی تێدا بەرجەستە نەبوون، چونکە قورئان لە ڕۆژگارو بارودۆخێکی تایبەتیدا نێردراوەو بەرنامەیەکی گشتیو هەتاهەتاییە، خودا بۆخۆی نازڵی کردووەو بۆخۆشی پارێزگاری دەکا ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ – الحجر/٩﴾.

پەیامی قورئان هەربۆ ئادەمیزاد نییەو بەس، بەڵکوو جیهانی جندۆکەو پەریشی گرتەوە، واتە: قورئان نامەی ئاسمانییە بۆ عالەمی ئادەمیزادو جندۆکە ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ، قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ، يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ – الأحقاف/٢٩ – ٣١﴾.

قورئانی پیرۆز کە ئەوە تایبەتمەندیو ئەوصافیەتی، لەهەموو جومگەکانی ژیاندا، موشکیلەکان حەل دەکا، لە هەموو بارودۆخێکدا چورتمو گرێ کوێرەکەی ژیان روحی بن عەقڵی بن، جەستەیی بن کۆمەڵایەتی بن، ئابوری بن، سیاسی بن......... هتد شی دەکاتەوەو بە حەکیمانە حەلیان دەکاو چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوە، چونکە ئەو قورئانە نازڵکراوی خودای حەکیمو حەمیدە، بۆ هەموو دەردێکی کۆمەڵایەتی دەرمانو شیفای خۆی دیاری کردووە، لەچوارچێوەی یاسایەکی گشتیدا حەللی کێشەکان دەکاو هەنگاوەکانی مرۆڤایەتی دەستنیشان دەکاو بۆ هەموو چاخو زەمەنێك یاسای گونجاوو سودبەخشی هەیەو فەرمان دەکا بە مرۆڤ پەیڕەوییان بکا.

بۆیه دەگوترێ: قورئان دەستوری کەونەو لەهەموو کاتو شوێنێکدا مرۆڤ دەتوانێ بیکاتە یاسای خۆیو پەیڕەوی بکاو ژیانی کامەرانی لە دونیاو قیامەتدا پێی دەستەبەر بکا، بەڵێ قورئان بەرنامەی ئایینی هەمیشە زیندوو نەمرە، ئای ئەم وتەیەی بانگخوازی گەورەو پایەبەرزی ئیسلامی (ئیمام حەسەن بەننا) چەند بە نرخو پیرۆزە: کە دەفەرموێ: (ئیسلام یاسایەکی گشتگیرە، هەموو دیاردەیەکی ژیانی لەخۆ گرتووە، دەسەڵاتو نیشتمانە، حکوومەتو گەلە، ڕەوشتو هێزە، ڕەحمەتو عەدالەتە، ڕۆشنبیریو یاسایە، زانیاری قەضاوەتە، مادەو سەروەتە، کاسبیو ساماندارییە، جیهادو بانگەوازییە، سوپاو بیروبۆچوون فیکرەیە، هەروەکوو چۆن عەقیدەیەکی راستاڵو عیبادەتێکی صەحیحو دروستە بە تەواویو بێ کەمو زیاد)[1]

ئەو مرۆڤایەتیەی ئەمڕۆ لەناخی خۆیدا ئازار دەچێژێ، یاساو دەستوری لێ چەواشە بووە، ڕەوشتو ئەخلاقی کرمۆڵو ڕوخاوە، جگە لە قورئان ڕزگارکەرێکی تری نیە لەم گێژاوی ژیانە ڕزگاری بکاو ئەمنو ئاسایشی پێ ببەخشێ لە دوکەڵو ئاگری سوتماکی ئەو دۆزەخە بیپارێزێ، ﴿قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى، وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى – طـه/١٢٣ – ١٢٤﴾.

بەڵێ هەر موسوڵمانانو بەس ئەوانەی ئەم چرا ڕوناکەی ژیانیان هەڵگرتووەو خاوەنی ئەم پەیامە پیرۆزەو دەستورە نەمرەی بونەوەرن، کە لەناو تاریکستانی یاسا دەستکردو مەبادیئە ڕوخاوەکانی مرۆڤدا لە کێ بڕکێدان، بوێرانە بەرەنگاری بەتاڵو ستەمکاران بوونەوە، شیاوی ئەوانەو ئەرکی سەرشانیانە کە دەستی خۆیان لە تەپو تۆزی هەموو کالایەکی چروکو تەزویر بتەکێنن رابەرایەتی مرۆڤایەتی سەرگەردانو ڕێگا لێ

---

[1] رسالة التعاليم للإمام الشهيد حسن البننا.

گومبـوو بكـەنو قورئـان بكەنـە چـرای دەسـتيانو وزەو هێـزی هـەناويان، تـا بتـوانن وەكـوو ڕابـردووی زێڕينيـان مرۆڤايـەتی ڕزگـار بكـەنو بيگەيەننـە كەناری ئـەمانو سـەروەریو ئـازادی بـۆ بگێڕنـەوە، ئاشكراشـە هـەر دەسـتورو ياسـاو پـەيامێك بـە تـاقی كرابێتـەوەو گونجـا بـێ، مومكينـە جـارێكی تـر بەهـەمان شـێوە بێتـەوە گۆڕەپـانی ژيـان ئەگـەر هـەمان هۆكـارو وەسـيلەی پێشووی بۆ دەستەبەر ببن.

## پێناسەی قورئان

مـادەی (قـرأ) بـەمانا كۆكردنـەوەو خـستنە پەنايەكـە، (القـراءة): لێكدانو خستنە پەنايـەكی پيتو وشـەيە هەنـدێكيان بـۆلای هەنـدێكيان لـە خوێندنەوەدا.

وشەی (قران) لـە بنـەمادا دەق وەكـوو (قـراءة) وايـە ئـەويش چـاوگە، دەگوترێ: (قرأ قِراءة وقرآنا) پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَـهُ – القيامة/١٨﴾ واتە (فاتبع قراءته) واتە: بەهۆی جوبريلەوە چۆنمان قورئـان بۆ خوێندی، تۆيش بەوشێوە قيرائەتو خوێندنە بيخوێنە.

كەوابوو وشەی (قرآن) چاوگەو لەسەر كێشی (فُعلان) وەكوو (غفـران، شكران) دەگوترێ: (قرأته قرءً، وقراءة وقرآناً) هەمووبان يەك مانايـان هەيـە، خوێندراوەكـە: ئيـسمی (مفعـول)ە بـەناوی چـاوگەكە هـاتووەو شـايیع بـووەو جۆرێكە لە مەجاز.

وشەی (قرآن) تايبەت كراوە بەو نامـە ئاسمانييـەی بۆسـەر حـەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) نـازڵ كـراوەو بـۆی بووەتـە عەلـەمی شەخصی، ئەمجار بەشێوەی ئيشتراكی لەفظی، بەهەموو قورئانيش دەگوترێو بـە يەكـە يەكـەی هـەموو ئايـەتێكيش دەگـوترێ: قورئـان، كـە گوێـت لێ بـوو

یەکێك ئایەتێکی دەخوێندەوە صەحیحە بگوترێ: گوێم لێ بوو قورئانی دەخوێند ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ – الأعراف/٢٠٤﴾.

هەندێ لە عولەما پێیان وایە ناونانی ئەم کتێبە پیرۆزە بە (قرآن) زێدە لەهەموو نامە ئاسمانییەکانی تر، چونکە کۆکەرەوەی بەروبوومی هەموو کتێبەکانی پێش خۆیەتی، پەروەردگار خۆی ئاماژەی بەم ڕاستییە کردووەو فەرموویەتی: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ – النحل/٨٩﴾ یان دەفەرموێ: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ – الأنعام/٣٨﴾.

هەندێ لە عولەمای زمان پێیان وایە وشەی (قرآن) لە ئەصڵی (إشتقاق) هەمزەی تێدا نیە (هەمزاوی) نیە چونکە عەلەمێکی (مرتجل)ە بۆ ئەو نامە ئاسمانییەی بۆ سەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) نازڵ بووە، واتە: لە وشەی (قرأ) وەرنەگیراوە، کەوابێ لە وشەی (قرن) وەرگیراوە، دەگوترێ: (قرن الشیئ بالشیئ) ئەگەر شتەکەی خستە پاڵ شتەکەی تر، یان لە (قرائن) وەرگیراوە، چونکە ئایەتەکانی هەندێکیان دەشوبهێنە هەندێکیانو پیتی (ن) تێیدا ئەصڵییە، بەڵام ئەم ڕایە زەعیفەو رای یەکەم صەحیحە.

قورئانی پیرۆز محاڵو ئەستەمە بە پێناسەی مەنطیقیانە بە (جینسو فەصلو خەواص) پێناسە بکرێو پێت وابێ ئەوە پێناسەی حەقیقی قورئانە، بەڵکوو تەعریفی حەقیقی بۆ قورئان ئەوەیە لە ذیهندا ئامادەی بکەی، یان بە هەست ببینی، وەکوو ئەوە ئاماژە بکەی بۆیو بڵێی ئەوە قورئانە، یان بخوێندرێ بە زوبانو بڵێی قورئان ئەوەیە لەنێوان ئەم دوو بەرگەدایە، یان قورئان ئەوەیە لە ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ: الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ەوە تا دەگاتە ﴿مِنَ الْجِنَّةِ وَ النَّاسِ﴾.

زانایانی ئوصول پێناسەیەکیان بۆ کردووە مەعناکەی لە ذیهن نزیك دەکاتەوەو لە کتێبی تری جیا دەکاتەوە، بەمجۆرە تەعریفی دەکەنو دەڵێن

(كلام الله المنزل على محمد – صلى الله عليه وسلم – المتعبد بتلاوته) نامەی ئاسمانی خودایە نازڵ بووە بۆ سەر پێغەمبەرو خوێندنەوەی عیبادەتەو بە خوداپەرستی دەژمێردرێ.

وشەی (کلام) لە تەعریفەکەدا (جینسە) ماکە، هەموو کەلامێك دەگرێتەوە، کە ئیضافەی دەکەی بۆلای خوداو دەڵێی (کلام الله) هەرچی کەلامێ هەیە جگە لە کەلامی خودا خاریج دەبن واتە: کەلامی ئادەمیزادو جندۆکەو فریشتە لەچوارچێوەی تەعریفەکە دەردەچن.

کە دەڵێی (المنزل) ئەو کەلامە ئیلاهییەش خاریج دەبێ: کە لای خودا خۆیەتی نازڵی نەکردووە ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا – الكهف/١٠٩﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ – لقمان/٢٧﴾.

ئەمجار کە وشەی (المنزل) دەبەستییەوە بە (علی محمد) (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو ئەو کەلامە ئیلاهییانەی پێش حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) نازڵ بوون بۆ سەر پێغەمبەرانی پێشوو وەکوو تەوراتو ئینجیلو زەبورو صوحوف خاریج دەبن.

کە دەڵێی (المتعبد بتلاوته) قیرائاتی ئاحادو فەرموودەی قودسی – ئەگەر بڵێین ئەمانە بە وشەکانیانەوە لە خوداوە نازڵ بوون – خاریج دەبن چونکە مانای (المتعبد بتلاوته) ئەوەیە خودا فەرمانی کردووە لەناو نوێژو غەیری نوێژیشدا بخوێندرێو خوێندنەکەی تاعەتو خوداپەرستییەو بەشێکە لە عیبادەت، دەی قیرائاتی ئاحادو فەرموودەی قودسی وەها نین.

# ناوەکانی قورئانو صیفاتەکانی

پەروەردگار زۆر ناوی بۆ قورئان داناون:-

١- (القرآن) ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ - الإسراء/٩﴾.

٢- (الكتاب) ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ - الأنبياء/١٠﴾.

٣- (الفرقان) ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا - الفرقان/١﴾.

٤- (الذكر) ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ - الحجر/٩﴾.

٥- (التنزيل) ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ - الشعراء/١٩٢﴾.

زۆر ناوی تر لە قورئاندا هاتوون، لەناو ناوەکانی دوو ناوی غالبو مەشهور بوون کە بریتین لە (القرآن والكتاب).

دکتۆر عەبدوڵلا دەراز دەڵێ: کە ناوی نراوە (قورئان) لەم ڕووەوەیە: کە بە زوبان دەخوێندرێتەوە، کە پێشی دەگوترێ: (الكتاب) ئەوە ڕەچاوکراوە: کە بە قەڵەم دەنووسرێتەوە، هەردوو ناوەکەی ناونانیەتی بەو مەعنا واقیعەی لەخۆی گرتووەو لەسەری جێگیرە.

ناولێنانی بەم دوو ناوە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە پێویستە قورئان گرنگی پێ بدرێو لە دوو لاوە بپارێزێ، بە دوو شێوە بیپارێزین نەك بە یەك شێوە، واتە: واجبە لەبەر بکرێو لە سنگدا بپارێزرێ، لەناو کاغەزو شتی وادا بنووسرێتەوەو پارێزگاری بکرێ، کە لایەکیان شێوانو لەبیرچوونەوەی تێدا ڕوودرا بەلایەکەی تر راستی بکەینەوە، کەوابێ بتمانە بە لەبەربوونی حافظیك ناکەین هەتا دەقەکەی لەبەریەتی، موافیقی ئەو (رەسم المصحف) نەبێ: کە کۆڕای هاوەڵانی لەسەرەو چین بەچین بەشێوەی تەواتور لەسەر ئەو شێوە رەسمەی یەکەمجار پێی نووسراوەتەوە بە ئێمە گەیشتووە، هەروا بتمانە بە نووسینەوەی نووسەرێك ناکرێ هەتا

نووسینەکەی موافیقی ئەو شێوەیە نەبێ: کە لەلای قورئان لەبەران (الحفاظ) بە ئیسنادی صەحیحو (متواتر) چەسپاوە.

بەم گرنگی پێدانە دوو سەرەو هاوتەریبە: کە پەروەردگار لە دڵو دەروونی ئوممەتی پێغەمبەری ئیسلامدا (دروودی خودای لەسەر بێ) رسکاندویەتیو لەم ڕووەوە چاویان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە قورئانی پیرۆز بە دەستکاری نەکراوی ماوەتەوەو پارێزراوە، وادەی پەروەردگار هاتۆتە دیو پارێزگاری کراوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ – الحجر/٩﴾.

ئەم چاودێرییە ئیلاهییەیە: کە قورئان بەبێ ئەوەی کەس بتوانێ گۆڕانکاری تێدا بکا بە مەحفوظی ماوەتەوە ئەو گۆڕانکاریو کەمکردنو لێ زیادکردنەی لە کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوودا کراوە، لەڕوی تەحریفو تەبدیلو پچڕانی روشتە، کەم تا زۆر توشی ئەم نەبووە.

نهێنی ئەم فەرقو جوداوازییەی نێوان قورئانو نامە ئاسمانییەکانی تر، ئەوەیە: نامە ئاسمانییەکانی پێش قورئان بۆ کاتێکی دیاریکراوو گەلو نەتەوەیەکی تایبەت نێردراون، قورئانی پیرۆز نازڵ کراوە بۆ سەر هەموو ئادەمیزادو بۆ هەتا هەتایە، تەصدیقی نامە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکاو بەسەریاندا بالآدەستە، هەرچی حەقائیقی چەسپاوە تێیاندا ئەم کۆی کردوونەوەو لەخۆی گرتوون، چەندێکیش خودا ویستبیەتی لێی زیاد کردووە، ئاوا ڕێڕەوی خۆی گرتە بەرو ڕۆژگاری شەق کرد، هیچ شتێك نەبوو بتوانێ شوێنی ئەو بگرێو جێگای ئەو پڕ بکاتەوە، حوکمو ویستی خودا وایە ئەم قورئانە وەکوو خۆی بمێنێتەوەو حوججە بێ تا ڕۆژی قیامەت.

ئاشکراشە: کە پەروەردگار بڕیاری شتێکیدا هۆکارەکانیشی بۆ دەرەخسێنێ، ئەو بۆخۆی خودایەکی حەکیمو زانایە، کار دروستو فەرمانڕەوایە، چی بوێو چۆنی بوێ ئەوە دێتە کایەوە.

# صیفەتەکانی قورئان

**پەروەردگار قورئانی بە زۆر صیفەت ناوهێناوە:**

**١- نور: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا – النساء/١٧٤﴾.**

**٢- هدى، شفاء، رحمة، موعظة: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ – يونس/٥٧﴾.**

**٣- مبارك: ﴿وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ – الأنعام/٩٢﴾.**

**٤- مبين: ﴿جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ – المائدة/١٥﴾.**

**٥- بشرى: ﴿مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ – البقرة/٩٧﴾.**

**٦- عزيز: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ – فصلت/٤١﴾.**

**٧- مجيد: ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ – البروج/٢١﴾.**

**٨- بشير، نذير: ﴿كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ، {بَشِيرًا وَنَذِيرًا – فصلت/٣ – ٤﴾.**

**هەرناوێك لە ناوەکانی قورئان، یان هەر صیفەتێکی مانایەکی تایبەتی لە ماناکانی قورئان لەخۆ گرتووە.**

## جوداوازی نێوان قورئانو حەدیثی قودسیو حەدیثی نەبەوی

لەوەپێش تەعریفو پێناسەی قورئانمان کرد، ئەمجار بۆ ئەوەی جوداوازی نێوان قورئانو حەدیثی قودسیو حەدیثی نەبەوی بزانین ئەم دوو پێناسە بۆ حەدیث دەکەین، لە دەرئەنجامی پێناسەکاندا جوداوازی نێوانیان دەردەکەوێ.

١- الحدیث النبوی: (حدیث) لە زمانـدا پێچەوانەی کۆنە، کە بە ڕەهایی گوترا مەبەست هەموو قسەیەکە بگوترێ، بگوێزرێتەوەو بە مرۆڤ رابگەیەندرێ لە ڕێگەی گوێچکەوە، یان بەهۆی نیگاوە بە خەبەری، یان بە نوستویی.

بەم مانایە قورئان ناونراوە (حەدیث) ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّـهِ حَـدِيثًا – النساء/٨٧﴾ ئەوەی لە خەودا مرۆڤ دەیبینێ هەر پێی دەگوترێ: (حدیث) ﴿وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ – یوسف/١٠١﴾.

وشەی (حەدیث) لە زاراوەی ئوصولیاندا بەو گوفتارو کردارو صیفەتو تەقریرو ڕازیبونە دەگوترێ پاڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بدرێ، واتە: (قول، فعل، وصف، تقریر).

حەدیثی گوفتاری وەکوو «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى ، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[١]

حەدیثی کرداری: وەکوو ئەو حاڵەتانەی: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانانی فێری ئەرکێکی ئایینی کردووە، بۆ نموونە

---

[١] بەشێکە لە حەدیثیکی درێژ بوخاری ڕیوایەتی کردووە، هەروا موسلیم (٤٩٢٧) لە عومەری کوڕی خەتابەوە.

فێرکردنی نوێژ، دوایی فەرموویەتی: «وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي».[١] یان کە ئەرکەکانی حەجی فێرکردن، فەرموویەتی: «خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ».[٢]

حەدیثی تەقریری: وەکوو گوفتارێك کارێکی لە هاوەڵێکی دیبێ، یان بیستبیەتی: کە فلان هاوەڵ ئیشێکی وای کردووە، ئەویش نارازیبوونی بەرامبەر دەرنەبڕیبێ، جا ئەو گوفتارو کارەی هاوەڵان بە حضوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووبێ، یان بە غیابی بووبێ، نمونەی ئەوە وەکوو خواردنی سوسەمار لەسەر سفرەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چیرۆکێکی مەشهورە گوایە خالید لەسەر سفرەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوسەماری خواردووە.

یان ئەوەی ڕیوایەت کراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی کردە ئامیر سریەو بە ئەرکێك ناردی، ئەم پیاوە کە پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد قورئانی دەخوێند، هەموو جارێ خوێندنەکەی بە سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ.....﴾ کۆتایی پێ دێنا، هاوەڵان ئەمەیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە فەرمووی: «سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ؟» کە لێیان پرسی لە وەڵامدا وتی: چونکە صیفەتی (الرحمن)ە منیش حەزم لێیە ئەوە بخوێنم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ».[٣]

حەدیثی ڕەوشتی: وەکوو ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) «كان دائم البشر، سهل الخلق، لين الجانب، ليس بفظ ولا غليظ، ولا صخاب، ولا فحاش، ولا عياب».[٤]

---

[١] أخرجه االبخاری/٦٣١.

[٢] أخرجه مسلم (٣١٣٧) وأحمد (١٤٤١٩) والنسائی (٣٠٦٢).

[٣] أخرجه البخاری (٧٣٧٥) ومسلم (١٨٩٠).

[٤] أخرجه الترمذی فی الشمائل/٣٥١.

الحديث القدسی: مانای حەدیثمان ڕوون کردەوە.

وشەی (القدسی) پاڵدانە بۆلای قودس، ئەمەش پاڵدان‌و نیسبەتدانێکە مانای گەورەیی‌و پاك‌و بێگەردی دەگەیەنێ، چونکە مادەی وشەکە دەلالەت دەکا لەسەر پاکی‌و بێ عەیبی بۆ نمونە (التقدیس) بە مانا تەنزیهو پاك‌و بێ عەیبی پەروەردگارە ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ - البقرة/٣٠﴾ واتە: ئێمە سەرگەرمی تەسبیح‌و حەمدو سوپاسی تۆین‌و خۆمان تەرخان کردووەو خۆمان پاك کردۆتەوە لە هەرشتێك بۆنی ئەوەی لێ بێ عەیب‌و خەوش بۆ زاتی پاکت بڕیار بدەین.

حەدیثی قودسی لە زاراوەی ئوصولدا ئەو فەرموودەیە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پاڵ پەروەردگاری دەدا، واتە وای بە ئێمە ڕاگەیاندووە: کە ئەوە فەرموودەی خودایە، کەوابوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕاوییە بۆ کەلامی خودا بەلام لەفظەکە هی خۆیەتی، ئەگەر یەکێك ئەو حەدیثە ڕیوایەت بکا لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتی دەکا بەڵام ئیستنادی دەدا بۆلای خودا، دەڵێ: «قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم – فيما يرويه عن ربه عزّ وجلّ». یان ئاوای ڕیوایەت دەکا: «قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم – قال الله تعالى» أو «يقول الله تعالى».

نموونەی یەکەم: عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ – وَقَالَ – يَدُ اللَّهِ مَلأَى لاَ تَغِيضُهَا نَفَقَةٌ ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ».[1]

نموونەی دووەم: عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – قَالَ قَالَ النَّبِىُّ – صلى الله عليه وسلم – « يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِى بِى ، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا

---

[1] اخرجه البخاری/٧٤١١، ومسلم/٢٣٠٨، واحمد/١٠٥٠٠.

ذَكَرَنِي ، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي ، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلأٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلأٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا ، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً».(١)

## جوداوازی نێوان قورئان‌و حەدیثی قودسی

چەند فەرق‌و جوداوازییەك هەن لەنێوان قورئان‌و حەدیثی قودسی‌دا، گرنگەکانیان ئەمانەن:

١- قورئانی پیرۆز کەلامی خودایە بە لەفظو مەعنایەوە، پەروەردگار بە نیگا بەو لەفظە بۆ پێغەمبەری نادرووە (درووودی خودای لەسەر بێ)، تەحەدای عەرەبی پێ کردووە: کە بتوانن نمونەی ئەو قورئانە بخەنە ڕوو، یان (دە) سورەتی وەکوو ئەو، یان سورەتێکی وەکوو ئەو بێنن، ئەم تەحەدایە هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵەیە ئاڕاستەی عەرەبو ناعەرەب کراوەو تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، عەرەبەکان‌و هەموو ئادەمیزاد لەگەڵیاندا لە بەرامبەر ئەم تەحەدایە دەسەوسان بوون‌و بۆڕیان خواردو نەیانتوانی بەرەنگاری تەحەدایەکە ببنەوەو ناشتوانن، کەواتە: قورئان موعجیزەیەکی نەمرە تا ڕۆژی قیامەت.

بەڵام حەدیثی قودسی ئەو تەحەدایەی پی نەکراوەو بە موعجیزە ڕانەگەیەنراوە.

٢- قورئانی پیرۆز راستەوخۆ نیسبەت دەدرێ بۆلای خودای گەورە دەگوترێ: «قَالَ اللّٰهُ تعالى....................».

حەدیثی قودسی وەکوو لەوەپێش گوتمان: جاری وا هەیە ئیضافە دەکرێ بۆلای خودا نیسبەتدانەکە بۆلای نیسبەتی ئینشائە، دەگوترێ: «قَالَ

---

(١) اخرجه البخاری/٧٤٠٥، ومسلم/٦٨٠٥.

اللّٰهُ تعالى..........». يان «يَقُولُ اللّٰهُ تَعَالَى..................». جارى وا هەيە ڕيوايەت دەكرێ ئيضافە بكرێ بۆلاى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ئەوكاتە نيسبەتدانەكە نيسبەتى ئيخبارە، چونكە لەم حالّەتەدا پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) هەوالّدەرە، دەگوترێ: «قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم – فيما يرويه عن ربه عزّ وجلّ».

٣- قورئانى پيرۆز هەمووى بە لەفظو مەعناوە، نيگاى خودايە بە لەفظو مانايەوە، حەديثى قودسى ماناكەى لە خوداوەيە لەفظەكەى هى پێغەمبەر خۆيەتى (دروودى خوداى لەسەر بێ) بەگوێرەى قەولى صەحيح حەديثى قودسى وەحىو نيگايە بە مەعنا فقط، نەك بە لەفظەكەشى، بۆيە لاى جەماوەرى (محدثين) فەرموودەناسان دروستە حەديثى قودسى بە مانا ڕيوايەت بكرێ.

٤- قورئانى پيرۆز هەمووى بە تەواتور نەقلّ كراوە، (قطعى الثبوت)ە، حەديثە قودسيەكان زۆربەيان خەبەرى تاكن، (أخبارى آحاد)ن، (ظني الثبوت)ن حەديثى قودسى وا دەبێ صەحيحە، وادەبێ پلەى حەسەنى هەيە، وادەبێ ضەعيفە.

٥- قورئانى پيرۆز خوێندنەكەى بەشێكە لە عيبادەت، ئەوەتا مەرجە لەنوێژدا هەندێ لە قورئان بخوێندرێ ﴿فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ – المزمل/٢٠﴾ خوێندنى قورئان لە نوێژيشدا نەبێ هەر عيبادەتەو خودا پاداشى لەسەر دەداتەوە، ئەوەتا لە حەديثدا هاتووە دەفەرموێ: «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللّٰهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لاَ أَقُولُ الم حرف وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلاَمٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ».[1]

---

[1] أخرجه الترمذى/٣١٣٥ عن إبن مسعود وقال: حديث حسن صحيح غريب.

نوێـژکردن بـه خوێنـدنی حـەدیثـی قودسـی تێیـدا دروست نیـه، لـه دەرەوەی نوێژیشدا خودا له پاداشی خوێندنەوەی حەدیثی قودسـیدا پاداشـی گشتی دانـاوه وەکوو ئـەو پاداشـه تایبەتیـه نیـه: کـه بـۆ خوێنـدنی قورئـانی دیاریکردووه: که بەهەر حەرفێکی ده چاکەی بۆ بنووسرێ.

## جیاوازی نێوان (الحدیث القدسی) و (الحدیث النبوی)

حەدیثی نەبەوی دوو جۆرە:

جۆرێکیان تەوقیفیـیه بریتییه لەو فەرموودانەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسـەر بـێ) ناوەڕۆکەکـەی لـه نیگـاوه وەرگرتـووه، بـه لـەفظو وشـەی خـۆی بـه خـەڵکی ڕاگەیانـدوەو بـۆی شـی کردوونـەوە، ئـەم جـۆرە فـەرمووده هەرچـەنده مـەضـمونو مانـای نیـسبەت دەدرێ بـۆلای خـودا، بـەڵام - لـەم ڕووەوە: که کەلامو ئاخاوتنه — شیاوی ئەوەیه پاڵ پێغەمبەر بـدرێ (درووودی خودای لەسەر بێ) چونکه قسەو ئاخاوتن (عادەتەن) پاڵ بێژەرەکـەی دەدرێ، هەرچەنده هەندێ مانای قسەکانی له یەکێ ترەوه وەرگرتبێ.

جـۆرێکی تـری حـەدیـث تـەوفیقیـیـه: ئـەویش بریتییـه لـەو فەرموودانەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لـه ئاکـامی تێگەیـشتنی له قورئان دەری هێناوه، ئەم جۆرە فەرمووودە (إستنباط) کـراوەی پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) ئەگـەر صـەوابو حـەق بـوو نیگـای ئاسمـانی پشتگیری دەکا، خۆ ئەگەر ئیجتیهادەکەی هەڵەیەکی کەمی تێدا بووبـێ، نیگـا نازڵ بووەو حوکمه ڕاستەکەی دیاریکردووه[١].

---

[١] نموونەی ئەمه ئەو ڕوداوەیه که دەربارەی دیلەکانی بەدر پێغەمبەر (درووودی خـودای لەسەر بێ) ڕای ئەبو بەکری وەرگرتو فیدیەی لێ وەرگرتن، ئـەوەبوو قورئـان نـازڵ بـوو ڕەخنەی له پرۆسەکه گرت فەرمووی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَـهُ أَسْـرَى حَتَّـى يُـثْخِنَ فِـي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – الأنفال/٦٧﴾.

دەی بە تەئکید ئەم جۆرەیان کەلامی خودا نیە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە حەدیثە نەبەوییەکان بە هەردوو جۆرەکانیانەوە (تەوقیفیو تەوفیقی): کە نیگا دەیچەسپێنێو ئیقراری دەکا، دەگونجێ دەربارەیان بگوترێ: تێکڕایان دەگەڕێندرێنەوە بۆ سەرچاوەکەی کە نیگای ئاسمانییە، ئەمەیە مانای ئایەتی ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى – النجم/٣ – ٤﴾.

حەدیثی قودسی ماناکەی لە خوداوەیەو ئاراستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کراوە بەجۆرێك لە جۆرەکانی نیگا بەڵام بەشێوەی دیاری نەکراو، وشەو ڕستەکانیشی لەلایەن پێغەمبەرەوە داندراوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر لەفظەکانی لەخوداوە بونایە ئیتر جوداوازی نێوان ئەوو قورئان نەدەبوو، موعجیزە دەبوو تەحەدای پێ دەکراو خوێندنەوەکەشی بەشێك دەبوو لە عیبادەت.

**لێرەدا دوو شوبهە سەر هەڵ دەدەن:**

**شوبهەی یەکەم:** بەگوێرەی ئەو مانایەی پێشەوە بێ حەدیثی نەبەوی دەچێتە چوارچێوەی نیگاوەو لەفظەکەی هی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆچی پێی نەڵێین: حەدیثی قودسی؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە ئێمە دڵنیاین لەوە: کە حەدیثی قودسی ماناکەی لە خوداوەیە چونکە دەقی شەرعی هەیە لەسەر ئەوە کە نیسبەت دراوە بۆلای خودا، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە صەریحی عیبارەت نیسبەتی دەدا بۆلای خودا دەفەرموێ: (قال الله تعالی) یان دەفەرموێ: (یقول الله تعالی) بۆیە ناومان ناوە حەدیثی قودسی بەپێچەوانەی حەدیثە نەبەوییەکان، ئەوان هیچ کامێ لەو جۆرە دەقەیان دەربارە وارید نەبووە.

دروسـتە دەربـارەی هـەر یـەکێك لـە حـەدیثـە نەبەوییـەکان کـە مەضمون‌و مانایان بەهۆی نیگاوە فێـری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) کرابێ واتە: (تەوقیفی)بن، یان پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بە ئیجتیهادو لێوردبوونـەوە لـە قورئـان ئـەو مانایـەی بـۆ دەسـتەبەر بووبـێ واتە: (تەوفیقی)بن، بۆیە هـەردوو جۆرەکـەیان بـە حـەدیثـی (نبـوی) نـاوزەد کردووە، ئەمەش لە ڕوانگەی ڕاوەسـتان لەسـەر ناوێك: کـە (مقطـوع بـە)یيـە زانایان لەسەری وەستاون، خۆ ئەگـەر شـتێکمان لابوایـە کـە نیگـای تـەوقیفی جیابکاتەوە ئەویشمان ناو دەنا قودسی.

**شـوبهەی دووەم:** دەگـوترێ: ئەگـەر ئـەلفـاظی حـەدیثـی قودسـی لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـن‌و تـەعبیری ئـەو بـێ بۆچـی نیسبەتیان دەدا بۆلای خودا دەفەرموێ: (قال الله تعالی) یان دەفەرموێ: (یقـول الله تعالی).

وەلامـی ئـەو شـوبهەیەش ئەوەیـە: دەڵـێین: ئـەم جـۆرە ئاخاوتنـە لـە زمانی عەرەبیدا ڕەوان‌و ڕەوایە: کـە جـاری وا دەبـێ کـەلام بـەگوێرەی مانـای نیسبەت دەدرێ بۆلای یەکێك خودی ئەلفاظەکانیش هی ئەو نین، ئەوەتا زۆر جاری وا هەیە ئەتۆ دێڕە شێعرێك دەکەیـە پەخـشان لـەفظەکان هـی خـۆتن کەچی دەڵێی فلانکەس وا دەڵێ‌و وایگوت.

ئەوەتا قورئانی پیرۆز حیکایەت‌و چیرۆکی موساو فیرعەون‌و کەسـانی ترمان بۆ دەگێڕێتەوە مانای ڕوداوو بەسەرهاتەکان بە ئەلفاظیـك ئـەدا دەکا: کە ئەلفاظی ئەوان نین، بە ئوسلوبێك ماناکان دەردەبڕێ ئوسلوبی ئەوان نیە، کەچی نیـسبەتی داوە بـۆلای ئـەوان ﴿وَإِذْ نَـادَى رَبُّـكَ مُوسَـى أَنْ ائْـتِ الْقَـوْمَ الظَّالِمِينَ ، قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلا يَتَّقُـونَ ، قَـالَ رَبِّ إِنِّـي أَخَـافُ أَنْ يُكَـذِّبُون ، وَيَـضِيقُ صَدْرِي وَلا يَنْطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَى هَارُونَ ، وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنْبٌ فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُـونِ ، قَالَ كَلاَّ فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ ، فَأْتِيَا فِرْعَـوْنَ فَقُـولا إِنَّـا رَسُـولُ رَبِّ

الْعَالَمِينَ ، أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ ، قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ، وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنْتَ مِنْ الْكَافِرِينَ ، قَالَ فَعَلْتُهَا إِذاً وَأَنَا مِنْ الضَّالِّينَ ، فَفَرَرْتُ مِنْكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْماً وَجَعَلَنِي مِنْ الْمُرْسَلِينَ ، وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ ، قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ ، قَالَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنتُمْ مُوقِنِينَ – شعراء/١٠ – ٢٤﴾.

## ٣ الوحی (نیگا)

وەحی ئاسمانیو وەرگرتنی لەلای پێغەمبەرانەوە شتێکی مومکینەو ڕویداوە.

زانستو وزانیاری گەشەی کردو تیشکی ڕوناکی تاریکی دڕداو هەموو ئەو شكو گومانانەی ڕەواندنەوە: کە تا ماوەیەکی نزیکی لەمەوپێش خەڵکی دەربارەی ئەو دێوی مادە هەیانبوو، گەلێك بیروڕای هەڵەو بێ بنەمایان خستبوونە ڕوو، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد: کە جگە لە جیهانی مادە هیچ شتێکی تر لەم بوونەوەرەدا بوونی نیە، هیچ بڕوایان بە ڕۆحو جیهانی غەیبی نەبوو، بەڵام ئەم کەڵەکە بێ بناغەیە سەری نەگرتو تێك ڕوخاو سەرەنجام زانستی مادی پێشکەوتوو: کە هەموو کائیناتێکی خستە بەر لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەو بەراورد کردن بە قەناعەتەوە، ئیمانی هێنا بەوەی کە لە ئەودیو ئەم جیهانە مادییە بینراوو هەست پێ کراوە، جیهانێکی غەیبی هەیە، زۆر لەم فراوانترو وردترو قوڵترە، هەتا زانست پێش بکەوێو گەشە بکا، مەودای ئەو عالەمە نەبینراوە پتر بەرفراوان دەبێو نهێنییەکانی زیاتر کەمەندکێش دەبنو زیاتر ئەو ڕاستیەمان لەلا بەرجەستە دەبێ: کە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً – الإسراء/٨٥﴾.

بــەڵێ زۆربــەی زۆری ئــامێرە داهێنراوەکــانی تــازەو ســەردەم تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی جیهانی کۆمپیتەرو ئەنتەرنێتو..... گەلێ شتی تری لەو جۆرە کە ئادەمیزادی توشی سەرسوڕمانو تێڕامان کردووە، لەو دیویەوە ئەم نهێنییە زۆر نهێنییە خۆی حەشار داوەو پەردەی لێ گرتوینەوە، بەڵێ ئەو سیڕە زۆر نهێنییەی کە زانستی ماددی کۆڵەوارە لە پەی بێ بردنیو دەرککردنی کونهەکەی، هەرچەند مولاحەظەی ئاثارو دیاردەکانی دەکا، وا وردە وردە ئەم موختەڕەعاتە تازانە لەمپەڕەکانی نێوان ئینکاریکردنی ئایینەکانو ئیمان پێ هێنانیان رادەماڵێو درزو قەڵشتی نێوانیان تەسك دەکاتەوەو ڕۆژ بەڕۆژ مانای ئەم ئایەتە دێتە جێ: کە دەفەرموێ: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ – فصلت/٥٣﴾

ئێستا لێکۆڵینەوە دەروونناسییە رۆحیەکان، لە مەیدانی عیلمو زانستدا گرنگی خۆیان هەیەو پلەوپایەی تایبەتییان دەدرێتێو جوداوازی ئادەمیزادەکان لە تێگەیشتنو حەزو ئارەزۆو غەریزەکانیان دەبێتە هاندەرو لایەنە رۆحییەکە لە تێگەیشتن نزیك دەکاتەوە، ئادەمیزادی وا هەیە خاوەنی عەقڵێکی عەبقەرییەو داهێنانی سەیروسەمەرە دەخاتە ڕوو، هی وایش هەیە گێلو نەفامو کەودەنە، شتی بەدیهیو سەهلو سادەی لێ یاخی دەبێو تێی ناگا، لەنێوان ئەم دوو جۆرە ئادەمیزادەدا چەند پلەی جۆراوجۆر هەن، نەفسەکانیش بەهەمان شێوە، هی وا هەیە: رۆحو نەفسێکی صافو بێگەردو ڕوناکە، هەیە نەفسێکی پیسی چڵکنو ژەنگاوییە.

جەستەی مرۆڤ گیانێکی لەخۆ گرتووە نهێنی زیندویەتی ئەم گیانە کە نەفخەیەکی خوداییە ئادەمیزاد هیچی لێ نازانێ ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الرُّوحِ قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي – الإسراء/٨٥﴾.

جا ئەگەر جەستەی ئادەمیزاد بەشی خۆی وەرنەگریّ زەڕاتەکانی دەپوکێنەوە، ئەنسیجەو خەلیەکانی لەناو دەچن‌و دەفەوتێن، ئەوە رۆحیش بەهەمان شێوە شیاوی ئەوەیە بژێوی خۆی وەرگریّ‌و هێزی گیانی خۆی دابین بکا بۆ ئەوەی ئیحتیفاظ بەهێزو موقەویماتی خۆیەوە بکا.

بۆ خوداش کارێکی ئاسان‌و ئاساییەو دوور نیە: کە لە بەندەکانی خۆی کەسانێك هەڵبژێریّ جەوهەرەکەیان ئەوەندە خاوێن‌و پاك بیّ، ئەوەندە سروشتی سەلامەت‌و ئامادەباشیان بکا فیوضاتی ئیلاهی وەربگرن‌و نیگای ئاسمانیان بۆ سەر نازڵ بیّ‌و هەریەکەیان بتوانیّ پەیوەست بیّ بە (مەلەئی ئەعلاوە) بۆ ئەوەی خودای باڵادەست‌و بیّ هاوتا پەیامی خۆی بۆ بنێریّ‌و ئەرکی پێغەمبەرایەتی بخاتە ئەستۆی: کە لە واقیعدا ئادەمیزاد زۆری پێویست پێیەو بەبیّ ئەو نیگا ئاسمانییە هەرگیز مرۆڤایەتی هەڵناکاو لە ئاژەڵ جیا نابێتەوەو ویژدانی پاڵفتە نابیّ‌و ئەخلاق‌و ڕەوشتی بەرز نابێتەوەو یاساو نیظامی راناوەستیّ‌و بەختەوەری بەخۆیەوە نابینیّ، ئا ئەم زاتە هەڵبژاردانە فروستادەو پێغەمبەرانی خودان.

زۆر ئاساییشە کە ئەم پەیوەندییەی نێوان ئەو مرۆڤە هەڵبژێراوانەی خودا بە مەلەئی ئەعلاوە بەهۆی نیگای ئاسمانی بیّ.

ئەمرۆ خەڵك بەچاوی خۆیان پرۆسەی تەنویمی موگناتیسی دەبینن، بۆیان دەردەکەویّ: کە پەیوەندی نەفسی ئادەمی بەهێزێکی لەخۆی باڵادەست تر کاریگەری وای تێدەکا نزیکی دەکاتەوە لەوە وا تێبگەین ئەمە دیاردەیەکی نیگا بیّ، بەجۆرێك پیاوی خاوەن ئیرادەی بەهێز بەهۆی ئەو ئیرادەیەوە دەتوانیّ بەسەر کەسێکی تردا کە ئیرادەی لەو بیّ هێزتر بیّ باڵادەست بیّ‌و کۆنترۆڵی هەموو هەست‌و نەستێکی بکاو وای لیّ بکا خەوێکی قوڵی بەسەردا بێنیّ‌و بەویستی خۆی بەکاری بێنیّ، چی بویّ ئاراستەی دەکاو فێری دەکا

ئەویش بەبێ ئیرادە (توتی ئاسا) ئـەوەی لێـی داوا دەکرێدەیڵێو بەسـەر دڵو زوبانیدا جاری دەبێ.

جا ئەگەر ئەمە کاریگەری مرۆڤی بەهێز بێ لەسەر مرۆڤی کەم هێـز ئەی تۆ دەبێ گومانت چۆن بێ بەرامبـەر کەسێك کە هێـزو توانـای لەگـەڵ مرۆڤدا هەر بەراورد ناکرێ!![1]

ئەمڕۆ ئادەمیزادەکان لەڕێگەی شەپۆلەکانی (أثیر)ەوە قسەو وتـاری کەسـانی تـری نزیـكو دوور دەبیـسن، لـە دووری هـەزاران کیلۆمـەترو لـە ئەوپەڕی دەریـاوە بەسـەر سارای بـەرفراوانو کێـوی سـەرکەشو شـیوو دۆڵـی زۆرو زەبەنـدەدا بـەهۆی ئـەو مـادە (أثیر)ییـەوە قـسەی تۆمـارکراو بـۆ ئێمـە دەگوێزنەوە بەبێ ئەوەی خاوەن گوفتارو قسەکەر ببینین، یان هەیانە زۆر لە مێژە لە ژیاندا نەماوە!!

ئـەمڕۆ بەچـاوی خۆمـان دەبیـنین دوو کـەس لەڕێگـەی تەلـەفونو موبایلەوە، لەڕێگەی جیهازی تەلەفیزیۆنی بیـستراو بینـدراوەوە قسە دەکـەن، یـەکیان لەوپـەڕی خۆرهـەڵاتو ئـەوی تریـان لەوپـەڕی خۆرئـاواوە، قـسەی یـەکتری دەبیـستنو لێـك حـاڵی دەبـن، وا دەبـێ بـە چـاویش یـەکتر دەبیـنن، ئەوانەی لە پەنایانەوە دانیشتوون هیچ لە ئاخاوتنی ئەو دوانە نابیستن، هەر ئەوەندە دەزانن گوێیان لە ویزەو جەرەسێك بووە وەکوو ویـزەی هـەنگ: کـە ئەم جۆرە ویزەو دەنگە دیاردەو صیفەتی نازڵبوونی نیگای ئاسمانی بـووە بـۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

کێ هەیە لە ئێمە لە حاڵی بە خەبەریداو لە حاڵی نووستوییدا قسە لەگـەڵ نـاخی خـۆی نـەکاو بـیروڕاوی خـۆی، تـەگبیرو پـلانو پیلانـی خـۆی بەراورد نەکا، بەبێ ئەوەی قسەکەرێك لەبەردەمی خۆیدا ببینێ؟

---

[1] بڕوانە کتێبی (النبأ العظیم) ص/٧٥ نووسینی دکتۆر: عبدوڵلا دراز.

ئا ئەم نموونانەو هی تریش حەقیقەتی نیگای ئاسمانی بۆ عەقڵو ئاوەزمان ڕون دەکەنەوە.

بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە پیاوی ڕۆژگاری دابەزینی نیگابوون، زۆریان شایەتی دیاردەی وەحیی بوون، ئەمجار بە تەواتوری تەواو: کە هەموو مەرجی تەواتوری تێدا بەرجەستە بووەو (مفید)ی زانیاری قەطعی بووە، چین دوای چین نەقڵ کراوە تا بەئێمە گەیشتووە، مرۆڤایەتی هەستی بە کاریگەری ئەو نیگایە کردووە لە ژیانو ژیاری نەتەوەکەیدا، لە ورە بەرزیو بەهێزی شوێنکەوتوانیدا، لە شکۆمەندیو مەردایەتیو شانوشەوکەتیاندا بەدرێژایی ڕۆژگاری پابەندبوونیان بەو پەیامەوە، هەروا روخانی کیانو دەسەڵاتو ڕیسوابوونی ئەو گەلو نەتەوەیەی کە کەمتەرخەم بوون لە پابەندبوو پێیەوە، ئەمانە هەموو بەڵگەو شایەتی ئەوەن کە دابەزینی نیگا بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی مومکینەو ڕویداوە، زەروریو پێویستە سەرلەنوێ مرۆڤایەتی بگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیامەو پابەندبوون پێیەوە، بۆ ئەوەی بژێوی گیانی لێ وەربگرنو تینوایەتی نەفسی هەڵقرچاویان بە بەها بەرزەکانیو قییەمە روحیەکانی تێراو بکەن.

پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکەم پێغەمبەرێك نیە: کە نیگای بۆ کراوە، بەڵکوو پەروەردگار لەپێش ئەوەی نیگا بۆ ئەو بکا، نیگای بۆ زۆر پێغەمبەری تر کردووە، هەمان نیگای بۆ ئەمی کردووە بۆ ئەوانی پێشووشی کردووە ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُوراً (١٦٣) وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً – النساء/١٦٣ – ١٦٤﴾.

له دابەزینی نیگادا بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ شتێکی وا نیە جێگای سەرسوڕمان بێ، بۆیە پەروەردگار ئینکاری هەڵوێستی عاقڵمەندانی کردووە لە بەرامبەر ناردنی نیگا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە سەریان سوڕماوە، دەفەرموێ: ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَباً أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنْ أَنْذِرْ النَّاسَ وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ – يونس/٢﴾

## مانای وەحی

دەگوترێ: (وحيت أليه وأوحيت) ئەگەر قسەت لەگەڵ یەکێکدا کرد بەجۆرێك جگە لە ئەو کەسی تر گوێی لێ نەبێ.

وەحي: بریتییە لە ئیشارەو ئاماژەی خێرا، ئەمەش بە قسەو ئاخاوتن بەشێوەی رەمزو تەعریض، وادەبێ بە دەنگی روت، وادەبێ بە ئاماژەی بڕێ ئەندامی جەستە دێتە دی.

وشەی (وەحي) چاوگە (مصدر)ە دوو مانا دەگەیەنێ: نهێنیو خێرایی، بۆیە لە مانای (وحي)دا گوتراوە: بریتییە لە پێ ڕاگەیاندنی نهێنیو خێرایی وا تایبەت بێ بەو کەسەی نیگاکەی تەوجیە دەکرێ بەجۆرێك غەیری ئەو کەسی تر پێی نەزانێو ئاگاداری نەبێ، ئەمە مانا (مصدر)ەکەیەتی.

وایش دەبێ بە مانای ئیسمی مەفعول بەکار بێندرێ، بە مانا پەیامە ئاڕاستە کراوەکەیە.

### وەحی بە مانا زمانەوانییەکەی ئەم جۆرانە دەگرێتەوە:

١- ئیلهامی سروشتیو خستنە دڵەوە، وەکوو ئەو نیگایەی بۆ دایکی حەزرەتی موسا کرا ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ – القصص/٧﴾.

٢- ئیلهامی غەریزی بۆ گیانلەبەر، وەکوو وەحیی بۆ هەنگ ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنْ اتَّخِذِي مِنْ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنْ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ – النحل/٦٨﴾.

٣- وحیی بە مانا ئیشارە بەشێوەی رەمزو ئامـاژە، وەکوو وەحیی حەزرەتی زەکەریيا بۆ قەومەکەی: کە قورئـان لێیەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنْ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيّاً – مريم/١١﴾.

٤- وەحیی بەمانا ختوکەدانی شەیتان بۆ ئادەمیزادو جوانکردنی شەڕو کاری شەڕئامێز لە دڵو دەروونیدا وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ – الأنعام/١٢١﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّاً شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً – الأنعام/١١٢﴾.

٥- ئەو نیگایەی پەروەردگار ئاڕاستەی فریشتەکانی دەکا دەربارەی کارێك کە ئەنجامی بدەن ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا – الأنفال/١٢﴾.

قورئانی پیرۆز بە بەربلاوی دەستەواژەی (أوحى)ی بەکارهێناوە بە (مزيد فيه)ی و وەزنی بابی (أفعال) بەشێوەی (مصدر) لەم بابە بەکاری نەهێناوە، بەشێوەی مەصدەری (ثلاثی مجرد)یش هێناویەتی ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى – النجم/٤﴾.

وەحی پەروەردگار بۆلای پێغەمبەرانی، زانایانی شەرعزان و ئوصولی فیقهو کەلام، ئاوایان پێناسە کردووەو فەرموویانە: بریتییە لە کەلامی خودا کە نازڵی کردووە بۆسەر پێغەمبەرانی، ئەم پێناسەیە پێناسەی (وحي)یە: کە (مصدر) بێو بە مانا ئیسمی (مفعول) بێ، واتە: نیگا ئاڕاستە کراوەکە.

(وحـي) بـەمانا (مـصدر)یەکـەی لـە زاراوەی ئوصـولییاندا بریتییـە لەوەی پـەروەردگار ئیعلامـی کەسانی هەڵبـژاردەی خـۆی بکا لـە بەنـدەکانی، ئەوەی دەیەوێ بەشێوەیەکی نهێنیو خێرا پێی رابگەیەنێ.

مامۆسـتا موحەممـەد عەبـدە لـە ریـسالەی تەوحیـددا ئـاوای پێناسـە کردووە فەرموویەتی: (وەحی زانیارییـە کـە مرۆڤەکـە لـەخۆیدا هەسـتی پـێ دەکا لە ناخیا جێگیر دەبێو دڵنیایـە ئـەوە لـە خـوداوە خراوەتـە دڵیـەوە، جا بەهۆی کەسێکەوە بێ، یان ڕاستەوخۆ بێ).

جۆری یەکەم وادەبێ بەدەنگ دەکەوێتە بـەر هێـزی بیـستنیو وایـش دەبێ بەبێ دەنگ لەناخیا دەچەسپێ.

## جوداوازی نێوان (وحی) و (ئیلهام) ئەمەیە:

(ئیلهام) زانیارییەکە لەناخـدا پەیـدا دەبـێو هەسـت دەکـا چـی لێ داوا دەکرێ، بەڵام نازانێ لەکوێوە بۆی هاتووە، زۆرتـر دەشـوبهێتە هەسـتکردن بـە برسیایەتیو تینوایەتیو خەمباریو کەیفخۆشی[1].

ئەمـە پێناسـەی (وحـي)ە بـە مانـا (مـصدری)یەکـەی، هەرچـەندە سەرەتاییەکەی وا دەچێتە وەهمەوە: کە دەشـوبهێتە حـەدیثـی نـەفس، یـان کەشـفو دەرکـەوتن، وەلێ جـوداوازی نێـوان (وحـي) و (ئیلـهام) کـە لەبەشـی دووەمی پێناسەکەدایە ئەو بۆچوونە ڕەت دەکاتەوە.

---

[1] بڕوانە کتێبی (الوحیی المحمدی) دانراوی شێخ محمد رشید رضا/ص٤٤.

## چۆنیەتی وەحی خودا بۆلای فریشتەکانی

١- قورئـانی پـیرۆز بـە ڕونـی ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەكـا: كـە پـەروەردگار ئاخاوتن لەگەڵ فریشتەكانی‌دا دەكا ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّـكَ لِلْمَلاَئِكَـةِ إِنِّـي جَاعِـلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَـا مَـن يُفْـسِدُ فِيهَـا وَيَـسْفِكُ الـدِّمَاء وَنَحْـنُ نُـسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ – البقرة/٣٠﴾.

هـەروا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەكـا: كـە خـودا نیگـا بـۆ فریـشتەكانی دەكـاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرَّعْبَ فَاضْرِبُواْ فَـوْقَ الأَعْنَـاقِ وَاضْـرِبُواْ مِـنْهُمْ كُـلَّ بَنَـانٍ – الأنفال/١٢﴾.

هەروەها قورئان ئاماژە بەوە دەكا: كە پەروەردگار فریشتەی كردوونە بەڕێوەبەری كەون‌و بە فەرمان‌و ویـستی ئـەو كاروبـاری بوونـەوەر جێبـەجێ دەكەن، دەفەرموێ: ﴿فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا، فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْـرًا – النازعـات/٤ – ٥﴾ ئەم دەقە قورئانیانە یەكتر بەهێز دەكـەن‌و ئـەوە دەگەیـەنن كـە پـەروەردگار ئاخاوتن لەگەڵ فریشتە دەكا بەبێ ناوەند، بـە كـەلامێك فـەرمانیان پـێ دەكـا كـە ڕاسـتەوخۆ لێـی حـاڵی دەبـن، ئـەوەی پـشتگیری ئـەم بۆچـوونە دەكـا ئـەو حەدیثەیە كە (النواس)ی كوڕی سەمعان ڕیوایـەتی كـردووە دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «إذا أراد الله تعـالى أن يـوحي بـالأمر تكلم بالوحي، فإذا تكلم أخذت السموات منه رجفـة – أو قـال عـدة – شـديدة خوفاً من الله عزوجل، فإذا سمع ذلك أهـل الـسموات صـعقوا وخـرّوالله سـجدا، فيكون أول من يرفع رأسه جبريل، فيكلمه الله من وحيه بمـا أراد، ثـم يمـر جبريـل على الملائكة، كلما مرّ بسماء سأله ملائكتهـا مـاذا قـال ربنـا يـا جبريـل؟ فيقـول

جبريل: قال الحق وهو العلي الكبير، فيقولون كلهم مثل ماقال جبريل فينتهي جبريل بالوحي إلى حيث أمره الله عزوجل».[1]

ئەم فەرمووده ئەوه ڕون دەكاتەوه: كه چۆنیەتی نیگا، ئاخاوتنه له خوداوه، بیستنه له فریشتەوه، سامو هەیبەتێكی گەورەو ترسناك له ئاكامەكەی دێته ئاراوه، جا ئەگەر ظاهیرەكەی ئەوه دەگەیەنێ: كه ئەم جۆره نیگایه تایبەته به قورئانەوه، ئەوه سەرەتای حەدیثەكه چۆنیەتی نیگا بەگشتی ڕون دەكاتەوه، بنەمای صەحیحی ئەم فەرمووده له بوخاریدا ئاوایه «إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ كَالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَانٍ».[2]

٢- ئەوه چەسپاوه: كه قورئانی پیرۆز له (لوح المحفوظ)دا نووسراوه، ئاماژه به ئایەتی ﴿بَلْ هُوَ قُرآنٌ مَّجِيدٌ ، فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ – البروج/٢١ – ٢٢﴾ هەروەكوو ئەوەش چەسپاوه: كه قورئان له شەوی لەیلەتولقەدردا به یەكجار نازڵ كراوه بۆ (بيت العزه) له ئاسمانی دونیا ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ – القدر/١﴾ یان ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ – الدخان/٣﴾ یان ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ – البقرة/١٨٥﴾.

له فەرموودەكانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووده هەن ئەوه ڕوون دەكەنەوه: كه ئەو نازڵبوونەی ئایەتەكان باسی لێوه دەكەن غەیری ئەو نازڵبوونەیه كه بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕویداوه، ئەوەتا له ئیبنو عەبباسەوه (ڕەزای خودا لەخۆیو له باوكی بێ) فەرموودەیەكی مەوقوف ڕیوایەتكراوه دەفەرموێ: «أُنْزِلَ الْقُرْآنُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ جُمْلَةً وَاحِدَةً إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا ثم أنزل بعد ذلك في عشرين سنة» ئەمجار

---

[1] أخرج الطيراني فى معجم الشاميين/٥٩١ بنحوه وذكره الهيثمى فى مجمع الزوائد ٩٤/٧.

[2] أخرجه البخارى (٤٧٠١) من حديث أبى هريره.

ئایـەتی ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا – الفرقان/٣٣﴾ یـان ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً – الإسراء/١٠٦﴾.[1]

له ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: «فصل القرآن من الذكر، فوضع فـي بيـت العزة من السماء الدنيا، فجعل جبريل ينزل على النبي».[2]

لـە ڕوانگـەی ئـەم دەقانـەوە زانایـان دەربـارەی چـۆنیەتی نیگـای پەروەردگار بۆلای جیبریل بە قورئان ئەم ڕاوبۆچوونانەیان لەلا گەڵاڵە بووە:-

أ/ حەزرەتی جوبرائیل قورئانی بەو لەفظە تایبەتیە لە خودای مەزن بیستووە.

ب/ جوبرائیل لە لەوحولمەحفوظ وەری گرتووە.

ج/ جوبرائیل ماناکەی ئاڕاستە کراوەو ئەلفاظەکانی هـی جوبرائیلـە، یان هی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ).

ڕای یەکەم صەحیحو ڕاستە، ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەر ئـەو ڕایەن، حەدیثی (النواس)ی کوڕی سەمعانیش کە لەوەپێش تێپەڕی پـشتگیری ئەوە دەکا، لە لایەکی تـرەوە لـە زۆر ئایـەتی قورئانـدا بـە صـەراحەت قورئـان نیـسبەت دراوە بـۆلای خـودا ﴿وَإِنَّـكَ لَتُلَقَّـى الْقُـرْآنَ مِـن لَّـدُنْ حَكِـيمٍ عَلِـيمٍ – النمل/٦﴾ یـان ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَـلاَمَ اللّـهِ – التوبة/٦﴾ یـان ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْـتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَـاء نَفْـسِي إِنْ أَتَّبِـعُ إِلاَّ مَـا يُوحَى إِلَيَّ – يونس/١٥﴾ گەلێك ئایەتی تریش.

قورئـانی پـیرۆز کـەلامی خودایـە بـە لـەفظو مـەعناوە نـەك کـەلامی جوبرائیل، یان موحەممەد بێ (دروودی خودای لەسەر بێ).

---

[1] اخرجه إبن منده فى (الأيمان) ٧٠٣، والحاكم/٢٨٧٩ والبيهقى فى الأسماء والصفات/٤٩٧.

[2] أخرجه النسائى فى الكبرى (٧٩٣٧) والحاكم (٢٨٨١).

ڕای دووەم هیچ ئیعتیبارێکی نیە، چونکە ثابیت بوونی قورئان لە لەوحولمەحفوظدا وەکوو ثابیت بوونی باقی غەیبیاتەکان کە قورئانی پیرۆز بەشێکیانە.

ڕای سێیەم بۆ سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گونجاوەو حەقە بەسەر ئەودا ببڕدرێ، چونکە وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان پێکرد بەشێکی فەرمووده وەحی خودایییە ئاراستەی جوبرائیل کراوە ئەمجار ئەویش بە مانا ئاڕاستەی حەزرەتی موحەممەدی کردووە (دروودی خودای لەسەر بێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عیبارەتی خۆی تەعبیری لێ داوەتەوە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى - النجم/٣ - ٤﴾ بۆیە ڕیوایەتکردنی حەدیث بە مانا بۆ کەسێك شارەزای زمانی عەرەبی بێ دروستە بە مەرجێك ماناکەی نەگۆڕێ، بەڵام قورئانی پیرۆز نەقڵ کردنیو خوێندنەوەی بە مانا دروست نیە.

**بۆ ڕەتدانەوەی ئەوانەی دەڵێن: قورئان کەلامی جوبرائیلە دەڵێین: ئەمە لە چەند ڕویەکەوە ڕایەکی پوچو گەندەڵە:**

**یەکەم:** موسوڵمانان ئەگەر ئایەتێکیان بخوێندایەوە دەیانگوت: (قال الله تعالى.......) ئەگەر قورئان کەلامی جوبرائیل بوایە دەیانگوت: (قال جبريل..........).

**دووەم:** ئەو نووسراوەی لەنێوان دوو بەرگی قورئاندایە لە ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ سەرەتای سورەتی فاتیحەوە تا دەگاتە (س)ی (الناس)ی سورەتی ﴿الناس﴾ بە کۆڕای موسوڵمانان نامەی خودایە بە لەفظو مەعناوە، دەی لەسەر ڕای ئەوان دەبێ کەلامی جوبرائیل بێ!!.

**سێیەم:** خودا دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ - النحل/١٠٢﴾ دەی بە قسەی ئەوان بێ ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ بڵێ: ﴿من كلام نفسه﴾.

**چوارەم:** خودا دەفـەرموێ: ﴿ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ – التوبـة/٦﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللّـهِ – البقـرة/٧٥﴾ دەی لەسـەر رای ئەوانـە ئـەم دەسـتەواژانە راسـت نـین، دەبـێ بیـستراوەکە قـسەی جوبرائیل بێ.

بۆ ئەوانەش: کە دەڵێن قورئان کەلامی موحەممەدە (دروودی خـودای لەسەر بـێ) دەڵـێن: بۆچوونەکەیان هەڵەیـە لەبـەر ئـەو بەڵگانـەی باسـکران لەوەپێش، لەلایەکی ترەوە ئەوانە بەو بۆچوونەیان هاوڕان لەگـەڵ (الولیـد)ی کوڕی (المغیرة) کە گوتی: ﴿إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَـشَرِ – المـدثر/٢٥﴾ کـەوابێ ئـەو هەڕەشەی لەو کراوە ئەمانیش دەگرێتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿سَأُصْـلِيهِ سَـقَرَ – المدثر/٢٦﴾.

تەنانەت پەروەردگار بۆ خۆیشی رەدی ئەوانـەی داوەتـەوەو بەهـەمان شێوەی کە رەدی موشریکەکانی داوەتەوەو دەفـەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ، فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ – الطور/٣٣ – ٣٤﴾.

لـەوەپێش جـوداوازی نێـوان قورئـانو حـەدیثـی قودسـیو حـەدیثـی نەبـەویمان ذیکـر کـرد، دووبـارەی ناکەینـەوە وەلێ بـە کـورتی ئاماژەیـان پـێ دەکەینەوە.

## بڕێك لە تایبەتمەندییەکانی قورئان ئەمانەن:

١- قورئان موعجیزەیە.

٢- قەطعییولثبوتە، چۆن لە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بیستراوە ئاوا چین لەدوای چین بەبێ گۆڕانکاری تێیدا بە ئێمە گەیشتووە.

٣- خوێندنەوەکـەی بەشـێکە لـە عیبـادەتو دەبـێ لەنوێـژدا فاتیحـە بخوێندرێ.

٤- پێویستە بە لەفظی خۆی ئەدا بکرێو هیچ وشەیەکی لێ نەگۆڕدرێ، بەڵام حەدیثی قودسی تەنانەت لەسەر ڕای ئەوانەیش کە دەڵێن: لەفظەکەی لە خوداوەیە دروستە بە مانا نەقڵ بکرێ.

## حەدیثی نەبەویش دوو جۆرە:

١- ئەوەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە تێڕوانینو ئیجتیهادی خۆی فەرموو‌بێتیو نەچێتە چوارچێوەی نیگاوە، جا ئەگەر وەحیو نیگا ئیقراری بکاو لێی بێدەنگ بوو ئەوە صەوابەو حەقە.

٢- ئەوەیە ماناکەی بە نیگا ئاراستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرابێ، لەفظەکە تەعبیری پێغەمبەر بی (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە دروستە ئەم جۆرە حەدیثە بەمانا ڕیوایەت بکرێ.

حەدیث بەگوێرەی قەولی راجیح: کە گوایە ماناکەی لە خوداوەیە نەك لەفظەکەی ئەوە دەچێتە چوارچێوەی بەشی دووەمی حەدیثی نەبەوی، نیسبەتدانیشی بۆلای خودا لە ڕیوایەتکردنیدا لەبەر ئەوەیە دەقی شەرعی بەو نیسبەتدانە هاتووە، بەڵام بۆ حەدیثی نەبەوی نەهاتووە.

## چۆنیەتی نیگاکردنی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی

پەروەردگار نیگای بۆ پێغەمبەرانی کردووە بەهۆی ناوەندەوە، یان بەبێ ناوەند.

**جۆری یەکەم:** بە واسیتەی جوبرائیلەوە نیگای ناردووە بۆلای پێغەمبەرانی، لەمەودوا بە درێژی باسی دەکەین.

**جۆری دووەم:** کە بەبێ ناوەند نیگای بۆ کردبن، بە دوو شێوە:

أ/ خەوبینینی راستاڵانە (الرؤیا الصالحة).

له خاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە فەرموویەتی: «أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ» واتە: سەرەتای هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بینینی خەوی ڕاستالانە بوو، ئەوەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر خەوێکی بدیبایە وەکوو گزنگی بەیان ئاشکراو نمایان بوو.

ئەم حاڵەتە ڕێخۆشکەر بوو بۆ پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) تا ئامادەباش بێ بۆ نازڵبوونی نیگا بۆ سەری لە حاڵەتی بە خەبەری‌و هۆشداریدا، هیچ کامێ لە ڕستەو ئایەتەکانی قورئان بەم شێوە بۆی نازڵ نەبوون، بەڵکوو قورئان هەمووی لە حاڵەتی بە خەبەریدا نازڵ بووەتە سەری، تەنانەت ئایەتێکیشی لە قورئان لە خەودا بۆ نازڵ نەبووە، بەپێچەوانەی ئەوانەی ئیدیعای ئەوە دەکەن کە سورەتی (الكوثر)ی لە خەودا بۆ نازڵ بووە.

ئەوەتا لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕێوایەت کراوە دەڵێ: «بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أَظْهُرِنَا إِذْ أَغْفَى إِغْفَاءَةً ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا فَقُلْنَا مَا أَضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ ». فَقَرَأَ « بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ» دەگوترێ ئەم حەدیثە ئەوە ناگەیەنێ کە لە خەودا بۆی نازڵ بووبێ، وێدەچێ ئەم لە هۆشخۆچوون‌و بوورانەوەیە ئەو حاڵەتە ڕەنگ گۆڕان‌و دیاردە (إغفاء)ەی ئەو حاڵەتە بووبێ: کە زۆرجار لە کاتی نازڵبوونی وەحی بۆسەری توشی هاتووە.

لەو بەڵگانەی کە ئەوە دەگەیەنن: خەونی صاڵح‌و ڕاستالانە بۆ پێغەمبەران نیگایە پێویستە پەیڕەوی بکرێ ئەو چیرۆکە قورئانیەیە کە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەزرەتی ئیبراهیم خەوی بینیوەو لە خەویدا

ئیسماعیلی کوڕی سەربڕیوە ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلامٍ حَلِيمٍ ، فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنْ الصَّابِرِينَ ، فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ ، وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ ، قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ، إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلاءُ الْمُبِينُ ، وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ، وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الآخِرِينَ ، سَلامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ، كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ، إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ، وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَقَ نَبِيّاً مِنْ الصَّالِحِينَ – الصافات/١٠١ - ١١٢﴾.

ئەگەر ئەم خەونە نیگا نەبوایەو جێبەجێ کردنی پێویست نەبوایە حەزرەتی ئیبراهیم پرکێشی سەربڕینی کوڕە خۆشەویستەکەی نەدەکرد، خۆ ئەگەر پەروەردگار بە فەضلی خۆی فیدیەی بۆ نەناردایە ئەوە کارەکەی بەجێ دێناو کوڕەکەی سەردەبڕی!

روئیای صالیحە تایبەت نیە بە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوحاڵەتە بۆ موسوڵمانانیش دەستەبەر دەبێ، هەرچەندە بۆ ئەوان بە وەحی ناژمێردرێ، وەکوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی فەرموویەتی: «انقطع الوحي وبقيت المبشرات، رؤيا المؤمن»[1]

خەونی راستو پیرۆز (روئیا صالیحە) بۆ پێغەمبەران جۆری یەکەمە لە ئاخاوتنی ئیلاهی: کە لە قورئاندا ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ – الشورى/٥١﴾.

ب/ جۆرێکی تری وەحی؛ ئاخاوتنی پەروەردگارە لەگەڵ یەکێ لە بەندە هەڵبژاردەکانی: کە بەبێ ناوەند لە پشتی پەردەوە بەندەکە لە حاڵەتی بەخەبەریدایەو نیگاو ئاخاوتنی ئاراستە دەکا، ئەم حاڵەتە بۆ حەزرەتی

---

[1] أخرجه بنحوه أحمد/٢٧١٤٢، وابن ماجه/٣٨٩٦.

موسا ڕویداوەو چەسپاوە ﴿وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ - الأعراف/١٤٣﴾ یان ﴿وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا - النساء/١٦٤﴾.

هەروەکوو ئەم جۆرە نیگایە بۆ پێغەمبەری ئیسلامیش هاتۆتە دیو چەسپاوە کە لە شەوی ئیسراءو میعراجدا ئاخاوتنی لەگەڵ زاتی پەروەردگار کرد، ئەم جۆرە نیگایە بەشی دووەمە: کە لە ئایەتی (٥١)ی سورەتی الشوریدا ئاماژەی پێ کراوە بە رستەی ﴿أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ﴾ هیچ ئایەتێکی قورئان بەم شێوە نازڵ نەبووە.

## چۆنیەتی نیگاکردنی فریشتە بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)

نیگای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی، بەبێ واسیتەو ناوەند، ئەوەیە کە لە پێشەوە ئاماژەی بۆ کراو بەشێکیشی خەونی راستو پیرۆز بوو، بەشێکیشی ئاخاوتنی پەروەردگار بوو لە پشت پەردەوە، یان بە واسیتەی فریشتەی تایبەت بە نیگاوە ئەنجام دراوە، هەر ئەمەیشە لێرەدا ئێمە باسی لێوە دەکەینو مەبەستمانە چونکە قورئانی پیرۆز هەمووی بەمجۆرە نازڵ بووە.

**ئەمجار ناڕاستەکردنو چۆنیەتی نیگا هێنانی فریشتە بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لە دوو حاڵەت بەدەر نیە:**

**حاڵەتی یەکەم:** کە لەسەر پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) زۆر قورسو گران بووە ئەو شێوەیە بووە: کە وەکوو زڕەی جەرەس بۆی هاتووە، عادەتەن دەنگی بەهێز هۆکاری ئاگادارکردنەوە دەوروژێنێو نەفسو دەرون بەهەموو هێزو ئامادەباشییەکیەوە خۆی ئامادە دەکا بۆ وەرگرتنی ئەثەرەکەی جا ئەگەر نیگای لەم جۆرە نازڵ دەبوو بۆ سەر پێغەمبەر

(دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو هەموو هێزو توانایەکی خۆی دەخستە کار بۆ بیستنیو وەرگرتنیو تێگەیشتنی، دەگونجێ ئەو دەنگە جەرەس ئاسایەی کە لە حەدیثی «إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ» ویزەو زرەی باڵی فریشتەکە بووبێ، یان دەنگی فریشتەکە خۆی بووبێ لە یەکەم بیستنی لەلایەن پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ).

**حاڵەتی دووەم:** ئەوەبوو فریشتەی نیگا لەشێوەی پیاوێکدا هاتبێتە خزمەتیو نیگای ئاراستە کردبێ، ئەم حاڵەتە لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حاڵەتی پێشوو سوکتربوو چونکە موناسەبەو پەیوەندی لەنێوان قسەکەرو بیسەردا هەبوو، حاڵەتەکە لەوەدەچوو کە دوو پیاو بۆ کارێکی گرنگ پێکەوە بدوێن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە بیستنی نیگا لە فریشتەی نێردراوو نیگاهێن فێنکایی بە دڵی دەهاتو ئارامی دەگرت، ئەو شێوەیەی حەزرەتی جوبرائیل خۆی تێدا نیشانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەداو لەشێوەی پیاوێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیبینی ئەوە نەبووە کە لە حاڵەتە روحانیەتەکەی خۆی تەجەرودی کردبێ، ئەوە ناگەیەنێ کە زاتی جوبریل بووبێتە جەستەی پیاوێکی ئاسایی خاوەن سەروکەللەو گەدەو ورگو گیپاڵ بەڵکوو مەبەست ئەوەیە جوبرائیل لەشێوەی ئادەمیزاددا هاتۆتە بەر دیدگای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی ئولفەتی پێوەبگرێو سامی لێ بشکێو بەبێ ترس گوێ بۆ نیگا بگرێ.

ئاشکراشە حاڵەتی یەکەم کە وەکوو دەنگی جەرەس لە سەرەتادا دەهاتە بەرگوێی ئەو شێوە ئونسو ئولفەتەی تێدا بەدی نەدەکرا، ئەم حاڵەتە جەرەساوییە پێویستی بە وره بەرزیو گیانسەختیو بەرزە روحیەکی وەهای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو: کە گونجاو بێ لەگەڵ روحانیەتی فریشتەکە، ئەم حاڵەتە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای

لەسەر بێ) قورسترینی دوو حاڵەتەکەی وەحی بوو، چونکە ئەم حاڵەتە وەکوو ئیبنو خەلدون دەڵێ: دەرچوون‌و دارنینی زات بووە لە هەیکەلی ئادەمیزادیەتی جەستەیی‌و پەیوەست بوون بە گیانی فریشتەیی عالەمی لاهوتەوە، حاڵەتەکەی تر پێچەوانەی ئەمیان بووە، چونکە لێرەدا گیانی فریشتەیی نیگا هێنەر چووەتە جیهانی قەبارەی ناسوتی‌و جەستەیی ئادەمیزادەوە (تاريخ إبن خلدون ج١/١٢٣).

لە ریوایەتەکەی خاتو عائیشەدا (رەزای خودای لێ بێ) هەردوو حاڵەتەکە ئاماژەیان پێ کراوە: تێیدا هاتووە دەڵێ: (الحارث)ی کوڕی هیشام پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد؛ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بە چ شێوەیەك نیگات بۆ دێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ – وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ – فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ» وا دەبێ ئەو نیگایەی بۆم دێ وەکوو زەڕەی جەرەس ئاراستەم دەکرێ، ئەمە زۆر لەسەرم قورس‌و گرانە، کە لەبەر گوێچکەم کۆتایی دێ هەرچی ئاراستەم کراوە لێی حاڵی بووم‌و تێی گەیشتووم، جاری وایش دەبێ فریشتەی نیگا لەشێوەی پیاوێك دێتە لام‌و ئاخاوتنم لەگەڵ دەکا چیم پی دەڵێ: لێی حاڵی دەبم‌و هە زمی دەکەم.

خاتو عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) بۆخۆی ئەو حاڵەتە دەگێڕێتەوە کە لە کاتی نازڵبوونی وەحی‌دا بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتووە دەفەرموێ: «وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ ، فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا».[1]

ئەم دوو حاڵەتە بەشی سێیەمی شێوە هاتنی نیگایە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ».

---

[1] أخرجه البخاري (٢) ومسلم/٦٠٥٩ وأحمد/٢٦١٩٨.

١- «إِلاَّ وَحْيًا»

٢- «أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ»

٣- «أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ»

جۆرێکی تر له نیگاکردن بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) که خۆی ئاماژەی پی دەکاو دەفەرموێ: «أن روح القدس نفث في روعي إنه لن تموت نفس حتى تستكمل رزقها وأجلها فاتقوا الله وأجملوا في الطلب».[1] جوبرائیل خستیه ناو دڵمەوە: که هیچ کەسێ نامرێ هەتا ڕزقو ڕۆژی خۆی نەخواو ئەجەلی تەواو نەبێ، لە خودا بترسنو داوای شتی باشی لێ بکەنو بەجوانی لێی بپاڕێنەوە.

له ڕاستیدا ئەم حەدیثە ئەوە ناگەیەنێ: کە ئەو نیگا خستنە دڵە حاڵەتێکی سەربەخۆ نیە، وێدەچێ بکەوێتە چوارچێوەی یەکێك لەو دوو حاڵەتەی له حەدیثەکەی عائیشەدا ئاماژەی بۆ کرا، کە فەرمووی: «فيأتيه الملك في مثل صلصلة الجرس وينفث في روعه، أو يتمثل له رجلاً وينفث في روعه» وێدەچێ ئەم حاڵەتی خستنی نیگا بۆ ناو دڵ بۆ هی غەیری قورئان بێ.

## گومانی ئەوانەی بڕوایان بە وەحی نیە

نەفامو نەزانەکان لە کۆنو نوێدا هەمیشە هەوڵیان داوە شوبهەو گومان بخەنە سەر وەحیو نیگای خودا بۆ پێغەمبەرانیو بە تایبەتی تێکۆشاوو لێبڕاون بۆ ئەوەی ڕاستی بشێوێننو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (درووودی خودای لەسەر بێ) بە درۆو بێ بنەما بخەنە بەرچاو، سەر ڕەقانەو لوتبەرزانە ئەو پەیامە پیرۆزەیان ڕەتکردۆتەوەو ڕەتی دەکەنەوە، بەڵگەو گومانیان لەتۆڕی جاڵجاڵۆکە بێ هێزترو لاوازترن.

---

[1] أخرجه القصناعي في مسند الشهاب/١١٥١ وإبن أبي شيبه/٣٤٣٣٢.

١- ئەوانە پێیان وایە قورئانی پیرۆز کەلامی خودا نیەو دانراوی موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ) خۆیەتی، لە گەنجینەی خەیاڵی خۆیدا ماناکانی داهێناونو بە ئوسلوبو تەعبیری خۆی دایڕشتوونو قورئانی لێ پێك هاتووەو هیچ پەیوەندی بە وەحیو شتی واوە نیە.

بێگومان ئەمە راوبۆچوونێکی پوچو بەتاڵە، چونکە ئەگەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئیدیعای زەعامەتی بۆخۆی بکردایەو تەحەدای قوڕەیشو عەرەبەکانی تری بە موعجیزەکانی بۆ ئەوە بکردایە ببێتە زەعیمو پاشاو چەسپاندنی سەروەری بۆخۆی، دەبوایە نیسبەتی قورئانی بۆلای خۆی بدایەو بیگوتایە ئەمە دانراوی خۆمە، چونکە هیچ بەرژەوەندیەکی ئەوی تێدا نیە ئەو شتەی تەحەدای پێ دەکا نیسبەتی بدا بۆلای غەیری خۆیو بڵێ: ئەمە قسەو کەلامی من نیە هی خودایە بۆی نازڵ کردووم، خۆی دەیتوانی قورئانی پاڵ خۆی بدایەو بیگوتایە زادەی بیری خۆمە، ئەمەش کیفایەت دەبوو بۆ بەرزبوونەوەی پلەوپایەی لەلای گەلەکەیو رێزیان لێ دەگرتو دەیانکردە گەورەو مەلیکی خۆیان، چونکە هەموویان بۆریان خوارد لەوەی بتوانن بەرەنگاری بکەنو دانیان بەوەدا نا: کە ئەم ئوسلوبو کەلامە لە رەوانبێژیو رەوانیدا گەیشتۆتە ئاستێك ئەوان لەبەرامبەریا جۆش داماون، جا ئەگەر بیگوتایە ئەمە کەلامی خۆمەو خۆم دامناوە، بەبێ چەندو چون گەردنکەچی دەبوونو بە زەعیمو گەورەی خۆیان هەڵیان دەبژارد، چونکە شتێکی خستە ڕوو ئەوان لە ئاستیا کۆڵەوار بوون.

نابێ بگوترێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە نیسبەتی قوررئانی داوە بۆلای نیگای ئیلاهیو فەرموویەتی لە خوداوە بۆم هاتووە، ویستویەتی ڕێز بۆ کەلامەکەی دەستەبەر بکاو زوور کەلامی خۆی بخا، هەتا

بتوانێ لەو ڕێگەوە ئیستیجابەی خەڵکەکە دەستەبەر بکاو فەرمانەکانی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ.

دەڵێین: نابێ قسەی لەو جۆرە بگوترێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قسەو کەلامی خۆی هەیەو نیسبەتی داوە بۆلای خۆیو پێی دەگوترێ (الحدیث النبوی) بەمەش هیچ لە شانو شەوکەتی پێغەمبەرو واجببوونی شوێنکەوتنی کەم نەبۆتەوە.

خۆ ئەگەر واقیعەکە وابوایە: کە ئەوان لەوەهەمو خەیاڵی خۆیاندا بەرجەستەیان کردووە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) قسەو فەرموودەکانی خۆیشی پاڵ خودا دەدانو دەیفەرموو ئەمانە لە خوداوە بۆم هاتوون.

ئەم ئیدیعایەی ئەوان وا مەزەندە دەکرێ: کە پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) لە پێڕی ئەو سەرکردەو فەرمانڕەوایانە بێ: کە بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆیان چەندان پردو قەنتەرەی درۆو دەلەسەیان دروستکردوون بۆ ئەوەی بەسەریان بپەڕنەوەو ئامانجی دونیایی خۆیانیان دەست بکەوێ.

لە ڕاستیدا ئەم مەزەندەکردنو بۆچوونەی ئەوانە شتێکە واقیعی مێژوویی بە درۆی دەخاتەوەو لە سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) نەبیستراوەو نەبیندراوە، سەرباری ئەوە ڕاستگۆیی پێغەمبەرو ئەمانەتپارێزی بە جۆرێك بووە دوژمنەکانی پێش دۆستەکان شایەتی بۆ دەدەنو لە واقیعی تاریخیدا چەسپاوە، هەموو ئەمانە بیروبۆچوونی ئەو نەیارە نەزانانە ڕەتدەکەنەوە.

بێگومان دووڕووەکان بوختانیان بۆ خاتو عائیشەی خێزانی هەڵبەست: کە خۆشەویسترین خێزانی بوو، تۆمەتێکیان بۆ هەڵبەست مەسسی کەرامەتو شەرەفی خودی پێغەمبەری دەکرد (درودی خودای

لەسەر بێ) وەحی ئاسمانی دواکەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی توشی حەرەجو نارەحەتی بوو، هاوەڵانی پێیان ناخۆش بوو، بە دڵتەنگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) توشی شۆك بوونو خەفەت تا بینەقاقایانی داگرت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلایەن خۆیەوە کەوتە هەوڵدانو مەشورەت کردنو ڕاگۆڕینەوە، هاوەڵانو بنەماڵەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەك مانگی تەواو بەم دەردە دەتلانەوەو خەفەتیان دەخوارد.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو ئەم ماوەیەدا سەرەنجام بەس ئەمەی بە عائیشە فەرموو: «أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِالذَّنْبِ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ»[1] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم حاڵەوە مایەوە تا وەحی نازڵ بوو داوێنپاکی خاتو عائیشەی ڕاگەیاندو خانەوادەی پێغەمبەری خودا، ئارامی بۆ گەڕایەوە.

دەی ئەگەر قورئان کەلامی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێ چی مەنعی کرد لەوەی بۆخۆی کەلامێك داتاشێو قسەو بوختانی ئەو زمان درێژانە ببڕێو ناموسی خۆی بپارێزێ؟! بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن دەبێ درۆ لەگەڵ خەڵك بکاو بە دەم خوداوە درۆ هەڵبەستێ، بەهیچ شێوەیەك ئەوە لە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) جێگای نابێتەوە ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ، فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ – الحاقة/٤٤ – ٤٧﴾.

---

[1] البخاري/٢٦٦١ ومسلم/٧٠٢١.

کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵان عوزریـان هێنایـەوەو داوایـان کـرد نەچـن بـۆ غـەزای تـەبوك هەنـدێك لەوانـە دوورپ بـوونو عوزرەکانیـان هەڵبەسـتبوون، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئیزنـی دان: کە نەچـن بـۆ غەزاکە، دوایـی قورئـان نـازڵ بـوو لۆمـەی کـرد لەسـەر هـەبوونی هەڵە لـە رایەکـەیدا ﴿عَفَا اللّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَـكَ الَّـذِينَ صَـدَقُواْ وَتَعْلَـمَ الْكَـاذِبِينَ – التوبة/٤٣﴾ خۆ ئەگەر ئەم رەخنەو لۆمەیە هەڵقولاوی ویژدانی خۆی بوایەو رەنگدانەوەی پەشیمانی خۆی بوایە کاتێ بۆی دەرکـەوت رایەکـەی صەحیحو راست نیە، بەم شێوە زەقە رەخنـەی ئاراسـتەی خـۆی نـەدەکرد وا بـە تونـدی لۆمەی خۆی نەدەکرد!!

وێنەیەکی لەم جۆرە رەخنانـە ئـەو رەخنەیەیـە: کە خـودا ئاراسـتەی پێغەمبەری خۆی کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەوەی فیدیەی لە دیلەکانی بەدر وەرگرت ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِـي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ، لَّـوْلاَ كِتَـابٌ مِّـنَ اللّـهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ – الأنفال/٦٧ – ٦٨﴾.

هــەروا لۆمــەکردنو عیتــاب لێگرتنــی لەســەر ئــەوەی پــشتی لــە عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتومی نابینا هەڵکردو گرنگی بە هەندێ لە پیاو مـاقولانی قـوڕەیشدا، هـەولی لەگـەڵ دەدان ئیمـان بێـنن ﴿عَـبَسَ وَتَـوَلَّى ، أَنْ جَاءَهُ الأَعْمَى ، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى ، أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنْفَعَهُ الذِّكْرَى ، أَمَّا مَنْ اسْـتَغْنَى ، فَأَنْتَ لَهُ تَصَدَّى ، وَمَا عَلَيْكَ أَلاَّ يَزَّكَّى ، وَأَمَّا مَنْ جَاءَكَ يَسْعَى ، وَهُـوَ يَخْـشَى ، فَأَنْتَ عَنْهُ تَلَهَّى ، كَلاَّ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ – عبس/١ – ١١﴾.

ئاشکراو نمایانە: کە پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـەر لـە تەمەنی منداڵیەوە نمونەیەکی هەرە بەرزی رەوشـت جوانی بـووە، سروشـتو سـەجییەی پاكوخـاوێن، راسـتگۆ لـە قـسەو ئاخاوتنـدا، راسـتاڵ لـە گوفتـارو کـردەوەدا، گــەلو نەتەوەکــەی ســەرەتای بانگــەوازی کردنــی بۆیــان ئــەم

شایەتییەیان بۆداوە، ئەوەبوو پێی گوتن: «أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً بظهر هذا الوادي تريد أن تغير عليكم أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ» وتیان بەڵێ ئێمە بڕوات پێ دەکەین چونکە هەرگیزاو هەرگیز درۆمان لێ نەبینیوی[1].

ژیاننامەی عەتر ئامێزی جێگای ئارامگرتنی دڵەکان بوو بۆ چوونە ناو ئیسلام‌و موسوڵمان بوون، لە عەبدوڵلای کوڕی سەلامەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتە مەدینەو ئەو خاکەی پیرۆز کرد، خەڵك بۆلای کێش بوون‌و وەجبە وەجبە دەچوونە خزمەتی.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی گەیشتە مەدینە منیش لەگەڵ خەڵکدا چووم بیبینم، جا کە تێی رامام‌و لێی وردبوومەوە، بە تەواوی ڕوخساریم دی، زانیم کە ئەو ڕوخسارە ڕوخساری درۆزن نیە[2].

خاوەنی ئەم صیفاتە بەرزو نمونەییانە، کە ڕاستگۆیی تاجی هەر پیرۆزیانە، نابێ کەس گومانی لە وتەکانی‌دا هەبێ، کاتێك دەفەرموێ: ئەم قورئانە شاکاری خۆم نیەو لە خوداوە بۆم نازڵ بووە، دەبێ بە دڵ‌و بە گیان لە ناخەوە بڕوای پێ بکەین‌و هیچ گومانمان لە راستی‌و دروستی فەرموودەکەی‌دا نەبێ ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ - یونس/١٥﴾.

٢- نەفام‌و نەزانەکان لە کۆن‌و نوێدا پێیان وابووەو لایان وایە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) خاوەنی زیرەکییەکی ناوازە بووە، بە صیرەتێکی زۆر بەهێزی هەبووە، فیراسەتێکی تیژو تێگەیشتن‌و بە ئاگایی‌یەکی کاریگەری هەبووە، خاوەنی دڵ‌و دەرونێکی صاف‌و

---

[1] البخاری/٤٩٧١ ومسلم/٥٠٨.

[2] أخرجه الترمذی/٢٤٨٥ وإبن ماجه/١٣٣٤ واحمد/٢٣٧٨٤.

مشتوماڵ کراو بووە، تێفکرینی ڕاستی تێدا بەرجەستە بووە، هەموو ئەم صیفاتو ڕەوشتانەی تێدا کۆبوونەوە وایان لێ کردبوو ببێتە خاوەنی ئیلهامێکی وەها ئەندازەی خێرو شەڕ بزانێ، حەقو بەتاڵ لێك هەڵاوێرێ، بەهۆی کەشفو وەحی نەفسییەوە نهێنی کارەکان بزانێ، کەوابێ قورئان ئەثەرو کارلێکی ئەو ئیستینباطو هەڵگۆزینو دەرهێنانی عەقڵیو دەرککردنی ویژدانییەوە، موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئوسلوبو بەیانی خۆی دەری بڕیوە.

هەڵبەتە ئەمە بوختانێکی گەورەو نەفامیەکی ڕونو ئاشکرایە! دەبێ چ شتێك لە قورئاندا زانینی پشت بە زیرەکیو ئیستینباطو هەستەوە ببەستێ؟! جارێ لایەنی ئیخباریو هەواڵدانی – کە بەشێکی زۆری قورئانی داگرتووە – هیچ عاقڵمەندێك گومانی لەوەدا نیە کە بەبێ پێگوتنو فێرکردن دەستەبەر نابنو عاقڵو زیرەکی چ ڕۆڵێکیان لە بەدەستهێنانی ئەم بوارەدا نیە!

بێگومان قورئان زۆر بەسەر هاتو چیرۆکی گەلو نەتەوە پێشینەکانی بۆ گێڕاوینەوە، سەرگوروشتەو چیرۆکی پێغەمبەرانو کۆمەڵانی ئادەمیزادو ڕوداوە مێژوییەکانیان بەوپەڕی وردەکاری ڕاستیو دروستییەوە تۆمار کردووە.

وێڕای ئەو ڕۆژگارە کۆنو کەونارانەی کە چووەتە قوڵایی مێژووەوەو تا سەرەتای دروستبوونی کەون ڕۆیشتۆتە خوارێ، کەچی وەکوو شایەتێکی بینەری ڕوداوەکە بۆمانی دەگێڕێتەوەو قۆناخ بەقۆناخ تۆماری کردوون، کە لە ڕاستیدا ئەم بوارانە بواری ئەوە نین فیکرو فیراسەت ڕۆڵیان تێدا بگێڕن، حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی هاوچەرخی هیچ کامێ لەم ڕوداوانە نەبووە، لەگەڵ ئەو گەلو نەتەوانە نەژیاوەو تێکەڵاویان نەبووە، هەتا ئاگاداری ڕوداوەکان بووبێو هەڵەکان تۆمار بکا، لەلایەکی ترەوە

كتێبو نووسراوی ئەو گەلو نەتەوانەشی دەست نەکەوتووەو خوێندەواریشی نەبووە، تا لە ڕێگەی ئەو کتێبانەوەو خوێندەواری خۆیەوە لێکۆڵینەوەی تێدا کردبنو هەواڵو بەسەرهاتیانی ڕاگواستبێو بەشێکی قورئانی لێك پێك هاتبێ ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ الشَّاهِدِينَ ، وَلَكِنَّا أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَلَكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ - القصص/٤٤ - ٤٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ - هود/٤٩﴾ یان دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ - یوسف/٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُون أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ - آل عمران/٤٤﴾.

هەندێ بواری تری قورئان ژمارەی حیسابو لێکدانەوەی وا لەخۆ دەگرێ خوێندەواری زیرەكو وشیار نەبێ هەستی پێ ناکا، ئەوەتا لە چیرۆکی حەزرەتی نوحدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ - العنكبوت/١٤﴾ ئەمە دەق موافیقی ئەو دەقەیە کە لە تەوراتدا لە سفری (التکوین)دا هاتووە.

دەربارەی چیرۆکی ئەصحابولکەهف دەفەرموێ: ﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا - الكهف/٢٥﴾ ئەم ژمارە لای ئەهلی کیتاب سێسەد ساڵی شەمسی‌یە نۆ ساڵ زیادەکە فەرقی نێوان ساڵی شەمسیو ساڵی قەمەرییە.

دەی باشە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم وردەکارییەی لەکوێ هێناو بەچی ئەم ژمارانەی دەرهێنان؟ ئەگەر وەحی

خـودایی نـەبێ، لـە حاڵێکـدا ئـەو نەخوێنـدەوار بـووە لـەناو گـەلو هـۆزێکی نەخوێندەواردا ژیاوەو نە نووسینیان زانیوە نە حسیاب.

بێگومان ئادەمیزادەکانی سەردەمی نەزانی کۆن، زۆر زیرەکتر بوون لە مولحیدە نەفامەکانی هاوچەرخ، ئەوان هەرگیز زاتی ئـەوەیان نـەکردووە ئـەم بوختانە زەبەلاحە هەڵبەستن نەیانگوت موحەممەد (دروودی خـودای لەسـەر بێ) ئەم هەواڵانەی لە نەفسی خۆی دەرهێنـاوەو بۆخـۆی بـە تـەعبیری خـۆی دایڕشتوون وەکوو ئەوانەی هاوچەرخ دەیڵێن!! بەڵکوو دەیانگوت: موحەممـەد (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەم قورئانـەی لای کەسـانی تـر خوێنـدووەو خـەڵك بەسـەریا دەخوێننـەوەو لەوانـەوە فێـر بـووە ﴿وَقَـالُوا أَسَـاطِيرُ الْـأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا - الفرقان/٥﴾.

پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ تـەنیا سـاتێکیش لای مامۆستا نەیخوێندووە — وەکوو لەمەودوا بـە درێـژی شـی دەکەینـەوە — دەی باشە ئەم هەواڵو سەرگورشتانەی لەکوێوە وا گۆزوگوممەت بۆ هات؟ چی بوو لەپشت ئەو حاڵەتەیەوە: کە تەمەنی گەیشتە چل ساڵ لـەپڕ ئـەم هەواڵانـەی ڕاگەیانـدن؟! ﴿إِنْ هُوَ إِلَّـا وَحْـيٌ يُـوحَى - الـنجم/٤﴾ ئەمـە لـەبواری هـەواڵو بەسەرهاتدا.

وەڵێ دەربـارەی زانـستە جۆراوجۆرەکـانی تـر: کـە قورئـان لـەخۆی گرتـوونو ئامـاژەیـان پـێ دەکـا، بێگومـان بەشـی عیبادەتەکـەی زۆر شـتی بـە وردەکارییـەوە لـەخۆ گرتـووە دەربـارەی سـەرەتای دروسـتکردنی بوونـەوەرو کۆتایی هاتنی، دەربارەی ژیانی ڕۆژی دوایی‌و ئـەوەی تێیدایـە لـە بەهەشـتو نیعمەتـەکانی، لـە دۆزەخو سـزای سـامناکی، لـە فریـشتەو ئەوصـافو ئـەرکی سەرشانیان، هەموو ئەمانـەو گـەلێ شـتی تـری ئـەو جیهانـە، چـەند زانیـاریو مـەعلوماتێکن عـەقڵو زیرەکـیو فیراسـەتو دووربینـی چ ڕۆڵێکیـان نیـە تێیانداو بەوان پەییان پێ نابرێ، ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْـحَابَ النَّـارِ إِلَّـا مَلَائِكَـةً وَمَـا

جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاء وَيَهْدِي مَن يَشَاء وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ – المدثر/٣١﴾.

﴿وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِن دُونِ اللّهِ وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لاَ رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ – يونس/٣٧﴾ **ئەمە جگە لەوەی قورئان چەند ئەحكامێكی قاطیعو حاشا هەڵنەگری لەخۆ گرتوون دەربارەی ڕووداوی داهاتوو: كە بەگوێرەی یاسا كۆمەڵایەتیەكانی پەروەردگار دێنە كایەوە؛ لە بەهێزیو بێ هێزی، لە بەرزبوونەوەو نزمبوونەوە، لە عیزەتو شكۆمەندیو زەلیلیو ژێردەستەیی، لە بیناكردنو ڕوخاندن.........هتد** ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ – النور/٥٥﴾ **یان** ﴿الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ، الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ – الحج/٤٠ – ٤١﴾ **یان** ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ – الأنفال/٥٣﴾.

**وێڕای ئەمانە هەموو بێگومان قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوە ڕوون دەكاتەوە: كە ئەو پابەندی ئەو نیگایەیە كە لە خوداوە بۆی دێو بە موو لێی لانادا** ﴿وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِآيَةٍ قَالُواْ لَوْلاَ اجْتَبَيْتَهَا قُلْ إِنَّمَا أَتَّبِعُ مَا يِوحَى إِلَيَّ مِن رَّبِّي هَذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى

وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ – الأعراف/٢٠٣﴾ ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەو هیچ لە غەیب نازانێ، لەو بارەوە دارای هیچ دەسەلاتێك نیە ﴿قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ – الأعراف/١٨٨﴾.

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر دەسەوسان بووە دەربارەی حەقیقەتی کێشەی نێوان دوو رکابەرو دوو شایەتو نەیزانیوە چۆن بڕیار بداو چۆن حوکمی نێوانیان بکا، لە کاتێکا گوێی لە قسەو ئاخاوتنیان بووە، دەی ئەکید بۆ زانینی ڕوداوی رابردوو ڕوداوی داهاتوو پتر عاجز بووە!!

ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لە دەنگە دەنگو مقۆمقۆیەك بوو لەبەر دەرگای ژورەکەی، تەشریفی هاتە دەرەوە بۆ ناویان‌و فەرمووی: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ ، فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَدَقَ ، فَأَقْضِيَ لَهُ بِذَلِكَ ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ ، فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ فَلْيَتْرُكْهَا».[1]

دکتۆر عەبدوڵڵا دەراز دەڵێ: ئەم راوبۆچوونە: کە ئەمڕۆ مولحیدەکان ئەمڕۆ بەناوی وەحیەوە ڕەواجی پێ دەدەن‌و بانگەشەی بۆ دەکەن، پێیان وایە ئەوان بەم ناونانە لێی، رەئیەکی زانستی تازەیان بۆ هێناوین، لەوقیعدا تازە نیەو قسەیەکی کۆن‌و سواوی خەڵکە نەفامەکەی سەردەمی نەزانی‌یەو دەق قسە بەتاڵ‌و پوچەکانی ئەوان دەجوونەوە، نە بە کورتی‌و نە بە درێژی هیچ جوداوازییەك نیە لەنێوان بوختانی ئەمان‌و ئەواندا.

ئەمان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا وێنا دەکەن کە پیاوێکە خاوەنی خەیاڵێکی بەرفراوان‌و هەستێکی قوڵە، کەوابێ ئەو شاعیرو

[1] أخرجه البخاري/٢٤٥٨ و ٦٩٦٧ ومسلم/٤٤٧٥ وغيرهما.

هەستیارە، ئینجا لەمەیان زیاد کردووەو دەڵێن: ویژدانی سەرکەشەو بەسەر حەواسەکانی دا زاڵە بەجۆرێك وای لێ هاتووەو خەیاڵ دەکا شەخصێك دەبینێ‌و شتی لێ دەبیسێ، ئەوەی دەیبنێ‌و دەیبیسێ جگە لە وێنا خەیاڵی‌و ویژدانیەکانی هیچی تر نیە، کەوابێ شێت‌و خەرەفاوە ورێنە دەکاو قسەکانی (ئەضغاث الأحلام)ن.

ئەمجار نەیانتوانی لەسەر ئەم داواو بوختانانە بەردەوام بن‌و ئەم تەعلیلاتانە بخەنەڕوو، ناچار بوون واز لەوە بێنن‌و بڵێن ئەوە (وەحی نەفسی‌یە) بە تایبەتی: کە بۆیان دەرکەوت قورئان بەشێکی زۆری هەواڵ‌و بەسەرهاتی ڕابردوو داهاتووە، ئیتر بە ناچاری مەوجەکەیان گۆڕی‌و وتیان: ئەم قورئانەی لە کەسانێ بیستووەو لەوانی وەرگرتووە، لە بڕێ گەشت‌و کاروانی دا بۆ بازرگانی چاوی بە راهیب‌و قەشەو زانای جولەکەو مەسیحی کەوتووە، لە دەمی ئەوانەوە ئەم قورئانەی وەرگرتووە، کەوابێ ئادەمیزاد فێریان کردووە!

دەی دەبێ چ فەرق‌و جوداوازییەك هەبێ لەنێوان نەفامەکانی قوریش‌و بەناو زاناو ڕۆشنبیرەکانی سەردەمدا؟! ئایا هەموو ئەم قسەو تەعلیل‌و پڕوپاگەندەی ئەم زانا سەردەمیانە هەمان قسەو تەعلیل‌و بوختانی نەفامەکانی سەردەمی نەزانی نیە؟ ئەمان دەیجوونەوە بەناوی بریقەدارەوە بڵاوی دەکەنەوە.

بەڵێ هەموو قسەکانیان دووبارە کردنەوەو لاسایی کردنەوەی نەفامەکانی قوڕیشە، ئاوا بەوجۆرە فیکرەی ئیلحادو بێدینی لە بەرگە تازەکەیدا وێنەیەکی فۆتۆکراوی موشریکەکانی قوڕەیشە، بەڵکوو وێنەیەکی مەسخکراوو شێوێندراوە لە کۆنترین پۆشاکی دا بە ناشیرینترین شێوە!!

کەوابێ بژێوی ئەم ئەفکارە — بەناو پێشکەوتنخوازانەی سەردەم — لەبەرماوەو پارچەو ئێسقانە کرۆسراوەی سەر سفرەو خوانی ئەو دڵڕەقانەی

سەردەمی نەزانی پێك هێنراوەو ئامادە كراوە ﴿كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ – البقرة/١١٨﴾.

جا كە ئەمە جێگای سەرسوڕمان بێ، لەوە سەیرتر ئەوەیە: كە دەیانگوت موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاستگۆو ئەمانەتپارێزە، هەروا: كە دەیانگوت: موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) عوزری هەیەو ناچارە كە نیسبەتی بینینەكانی پاڵ نیگای خودایی دەدا، چونكە تێڕوانینە قوڵو بەهێزەكانی وایان لێ كردووە ئەو وێنا خەیاڵیانەی دەیانبینێ بە نیگای خودایان بزانێ، ئەو چ دەبینێ شایەتی لەوە دەدا.

بەم جۆرە پەروەردگار هەڵوێستو سەرگورشتەی پێشینانی ئەوانمان بۆ دەگێڕێتەوە: كە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ – الأنعام/٣٣﴾ جا كە ئەمە عوزرو بیانوی بێ لەوێناكردنی ئەوەی دەیبینێو دەیبیسێ، دەبێ عوزروبیانوی ئەوەی چبێ كە ئیدیعای ئەوەی كردووە: ئەم هەواڵو ڕوداوانەی بە نیگا بۆی هاتووە، لەوەپێش نەخۆیو نە گەلەكەی هیچیان لێ نەزانیوە، لە كاتێكدا بە دیدی ئەوان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەپێش ئەو شتانەی بیستوونو خەڵك فێری كردووە، دەی با ئەمانیش وەكوو قوڕەیشییەكان بڵێن: ئەو شتانەی هەڵبەستوون بۆ ئەوەی لە هەموو شتێكدا ببنە لاسایی كەرەوەی كافرەكانی قوڕیشو هەموو قسەكانیان بجونەوە!!

بەڵام ئەمان نایانەوێ ئەم قسەیە بكەن، چونكە ئەمان لافی ئەوە لێدەدەن ویژدانیان هەیەو خاوەنی عەقڵو ئاوەزنو قسەی وا ناكەن، وەلێ بەبێ گومان ئەوان هەمان قسەشیان كردووە بەڵام هەستی پی ناكەن!![1]

٣- نەفامەكانی قوڕیشو زانا نەزانەكانی سەردەم پێیان وایە: كە موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) زانستەكانی ناو قورئان لە مامۆستا

---

[1] بڕوانە كتێبی (النبأ العظيم) ص/٩٧.

فێر بووە، لەسەر دەستی (معلم) ئەو شتانەی خوێندون، ئەمە قسەیەکی ڕاستە وەڵێ ئەو مامۆستاو موعەلیمەی فێری قورئانی کردووەو قورئانی لێ وەرگرتووە فریشتەی نیگا بووە، ئەو قورئانی بۆ هێناوەو بەسەریا خوێندۆتەوەو فێری کردووە، ئیتر هیچ مامۆستای تری نەبوون نە لەناو نەتەوەی خۆی نە لە غەیری نەتەوەی خۆی.

بێگومان حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بە نەخوێندەواری پێگەیشتووە، بە نەخوێندەواری ژیاوە لەناو گەلێکی نەخوێندەواردا هەڵسوکەوتی کردووە، تا ئێستا لە مێژوودا نەبیستراوەو نەزانراوە: کە یەکێك لە گەلو نەتەوەی قورەیش پێش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازناوی مامۆستایی‌و فێرکردنی عیلم‌و زانستی هەلگرتبێ، ئەمە واقیعێکە مێژوو شایەتی لەسەر دەداو هیچ گومانی تێدا نیە.

ئەگەر بشگوترێ مامۆستای لە غەیری نەتەوەی خۆی هەبووە، ئەمەش ڕەتدەکرێتەوە، چونکە هیچ لێکۆڵەرەوەو باحیثێك ناتوانێ لە مێژوودا تاقە وشەیەك بدۆزێتەوە ئەوە بگەیەنێ: کە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێش ئیعلانی پێغەمبەرێتی‌دا لەلای یەك کەس لە زاناکانی ئەو ڕۆژگارە دەرسی ئایینی خوێند بێ، ئەمە ڕاستییەکی مێژوویەو نکۆڵی لێ ناکرێ.

بەڵێ ڕاستە ئەو لە منداڵیدا لە بازاڕی بوصرای شام چاوی بە (بحيرا الراهب) کەوتووە، لە شاری مەککە دوای ئەوەی نیگای بۆ هات لەگەڵ وەرەقەی کوڕی نەوفل دانیشتنی کردووە، دوای کۆچکردنی بۆ مەدینە، لەگەڵ مالم‌و قەشەی جولەکەو نەصارا دانیشتووەو وتوویژی کردووە، وەڵێ ئەوە چەسپاوو قەطعییە: کە لەپێش پێغەمبەرێتی‌دا هیچ شتێکی لەوان وەرنەگرتووە، لەدوای بوونیشی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

ئەوە بێگومان ماڵ‌و قەشەكان پرسیاریان لێ دەكردو دەمەدەمێ‌و جیدالیان لەگەڵدا دەكردو سودیان لێ دەبینی‌و شتی لێ فێر دەبوون.

جا ئەگەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شتێكی لە یەكێ لەو عالمانە وەربگرتایە ئەوە بەبێ شك مێژوو تۆماری دەكردو لێی بێدەنگ نەدەبوو، چونكە ئەوە شتێكی وا كەمبایەخ‌و عادی نیە كە خەڵك چاوپۆشی لێ بكەن، بە تایبەتی ئەوانەی لە سەنگەردان بۆ دژایەتیكردنی ئیسلام، ئەو چەند وشەیەی مێژوو لە راهیبی شامەوە نەقلیان دەكا، یان لە وەرەقەی كوڕی نەوفەلەوە دەیانگێڕێتەوە، ئەوە مزگێنی‌یە بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ) یان داننانە بە پێغەمبەرێتی ئەو زاتە.

بە هەموو ئەوانە دەڵێین: كە پێیان وایە حەزرەتی موحەممەد ئادەمیزاد فێری قورئانی كردووە، دەڵێین: پێمان بڵێن: ناوی ئەو مامۆستایە چیە: كە دەرسی پێغەمبەری ئیسلامی داداوەو قورئانی فێركردووە؟

ئەوكاتە وەڵامێكی هیچ‌و پوچ‌و گێلانەمان دەدەنەوە، كە لە ناوهێنانی یەكێكی وەكوو (حداد رومی)دا رەنگ دەداتەوەو دەڵێن: ئەم كابرا (رۆمی)یە مامۆستای بووە، ئەو قورئانی فێر كردووە، دەی باشە كەی عەقڵ ئەوە دەگرێ زانستەكانی قورئان ئەو كەلامە موعجیزو بێ وێنەیە لە كابرایەكەوە دەرچووبێ مەككە بە زانای دانەنابێ‌و نەبیندرابێ لێ بڕا بێ بۆ خوێندن‌و لێكۆڵینەوەو فێركردن؟ بەڵكوو دانیشتوانی وایان ناسیبێ كابرایەكی ئاسنگەری ماندوو شەكەتی چەكوچ وەشاندن‌و خۆشكردنی ئاگری كورەی ئاسنگەریەكەی بووە، كابراییەكی كەودەنی دڵ بێ ئاگای زوبان عەجەمی لەهجەخوار ئەگەر شتێك فێر ببوایەو بیخوێندایەتەوە خوێندنەوەكەی بە نیسبەت عەرەبەكانەوە لە پرتەپرت‌و بۆڵەبۆڵێكی نامەفهوم دەچوو ﴿وَلَقَدْ

نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ – النحل/١٠٣﴾.

بێگومان عەرەبەکان ئەوکاتە لە هەموو کەس زیاتر سوربوون لەسەر ڕەتدانەوەی ئەم قورئانەو بەرەنگاربوونەوەی‌و قەتیسکردنی پەیامی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشوێنی خۆیداو سەرەنجام کوژانەوەی ئەو نوورە، چونکە ئەوان زۆر ڕۆچوبوون لە دژایەتی‌و دوژمنایەتیکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

وەلێ چەند کردیان‌و کرواندیان نەیانتوانی بەرەنگاری ببنەوەو بۆڕیان خواردو دەسەوسان بوون، هەموو ڕێگاکانی گرتیانە بەر لەبەردەمیان داخرابوون‌و هەموو هەوڵ‌و تەقەڵلاکانیان فاشیل بوون‌و ماندوبوونیان بێهودە بوو!!

دەی عەقڵ‌و هۆشی ئەم مولحیدانەی سەردەم لە چ ئاستێکداو بە چ عەقڵێك دوای تێپەڕبوونی پانزە سەدە بەسەر ئەو بۆڕخواردن‌و تێشکانەی بەسەر قوڕەیشییەکاندا هات تازە بەتازە لە زبڵدانی مێژوودا چنگەکرەیانە وەکوو مریشکی کوێر چینە دەکەن‌و لە هەوڵی ئەوەدان ڕێگایەك بدۆزنەوە لەو ڕێگایانە کە لەپێش ئەوان چەند جار تاقی کراوەتەوەو کەسی تێدا سەرکەوتوو نەبووو سەریان لەبەرد داوە!!

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە قورئانی پیرۆز هیچ سەرچاوەیەکی ئادەمیزادی نیە، هیچ ئادەمیزادێك قورئانی فێری حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکردووە، هیچ گومان لەوەدا نیە کە لەلایەن خودای حەکیم‌و حەمیدەوە نازڵ بووە، سەرچاوەکەی خودایەو بەس.

پەروەردە بوونی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو بیئەو کۆمەڵگایەکی نەخوێندەوارو نەزاندا، سیرەو ڕەوڕەوەی ژیانی لەناو نەتەوەکەی، بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە خودا ئەو زاتەی ئامادە

کردووه بۆ له ئەستۆ گرتنی پەیامی ئیسلامو ئەم قورئانەی بە وەحی بۆ ناردووه بۆ ئەوەی ببێتە هیدایەتو ڕێ نیشاندەر بۆ نەتەوەکەی ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ، صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الأُمُورُ – الشورى/٥٢ – ٥٣﴾.

مامۆستا موحەممەد عەبدە لە (رسالة التوحيد)دا دەڵێ: یاسای کۆمەڵایەتیو دابونەریتی مرۆڤایەتی مەعروفو باو، وامان پێ دەڵێ: کە هەتیوێکی هەژاری نەخوێندەواری وەکوو حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبێ وا رابێ خو بەو شتانەوە بگرێ: کە لەسەردەمی منداڵیەوە تا تەمەنی کامڵبوونی دەیانبینێ، ئەوشتانەی دەیانبیسێ لەوانەی تێکەڵاویانە کاریگەری خۆیان لەسەر عەقڵو هۆشی جێ دێڵن، بەتایبەتی ئەگەر بیستنو دیتنەکەی لەوکەسانە بێ کە خزمو کەسوکارو هۆزو بنەماڵەنی، خوێندەوار نەبێو کتێبێك بخوێنێتەوە، مامۆستایەکی نەبێ لەسەر هەڵە ئاگاداری بکاتەوەو لەسەر ئیشی باش ئافەرینی بکا، پشتیوانێکی وای نەبێ: کە ویستی کارێك بکا پشتی بگرێ.

جا ئەگەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوشێوە ڕەوتی ژیانی بڕۆیشتایە، دەبوایە لەسەر بیروباوەڕی ئەوان پەروەردە ببوایەو دابونەریتی ئەوانی پەیڕەو بکردایە، تا دەگەیشتە تەمەنەکانی کامڵیو پیاوەتی، ئەوسا بۆ فکرو تێبینی مەجال دەڕەخساو پێچەوانەی دابو عورفیان بجوڵایەوە، ئەگەر بەڵگەی هەبوایە لەسەر گومڕاییو نەزانییان، وەکوو چەند کەسێکی کەمیان وایان کرد لە ڕۆژگاری ئەودا بۆ نموونە ئومەییەی کوڕی سەلتو زەیدی کوڕی نوفەیل ، وەڵێ ئەم ڕێوڕەسمانە، ئەم مەزەندە کردنانە وا بەڕێوە نەچوو، ڕوداوەکانی ژیانی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا تەمەنی گەیشتە چل ساڵی بەو شێوە ئاسایی‌و یاسایی‌یە نەهاتنە دی، بەڵکوو هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە زۆر رقی لە بتپەرستی دەبۆوە، چونکە زوو عەقیدەی پاك چووە ناخیەوە، وەکوو چۆن رەوشتی جوان‌و بەرزو پەسەند تێیدا کۆبوونەوەو بوون بە بەشێك لە پێکهاتەی زاتی پاکی، ئایەتی ﴿وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى - الضحى/٧﴾ ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێك لەرۆژان لەسەر بیروباوەڕی بتپەرستی بووبێ‌و هیدایەت درابێ بۆ یەکتاپەرستی، لەسەر ڕێبازی خواروخێچ بووبێ پاشان بوبێتە خاوەنی (خولوقی عەظیم).

حاشا سەدجار حاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابووبێ!! کەسێك بڕوای وابێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرەتا بتپەرستی کردووە بوختانێکی گەورەی هەڵبەستووە، دەبێ لێی پەشیمان بێتەوەو (أستغفرالله) بکا، کەوابێ ئەو (ضلالة)ی ئایەتەکە ئاماژەی بۆ دەکا، بریتییە لە حیرەو سەرسامی بوونێك: کە بیر دەکەنەوە چۆن ڕێبازی ڕزگاربوون بدۆزنەوە بۆ خەڵکە سەرلێ شێواوەکە، دەکەونە حیرەتەوە چۆن ڕێگایەك رەچاو بکەن بۆ هیدایەتدان‌و ڕزگارکردنی ئەوانەی لەسەر کەناری فەوتان‌و تێداچوونن، چی بکەن ئەو گومڕایانە لە لێواری فەوتان بگێڕنە دواوە، بێگومان پەروەردگار پێغەمبەری خۆی هیدایەت دا.

## ڕاوو بۆچوونی زانا کەلامیەکان

بێگومان زانا کەلامیەکان بەبێ هودە زۆر قوڵبونەوە لەبواری کەلامی خودادا، چاویان لە فەیلەسوفەکان کردووەو زۆر مەبەستیان نەپێکاوەو ڕێبازی راستیان لێ چەواشە بووە، موسوڵمانانیان خستۆتە زەلکاوو تونی بابای

وەهاوە، ڕێگای ڕاستیان لێ گومبووە، ئەوەتا کەلامی خودایان دابەشکردووە بۆ دوو بەشی سەرەکی:

١- کەلامێك کە قەدیمەو پەیوەستە بەزاتی خوداوە، نە حەرفە نە دەنگە، نە لێکدراوە، نە زمانێکی تایبەتیە ناویان لێ ناوە کەلامی نەفسی.

٢- کەلامێك مەلفوظ بێ، واتە بە زمان بگوترێ: کە نازڵ کراوە بۆ سەر پێغەمبەران، کە چوار کتێبە ئاسمانییەکە (زەبور، تەورات، ئینجیل، قورئان) لەو جۆرە کەلامەن، ئەمجار زانا کەلامیەکان ڕۆچوونە ناو دەمەدەمێو خیلافاتێکی زۆرو بێهودەی کەلامی‌یەوە بەجۆرێك لە زیان زیاتر هیچ سودێکی ئایینی نیە، خۆیان خستۆتە ناو جەنگەڵستانی وەهاوە: کە سەرلێ دەرکردنی زۆر زەحمەتە، دەڵێن: لەسەر ئەم مانای دووەمە ئایا قورئان مەخلوقە یان نا؟! ئەوەیان پەسەند کردووە: کە قوورئان مەخلوق بێ، بەمەش لە ڕێڕەوی سەلەفی صاڵح لایانداوەو ڕێبازێکیان گرتووە نە قورئان‌و نە سوننەت ئاماژەیان بۆ نەکردووەو لەهیچ کامێکیشیاندا دەقێکمان دەست ناکەوێ ئەو بیروباوەڕە پەسەند بکا.

کەوتوونە شیکردنەوەی صیفاتەکانی پەروەردگار بە شیکردنەوەیەکی فەلسەفیانەی وا کە سەردەکێشێ بۆ گومان خستنە سەر عەقیدەی یەکتاپەرستی!! مەزهەبی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لەبواری کەلامی خودا بە تایبەتی‌و ناوو صیفاتەکانیدا بەگشتی ئەوەیە: کە خودا بۆخۆی چەسپاندونی‌و پاڵ خۆی داون، هەر ناوو صیفەتێك خودا بۆخۆی چەسپاندبیەتی، یان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆی بەڕەوا دانابێ، ئێمەیش بە راشکاوی پاڵ پەروەردگاری دەدەین‌و قوڵبوونەوەی فەلسەفیانەی تێدا ناکەین، هەر ئەوەندە لەسەر ئێمە پێویستە ئیمانمان هەبێ: کە قورئان کەلامی خودایە، کەلامیش صیفەتێکە لە صیفەتەکانی پەروەردگار ﴿وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا – النساء/١٦٤﴾.

قورئـانی پـیرۆز: کـه بـه نیگـا نـازڵ بـووه بۆسـەر پێغەمبـەر (درروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـەلامی خودایـەو (غـیر مخلـوق)ە، دروسـتکراو نیـە، پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ – التوبة/٦﴾ چەسـسپاندنی ئـەم صیفەتەو صیفەتەکانی تـری لـەو شتانەن: کە خودا بۆخـۆی بـە صـیفەتی خـۆی دانـاونو پـاڵ خـۆی داون، یـان پێغەمبـەر (درروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـه صـیفەتی ئـەوی دانـاونو ڕایگەیاندوون، هەرچەندە هەنـدێ لـەو صیفەتانەی پـاڵ خـودا دەدرێـن، پـاڵ ئـادەمیزادیش دەدرێـن، بـەڵام ئەمـە لەگـەڵ کـەماڵی تـەنزیهی خـودادا هـیچ دژایەتیەکی نیه، چونکه پەروەردگار نه له زاتو نه لەصیفاتدا وینـەی نیـە، ئەو نەقصو کەموکوڕیەی له صیفاتی بەندەکانیدا هەیه، له صیفاتی خـودادا نیـە، پاكو مونـەزەهو بـەرزو پـیرۆزه لـه زاتو صـیفاتیدا، چونکه هاوبەشـی لەناودا، داخوازی ئەوە نیه هاوشان بێ له (مسمى)و ماناو مەدلولدا.

(خالقو مخلوق) بەدیهێنەرو بەدیهێنراو زۆر لێك دوورن لـه زاتو لـه صیفاتو له کرداردا، هەرناوەکەیان لێك دەچێ، ناوەڕۆکیان ئاسمانو ڕیسمانە، زاتی پەروەردگار له کامڵ کامڵ تره بێ نەقصو کەموکوڕییە، صیفاتەکانی تا بڵێی بەرزو پیرۆزن، کردارەکانی هەموو تەواوو له ژوور تەواوەوەن.

جا ئەگـەر کـەلام صـیفەتی کـەماڵ بـێ بـۆ مـەخلوق، چۆن دروسـتو ڕەوایه له خالیقو بەدیهێنەری دارنین؟؟ دەبێ ئێمه دەربارەی زاتو صیفاتو ئەفعالی خـودا بیروباوەڕمـان وابـێ: کـه هـاوەڵانی پێغەمبـەر (درروودی خـودای لەسەر بێ) و زانایـانی تـابیعینو مامۆسـتایانی فـەرمووده‌و فیقهـی ئیـسلامی لەسـەردەمه زێڕینـەکانی مێـژووی ئیـسلامدا پـەیڕەوییان کـردووەو پێیـەوه پابەنـد بوون، زانایانی موسوڵمانی ئـەو چـەرخانەی کـه: پێغەمبـەر (درروودی خـودای لەسـەر بـێ) شـایەتی بـۆ داون کـه چـەرخی خێـرو ئیـسلام نـەوازن باوەڕیان چۆن بووه ئێمەیش ئەو بیروباوەڕه له خۆماندا بەرجەسـته بکـەین،

دەبێ شوێن زانایانی موسوڵمانی پێش پەیدابوونی بیدعەو فەلسەفەی زانا کەلامیەکان بکەوین، هەرچی لە قورئاندا دەربارەی زاتو صیفاتی خودا، یان بەڕاستیو دروستی لە پێغەمبەرەوە بە ئێمە گەیشتبێ چ بە نەفی چ بە ئیثبات، بەبێ تەعطیلو تەشبیهو تەمثیلو تەئویل، بڕوامان پێیەتی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی تێدا ناکەین، ئێمە بۆمان نیە (هەر دروست نیە!) راوبۆچوونی خۆمان بکەینە حاکمو بڕیاردەر دەربارەی حەقیقەتی زاتی خوداو چۆنیەتی صیفاتەکانی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ – الشورى/١١﴾.

## مەککیو مەدەنی (ئەو ئایەتو سورەتانەی لە مەککە نازڵ بوون، یان لە مەدینە)

گەلو نەتەوەکان، هەریەکە لە عاست خۆیەوە گرنگی دەدا بە پاراستنی کەلەپوری فیکریو بنچینەو راگرەکانی ژیارو حەضارەتی، گەلو نەتەوەی موسوڵمانیش، ژیرانە لێبڕاوە بۆ پاراستنی کەلەپورو بۆماوەی ریسالەو پەیامی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو پەیامەی ڕێزی دا بە هەموو مرۆڤایەتیو ناسنامەی مرۆڤی خۆی بۆ گێڕایەوە، چونکە لە ڕاستیدا ئایینی ئیسلام پەیامێکی زانستی، یان بەرنامەیەکی چاکسازی وا نیە کە قبوڵ کردنی لەلایەن عەقڵەوە، یان بەرەو پیرهاتنی خەڵك بۆی پانتایی گرنگی پێدانی سنووردار بکا، بەڵکوو ئیسلام زیاد لەوەی بزێوو تێشووی فیکری هەیەو بنەمای چاکسازی جۆراوجۆری تێدا بەرجەستە بوون، ئایینێکە تێکەڵاوی عەقڵو هۆشی ئادەمیزادەکان بووەو کەناڵەکانی داپۆشیوەو بەناو دەمارە وردەکانی دڵدا بڵاو بۆتەوە، بۆیە دەبینین هاوەڵە ناودارو هەڵبژاردەکانی پێغەمبەرو (دروودی خودای لەسەر بێ) گەورەپیاوانی تابیعینو زانا موسوڵمانەکانی دوا ئەوان ئایەت ئایەت کاتی

نازڵبوونی قورئانیان کۆنترۆڵ کردووە، کاتی نازڵبوونو شوێنی نازڵبوونیان زۆر بە وردیو زانستانە دەستنیشان کردووە.

ئەم کۆنترۆڵ کردنە زانست ئامێزە، کۆڵەکەو پایەیەکی پتەوە لە مێژووی تەشریعدا: کە لێکۆڵەر پشتی پێ ببەستێ بۆ زانینی شێوازی دەعوەی ئیسلامیو جۆرەکانی خیطاب کە ئاڕاستەی ئادەمیزاد کراوە، چۆنیەتی (تدرج)و بەرەبەرە پیاهەڵکشان بە ئەحکامو تەکالیفەکاندا ئەوەتا لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە دەفەرموێ: سوێندم بەو خودایەی جگە لە ئەو خودای تر نین، هەر سورەتێك لە قورئان نازڵ بووبێ، من دەزانم لە کوێ نازڵ بووە، هەر ئایەتێك نازڵ بووبێ دەزانم دەربارەی چی نازڵ بووە، وەڵلاهی ئەگەر بزانم یەکێك لەمن زاناترە بە قورئانو بەسواری حوشتر بتوانم بیگەمێ، سواری حوشتر دەبوومو دەچوم بۆ خزمەتی[1].

بانگەوازیکردن بۆلای خودا پێویستی بە نەهجێکی تایبەتی هەیە لەشێوازی بانگەوازیکردندا لە بەرامبەر هەموو گەندەڵیو فەسادییەکدا لەبواری عەقیدەدا بێ، یان تەشریعو ڕەوشتو سلوكو پەرێز، ئەرکەکانی دەعوەو بانگەوازی فەرز ناکرێن مەگەر دوای زەمینەسازیو دروستکردنی کەسانی گونجاو بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەو پەروەردە کردنی چینو توێژێکی وا بتوانن ئەو ئەرکە پیرۆزە بخەنە ئەستۆی خۆیانو جێبەجێی بکەن.

بنەما تەشریعییەکانیو یاسا کۆمەڵایەتیەکانی ڕێك ناخرێنو ناکرێنە ئەرك‌و واجب هەتا دڵەکان پاك نەکرێنەوە ئامانجەکەی دەستنیشان نەکرێ، بۆ ئەوەی ڕەوڕەوەی ژیان بەگوێرەی هیدایەتو ڕێنمایی پەروەردگار وەگەڕ بکەوێ.

---

[1] أخرجه البخاري (٥٠٠٢) ومسلم (٦٣٣٣).

ئـەوەی قورئـان دەخوێنـیّ‌و تێـی دەفکـریّ، بـۆی دەردەکـەویّ هەنـدیّ تایبەتمەندی لە ئایەتە مەککییەکاندا هەیە لە ئایەتە مەدینەییەکاندا دەست ناکەویّ، هەندیّ کاریگەری واقیع‌و مانا هەیە تایبەتە بـە ئایـاتی مـەککی‌و لـە ئایەتی مەدینەییدا نین، هەرچەندە ئایەتە مەدینەییەکان لەبواری ئـەحکام‌و تەشـریعدا لەسـەر بنـەمای ئایەتـە مەککییـەکان بنیـات نـراون، جـا چـونکە خەڵکەکـە لەسـەردەمی نـەفامیدا چـاوی دڵیـان کـوێرو گوێـچکەی عـەقڵیان داخـراو بـوو، بتیـان دەپەرسـت، هاوەڵیـان بـۆ خـودا دادەنـا، ئینکـاری نیگـاو وەحییان دەکرد، بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نەبوو، ئەوەبوو دەیـانگوت: ﴿أَئِـذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ - الصافات/١٦﴾ یان ﴿وَقَـالُوا مَـا هِـيَ إِلَّـا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ - الجاثية/٢٤﴾.

لـە ڕاسـتیدا قوڕیـشییەکان لـە دوژمنایەتیـدا زۆر سـەر ڕەق‌و ڕیخۆڵـە بـەکێش بـوون، پیـاوی دەمــەدەمیّ‌و ڕەوانبێـژی‌و بـەیان بـوون، جـا کـە قوڕەیـشییەکان ئەمـە حـاڵ‌و وەزعیـان بـوو، ئـەو ئایـات‌و سـورەتانەی لـەوێدا نازڵبوون هەموویان گورزی بەهێزی بۆڕدەربوون، سەرودڵی دەکوتان‌و بڕستی لیّ دەبڕین، نیگای ئەو سـەردەمە هـەمووی زەجـرو پروێنـەر بـوون، هـەمووی بەڵگەی تیشکداری ترسێنەر بوون، هەمووی بەڵگەی بـۆڕدەرو بنبڕکـەر بـوون بیروبــاوەڕی بتپەرســتانی لێــك هەڵدەوەشــاندو بانگــەوازی دەکــردن بــۆ یەکتاپەسـتی، بـۆ تـاك‌و تـەنهایی خـودا لـە ئولوهیـەت‌و ربوبیەتـدا، پـەردەی لەسـەر گەنـدەڵی بیروباوەڕیـان هەڵدەدایـەوە، گاڵتـەی بـە عـەقڵ‌و ئاوەزیـان دەکـردو بەڵگــەی پێغەمبەرایــەتی حــەزرەتی موحەممــەدی دەچەســپاندو نمونـەی جۆراوجۆری بـۆ ژیـانی قیامـەت رادەنوانـدن، بەشـێوەی جۆراوجـۆر وەصفی بەهەشت‌و دۆزەخی دەکـردو بـە تەحـەداوە داوای لیّ دەکـردن بتـوانن نمونەی قورئان بخەنەڕوو.

سەرگورشـتـەو بەسـەرهاتی گەلـە بەدرۆخـەرەوەكانی ڕابـردوی بـۆ دەگێڕانـەوە، سـەرەنجامو ئاكـامی سەرپێـچیكارانی بـەگوێدا دەدان بـۆ ئـەوەی پێی پەند ئامێز بنو پەند وەربگرنو بەخۆیاندا بچنەوە.

تۆ: كە لـە ئایـەتو سـورەتە مەككییـەكانی رادەمێنـی وشـەی بـەهێزو كوتـەك ئاسـایان دەخوێنیـەوە، دەبینـی چ كـەلامێكیان بەگوێـدا دەدرێ، پیتەكانی پریشكی هەڕەشەو بڵێسەی ئاگری عـەزاب دەهاوێـژن، بڕوانـە چۆن وشەی (كلا) كە زەجرو رەدع دەگەیەنێ، وشـەی (الـصاخة، القارعـة، الغاشـية، الواقعـة)و وێنـەكانیان، هـەموویان وشـەی ئـاگراوی سـوتێنەرن، خڕكـەرو ترسێنەرن، جەستە دەخەنە شەقەتۆڵەو دڵ دەلەرزێنن.

هـەروا ئـەو وشـە هیجائییانـەی لەسـەرەتای سـورەتەكانداو ئایـاتی تەحەداو بێ منەتی لێیان: كە لەناو سورەتەكاندا هێناونی، سەرەنجامی گەلـە پێشینەكانو راستكردنەوەی بەڵگەو دەلیلی سـەركوتكەرو بەڵگـەی كـەونیو بەڵگەی عەقڵی، هـەموو ئەمانـە دەبیـنین تایبەتمەنـدی ئایـاتی مـەككینو بـە زەقی ئەو دیاردانەیان لەخۆ گرتووە.

جا كاتێك پەیامی ئیسلام بڵاوبـۆوە، كۆمـەڵی خـاوەن بـاوەڕ بـەخوداو بـە فریـشتەو ڕۆژی دوایـیو نامـەی ئاسمـانیو پێغەمبـەرانو قـەزاو قـەدەر پێكهـاتنو كەوتنـە ژێـر كاریگـەری ئەزیـەتی دوژمنانیـان، لەسـەر بیروبـاوەڕ، جۆرەها ئەشكەنجەو ئازاریان دان كۆچیان كـردو دەسـتیان لـە مـاڵو سـامانو خێزان هـەڵگرتو بـە تـەما نیعمەتـەكانی قیامـەت ژیـانی خۆیـان خـستە نـاو چورتمو خەتەرەوەو سەرەنجام سەركەوتنیان بەدەست هێنـاو بوونـە خـاوەن كیـانو دارای دەسـەڵات، ئـەمجار دەبیـنین ئایـاتی مـەدەنی نەفـەس درێـژ دادەبەزن، ئەحكامی ئیـسلامو سـنورەكانی دیـاری دەكـەن، بانگـەوازی جیهـادو خۆبەختكردن لە ڕێگای خودادا دوبارەو سێبارە دەكەنـەوە، ئوسـوڵی تەشـریع شـی دەكەنـەوە، یاسـای كۆمەڵایـەتی دادەنـێن، پەیوەندییـەكانی خێـزانو

پەیوەنــدی نێــوان تاكــەكانی كۆمــەڵو پەیوەندییــەكانی نێــوان دەوڵــەتانو میللــەتان سنوردار دەكــەن، هــەروەكوو چۆن پــەردە لەســەر هەڵس‌وكــەوتو بیروبــاوەڕی موونافیقــەكان هەڵدەدەنــەوەو نــاخو دەرونیــان دەردەخــەن، بــەڵێ قورئانی مەدینەیی موجادەلەو دەمەدەمێ لەگەڵ ئەهلی كیتاب دەكاو بۆڕیان دەداو دەمیان دەبەستێ، ئەمەش طابیعێكی گشتی قورئــانی مەدەنییــەو لــەم تەوەرانەدا دەسوڕێتەوە.

## گرنگیدانی زانایان بە ئایاتی مەككیو مەدەنی نمونەو سودی ئەو لێك جیاكردنەوانە

بێگومان زانایانی ئیسلام گرنگی زۆریان داوە بە لێكۆڵینەوە لە بــواری ئایــاتی مــەككیو مــەدەنیدا، زۆریــان هــەوڵ داوە لێكیــان جیــا بكەنــەوەو تایبەتمەندییــەكانیان دەســت نیــشان بكــەن، بــە وردی قورئانیــان دیراســە كــردووە، ئایــەت ئایــەتو ســورەت ســورەت بــە گــوێرەی زەمــەنی نــازڵبوونی ڕیزبەندییان بۆ كردووە، لەم ڕیزبەندیكردنەیاندا زەمانو مەكانو خیطابیان بەرچاوگرتووە، هەر بە دەستنیشان كردنی كاتی نازڵبوونو شــوێنی نــازڵبوون وازیــــان نــــەهێناوە بــــەڵكوو هــــاتوون دەستنیــــشانی (مخاطــــب) خیطــــاب ئاراستەكراویشیان كردووە، ئەمەش خــۆی لــە خۆیــدا ســنوردارکردنێكی وردو زانست ئامێزە، وێنــەی تــەحقیقی زانــستی زۆر ورد دەبەخــشێتە توێــژەرەوەی خاوەن ویژدان لەبواری دیاریكردنی ئایاتو سورەتی مەككیو مــەدەنیدا نــەك هەر لەم بوارەدا بەڵكوو لە هەموو بوارەكانی تــری (علــوم القــرآن)دا، زانایــانی ئیــسلام تــا ئەوپــەڕی ســنوور وردەكارییــان كــردووە زانــستانە باســەكانیان شیكردوونەوە.

لــە ڕاســتیدا ئەمــە ئــەركێكی پــیرۆزو گەورەیــە: كــە توێــژەرەوە بەدواداچوون بكا بۆ شــوێنی نــازڵبوونی قورئــان، لەهــەموو قۆناغــەكانیدا، بــۆ

نموونه ئایەتێك بێنێ بیخاتە بەر باس‌و لێكۆڵینەوە، كاتی نازڵبوونی دیاری بكا، ئەمجار بێنێ چی قاعیدەو قیاس‌و بەیەكگرتن‌و بەرامبەریكردن هەیە بۆ شێوازی خیطاب لەو ئایەتەدا بیخاتە ڕوو، ئایا ئەم ئایەتە لەشێوەی ئایەتی مەككی‌یە یان لەشێوەی ئایەتی مەدەنی‌یە؟ لەمەشدا پشت بە مەوزوعی سورەتەكە، یان ئایەتەكە ببەستێ! هەوڵی ڕونكردنەوەی ئەوە بدا ئاخۆ مەوزوعی ئەم سورەتە، یان ئەم ئایەتە لەو باسانەیە: كە لە تەوەرەو جەمسەری ئەو باسانەیە بانگەوازی ئیسلامی لە مەككەدا تێیدا دەسوڕایەوە؟ یان لە تەوەرەی ئەو باسانەدایە كە بانگەوازی ئیسلامی لە مەدینە لەسەری دامەزرا بوو؟.

جا ئەگەر باحیث‌و توێژەرەوە بەهۆی هەبوونی بەڵگەی جۆراوجۆر بۆ هەردوو تەوەرەكە دیاریكردنەكەی لێ چەواشە بوو، دەتوانێ ئیجتیهاد بكاو تەرجیح بدا، بڕێكیان بە وێچووی ئەو ئایەتانە دابنێ: كە لە مەككە نازڵ بوون، بڕێكیشیان بە وێچووی ئایەتی مەدەنی!

ئەگەر كۆمەڵە ئایەتێك لە شوێنێك نازڵ بوبوون‌و یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوای نازڵبوونەكەیان ئایەتەكانی لە شوێنێكی تر بە خەڵكی ڕاگەیاندبن، زانایانی علومی قورئان ئەمەشیان دیاریكردووەو باسی سەربەخۆیان بۆ تەرخان كردووەو فەرموویانە (ما حمل من مكة إلى المدينة) ئەو ئایەتانەی لە مەككە نازڵبوون‌و خێرا براون بۆ مەدینە لەوێ ڕاگەیاندراون، بە پێچەوانەشەوە (وما حمل من المدينة إلى مكة).

(أبو القاسم الحسن)ی كوڕی موحەممەدی حەبیبی (النيسابوري) لە كتێبی (التنبيه على فضل علوم القرآن)دا دەڵێ: ڕێزدارترین‌و گرنگترین باسەكانی زانستی قورئان، زانینی نازڵبوونی قورئان‌و شوێنی نازڵبوونیەتی، هەروا ڕیزبەندكردنی ئەوەی لە مەككە نازڵ بووەو ئەوەی لە مەدینە هاتۆتە

خوارێ، ئەوەی لە مەککە نازڵ بووەو حوکمەکەی مەدەنیـیە، ئەوەی لە مەدینە نازڵ بووەو حوکمەکەی مەککییە، هەروا ئەو ئایەتو سورەتانەی لە مەککە نازڵ بوون دەربارەی کۆمەڵگای مەدینە، ئەو بەشە قورئانەی لە مەدینە نازڵ بووە دەربارەی کۆمەڵگای مەککە، ئەو ئایەتانەی مەدینەیین‌و نازڵبوونەکەیان دەشوبهێتە ئایاتی مەککی، ئەو ئایاتو سورەتانەی مەککەیین‌و نازڵبوونەکەیان دەشوبهێتە ئایاتی مەدینەیی، ئەو ئایاتو سورەتانەی لە (الجحفة) نازڵ بوون، ئەوانەی لە (بيت المقدس) هاتونە خوارێ، ئەو ئایەتانەی لە (الطائف) نازڵ بوون، ئەوانەی لە (الحديبية) هاتوونە خوار، ئەوەی بە شەو نازڵ بووە، ئەوەی بە ڕۆژ نازڵ بووە، ئەو ئایەتو سورەتانەی نازڵ بوون بەشێوەی (مشيع) واتە: کۆمەڵێك لە فریشتە لەگەڵ حەزرەتی جوبرائیلدا دایان بەزاندوون بە ذیکرو تەسبیحات کردن[1] ئەوانەی بە تەنیا حەزرەتی جوبرائیل هێناونیە خوار، ئەو ئایەتانەی مەدەنین‌و لەناو سورەتی (مەککی)دان، ئەو ئایەتانەی مەککین‌و لەناو سورەتی مەدەنیدان، ئەو بەشە قورئانەی لە مەککە نازڵ بووەو بردراوە لە مەککە ڕاگەیەندراوە، ئەوەی لە مەدینە نازڵ بووەو بردراوە لە لەسەر خاکی حەبەشە ڕاگەیەندراوە، ئەوەی بە (مجمل)ی نازڵ بووە، ئەوەی نازڵ بووە بە (مفسر) واتە: ئایەتی موجمەل‌و شتی وای تەفسیرو بەیان کردووە، ئەو ئایەتو سورەتانەی زانایان تێیاندا کەوتوونە ڕاجیاییـیەوە؛ هەندێ فەرموویانە مەدەنین‌و هەندێکیان وتوویانە مەککین!

ئەمە بیستو پێنج جۆر وەجهی قورئانن، کەسێك نەیانزانێ‌و لێکیان جودا نەکاتەوە بۆی ڕەوا نیە قسە لە قورئان بکاو مانای لێ بداتەوە.[2]

---

[1] وەکوو ئەو ڕیوایەتانەی دەربارەی شێوە نازڵبوونی هەندێ سورەتو ئایەت هاتوون، بۆ نموونە سورەتی ئەنعام‌و سورەتی فاتیحەو ئایەتولکورسی.

[2] بڕوانە کتێبی (الإتقان في علوم القرآن) ص/٣١.

زانایانی بواری (علوم القرآن) زۆر حەریص بوون لەسەر ئەوەی بە وردەکاری قسە لە زانستەکانی قورئاندا بکەن، هاتوون سورەتەکانیان ڕیزبەند کردوون بەپێی نازڵبوونەکەیان، سورەت دوای سورەت دیارییان کردووە، فەرموویانە سورەتی فلان لەدوای فلان سورەت نازڵ بووە، ئەمجار لە ڕوانگەی سوربوونیان لەسەر وردەکاریو توێژینەوە تێیاندا جوداوازییان خستۆتە نێوان ئەوەی بە شەو نازڵ بووەو ئەوەی بە ڕۆژ نازڵ بووە، ئەوەی لە وەرزی هاویندا هاتۆتە خوارو ئەوەی لە وەرزی زستاندا دابەزیوە، ئەوەی نازڵ بووە لە حاڵێکدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موقیم بووە، ئەوەی لە سەفەردا نازڵ بووە.

**گرنگترین جۆرەکانی قورئان کە لەم بوارەدا زانایان توێژینەوەیان تێدا کردووەو خستوویاننە بەرباسو لێکۆڵینەوە ئەمانەن:**

١- ئەوەی لە مەککە نازڵ بووە.

٢- ئەوەی لە مەدینە نازڵ بووە.

٣- ئەوەی ڕای جیاوازی تێدایە ئاخۆ مەککیە، یان مەدەنییە.

٤- ئایەتە مەککییەکان لە سورەتە مەدەنییەکاندا.

٥- ئایەتە مەدینەییەکان لە سورەتە مەککییەکاندا.

٦- ئەوەی لە مەککە نازڵ بووەو حوکمی مەدینەیی‌یە.

٧- ئەوەی لە مەدینە نازڵ بووەو حوکمەکەی مەککییە.

٨- ئەوەی لە مەدەنییەو نازڵبوونەکەی لە مەککی دەچێ.

٩- ئەوەی مەککییەو نازڵبوونەکەی لە مەدەنی دەچێ.

١٠- ئەوەی لە مەککە نازڵ بووەو براوە بۆ مەدینە ڕاگەیاندراوە.

١١- ئەوەی لە مەدینە نازڵ بووە براوە بۆ مەککە ڕاگەیاندراوە.

١٢- ئەوەی بە شەو، یان بە ڕۆژ نازڵ بووە.

١٣- ئەوەی بە هاوین، یان بە زستان نازڵ بووە.

١٤- ئەوەی لە حەضەر (لەماڵەوە) نازڵ بووەو ئەوەی لە سەفەردا نازڵ بووە.

ئەم سەرەباسانە جۆرە سەرەکییەکانی مەککیو مەدەنین، بۆیە ئەم زانستە بە زانستی مەککیو مەدەنی ناوزەد کراوە.

١- ئەوەی زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە دەربارەی سورەتی مەککیو مەدەنی ئەوەیە: سورەتە مەدەنییەکان بیستن: ﴿١- البقرة، ٢- آل عمران، ٣- النساء، ٤- المائدة، ٥- الأنفال، ٦- التوبة، ٧- النور، ٨- الأحزاب، ٩- محمد، ١٠- الفتح، ١١- الحجرات، ١٢- الحديد، ١٣- المجادلة، ١٤- الحشر، ١٥- الممتحنة، ١٦- الجمعة، ١٧- المنافقون، ١٨- الطلاق، ١٩- التحريم، ٢٠- النصر﴾.

٢- ئەو سورەتانەی ڕاجیاییان تێدایە ئاخۆ مەککین، یان مەدەنین دوانزە سورەتن ﴿١- الفاتحة، ٢- الرعد، ٣- الرحمن، ٤- الصف، ٥- التغابن، ٦- المطففين، ٧- القدر، ٨- البينة، ٩- الزلزلة، ١٠- الإخلاص، ١١- الفلق، ١٢- الناس﴾.

٣- جگە لەم سورەتانە ئەوانیتر کە ژمارەیان هەشتاو دوو سورەتە هەموویان مەککین، کەوابێ کۆی سورەتەکانی قورئان سەدو چواردە سورەتن.

٤- ئەو ئایەتانەی مەککینو لە سورەتی مەدەنیدان لەم بەشانەی قورئاندا مەبەست ئەوە نیە وەصفی سورەتەکە بکرێ بەوەی مەککییە، یان مەدینەییە، چونکە وا دەبێ سورەتەکە مەککییەو هەندێ ئایەتی مەدەنین، یان سورەتەکە مەدینەییەو هەندی ئایەتی مەککی تێدا هەن، وەلێ وەصفێکە بەگوێرەی زۆرینە بۆی دیاری کراوە، واتە: کە زۆربەی ئایەتەکانی مەککی بوون پێی دەگوترێ: مەککی، ئەگەر زۆرینەیان مەدینەیی بوون پێی دەگوترێ: مەدەنی، بۆیە دەگوترێ سورەتی فلان مەککییە جگە لە فلان

ئایـەتو فـلأن ئایـەت، ئەوانـە مەدینـەیین، فـلأن سـورەت مەدینەییـەو جگـە لەفلأن ئایەت ئەوە مەککیە، وەکوو لە موصحەفەکاندا ئاماژەی پێ کراوە.

لە نموونـەی ئایـەتی مـەککی کـە لـە سـورەتی مـەدەنیدا نووسـرا بـن، سورەتی (الأنفال)ە، زانایان فەرموویانە سورەتی (الأنفال) مەدەنییـە جگـە لـە ئایەتی ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُـوكَ أَوْ يُخْرِجُـوكَ وَيَمْكُـرُونَ وَيَمْكُرُ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ - الأنفال/٣٠﴾.

ئیمـامی موقاتیـل (رەزای خـودای لێ بـێ) دەربـارەی ئـەم ئایەتـە دەفـەرموێ: لـە مەککـە نـازڵ بـووە، ظـاهیری مانـای ئایەتەکـەش خـۆی ئـەوە دەگەیەنێ چونکە ئەوەی لەخۆ گرتووە: کە موشریکەکان لە (دارالندوة) پێش کۆچـکردنی پێغەمبـەر (درەوودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ مەدینـە پیلانـی لەناوبردنی پێغەمبەریان داڕشتووە.

هەندێ لە زانایان فەرموویانە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللّـهُ وَمَـنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ - الأنفال/٦٤﴾یش مەککییە، ئاماژە بە ڕیوایـەتی (البـزار) لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لە بـاوکی بـێ) ڕیوایـەتی کـردووە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە کاتێك نـازڵ بـوو عومـەری کوڕی خـەتتاب موسـوڵمان بوو.

٥ ئایـاتی مـەدەنی لـە سـورەتی مـەککیدا، نموونـەی ئەمـە سـورەتی (الأنعام)ە، ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) دەفەرموێ: بە یەك وەجبە لـە مەککـە نـازڵ بـووە هـەمووی مەککییـە جگـە لـە سـێ ئایـەتی نـەبێ ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْـسَاناً وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلا تَقْرَبُوا الْفَـوَاحِشَ مَـا ظَهَـرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِـهِ لَعَلَّكُـمْ تَعْقِلُونَ ، وَلا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُوا الْكَيْـلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لا نُكَلِّفُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَـوْ كَـانَ ذَا قُرْبَـى

وَبِعَهْدِ اللّٰهِ أَوْفُوا ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ، وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – الأنعام/١٥١ – ١٥٢ – ١٥٣﴾.

هەروا سورەتی (الحج) هەمووی مەککییە جگە لە سێ ئایەتی نەبێ لە مەدینە نازڵ بوون کە بریتین لە ئایەتی: ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ، يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ ، وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ – الحج/١٩ – ٢٠ – ٢١﴾.

٦- ئەو ئایەتانەی لە مەککە نازڵ بوونو حوکمەکەیان مەدەنییە نموونەی ئەمە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ – الحجرات/١٣﴾ ئەم ئایەتە لە مەککە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە نازڵ بووە، ئەم ئایەتە بە مەدینەیی حیساب دەکرێ چونکە دوای کۆچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە نازڵ بووە، خیطابەکەشی گشتییە، ئەم جۆرە ئایەتانە زانایان نەپێیان دەڵێن مەککی، نەپێیان دەڵێن مەدەنی، بەڵکوو پێیان دەڵێن (ئەوەی لە مەککە نازڵ بووەو حوکمەکەی مەدەنییە) (مانزل بمكة وحكمه مدني).

٧- ئەوەی لە مەدینە نازڵ بووە حوکمەکەی مەککییە، نمونەی ئەمە دەهێننەوە بە سورەتی (الممتحنة) ئەم سورەتە لە مەدینە نازڵ بووە، کەوابێ بە ئیعتیباری شوێن مەدینەییە، وەڵێ خیطابی ناو سورەتەکە ئاڕاستەی موشریکەکانی مەککە کراوە، هەروا سورەتی (براءة) لە مەدینە نازڵ بووە وەڵێ خیطابی ناوی ئاڕاستەی موشریکەکانی مەککە کراوە.

٨- ئەو ئایەتانەی لە جۆری مەدەنین بەڵام شێوەی نازڵ بووونەکەیان دەشوبهێتە مەککی، زانایان مەبەستیان ئەو ئایەتانەیە لە سورەتی

مەدەنیدان وەڵێ ئوسلوبو تایبەتمەندیو طابیعی گشتی لەهی مەککی دەچێ، بۆ نمونە ئایەتی ﴿وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ – الأنفال/٣٢﴾ ئاشکرایە پەلەکردنی کافرەکان بۆ هاتنی عەزاب لە مەککە بووە.

٩- ئەو ئایەتانەی لە سورەتی مەککیدانو شێوەو ئوسلوبیان لە مەدەنی دەچن، زانایان ئەمەیان بە پێچەوانەی پێشوو پێناسە کردووەو نمونەیان بە ئایەتی سورەتی (النجم) هێناوەتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى – النجم/٣٢﴾.

شێخی سیوطی فەرموویەتی وشەی (الْفَوَاحِشَ) بریتییە لەو تاوانەی حەددی شەرعی تێدا بێ (الكبائر) هەر تاوانێك سزاکەی دۆزەخ بێ، (اللَّمَمَ) تاوانێکە لەنێوان (الْفَوَاحِشَ)و (الكبائر)دا بێ، دەی لە مەککە حەددی شەرعیو شتیوا نەبووە[1].

١٠- ئەو ئایەتە قورئانیانەی لە مەککە ومرگیراونو بردراون بۆ مەدینە، نمونەی ئەم جۆرە سورەتی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾یە.. بوخاری لە (البراء)ی کوڕی عازیبەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: یەکەم کەس لە هاوەڵان کە گەیشتە لای ئێمە موصعەبی کوڕی عومەیرو عەبدوڵلای کوڕی ئوم مەکتوم بوون، دەستیان کرد بە قورئان خوێندن بۆمان، پاشان عەممارو بیلالو سەعد هاتن، ئەمجار عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەتەك بیست لە کۆچکاران هاتە مەدینە پاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشت، نەمدیوە بەهیچ شتێ خەڵکی مەدینە کەیفخۆش بووبن بە

---

[1] الإتقان ص/٤٩.

ئەندازەی پێخۆشبوونیان بە هاتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهاتبوو من سورەتی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾م خوێندبوو چەند سورەتێکی تریش، ئەمە ئەو جۆرە دەگێڕێتەوە: کە کۆچکەران وەریان گرتووە فێری موسوڵمانانی مەدینەیان کردووە.

١١- ئەوەی لە مەدینە وەرگیراوەو بردراوە بۆ مەککە بڵاو کراوەتەوەو راگەیاندراوە، نمونەی ئەمە سورەتی (براءة)یە ئەوەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزرەتی ئەبوبەکری کردە ئەمیری حەج، جا کە سورەتی (براءة) نازڵ بوو، بەسەر حەزرەتی عەلیدا خوێندیەوەو پێی لەبەرکردو فەرمانی پی دا بەدوا ئەبوبەکردا بڕواو فریای بکەوێ بۆ ئەوەی ئەم نیگایەیان پێ ڕابگەیەنێو تێیان بگەیەنێ: کە ئیتر لەمەودوا نابێ بتپەست حەج بکا.

١٢- ئەوەی بە شەو نازڵ بووە، یان بە ڕۆژ نازڵ بووە، زۆربەی زۆری قورئان بە ڕۆژ نازڵ بووە، ئەوەی بە شەو نازڵ بووە کەمە (أبو القاسم الحسن)ی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەبیبی نیسابوری بەدوادا چوونی بۆ ئەم جۆرە کردووە چەند نمونەیەکی دیاری کردوون، لەوانە کۆتایی سورەتی (آل عمران) ئاماژە بە ڕیوایەتی ئیبنو حیبان (رەزای خودای لێ بێ) لە صەحیحەکەیداو ئیبنو لمونزیرو ئیبنو مەردەوەیهیو ئیبنو ئەبی دونیا لە خاتو عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە: کە بیلالی حەبەشی هاتووە بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی بانگی بەیانی بدا، بیلال کە تێفکری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگریا، عەرزی کرد بۆچی دەگری ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: «وما يمنعني أن أبكي وقد أنزل عليّ هذه الليلة». ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ

لِّأُوْلِي الألْبَابِ – آل عمـران/١٩٠﴾ پاشان فـەرمووی: «ویـل لـمن قرأها ولم يتفكر»[1] هاوار بۆ کەسێك ئەم ئایەتە بخوێنێتەوەو بیر نەکاتەوە.

هەروا ئایەتی (١١٧ - ١١٨)ی سورەتی (التوبة) ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ، وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ – التوبة/١١٧ – ١١٨﴾[2].

لە صەحیحەیندا کە لە کەعب خۆیەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: «فَأَنْزَلَ اللّٰهُ تَوْبَتَنَا عَلَى نَبِيِّهِ – صلى الله عليه وسلم – حِينَ بَقِيَ الثُّلُثُ الآخِرُ مِنَ اللَّيْلِ»

هەروا سەرەتای سورەتی (الفتح)، لە بوخاریدا هاتووە: کە ئیمام عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ لَهِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ» ئەمشەو سورەتێکم بۆ سەر نازڵ بووە لە هەموو ئەو بوونەوەرەی خۆری لێ هەڵدێ لەلام خۆشەویسترە ئەمجار ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا..........﴾ خوێندەوە.[3]

١٣- ئەوەی لە هاویندا نازڵ بووەو ئەوەی لە زستاندا دابەزیوە: زانایان بۆ ئەوەی بە هاوین دابەزیوە ئایەتی (الكلالة) کە لە کۆتایی سورەتی (النساء)دایە بە نمونە هێناوەتەوە.

---

[1] أخرجه إبن حبان/٦٢٠ وذكره فى الدار المنثور ٤٠٩/٢.

[2] البخارى/٤٤١٨ ومسلم/٧٠١٧.

[3] البخارى/٤١٧٧.

له صەحیحی موسلیمدا له عومەرەوه (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت گراوه دەفەرموێ: له هیچ شتێك ئەوەندەم پرسیار نەكردووه بە ئەندازەی ئەوەی دەربارەی (كلالة) پرسیارم كردو پرسیارەكەم دووبارەو سێباره كردۆتەوه، لەهیچ شتێكیش پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەنه لەگەڵمدا ڕوگرژو ڕەق نەبووه وەندی له باسی (كلالة)دا ڕوی لێ گرژ كردم، تەنانەت پەنجەی دا له سینگمو فەرمووی: «يَا عُمَرُ أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ».[1]

هەروا لە نمونەی ئایەتی هاوینەیی ئەو ئایەتانەی كه لە غەزای تەبوكدا نازڵ بوون، ئەمانه بە دەقی قورئان لە هاویندا نازڵ بوون ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ - التوبة/٨١﴾.

نمونەی ئایەتی زستانی وەكوو زانایان دەستنیشانیان كردووه ئایەتەكانی (إفك)ن: كه دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنْ الإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ، لَوْلا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْراً وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ ، لَوْلا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُوْلَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمْ الْكَاذِبُونَ ، وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ، إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّناً وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ ، وَلَوْلا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ ، يَعِظُكُمْ اللَّهُ أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَداً إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ ، وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ وَاللَّهُ

---

[1] أخرجه مسلم/١٢٥٨.

عَلِيمٌ حَكِيمٌ ، إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ ، وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَنْ يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ أَبَداً وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ، وَلا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ، إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ، يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ، يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمْ اللَّهُ دِينَهُمْ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ ، الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ أُوْلَئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ – النور/١١ – ٢٦﴾.

له صه‌حیحی بوخاریدا له خاتو عائیشه‌وه (ره‌زای خودای لێ بێ) ڕیوایه‌ت کراوه ده‌فه‌رموێ: ئه‌م ئایه‌تانه له ڕۆژێکی ساردو سه‌رمای زستاندا نازڵ بوون.[1]

هه‌روا له نمونه‌ی ئایه‌تی زستانه‌یی ئه‌و ئایه‌تانه‌ن که ده‌رباره‌ی غه‌زای خه‌نده‌ق نازڵ بوون: که له سوره‌تی (الأحزاب)دان که نازڵبوونه‌که‌یان له جه‌نگه‌ی سه‌رمادا بوو، ئه‌وه‌تا ئیمامی (البیهقی) له (الدلائل النبوة)دا له حوزه‌یفه‌وه نه‌قڵ ده‌کا ده‌ڵێ: شه‌وی (الأحزاب) موسوڵمانان بلاوه‌یان لێ کرد جگه له دوانزه که‌س، که‌س له ده‌وری پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) نه‌مابووه‌وه، پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) هاته لام‌و فه‌رمووی: «قم فانطلق إلی عسکر الأحزاب». وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر سوێندم به‌و که‌سه‌ی ئه‌تۆی

---

[1] البخاری/٢٦٦١.

به پێغەمبەری ڕەوانەکردووە ئەمن شەرمم کرد بە پیرتەوە هاتم ئەوەندەم سەرمایە خوا خوام بوو لە شوێنی خۆم نەجوڵێم، ئیتر ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا - الأحزاب/٩﴾.

## ١٤/ ئەوەی لە حەضەردا نازڵ بووەو ئەوەی لەسەفەردا دابەزیوە!

زۆربەی زۆری قورئان لە حەضەردا نازڵ بووە، واتە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موقیم بووەو لەماڵەوە بووە، وەڵێ ژیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پڕبووە لە جیهادو تێکۆشانو غەزاکردن لە ڕێگەی خودادا، بۆیە جاری وابووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەردا بووەو وەحی بۆ هاتووە.

بێگومان شێخی سیوطی زۆر نمونەی نەقڵ کردوون لەو ئایاتو سورەتانەی لەسەفەردا نازڵ بوون واتە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە سەفەردا بووەو ئەم جۆرە ئایەتو سورەتانەی بۆ نازڵ بووە، لەوانە سەرەتای سورەتی (الأنفال) کە لە بەدر دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە نازڵ بووە، وەکوو ئیمام ئەحمەد لە سەعیدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەتی کردووەو دەڵێ: ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ - التوبة/٣٤﴾ ئیمام ئەحمەد لە ثەوبانەوە ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لە کاتێکدا نازڵ بووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەردا بووە.

سـەرەتای سـورەتی (الحـج) تیرمـذیو الحـاكم لـە عیمرانـی كـوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێ: ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّـاسُ اتَّقُـوا رَبَّكُـمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ، يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُـلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَـدِيدٌ - الحـج/١ - ٢﴾ دەڵێ: ئەمـە نـازڵ بـووە سـەر پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) كە تەشریفی لە سەفەردا بوو.

الحـاكمو غـەیری ئـەویش لـە (المسور)ی كوڕی مەخرەمـەو مـەروانی كوڕی (الحكم)ەوە ڕیوایەتیان كردووە: كـە دەڵـێن: سـورەتی (الفـتح) هـەمووی لەنێوان مەككەو مەدینەدا دەربارەی صوڵحی حودەیبییە نازڵ بووە[1].

## سودەكانی زانینی مەككیو مەدەنی

**زانینـی مـەككـیو مـەدەنیو لێـك جیاكردنـەوەیان چـەند سـودو قازانجێكی هەیە گرنگەكانیان ئەمانەن:**

١- دەكرێ پشتی پێ ببەسـترێ بـۆ ڕاڤـەكردنی قورئـان، چونكە گومـان لەوەدا نیە: كە زانینـی شـوێنو كـاتی نـزولی ئایـەتو سورەت یارمەتیـدەرێكی باشـە بـۆ تێگەیـشتن لـە مانـای ئایەتەكـەو تەفـسیركردنی بەشـێوەیەكی صەحیحو دروست، هەرچەندە دەگوترێ: (عیبرەت بە گشتی وشەیە نـەك بـە تایبەتمەندی هۆكار) (العبرة بعموم اللفظ لابخصوص السبب).

هەروەها تەفسیركەری قورئان دەتوانێ لەژێر ڕۆشـنایی ئـەو زانیـارەدا لـەكاتی دژ بەیەكوەسـتانی مانـای دوو ئایـەت ناسـیخو مەنـسوخ لێـك جیـا بكاتەوە، چونكە گومان لەوەدا نیە ئایەتە دواییـنەكە ناسیخەو ئەوی پێشەوە مەنسوخە.

---

[1] الحاكم/٣٧١٠ والطبرانی فی الكبیر ١٦/٢٠.

٢- ناسـين‌و چەشـتنی شـێوازەکانی قورئـان دەربـارەی ئوسـلوبی بانگـەوازیکردنی.. چـونکە هـەموو مـەقامێك مـەقالی تایبـەتی خـۆی هەیـە، ئاشکراشە بەرچاوگرتنی (موقتـەضـای حـال) ئاخـاوتن‌و قسە ئاراسـتە کـردن بـەگوێرەی داخـوازی حـال‌و مـەقام بـە تایبەتمەنـدی تـرین مانـای بەلاغـە دەژمێـردرێ، تایبەتمەنـدی ئوسلوبی مـەککی لـە قورئانـدا، یـان هـی مـەدەنی مەنهەج‌و ڕێبازێك بە توێژەرەوەو باحیث دەبەخشێ کە بتوانـێ شـێوازەکانی بانگـەوازیکردن بـۆلای خـودا بـەجۆرێك پـەیڕەو بکـا گونجـاو بـێ لەگـەڵ نەفسیەتی قسە لەگەڵ کراوەکەو واخیطـابی ئاراسـتە بکـا هەسـت‌و شعوری دابگرێ‌و بە ئوسلوبی حەکیمانـەی زۆر بـەرزو ڕەوان چارەسـەری نەخۆشـییە نەفسیەکانی بکا.

هەڵبەتە بۆ هـەموو قۆناغێـك لـە قۆناغـەکانی بانگـەوازی، چۆنیـەتی باس‌و شێوازی ئاخاوتن‌و هەلی ڕەخساو لەباری هەیـە، هـەروەکوو بـەگوێرەی جوداوازی جۆری کەسـەکان‌و جۆری بیروباوەڕیـان‌و بـارودۆخی دەوروبـەریان جۆری خیطـابەکـە دەگۆڕێ‌و ئوسـلوبی ئاخاوتنەکـە بـەپێی هـەلی ڕەخـساوو جۆری کەسەکان ئاڕاستە دەکرێ.

لە ڕاستی‌دا ئـەم شـێوە ئاخـاوتن‌و ئوسـلوب گۆڕینـە بـەپێی جـوداوازی شـوێن‌و کـات قـسە لەگـەڵ کراوەکـان، لـە قورئانـدا بـە زەقـی دەردەکـەوێ دیاردەیەکی هـەرە دیـاری ئوسـلوبی ئـەو کەلامـە پیرۆزەیـە لـە ئاڕاسـتەکردنی خیطاب لەگەڵ موسوڵمانان‌و لەگەڵ موشریك‌و لەگەڵ دوڕوو ئەهلی کیتاب.

٣- ئاگـاردداربوون بەسـەر ژیاننامـەی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـە تێـڕوانین لـە ئایەتـەکانی قورئـان‌و دیـاریکردنی مـەککی‌و مەدەنی بە لایەنێکی گرنگـی ژیـانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئاشـنا دەبـین، بێگومـان بەدوایەکـدا نـازڵبوونی وەحـی بۆسـەر پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هاوکـات بـووە لەگـەڵ مێـژووی بانگـەوازی

ئیسلامی بەهەموو ڕوداوەکانیەوە لەسەردەمی مەککیو مەدەنیدا، هەر لە یەکەم ئایەتەوە: کە نازڵ بووە تا کۆتا ئایەتی نازڵ بوو، قورئانی پیرۆز سەرچاوەی هەر گرنگی سیرەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) بە جۆرێك کە هیچ گومان لەوەدا نیە دەق لەگەڵ ڕیوایەتەکانی ئەهلی سێیەر هاوڕا دێتەوە، هەرکاتێ ڕیوایەتەکان ئیختیلافو جوداوازییان تێکەوت قورئان خیلافەکە پوچ دەکاتەوەو راستیەکە دەچەسپێنێ.

## ناسینو زانینی مەککیو مەدەنیو دیاریکردنی جوداوازی نێوانیان

زانایانی ئیسلام بۆ زانینی مەککیو مەدەنیو دیاریکردنی جوداوازی نێوانیان پشتیان بە دوو مەنهەجی سەرەکیو پتەو بەستووە، مەنهەجی سەماعیو نەقلی، مەنهەجی قیاسیو ئیجتیهادی.

مەنهەجی بیستراوی نەقلی پشت دەبەستێ بە ڕیوایەتی صەحیحو دروست: کە لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەت کرابێ، ئەو هاوەڵانەی هاوچەرخی نازڵبوونی نیگابوون، ئاگاداری نازڵبوونی وەحیەکە بوون، یان ڕیوایەتی (تابیعین) واتە: چینی دوا هاوەڵان ئەوانەی زانیاریەکانیان ڕاستەوخۆ لە هاوەڵان وەرگرتووە، چۆنیەتی نازڵبوونو شوێنو ڕوداوەکانیان لە هاوەڵان بیستبێ، هەڵبەتە زۆربەی زۆری زانیاری دەربارەی مەککیو مەدەنی لەم جۆرەیەو بەو شێوە ڕیوایەتکراوە، لەوەپێش زۆر نمونەمان هێناونەوە: کە هەموویان دەبنە بەڵگە لەسەر ئەو واقیعە.

بێگومان کتێبەکانی تەفسیر بە مەئثورو نووسراوەکانی زانایان دەربارەی ئەسبابی نزولو باسەکانی تری (علوم القرآن) پڕن لەو جۆرە زانیاریانەو بەو ڕیوایەتانە هاخندراون، ئاشکراشە هیچ شتێ لەمبارەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) وارید نەبووە، چونکە ئەو

---

علوم القرآن

زانیارییە لەو زانیاریانە نیە ئەرکی سەرشانی موسوڵمانان بێ مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی ناسیخو مەنسوخ لێك جیابکاتەوە.

قازی ئەبوبەکر باقلانی لە کتێبی (الإنتصار)دا دەڵێ: سەرچاوەی زانیاری دەربارەی مەککیو مەدەنی حیفظی صەحابەو تابیعینە، هیچ دەقێك لەم بارەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەت نەکراوەو لەم ڕووەوە هیچ فەرمانێکی نەفەرمووە، پەروەردگاریش ئەم جۆرە زانیاریەی لەسەر موسوڵمانان فەرز نەکردووە، خۆ ئەگەر شتێك، یان بڵێین بڕێك لەو زانیاریە لەسەر ئەهلی عیلم واجب بێ وەکوو زانیاری ناسیخو مەنسوخ ئەوە ئەو واجببوونە لە ڕێگای ترەوە زانراوە نەك بە فەرمانو ئەمری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).[1]

مەنهەجی قیاسی ئیجتیهادی پشت بەستووە بە زانینی تایبەتمەندییەکانی مەککیو مەدەنی، ئەگەر لە سورەتێکی مەککیدا ئایەتێك هەبوو سروشتو شێوازی مەدەنی تێدا ڕەچاو دەکرا، یان مانایەکی لەخۆ گرتبوو هی ڕوداوی سەردەمی دوا کۆچ بوو، زانایان فەرموویانە ئەو ئایەتە مەدەنییە، هەروا ئەگەر لە سورەتی مەدەنیدا ئایەتێك هەبوو تەبیعەتی ئایاتی مەککی لەخۆ گرتبوو، یان ڕوداوێکی پێش کۆچ (واتە سەردەمی مەککی) لەخۆ گرتبوو، ئەوە پێی دەگوترێ: مەککی، کە لە سورەتەکەدا تایبەتمەندی مەککی هەبوو وتوویانە: سورەتەکە هەمووی مەککییە، ئەگەر تایبەتمەندی مەدەنی تێدا بوو دەگوترێ: سورەتەکە مەدەنییە، ئەمە قیاسو بەراوردکردنێکی ئیجتیهادییە، بۆیە زانایان فەرموویانە هەر سورەتێك چیرۆکی پێغەمبەرانو نەتەوەو گەلە پێشینەکانی تێدا بێ ئەوە مەککییە.

---

[1] بڕوانە کتێبی (الإتقان) ص٣٢ والإنتصار ج١/٢٤٧.

هەر سورەتێك باسی فەرزو واجبێك بكا، یان حەدو تۆڵەی شەرعی لەخۆ گرتبێ ئەوە مەدینەییە، ئیمامی جەعبەری فەرموویەتی: بۆ ناسینی مەككیو مەدەنی دوو ڕێگا هەن (سەماعی، قیاسی).[1]

ئاشكراشە سەماعی ئیعتیمادی لەسەر نەقڵە، قیاسی ئیعتیمادی لەسەر عەقڵە، نەقڵو عەقڵ دوو ڕێبازی ڕاستو دروستن بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی.

## جوداوازی نێوان مەككیو مەدینەیی

**زانایانی ئیسلام بۆ جوداوازی نێوان مەككیو مەدینەیی سێ ڕایان هەیە، هەر ڕایەك بە ئیعتیبارێكی تایبەتی بنیات نراوە:**

١- **ڕای یەكەم:** بە بەرچاوگرتنی زەمانی نازڵ بوون، لەسەر ئەم بنەماو ئەساسە هەر ئایەتو سورەتێك پێش كۆچكردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە نازڵ بووبێ مەككییە، هەرچەندەش لە مەككەش دانەبەزیبێ، هەر ئایەتو سورەتێك دوای كۆچكردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە، نازڵ بووبێ مەدینەییە، هەرچەندە لە مەدینە نازڵ نەبووبێ، ئەوەی دوای كۆچكردن دابەزیبێ با لە مەككە، یان لە عەرەفەشدا نازڵ بووبێ مەدینەییە، وەكوو ئەوەی ساڵی ڕزگاركردنی مەككە دابەزی ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا - النساء/٥٨﴾ ئەم ئایەتە ساڵی ڕزگاركردنی مەككە لەناو كەعبەدا نازڵ بوو، یان ئەوەی لە حەجەتولویداعدا دابەزیوە: كە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ

---

[1] بڕوانە الإتقان ص٤٨.

وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - المائدة/٣﴾

ئەم ڕایە لە دوو ڕایەکەی تر وێچوترە، چونکە کۆنترۆڵ کردنی تێدایەو قاعیدەیەکی سەلماوە.

٢- **ڕای دووەم:** بەگوێرەی لەبەرچاوگرتنی شوێنی نازڵبوونەکەیە ئەوەی لە مەککەو لە دەوروبەری نازڵ بووبێ وەکوو عەرەفاتو میناو حودەیبییە ئەوە مەککییە، ئەوەی لە مەدینەو دەوروبەری نازڵ بووبێ وەکوو (أحد، قباء، سلع) ئەوە مەدینەییە، لەسەر ئەم ڕایە قورئان دابەش ناکرێ بە دووبەشی سەرەکی (مەککیو مەدینەیی) حەصریش نابێ لەو دوو بەشەدا، بەمجۆرە ئەوەی لە سەفەردا نازڵبووبێ، یان لە تەبوكو بەیتولمەقدیسدا دابەزیبێ ناچێتە ژێر هیچ کام لەو بەشانەو نە پێیان دەگوترێ مەککی، نە پێیان دەگوترێ مەدینەیی، هەروەها ئەوەشی لێ وەدی دێ کە ئەوەی لە مەککە نازڵبووە دوای کۆچ بە مەککی حیساب بێ.

٣- **ڕای سێیەم:** بەگوێرەی موخاطەبەکان دابەش دەکرێ، بەمجۆرە هەرچی خیطاب بێ بۆ دانیشتوانی مەککە بە مەککی دادەنرێ، مەدینەیش ئەوەیە خیطاب بێ بۆ ئەهلی مەدینە.

لەسەر ئەم بنەمایە هەرچی لە قورئاندا ﴿یَا أَیُّهَا النَّاسُ.....﴾ی تێدابوو مەککییە، هەرچی ﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُواْ.....﴾ی تێدابوو مەدینەییە.

بەلام کە سەرەنج دەدەین زۆربەی زۆری سورەتەکانی قورئان بەوجۆرە خیطابە دەستیان پێ نەکردووە، کەوابێ ئەمە نابێتە قاعیدەیەکی (مطرد)، بۆ نموونە سورەتی (البقرة) ئایەتی ﴿یَا أَیُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّکُمُ الَّذِي خَلَقَکُمْ وَالَّذِینَ مِن قَبْلِکُمْ لَعَلَّکُمْ تَتَّقُونَ - البقرة/٢١﴾ هەروا ئایەتی ﴿یَا أَیُّهَا

النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ - البقرة/١٦٨﴾ دەی ئەم سورەتە مەدینەیی‌یە.

سورەتی (النساء) سەرەتاکەی بە ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ.....﴾ دەست پێکراوە مەدینەییە، سورەتی (الحج) مەککییە بە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - الحج/٧٧﴾ دەستی پێکراوە.

قسەی حەق ئەوەیە بگوترێ: قورئان خیطابی پەروەردگارە بۆ هەموو خەڵك بەگشتی، دروستە خیطاب ئاراستەی موسوڵمانان بکا بە صیفەتو بەناوو بە ڕەگەز، هەروەکوو دروستە غەیری موسوڵمان فەرمانی پێ بکرێ بە خواپەرستی وەکوو چۆن فەرمان بە موسوڵمانان دەکرێ بە بەردەوامبوون لەسەر خواپەرستیو زۆرکردنی.

## تایبەتمەندییەکانی مەککیو مەدینەیی

زانایان لێکۆڵینەوەو بەدواداچونیان بۆ سورەتی مەککیو مەدەنی کردووە، قاعیدەو یاسای تۆکمەیان لەم بارەوە خستۆتە ڕوو تایبەتمەندی مەککیو مەدەنیو ئوسلوبو شێوازی هەریەکەیانیان دەستنیشان کردووە، باسو مەوضوعی هەریەکێ لە مەککیو مەدەنیان بەراورد کردووە، سەرەنجام قاعیدەو پێناسەو تایبەتمەندی هەردوو جۆرەکەیان تۆمار کردووە.

## قاعیدەو پێناسەو خاڵە جیاوازەکانی قورئانی مەککی

١- هەرسورەتێك سوژدەی تێدا بێ مەکییە.

٢- هەر سورەتێك وشەی (کلا)ی لەخۆ گرتبێ مەکییە، شایانی باسە ئەم وشەیە لەنیوەی کۆتایی قورئاندا نەبێ نەهاتووە.

٣- هەر سورەتێك ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ.....﴾ی تێدا بێو ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ...﴾ی تێدا نەهاتبێ مەککییە، جگە لە سورەتی (الحج) لە

کۆتاییی‌یەکەیدا ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ – الحج/٧٧﴾ هاتووە، زۆر لە زانایان پێیان وایە ئەم ئایەتە مەککییەو وەکوو چۆن سورەتەکە مەککییە.

٤- هەر سورەتێك چیرۆکی پێغەمبەرانو بەسەرهاتی گەلو نەتەوە ڕابردووەکانی تێدا بێ مەککییە جگە لە سورەتی (البقرة).

٥- هەر سورەتێك چیرۆکی ئادەمو ئیبلیسی تێدا بێ مەککییە جگە لە سورەتی (البقرة).

٦- هەر سورەتێك بە پیتی (التهجی) وەکوو (ألم)و (الر)و (حم)و (يس)و ئەو جۆرە وشانە دەست پێ بکا مەککییە، جگە لە (الزهراوين) کە سورەتی (البقرة)و (آل عمران)ن، ڕاجیاییش هەیە دەربارەی سورەتی (الرعد).

ئەمە لەڕوی قاعیدەو ضابیطەوە، وەلێ لەڕوی خاڵە جوداکەرەوە مەوضوعییەکانەوەو تایبەتمەندی ئوسلوبو شێوازەوە، دەتوانین لەم خاڵانەدا لێکیان جیا بکەینەوەو بڵێین: هەر ئایەتێك ئەم دیاردانە لەخۆ بگرێ مەککییە: بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستیو خودا بەیەکناسین، چەسپاندنی:

١- پێغەمبەرایەتی، چەسپاندنی زیندوبوونەوەو پاداشو سزا، یادی قیامەتو ڕوداوە ترسناکەکانی، ئاگری دۆزەخو سزای بەئێشی، باسی بەهەشتو نیعمەتەکانی، مەجادەلەو موناقەشە لەگەڵ بتپەرستەکاندا بە بەڵگەی عەقڵیو نیشانە کەونییەکان.

٢- دانانی بنەمای گشتی بۆ تەشریعو ئەخلاقی بەرز کە کیانی کۆمەڵگای لەسەر دادەمەزرێ، پەردە هەڵدانەوە لەسەر تاوانە جۆراوجۆرەکانی بتپەرستەکان لەبواری خوێن ڕشتنی یەکترىو خواردنی ماڵو سامانی خەڵك بە زوڵمو ستەم، زیندە بەچاڵکردنی کچۆڵەی تازەی لەدایکبوو زۆر دابو نەریتی ناشیرینو قیزەونی تریان.

٣- گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەرانو گەلو نەتەوە پێشینەکان، بە مەبەستی زەجرو گێڕانەوەی ئەو بتپەرستە سەرکەشانە لەکارو کردەوەی ستەمکارانەیان بۆ ئەوەی پەند ئامێز بن بە سەرەنجامی ئەو گەلو نەتەوانەی پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە، پەند وەربگرنو بە دەردی ئەوان نەچن، لەهەمان کاتدا بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و تەسەللادانەوەی، تا صەبر بگرێ لەسەر ئەزیەتو ناڕەحەتیەك كە لەوانەوە توشی دەهاتو دڵنیا بێ سەرەنجام سەرکەوتن بۆ ئەوەو ملکەچی دەبن.

٤- ئایاتی کورتو ئەلفاظی بەهێزو پتەو، کورتبڕی عبارەت بەجۆرێك گوێچکە وا لێ بکا خۆی بۆ کلۆر بکاو کاریگەری تێدا پەیدا ببێ، وشەکان لەسەر گوێچکە لێدانیان بەهێزە، دڵ ڕادەچەنێنن، هەست دەوروژێنن، جەخت لەسەر ماناکان دەکەنەوە بە سوێندخواردنی زۆرو بەشتی جۆراروجۆر!!

## قاعیدەو پێناسەی خاڵە جیاوازەکانی قورئانی مەدینەیی

١- هەر سورەتێك باسی فەرزێك بکا، یان حەددێکی شەرعی لەخۆ گرتبێ مەدینەیی‌یە.

٢- هەر سورەتێك باسی دووڕووەکانی تێدا بێ مەدینەیی‌یە، جگە لە سورەتی (العنكبوت) ئەو مەککییە.

٣- هەر سورەتێك موجادەلەی لەگەڵ ئەهلی کیتاب تێدا بێ مەدینەیی‌یە.

ئەمە لەڕوی قاعیدەو ضەوابیتەوە، وەلێ لەڕووی خاڵە جیاکەرەوەو میزاتە مەوضوعییەکانەوە وێڕای تایبەتمەندی شێوازو ئوسلوب، ئەوە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا دەستنیشانیان بکەین.

١- ڕوونکردنـــەوەی بـــواری عیبـــادات‌و موعامـــەلات‌و حـــەددە شـــەرعییەکان‌و نیظـامی خێـزان‌و ئـەحکامی مـیرات‌و گـەورەیی جیهـادو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان‌و پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەکاتی ئاشتی‌و جەنگدا، ڕوونکردنەوەی یاسای حوکم‌و دەسەڵات‌و مەسائیلی تەشریع.

٢- گوفتوگۆ لەگەڵ ئەهلی کیتاب جولەکەو مەسیحی‌و بـانگ کردنیـان بـۆ موسـوڵمان بـوون، ڕوونکردنـەوەی ئـەوە: کـە ئـەوان دەسـتکاری تـەورات‌و ئینجیلیان کردووەو دەستدرێژییان لە حەق‌و ڕاستی‌دا کـردووە، دووبـەرەکی‌و ئیختیلافیـان تـێ کـەوت دوای ئـەوەی عـیلم‌و زانیـاری حـەقیان بـۆ هـات، بـە ناحەق‌و بێ بنەما کێشەو دووبەرەکییان بەرپاکردو پەرەیان پێ دا.

٣- پـــەردە هەڵدانـــەوە لەســـەر ڕووی مونافیقـــەکان‌و دەرخـــستنی بیروبۆچوونی دژ بـە ئیـسلامیان‌و شـیکردنەوەی نـاخ‌و دەروونیـان‌و لابردنـی پەردە لەسـەر شـتە شـاردراوەکانیان‌و بـەیانکردنی خەتـەرو زەرەریـان لەسـەر ئایین.

٤- درێژی کۆپلـەو مـەقطـەعـی ئایەتـەکان بەشـێوازێك کـە شـەریعەت دەچەسپێنی‌و ئامانج‌و مەبەستەکانی ڕوون دەکاتەوە.

## ٥ ناسین‌و زانینی یەکەم ئایەتی نازڵبوو وە دوا ئایەت

دوا ئایەتی نـازڵبوو تەعبیردانـەوە لـەو حاڵەتـەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی تێدا وەرگرتووە، بە وشەی (نزول) بۆسـەر گیـانی پاکی تەعبیرێکە هێزو دەسـەڵاتێکی تێـدا ڕەنـگ دەداتـەوەو ئامـاژە بـۆ هێـزو توانایـەك دەکـا، مـرۆڤ لـە ناخـەوە لـە وێنـاکردنی هـەموو دابـەزینێك لـە بەرزییەوە هەسـتی پێ دەکا، ئەمـەش بـەگوێرەی بـەرزی‌و پـاکی پلەوپایـەی قورئان‌و گـەورەیی‌و گرنگـی تـەعلیمات‌و حوکمـەکانی کـە شـەقامەڕێی ژیـانی مرۆڤایەتی گۆڕی‌و گۆڕانکارییەکی سەرلەبەری وای تێدا بـەدی هێنـا ئاسمـانی

بــه زەوییــەوە پەیوەســت کــرد، دونیــای بــە قیامەتــەوە بەســتەوە، ناســین‌و شارەزابوون لەمێژووی تەشریعی ئیسلامی‌دا لە ڕوانگەی سەرچاوەی یەکەم‌و ڕەســەن‌و ئەصــڵییەو – کــە قورئــان – وێنەیــەکی ڕون دەخاتــە بــەردەم توێژەرەوە لەبواری (تەدەروج) لە دانانی ئەحکام‌و گونجانی هەر حوکمێك لەگەڵ ئەو حاڵەتەی تێیدا نازڵ بووە، بەبێ ئەوەی دژایەتی‌و بەریەککەوتن لەنێوان (سابق‌و لاحق) پێشین‌و پاشین‌دا هەبێ.

بێگومان یەکەم بەشی نازڵبوو لە قورئان‌و کۆتا بەشی نازڵبوو لە قورئان بە ڕەهایی ئەم حاڵەتە ناوازەی وەرگرتووە، هەروەکوو چۆن ئەم حاڵەتە بەرچاو دەکەوێ لە یەکەم بەشی نازڵبوو تا کۆتا بەشی نازڵبوو لە تەشریعکردنی هەموو تەعلیماتە ئیسلامیەکانی وەکوو حوکمی خواردن‌و خواردنەوەو شەڕو جەنگ‌و شتی وا.

زانایانی ئیسلام دەربارەی یەکەم بەشی نازڵبووی قورئان بە ڕەهایی‌و کۆتا بەشی نازڵبووی، چەند ڕاوبۆچوونێکیان هەیە هەوڵ دەدەین چڕیان بکەینەوەو هەڵیان سەنگێنین‌و تەرجیح لەنێوانیاندا بدەین.

## یەکەم بەشی نازڵبوو لە قورئان

١- ڕاستترین قەول لەم بوارەدا ئەوەیە دەگوترێ: یەکەم بەشی نازڵبوو لە قورئانـدا ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ، اقْـرَأْ وَرَبُّـكَ الأَكْرَمُ ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ، عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ – العلق/١ – ٥﴾ بەڵگەی ڕاست‌و دروست لەسەر ئەمە ڕیوایەتی موسلیم‌و بوخاری‌و هی تریشە: کە لە خاتو عائیشەوە ڕیوایەت دەکەن دەفەرموێ: یەکەم جار کە نیگا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی پێکرد، خەون بینینی ڕاست بوو، ئەوەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر خەونێکی دەبینی وەکوو کازیوەی بەیان ڕوناك دەبوو، پاشان وای لێ بەسەر هات حەزی لە

گۆشەگیری بوو، دەچوو بۆ ئەشکەوتی حیراء چەند ڕۆژو شەو لەسەر یەك لەوێدا دەمایەوە، تێشوی لەگەڵ خۆی دەبرد، کە بژێوی لێ دەبڕا دەهاتەوە بۆلای خەدیجە (ڕەزای خودای لێ بێ) سەرلەنوێ خواردنو پێداویستی خۆی دەبردو دەچووەوە بۆ ئەشکەوتەکە، تا ڕۆژێك لەناکاو حەق یەخەی گرت، لە ئەشکەوتەکەدا فریشتەی وەحی هاتە لایو پێی فەرموو: بخوێنە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێم گوت: من خوێندەواریم نیە، بەخۆیەوە گوشیم تا وام لێ هات بێهۆش ببم، پاشان بەرەڵای کردم، وتی: بخوێنە، وتم من خوێندەواریم نیە، جاری دووەم بە خۆیەوە گوشیم تا تەواو تینم بۆ هات، ئەمجار بەری دام، وتی: بخوێنە، وتم من خوێندەوار نیم، بۆجاری سێیەم بەخۆیەوە گوشیم تا تەواو بڕستم لێ بڕا، پاشان بەرەڵای کردمو وتی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ تا دەگاتە ﴿مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەو حاڵەوە گەڕایەوە هەموو گیانی دەلەرزی..........................................[1]

٢- هەندێك دەڵێن: یەکەم ئایەت لە قورئان نازڵ بووە ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ە ئاماژە بە ڕیوایەتی موسلیمو بوخاری کە لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن ڕیوایەتیان کردووە دەڵێ: پرسیارم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا کرد، کام بەشەی قورئان لەپێشدا نازڵ بووە؟ وتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ وتم: ئەم یان ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ وتی: من ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرم بیستووە (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من لە نزیك ئەشکەوتی (حراء) بووم، کە لەوێ تێپەڕیمو دابەزیمە نێو شیوەکە بۆ پێشەوەو بۆ دواوەی خۆم ڕوانی، سەیری ئەملاو ئەولای خۆم کرد، پاشان سەرم هەڵبڕی بەرەو ئاسمان کە ڕوانیم ئەوە – واتە: جوبرائیلە – ئیتر لەرزین دایگرتم دەهشەتو سەرسامی ڕوی تێکردم، بەو

---

[1] دەقی ئەم فەرموودە لە بوخاری (٣)یەو لە موسلیم (٤٠٣)ە.

حاڵەتە ترساوی‌و لەرزینەوە، هاتمەوە بۆ ماڵەوە بۆلای خەدیجە (رەحمەتی خودای لێ بێ) وتم: داپۆشن ئیتر پەروەردگار ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ، قُمْ فَأَنذِرْ – المدثر/١ – ٢﴾ی نازڵ کرد.[1]

وەڵامی ئەم حەدیثەی جابیر دراوەتەوە، بەوە: دەگوترێ: پرسیارەکە دەربارەی نازڵبوونی سورەتێك بووە بە تەواوی نازڵ بووبێ! ئیتر جابیر ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە سورەتی ﴿الْمُدَّثِّرُ﴾ بە تەواوی نازڵ بووە پێش ئەوەی سورەتی ﴿اقْرَأْ﴾ بە تەواوی نازڵ ببێ، چونکە یەکەم بەشی قورئان: کە نازڵ بووە سەرەتای سورەتی ﴿اقْرَأْ﴾ بووە.

بۆ پشتگیری ئەمە لە صەحیحەیندا فەرموودەیەك هەیە دوبارە لە ئەبو سەلەمەوە لەجابیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ ژنەوتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی سەردەمی هاتنی نیگای دەگێڕایەوە، لەنێو فەرماییشتە کانیدا فەرمووی: «فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي. فَدَثَّرُونِي فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ( يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ )».[2]

ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەم روداوە دوا روداوی ناو ئەشکەوتی (حراء) بووە، یان سورەتی (ألمدثر) دوای ماوەیێك لە نازڵبوونی نیگا یەکەم سورەتە: کە بەتەواوی نازڵ بووە. جابیر کە ئەو قسەیەی کردوە بە ئیجتیهادی خۆی بووە، ریوایەتی عائیشەی لێ پێشکەوتووە، کەوابێ ئەوەی لە قورئان بە رەهایی یەکەمجار نازڵبووە، ئەو چەند ئایەتەن کە بە (إقرأ) دەست پێدەکەن، یەکەم سورەتیش کە بەتەواوی نازڵبووە سورەتی (ألمدثر)ە،

---

[1] البخاری/٤٩٢٤ ومسلم/٤٠٩.

[2] البخاری/٤، ومسلم/٤٠٦.

یان یەكەم بەش كەدوای نیگاكردنی سەرەتاو ماوەیەكی پێ چووە ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ە. یان یەكەم بەشی قورئان كە نازڵبووبێ‌و ئەركی پێغەمبەرایەتی خستبێتە سەرشانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سورەتی (المدثر)ە بۆ (نبوەت‌و نیگاش) ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ە.

٣- رەئیەك هەیە دەڵێ: یەكەم بەشی قورئان: كە نازڵبووە سورەتی فاتیحەیە. وێدەچێ مەبەستەكە ئەوەبێ یەكەم سورەتی كامل‌و تەواو: كە نازڵ بووبێ فاتیحەیە.

٤- رەئیەك هەیە دەڵێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ە ئاشكراشە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ لەسەرەتای هەموو سورەتێكەوە هەیە. بەڵگەی ئەم دووخاڵە (٣-٤) چەند حەدیثیكی مورسەلە.

رای یەكەم: كە بەحەدیثی عائیشە پشتگیری كراوە. رایەكی بەهێزو مەشهورە.

بێگومان ئیمامی زەركەشی لەكتێبی (ألبرهان)دا حەدیثەكەی خاتو عائیشەی زیكركردوە: كە بەدەق ئەوە دەگەیەنێ كە یەكەم شت لە قورئان كە نازڵ بووە ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ هەروا حەدیثی جابیریشی نەقڵ كردوە ئەوە دەچەسپێنێ كە یەكەم بەش لەقورئان: كە نازڵ بووە سورەتی (المدثر)ە دەتواندرێ جەمع لەنێوان ئەم دوو حەدیثەدا بكەین بەوە: كە جابیر گوێی لێ بووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چیرۆكی سەرەتای دەستپێكردنی وەحیی گێڕاوەتەوە، گوێی لەكۆتایی چیرۆكەكە بووە ئەوەڵەكەی گوێ لێ نەبووە، وای گومان بردووە ئەم بەشەی كۆتایی چیرۆكەكە سەرەتایەتی. وایش نیەو لێی تێك چووە!!

بەڵێ: سورەتی (ألمدثر) دوای ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾و برانی وەحیی یەكەم بەشی قورئانە كە نازڵ بووە، ئاماژە بەوەی لە صەحیحەیندا چەسپاوە ئەمیش هەر لەجابیرەوە ریوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (درودی

خـوداى لەســەر بـێ) باســى بڕانــى نيگـاى دەكــردو لەدرێــژەى چـيرۆكەكەدا فەرمووى: «فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا الْمَلَـكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ الـسَّمَاءِ وَالأَرْضِ ، فَجَئِثْـت مِنْـهُ فرقـاً فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي . فَدَثَّرُونِي فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَـالَى ( يَـا أَيُّهَـا الْمُـدَّثِّرُ )».

ئـەوەتا پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) بـۆ خـۆى لـەم فەرمودەيـەدا باسى ئەو فريشتە دەكا: كە لەوەپێش لە ئەشكەوتى حيراءدا هاتووە بۆلاى، لە فەرمودەكەى خاتو عائيشەشدا هەواڵى ئەوەى داوە كە نـازڵبوونى ﴿اقْرَأْ بِاسْـمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ لە ئەشكەوتى حيرادا بووەو يەكەم دەسپێكى نيگاش بـووە، پاشان ماوەيێك وەحيى بڕانى بەسـەردا هـات، لـە حـەديثـى جابيريش ئـەوەى چەسپاندووە: كەدواى نازڵبوونى ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ ئيتر نيگا درێـژەى كێشاوە وەجبە وەجبە نازڵ بووە. كەوابێ زانـدرا: كە ﴿اقْرَأْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ الَّـذِي خَلَقَ﴾ يەكەم بەش و سەرەتاى نازڵبوونى قورئانەو سورەتى (المـدثر) دوا ئـەو نــازڵ بــووە، ئيبنــو حيبــانيش لــە صــەحيحەكەى هــەرواى بۆچــووەو دەڵــێ: دژايەتى لەنێوان دوو حەديثەكەدا نيە، بەڵكوو يەكـەم دەقێك لـەقورئان: كـە نازڵ بووە ﴿اقْـرَأْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ الَّـذِي خَلَـقَ.......﴾ لـە ئەشـكەوتى حـيرا بـۆى دابەزيوە: جا گەڕايەوە بۆلاى خەديجە (ڕەزاى خوداى لێ بـێ) ئـاوى ساردى لێ پڕژاند، لەماڵى خەديجە سـورەتى ﴿يَا أَيُّهَـا الْمُـدَّثِّرُ.........﴾ى بـۆ سـەر نـازڵ بوو، كەوابێ ڕوداوەكە بەم جۆرە بووە: كـە ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّـكَ الَّـذِي خَلَـقَ﴾ ى بۆسەر نـازڵ بـوو، گەڕايـەوە بـۆ ماڵـەوە حـاڵى پەشـێوو بـوو، دايانپۆشـى ئـيتر سورەتى ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ى بۆسەر نازڵ بوو.

ڕيوايەتێك هەيە دەڵێ: يەكەم دەق لە قورئان: كە نازڵ بووە سـورەتى فاتيحە بووە، ئەمە لە ڕێگەى ئەبو ئيسحاقەوە لە ئـەبو مەيـسەرەوە ڕيوايـەت كراوە، دەڵێ: پێغەمبەرى خودا (دروودى خوداى لەسەر بێ) كـە دەنگـى گـوێ لێ دەبـوو بـە گـورجى ڕادەپـەڕى و بـيرى يەكـەمجار هـاتنى فريـشتە بـۆلاى

دەكـردەوەو يـادی ئـەوەی دەكـردەوە: كـە پێـی گوتـووە ﴿الْحَمْـدُ للّــهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ...............﴾ تاكۆتايی[1].

قازی ئەبو بەكر لە كتێبی (الإنتصار)دا دەڵێ: ئەم حەدیثە (منقطع)ە بەهێزترینی قەولەكان ئەوەیە: كە دەڵێ: یەكەم بەشی قورئان كە نـازڵ بـووە ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّـذِي خَلَـقَ﴾ ئـەمجار لـە بـەهێزیدا، قـەولی ئەوانـە دێ: كـە دەڵێن: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ە.

ڕێگای كۆكردنەوەی حەدیثەكان بۆ ئەوەی دژایەتی نەبێ لەنێوانیاندا ئەوەیە یەكەم شت ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ یەكـەم شـتێكیش لـە قورئـان نــازڵ بووبــێ دەربــارەی فــەرمانو نــەهیو تــەبلیغ ســورەتی ﴿يَــا أَيُّهَــا الْمُدَّثِّرُ.........﴾.

یەكەم سورەت لە قورئان: كە دابەزیوە سورەتی فاتیحەیـە، ئەمـە دەق وەكوو ئەوە وایە لە حەدیثدا هاتووە «أول مايحسب به العبد الـصلاة»[2] «أول مايقضى فيه الدماء».[3] كۆكردنەوە لەنێوان ئەم دوو حەدیثـە بـەمجۆرە دەبـێ، یەكەم شتێك كە لە مەظالیم لەنێوان بەندەكانـدا یـەكالا دەكرێتـەوە خوێنـە، یەكەم شتێكیش: كە بەندەكان لەسەری موحاسەبە دەكرێن لەناو فەرزەكانـدا نوێژە.

ڕەئیەك هەیە دەڵێ: یەكەم بەشێك كە لە قورئان نازڵ بووە دەربارەی پەیامو پێغەمبەرێتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.........﴾ە، یەكـەم شـتێكیش دەربـارەی (نبوة)و نیگا نازڵ بووە ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ......﴾ە، بێگومان زانایـان فەرموویانە فەرمایشتی پەروەردگار: كە دەفەرموێ: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّـكَ .....﴾

---

[1] أخرجه إبن أبی شیبه/٣٦٥٥٥.

[2] رواه أبو داود/٨٦٤ والترمذی/٤١٥ والنسائی/٤٦٦ وإبن ماجه/١٤٢٥.

[3] أخرجه البخاری/٦٥٣٣ ومسلم/٤٣٨١.

بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) چونکە (نبوة) پێغەمبەرێتی بریتییە لەنیگاکردن بۆ ئادەمیزادێك لەسەر زوبانی فریشتە بە ئەرکێکی تایبەتی، کەوابێ فەرمایشتی خودا: کە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ، قُمْ فَأَنذِرْ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەرکی ریسالەت‌و پەیامبەری، چونکە ئەمەیان بریتییە لە ناردنی نیگا بۆ ئادەمیزادێك لەسەر زوبانی فریشتە بە ئەرکێکی گشتی.[1]

## دوا ئایەتی نازڵبوو

١- هەندێك پێیان وایە کۆتا ئایەتی نازڵ بوو ئایەتی ﴿ریبا﴾یە ئاماژە بە ڕیوایەتەکەی بوخاری: کە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) هێناویەتی دەڵێ: «آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – آيَةُ الرِّبَا».[2] مەبەست بە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ البقرة/٢٧٨﴾.

٢- ڕەئیەك هەیە دەڵێ: کۆتا ئایەتی نازڵ بوو لە قورئان ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ – البقرة/٢٨١﴾ ئاماژە بە ڕیوایەتی نەسائی‌و غەیری ئەویش لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) کە دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ «قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ هَذِهِ آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم».

---

[1] البرهان فی علوم القرآن للزرکشی تحقیق محمد أبو الفضل ٢٠٦/١.

[2] البخاری/٤٥٤٤.

٣- ڕەئیەکی تر هەیە دەڵێ: کۆتا شتێك لە قورئان نازڵ بووبێ، ئایەتی ﴿الدَّيْن﴾ە مەبەست پێی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ وَلاَ تَسْأَمُوْاْ أَن تَكْتُبُوْهُ صَغِيرًا أَو كَبِيرًا إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلاَّ تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – البقرة/٢٨٢﴾.

جەمعکردنەوە لەنێوان ئەم ڕیوایەتانەدا بەمە دەبێ بڵێین: ئەم ئایەتانە بە یەك وەجبە نازڵ بوون وەکوو چۆن لە موصحەفدا ڕیزبەند کراون (١- ئایەتی ریبا، ٢- ئایەتی واتقوا یوما، ٣- ئایەتی دەین) چونکە هەرسێك ئایەتەکە لە یەك چیرۆکدا کۆبوونەوە، ئیتر هەر راوییەك هەواڵی لە بەشێکی داوەو وتویەتی ئەمە کۆتا بەشی نازڵبوونی قورئانە، ئەمەش هیچ دژایەتیو تەناقوزێکی تێدا نیەو رای هەموویان صەحیحەو موناقەضات لەنێوانیاندا نیە.

٤- رایەکی تر هەیە دەڵێ: کۆتا ئایەتی نازڵ بوو لە قورئان (کلالە)یە ئەوەتا بوخاریو موسلیم لە (البراء)ی کوڕی عازیبەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێ: کۆتا ئایەتی نازڵبوو لە قورئان ئایەتی ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء

فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – النساء/١٧٦﴾ لێرەدا دەگوترێ: ئەم (کۆتا نازڵ بوونەی) ئێرە وا ئاراستە دەکرێ کۆتا ئایەتی نازڵبوو لەبواری میراتدا ئایەتی کەلالەیە.

٥- رایەکی تر هەیە دەڵێ: کۆتا بەشی نازڵ بوو لە قورئان ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – التوبة/١٢٨﴾ ئەوەتا لە (المستدرك)دا[1] لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: ئاخیر ئایەتی نازڵ بوو ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ ، فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ – التوبة/١٢٨ – ١٢٩﴾ ئەمەش وا ئاراستە دەکرێ دەگوترێ: دوا ئایەتی نازڵبوو لە سورەتی (براءة)دا ئەم ئایەتانەن.

ئەوەتا عەبدوڵڵای کوڕی ئیمام ئەحمەد لە زەوائیدی (المسند)دا لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕیوایەتی کردووە: کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم دوو ئایەتەی ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ ، فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ – التوبة/١٢٨ – ١٢٩﴾ لە کۆتای سورەتی (براءة)دا خوێندەوە[2].

٦- ڕایەکی تر هەیە دەڵێ: کۆتا بەشی قورئانی نازڵبوو سورەتی (المائدة)یە، ئاماژە بە ڕیوایەتی تیرمذیو حاکم لەم بارەوە لە عائیشەوە[3] ئەمەش وا ئاراستە کراوە: کە کۆتا سورەتی نازڵبوو دەربارەی حەڵاڵو حەرام سورەتی مائیدەیەو هیچ حوکمێکی نەسخ نەبۆتەوە.

---

[1] رواه الحامن فيها المستدرك/٣٢٩٦.

[2] أخرجه فى المسند/٢١٢٢٦.

[3] الترمذى/٣٣١٦ والحاكم/٣٢١١ من حديث عبدالله بن عمر.

٧- ڕایەك هەیە دەڵێ: كۆتا ئایەتی نازڵبوو ئایەتی ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ – آل عمران/١٩٥﴾ ئاماژە بە ڕیوایەتی ئیبنو مەردەوەیهی لە ڕێگەی موجاهیدەوە لە ئوممو سەلەمەوە كە دەفەرموێ: كۆتا ئایەتێك كە نازڵبووە ئایەتی ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ – آل عمران/١٩٥﴾[١].

ئەوەبوو ئوممو سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە چیە پەروەردگار هەر باسی پیاو دەكا باسی ژنان لە كولەكەی تەڕیشدا نایە؟ ئیتر ئایەتی ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا – النساء/٣٢﴾ نازڵ بوو، هەروا ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا – الأحزاب/٣٥﴾ نازڵ بوو.[٢]

---

[١] الدارالمنثور ج٢/٤١٢.

[٢] أخرجه الحميدی فی مسنده/٣٠٣ وسعيد بن منصور/٥٥٢ وأبو يعلى فی مسنده/٦٩٥٨ والحاكم/٣١٧٤ والبيهقی فی معرفة السنن والآثار/١٧٦٤٤.

ئـەم ئایەتـە واتـە ئایـەتی ﴿فَاسْـتَجَابَ............﴾ كۆتـا ئایـەتو سێیەمینی ئایەتەكانە لە نازڵبووندا هەروا ئاخیر ئایەتە لەو ئایەتانەی باسی ئافرەتو پیاوی كـردووە دوای ئـەوەی لـەوەپێش هـەر دەربـارەی پیـاو ئایـەت نازڵ دەبوون بە تایبەتی.

لەمـەوە بۆمـان ڕون دەبێتـەوە: كـە ئایـەتی ﴿فَاسْـتَجَابَ لَهُـمْ رَبُّهُمْ.........﴾ كۆتا ئایەتی سێ ئایەتە نازڵبووەكانـەو كۆتـا ئایەتـە كـە نـازڵ بووبێو باسی ئافرەتی لەخۆ گرتبێ.

٨- ڕایەكی تر هەیە دەڵێ: كۆتا ئایەتێك نازڵبووبێ ئایەتی ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَـهُ وَأَعَـدَّ لَـهُ عَـذَابًا عَظِيمًـا – النـساء/٩٣﴾ ئامـاژە بـەو حـەدیثـەی بوخـاریو غـەیری ئـەویش ڕیوایەتیان كردووە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوكی بـێ) كە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە، واتە ئایـەتی ﴿وَمَـن يَقْتُـلْ مُؤْمِنًـا مُّتَعَمِّـدًا فَجَـزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَـذَابًا عَظِيمًـا – النـساء/٩٣﴾ كۆتا ئایەتێكە نازڵ بووەو هیچ شتێك نەسخی نەكردۆتـەوە، كـە دەڵـێ: هـیچ شتێك نەسخی نەكردۆتەوە ئەوە دەگەیەنێ: كە ئاخیر ئایەتێك بـێ دەربـارەی كوشتنی موسوڵمان بە ئەنقەست هاتبێتە خوار.

٩- ڕایەكی تر هەیە دەڵێ: ئیمام موسلیم لە ئیبنو عەبباسـەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوكی بێ) نەقڵی كـردووە دەفـەرموێ: كۆتـا سـورەتی نـازڵ بوو سورەتی ﴿إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ – النصر/١﴾.[1]

ئەمەشیان وا ئاراستە كردووە دەڵێن: كۆتا سـورەتێكە كـە ئامـاژەی لـە دونیا دەرچوونی پێغەمبەری تێدا بـێ وەكوو هەنـدێ لـە هـاوەڵان لێـی حـاڵی بوون، یان ئاخیر سورەتە كە بە تەواوی نازڵ بووبێ.

---

[1] مسلم/٧٥٤٦.

ئـەم قـەول‌و راوبۆچـونانە هیـچیان حـەدیثیکیـان بـە دەسـتەوە نیـە بەرزکرابێتەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەریەکەیان بـە جۆرە ئیجتیهادێك‌و بە ظەننێکی غالب ئەو رایەی گوتووە، ئیحتیمالی ئەوەش هەیـە هەریەکـەیان هـەوالّی لـە کۆتـا بیـستراوێك دابـێ کـە لـە پێغەمبـەری بیستووە.

یـان ئـەو رایـەی بـەو ئیعتیبـارە گوتبـێ، کـە کۆتـا نـازڵبووی بـوارێکی تایبەتی‌و تەشریعێکی خاص بێ، یان کۆتا سورەتێك بێ بـە تـەواوی هـەمووی نازڵ بووبێ، وەکوو ئێمە بۆ هەر ڕایەك ئاماژەمان پێ کردووە.

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکـەین کـە ئایـەتی ﴿حُرِّمَـتْ عَلَـيْكُمُ الْمَيْتَـةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيـرِ وَمَـا أُهِـلَّ لِغَيْـرِ اللّـهِ بِـهِ وَالْمُنْخَنِقَـةُ وَالْمَوْقُـوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَـةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْـتُمْ وَمَـا ذُبِـحَ عَلَـى النُّـصُبِ وَأَن تَسْتَقْـسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِيـنِكُمْ فَـلاَ تَخْـشَوْهُمْ وَاخْـشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًـا فَمَـنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَـإِنَّ اللّـهَ غَفُـورٌ رَّحِيـمٌ – المائـدة/٣﴾ ئـەم ئایەتە لە عەرەفە لە حەجی ماڵئاوایی‌دا نازڵ بـووە، ظاهیری ئایەتەکـە ئـەوە دەگەیـەنێ دیـاریکردنی ئـەحکام‌و فـەرزەکان تـەواو بـووە‌و ڕوونکرانـەوە، بێگومان لەوەپێش ئاماژە بـۆ ئـەو ڕیوایەتـە نـەکرا: کـە دەربـارەی نـازڵبوونی ئایەتی ریبا‌و ئایەتی (الدَین)‌و ئایەتی (کەلالە)‌و غەیری ئەوانیش کرا، بۆیـە زۆر لـە زانایـان رسـتەی ﴿أَكْمَلْـتُ لَكُـمْ دِيـنَكُمْ...﴾یـان وا مانـا کـردووە‌و فەرموویانە: خودا نیعمەتی خۆی بەسەردا دارشتوون بـەوە: کـە لـە مەککـەدا جێگیری کـردوون‌و توانیـان دەسـەلات بگرنـە دەسـت‌و بتپەرسـتەکان پـەراوێز بخـەن‌و بۆخۆیـان حـەج بکـەن‌و موشـریك ڕێگـەیان نـەبێ هاوبەشـی حـەجی موسوڵمانان بکەن، بێگومان لـەوەپێش بتپەرسـتەکان هاوبەشـی حـەج کردنـی

موسـولمانانیان دەکـرد ئەمـەش تەواوکـەری نیعمـەتی خودایـە بەسـەر موسولمانانەوە.

قازی ئەبو بەکری باقلانی لە کتێبی (الإنتصار)دا تەعلیقی لەسەر زۆری ڕیوایات دەربارەی کۆتا بەشی نازڵبووی قورئان نووسیوەو دەفەرموێ: ئەم ئەقوال‌و ڕیوایاتانە هیچیان ڕستەو سەنەدیان نەگەیشتۆتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوابێ وێدەچێ هەریەکەیان بە جۆرێك لە ئیجتیهادو گومانسواری ئەو ڕایەیان دەبڕیبێ، هەروا وێدەچێ هەریەکێ لە خاوەنی ئەو ڕایانە هەواڵی لە ئاخیر شتێك دابێ: کە لە پێغەمبەری بیستووە (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو ڕۆژەدا وەفاتی کردووە، یان پێش نەخۆشی‌یەکەی بە ماوەیەك، ئەمجار یەکێکی تر لەوی بیستبێ، با ئەم شەخصی دووەمە خۆی لە پێغەمبەری نەبیستبێ.

وێدەچێ ئەو ئایەتانەی کە کۆتا ئایەتێك بووە نازڵ بووەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ چەند ئایەتێکی تر کە لەگەڵی نازڵ بوون خوێندبێتەوە ئەمجار فەرمانی کردبێ بە نووسینەوەی ئەو ئایەتانەی لەگەڵی دابەزیون دوای نووسینەوەی ئایەتە کۆتاکە، پاشان واگومان برابێ: کە ئەو ئایەتانە کۆتا ئایەتی نازڵبوون لەڕوی تەرتیبەوە.[1]

## ئەو ئایەتانەی لە باسێکی تایبەتی‌دا یەکەم ئایەتن لە نازڵبووندا

زانایانی ئیسلام ئەو ئایەتانەشیان دەستنیشان کردووە کە یەکەمجار لە باسی شتێکی تایبەتی‌دا نازڵ بوون:-

١- یەکەم ئایەتێك لە بواری خۆراکدا، یەکەم ئایەت: کە لە مەککە نازڵبووبێ لەو بوارەدا ئایەتی ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ

---

[1] بڕوانە: الإتقان/٦٩ البرهان/١/٢١٠.

يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – الأنعام/١٤٥﴾ پاشان ئايەتى ﴿فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ حَلالاً طَيِّبًا وَاشْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ، إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخَنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ – النحل/١١٤ – ١١٥﴾ پاشان ئايەتى ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – البقرة/١٧٣﴾ ئەمجار ئايەتى ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – المائدة/٣﴾.

## یەکەم ئایەت: کە دەربارەی خواردنەوەکان دابەزیوە

یەکەم ئایەت: کە دەربارەی خەمر نازڵ بووە ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ – البقرة/٢١٩﴾ پاشان ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلاَ جُنُبًا إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىَ تَغْتَسِلُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا – النساء/٤٣﴾ ئەمجار ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن

يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ – المائدة/٩٠ – ٩١﴾.

له ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایەت کراوە دەفەرمویێ: دەربارەی خەمر سێ ئایەت نازڵ بوون.. یەکەم شتێك نازڵبووبێ ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ – البقرة/٢١٩﴾ پێیان ڕاگەیەندرا خەمر حەرام کرا، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێگەمان بدە با سودی لێ وەربگرین وەکوو خودا بۆخۆی فەرموویەتی، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێیان بێ دەنگ بوو، پاشان ئەم ئایەتە نازڵ بوو ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلاَ جُنُبًا إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىَ تَغْتَسِلُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا – النساء/٤٣﴾ پێیان ڕاگەیاندرا کە شەراب حەرام بووە، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەکاتی نزیکبوونەوەی نوێژدا نایخۆینەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێیان بێدەنگ بوو، پاشان ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ – المائدة/٩٠ – ٩١﴾ نازڵ بوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شەراب حەرام بوو.[1]

---

[1] اخرجه الطیالسی فی مسنده/٢٠٦٩ والبیهقی فی الشعب/٥١٨١.

٢- یەکـەم ئایـەت: کـە دەربـارەی جـەنگ نـازڵ بـووە، لـە ئیبنـو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایـەت کـراوە دەفـەرموێ: یەکەم ئایەت دەربارەی جەنگ نازڵ بووبێ ئایەتی ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـاتَلُونَ بِـأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ - الحـج/٣٩﴾.

## سوودی ئەم باسە:

**بۆ زانینی یەکـەم بەشی نـازڵبوو لـە قورئـانو دوابەشـی نـازڵبوو چـەند سوودو قازانجێک هەیە:**

أ/ ڕوونکردنەوەی ئەو گرنگی پێدانەی قورئان بەری کـەوتووە لـەڕوی پارێزگـاریکردنی لـە تـەحریفو گۆڕانکـاریو کـۆنترۆڵ کردنـی ئایەتـەکانی، بێگومـان هـاوەڵان ئـەم قورئانـەیان ئایـەت ئایـەت لەبـەر کـردووە، لەهـەموو ڕویەکەوە ئاگایان لێ بووە، دەیـانزانی فـلان ئایـەت کـەیو لـەکوێ نـازڵ بـووە، چـونکە ئـەوان ئـەو نیگایـەی دادەبەزییـە سـەر پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسەر بێ) خێرا وەریان دەگرتو دەیانقۆستەوەو کاریان پێ دەکرد.

وەکـوو موسـوڵمانێکی راسـتاڵ: کـە ئـەرکانو بنـەما ئایینیـەکانی وەربگرێ، بوژێنـەرەوەی ئیمانی فێر ببێ، سەرچاوەی عیزو شکۆمەندی خـۆی بەدەسـت بێنـێ، لـە ئاکـامی ئـەم گرنگـی پێدانـە بـەم شـێوە سەرسـوڕهێنەرە قورئان پارێزراو گۆڕانو تەحریف پەی پێ نەبرد ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ - الحجر/٩﴾.

ب/دەرککـردنو ئاگـاداربوون بەسـەر نهێنـی تەشـریعی ئیـسلامیدا لەمێـژووی سەرچـاوە رەسـەنەکەیەوە، بێگومـان ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز چارەسـەری نەفـسی ئـادەمیزادی کـردووە بـە رەهنومـایی ئاسمـان بەشـێوازی حەکیمانـە ئاخـاوتنی لەگـەڵ خـەڵك کـردووە: کـە نـەفسو دەرونیـانی بـە پەیژەی کەماڵو شکۆمەندیدا سەرخستووە، پێ بەپێو بە تەدریج ئـەحکامی

ئاراستەکردوون‌و مەنهەجی ژیانی لەسەر حەق‌و راستی راگیر کردوون، کاروباری کۆمەڵایەتی‌و کەسایەتی ئادەمیزادی لەسەر ڕێگای راست‌و حەق ڕێك خستووە.

ج/جیاکردنەوەی ناسیخ لە مەنسوخ، چونکە وادەبێ لە یەك مەوضوعدا دەربارەی یەك شت، دوو ئایەت، یان چەند ئایەتێك نازڵبوون، حوکمی ئەمیان لەهی ئەوی تریان جوداوازە، جا ئەگەر زاندرا کامەیان یەکەمجار نازڵ بووەو کامەیان دواجار نازڵ بووە، دەزاندرێ حوکمی ئەوەی دوایی نەسخکەرەوەی حوکمی ئەوەی پێشەوەیە.

## ٦) اسباب النزول (هۆکاری نازڵبوونی ئایەت‌و سورەتەکانی قورئان)

قورئانی پیرۆز بۆیە نازڵ بووە مرۆڤایەتی رەهنومایی بکا بۆ ڕێبازی حەق‌و راست، شارەزاییان بکا بۆ مەنهەجی بەختەوەری‌و سەرفرازی، بۆیە نێردراوە تا بناغەکانی ژیانی ئاسودەیی بۆ مرۆڤایەتی دابمەزرێنێ‌و لەسەر ئەو بناغە تۆکمەو حەقانە کۆمەڵگایەك پێك بێنێ لەسەر ئیمان بەخوداو بە پێغەمبەرایەتی، ڕابردوو ئێستاو داهاتووی لەخۆ گرتووەو چەسپاندونی، ڕوداوەکانیان تەقریر دەکا، زۆربەی زۆری قورئان لە سەرەتادا بۆ ئەم ئامانجە گشتیانە نازڵ بووە، وەلێ هاوەڵان بە هەڵس‌وکەوتیان لە خزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ڕوداوەکانی سیرەیان بینیوە.

وا ڕێکەوتووە لەناویاندا ڕوداوێك ڕویداوە، پێویستی بەوە بووە بزاندرێ رای شەریعەت چۆنە بەرامبەری، یان لە حوکمەکەدا دەکەوتنە ئیلتیباسەوەو لێیان دەشێواو نەیان دەزانی چی بڵێن‌و چی بکەن، پرسیاریان لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەکرد، بۆ زانینی حوکمی ئیسلام بەرامبەری، ئیتر ئایەتی قورئان دادەبەزی‌و حوکمی ئیسلامی بەرامبەر ئەو

ڕوداوە ڕوون دەكردەوە، یان وەڵامی پرسیارێكی هاوەڵان، یان غەیری ئەوانی دەدایەوە، ئەم حاڵەتو ڕوداوو پرسیارانە پێیان دەگوترێ: (أسباب النزول).

## گرنگیدانی زانایان بە سەبەب نزول

بێگومان توێژەرانو زانایان لە بواری (علوم القرآن)دا گرنگی زۆریان داوە بە زانینی سەبەب نزول، هەستیان بەوە كردووە: كە زانینی سەبەب نزول زۆر پێویستە بۆ تەفسیری قورئان، زانینی سەبەب نزول دەرگا بۆ خوێنەرو ڕاڤەكەری قورئان والا دەكا بچنە ناو زانستی تەفسیرەوەو لەو مەیدانەدا قەڵەمی خۆیان رادەن، بۆیە جەماعەتێك لە زانایان بە تایبەتی كتێبیان تێدا داناوە، بەناوبانگترینی ئەو زانایانە عەلی كوڕی (المدینی)یە: كە شێخی ئیمامی بوخارییە، پاشان ئیمام (الواحدی)یە كتێبێكی داناوە بەناوی (أسباب النزول)ەوە، ئەمجار (برهان الدین)ی الجعبری هات كتێبەكەی واحیدی كورت كردەوە سەنەدی ڕیوایەتەكانی حەذف كردنو هیچی لێ زیاد نەكردن ئەمجار شەیخولئیسلام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی كتێبێكی دانا لەبواری (أسباب النزول)دا شێخی سیوطی بەشێكی لە دەستنووسی ئەو كتێبەی بینیوە بە خزمەت هەمووی نەگەیشتووە، ئەمجار شێخی سیوطی خۆی كتێبێكی یەكانگیرو پوختو كەم وێنەی لەو بوارەدا داناوە، بۆخۆی دەڵێ ناوم نا (لباب النقول فی أسباب النزول).

## ئەوەی لەبواری زانستی ئەسباب نزولدا پشتی پێ دەبەسترێ

زانایان لەبواری زانینی هۆکاری نازڵبوون پشت بە ڕاستیو دروستی ڕیوایەتەکان دەبەستن: کە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ)، یان لە هاوەڵانەوە ڕیوایەتکراون، چونکە هەواڵدانی صەحابە دەربارەی ئەم جۆرە شتانە ئەگەر بە صەراحەت بوو بەڕای ئەو نازمێردرێ، بەڵکوو حوکمی حەدیثی مەرفوعی هەیە.

ئیمامی واحیدی دەڵێ: دروست نیە نابێ قسە لە ئەسبابی نزول بکرێ مەگەر لەسەر بنەمای ڕیوایەتو بیستن لەوانەی دابەزینی ئایەتو سورەتەکانیان زانیوەو لێکۆڵینەوەی زانستییان تێدا کردووەو لێبڕاون بۆ بەدەستهێنانی ئەو زانستە پیرۆزە.

ئەمە ڕێبازی زانایانی سەلەف بووە، بێگومان ئەوان خۆیان لەوە پاراستووە شتێك بڵێن: نەچوبنە بنجو بنەوانی، موحەممەدی ئیبنو سیرین دەڵێ: دەربارەی ئایەتێکی قورئان پرسیارم لە عەبیدەی کوڕی عومری (السلمانی) کرد دەربارەی ئایەتێکی قورئان، فەرمووی: لەخودا بترسەو ڕاستگۆبە، ئەوانە ڕۆیشتن: کە دەیانزانی ئایەتو سورەتەکانی قورئان دەربارەی چی نازڵ بوونو هۆکاری نازڵبوونەکەیان چی بووە، مەبەستی بەوانە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو.

جا کە ئەمە قسەو بۆچوونی ئیبنو سیرین بێ: کە یەکێکە لەپیاوە ناودارەکانی چینی دوا هاوەڵان لەڕوی توێژینەوەو پشکنینو بەراورد کردنی ڕیوایەتەکانو وردەکاری لە هەڵاواردندا، دیارە بێگومان هەڵوێستەکەی ئەوە دەگەیەنێ: کە پێویستە لەبەردەم هەبوونی ئەسباب نزولی صەحیحو ڕاستو دروستدا ملکەچ بین پەل بەملاو بەولادا نەهاوین، چونکە قسەی پشت پێ بەستراو لەناو ئەقوالی صەحابەدا دەربارەی ئەسبابی نزول ئەو قسەیەیە کە صیغەو شێوازی وەکوو (مسند) ڕیوایەت کرابێ، واتە: صیغەکە بە ڕونی ئەوە

بگەیەنێ کە ئەو فلاّن شتە، ئەو فیسار ڕوداوە سەبەب نزولی ئەم ئایەت، یان ئەو سورەتەیە.

شێخی سیوطی پێی وایە قسەی تابیعی ئەگەر دەربارەی سەبەب نزول صەریح بوو، ئەوە وەردەگیرێ، ڕیوایەتەکەشی بە مورسەل دادەنرێ ئەگەر (موسنەدو ئیلەیهییەکەی) صەحیح بوو، یەکێکیش بوو لە ئیمامەکانی تەفسیر: کە لە هاوەڵانەوە زانستیان وەرگرتبێ، وەکوو (موجاهیدو عکرمەو سعید بن جبیر) بە مورسەلێکی تریش پاڵپشت کرابێ.

لەبەر ئەم گرنگی پێدانەو حەزەرکردنەیە: کە ئیمامی واحیدی ڕەخنەی لە زانایانی سەردەمی خۆی گرتووە لەوەدا کە ئاسانکارییان کردووە لە ڕیوایەت کردنی سەبەب نزولدا بە بوختانکەرو درۆزنی لە قەڵەم داون و هەڕەشەی توندی لێ کردوون و بەشیاوی زانیون بۆ عەزابی توندو بەشیدەت بە دەق دەڵێ: (أما اليوم فكل أحد يخترع شيئا، ويختلف أفكا وكذبا، ملقيا زمامه إلى الجهالة غير مفكر فى الوعيد للجاهل بسبب الآية).

## پێناسەی سەبەب نزول

**دوای ئەو توێژینەوەی ئەنجامدرا بۆمان دەردەکەوێ کە سەبەب نزول لەسەر دوو حاڵەت کورت هەڵدێ:**

١- ڕوداوێك ڕویدابێ و قورئان دابەزیبێ دەربارەی، وەکوو ئەو ڕوداوەی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لە باوکی بێ) دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ – الشعراء/٢١٤﴾ نازلبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ دەرکەوت و ڕۆیی سەرکەوتە سەر کێوی صەفا، ئیتر هاواری کرد فەرمووی: «يَا صَبَاحَاهْ» ئای لەو بەلاّیەی بەڕێوەیە لە بەرەبەیاندا یەخەتان بگرێ! ئیتر قوڕەیشییەکان لێی کۆبوونەوەو پێی فەرموون: «أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً تَخْرُجُ مِنْ سَفْحِ هَذَا الْجَبَلِ أَكُنْتُمْ

مُصَدِّقِيَّ» هەڵوێستان چی دەبێ ئەگەر هەواڵتان بدەمێ کە کۆمەڵێك ئەسپ سوار لە پێدەشتو ئەودیو ئەو کێوە خۆیان ئامادە کردووە هێرشتان بکەنە سەرو لە کەمیندان بۆتان، ئایا ئێوە بڕوام پێ دەکەن؟ هەموویان تێکڕا وتیان: ئەی چۆن بڕوات پێ ناکەین، ئێمە تا ئێستا درۆمان لێ نەبیستووی، نەمان دیوە درۆیەك بکەی، ئەمجار فەرمووی: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ» ئەمن ترسێنەری ئێوەم، لە هاتنی عەزابێکی کوشندەو ترسناك ئەگەر بڕوام پێ نەکەن یەخەتان دەگرێو ڕزگارتان نابێ لە چنگی! ئەبولەهەب وتی: دەك بە کوشت چیو داوەشێی ئەمە بۆ ئەوە کۆتکردینەوە؟ ئیتر هەڵساو ڕۆیی، دوابەدوای ئەم حاڵەتە، سورەتی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ..........﴾ نازڵ بوو[1].

٢- حاڵەتی دووەم: ئەوەیە پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکرێ دەربارەی شتێكو قورئان دابەزێ بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمی ئەو شتە، وەکوو ئەو حاڵەتەی خەولەی کچی ثەعلەبە کاتێك مێردەکەی: کە ئەوسی کوڕی صامیت بوو ظیهاری لێ کردو لەخۆی حەرام کرد، سەرجێی بکاو پێی گوت: ئەتۆ وەکوو پشتی دایکم وایو لێم حەرام بی، ئیتر خەولە دوای ظیهارەکە هاواری لێ هەڵساو چاری نەماو شکوای خۆی بردە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پاكو بێ عەیبە ئەو خودایەی هەموو شتێك دەبیسێ، سوێندم بەخودا من ئەو دەمەی خەولە شکوای خۆی لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد ئەوەندە بە سرتەوە وەزعی خۆی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە، هەندێ وشەو ڕستەیم گوێ لێ بوو تێیان دەگەیشتم لە هەندێکی نەدەگەیشتم، دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوس گەنجیەتی فەوتاندم،

---

[1] أخرجه البخاري/٤٩٧١ ومسلم/٥٠٨.

ڕیخۆڵە ڕژاوبووم‌و منداڵم لێی هەیە، ئێستاکە تەمەنی جوانی‌و گەنجیم بەسەرچووە، بەساڵاچووم‌و لە سك کردن وەستاومەوە، ظیهاری لێ کردووم! خودایە من شکایەتی خۆم هەر لای تۆ دەکەم، عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: زۆری پێ نەچوو حەزرەتی جوبرائیل ئەم ئایەتانەی هێنان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ - المجادلة/١﴾ ئاشکرایە مەبەست بە وشەی (زەوج) ئەوسی کوڕی صامیتە.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ: کە دەبێ بۆ هەموو ئایەتێك سەبەب نزول بدۆزینەوە، چونکە قورئانی پیرۆز نازڵبوونەکەی وەقف نیە لەسەر ڕوداو وەقائیع، یان لەسەر پرسیارو پرسیارکردن، بەڵکوو سەرەتا قورئان نازڵ دەبوو بەو ئایەتانەی عەقیدەو ئیمانیان لەخۆ دەگرت، ئەو ئایەتانە دادەبەزین: کە واجباتی ئیسلام‌و شەریعەتی خودایان تێدا بەیان دەکرا دەربارەی ژیانی تاك‌و کۆمەڵ.

الجعبری: دەفەرموێ: قورئان بە دوو شێوە دابەزیوە بەشێکی سەرەتا دابەزیوە، قسمێکی دوای ڕودانی ڕوداوێك، یان پرسیارکردنی یەکێك نازڵ بووە، بۆیە پێناسەی (سبب نزول) بەم شێوەیە دەکرێ دەگوترێ: سبب نزول: بریتییە لەو ڕوداوو پرسیارەی قورئانەکە دەربارەی نازڵ بووبێ لەکاتی ڕوودانەکەیاندا.

لەڕاستیدا زێدەڕەوی‌یە ئێمە لە زانستی (سبب نزول)دا دەستبلاوی بکەین بەجۆرێك هەواڵ‌و سەربردەی نەتەوەکانی پێشوو ڕووداوەکانی ڕابردو بکەینە جۆرێك لە ئەسباب نزول، ئەمەش بۆ ئەوەی هەندێ شت هەیە ئیمامی واحیدی لە تەفسیرەکەیدا کردونی بە سەبەب نزول بچنە دەرەوە، وەکوو ئەوە دەگوترێ: سورەتی (الفیل) هۆکاری نازڵبوونەکەی چیرۆکی

هێرشی حەبەشییەکانە، چونکە بەهیچ جۆرێ ئەوە بە سەبەب نزول حیساب ناکرێ، بەڵکوو ئەوە خەبەردانە لە ڕوداوی رابردو، وەکوو چیرۆکی گەلی نوحو عادو ثەمودو دروستکردنی کەعبەو ئەوجۆرە شتانە هەروا باسی ئیبراهیم لە ئایەتی ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً - النساء/١٢٥﴾ هۆکاری ئەوە کە پەروەردگار حەزرەتی ئیبراهیمی کردووە بە دۆستو خۆشەویستی خۆی ئەمە نابێتە سەبەب نزول بەهیچ شێوەیەك.

## سودەکانی زانینی (سبب نزول)

**زانینی سەبەب نزول چەند سودێکی هەیە، هەرە گرنگیان ئەمانەن:-**

أ/ ڕوونکردنەوەی حیکمەتو داخوازی تەشریعکردنی حوکمێك لە ئەحکام، هەست کردن بە ڕەچاوکردنی شەرع بۆ بەرژەوەندی گشتی لەبواری چارەسەرکردنی ڕووداوەکان.

ب/ تایبەتمەندکردنی حوکمی ئایەتە دابەزیوەکە، ئەگەر هاتوو بە صیغەی عموم بوو بە سەبەبەکە، ئەمەلای ئەوانەی کە پێیان وایە عیبرەت بە خصوصی سەبەبە بە عومومی لەفظ نیە، ئەمە مەسئەلەیەکی خیلافییە لەوە بەملاوە زیاتر ڕونی دەکەینەوە.

وادەبێ نموونە بۆ ئەمە ئایەتی ﴿لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - آل عمران/١٨٨﴾ دەهێننەوە، ئەوەتا دەگێڕنەوە کە مەڕوان بە دەرگاوانەکەی خۆی گوت: ئەی رافیع بڕۆ بە ئیبنو عەبباس بڵێ: ئەگەر هەرکەسێك لە ئێمە کەیف خۆش ببێ بەوەی پێی دراوەو پێی خۆش بێ سوپاسی بکرێ بە کارێك کە نەیکردووەو بەوە شیاوی سزا بێ ئەوە ئێمە

هـــەموومان ســـزا دەدرێـــین؟ ئیبنـــو عـــەبباس فـــەرمووی: ئـــەو ئایەتـــە چ پەیوەندییەکی بە ئێوەوە هەیە؟ ئەم ئایەتە لە ڕاستیدا دەرحەق بە ئەهلی کیتاب نازڵ بووە ئەمجار ئایـەتی ﴿وَإِذَ أَخَذَ اللّـهُ مِيثَـاقَ الَّـذِينَ أُوتُـواْ الْكِتَـابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاء ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْاْ بِهِ ثَمَنـاً قَلِيلاً فَبِـئْسَ مَـا يَشْتَرُونَ آل عمران/١٨٧﴾ی خوێندەوە.

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـە بـاوکی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا پرسـیاری شـتێکی لێ کـردن، ئـەوانیش ژێـر لێویانـداو شتەکەیان دەرخست، واشیان نیشاندا ئەوەی لێیان پرسیار کراوە وڵامیان داوەتەوەو بەهیوابوون لەسەر ئەوە سوپاسیان بکرێ‌و کەیفخۆشبوون بەوەی توانیویانە ئەوەی لێیان پرسیار کراوە بیشارنەوە[1].

ج/ ئەگـەر لـەفظـە نازڵبووەکـەی قورئـان گـشتگیر بـوو، بەڵگـەی تەخصیص‌و تایبەتبوونی وارید بوبوو، ئەوە زانینی هۆکاری نازڵبوونی، وشە گـشتگیرەکە تایبەتمەندییەکـە کـورت هەڵـدێنێ لەسـەر غـەیری شـێوەکەی (فمعرفة السبب تقصر التخصيص على ماعدا صورته).

دروست نیە لەو شێوە دەربهێندرێ، چونکە داخڵبوونی شێوەی هۆکار لە لەفظە گشتگیرەکەدا قەطعی‌و بەڵگە نەویستە، دروست نیە بە ئیجتیهاد دەربهاویـژرێ، چونکە ئیجتیهادەکە ظەننـی‌و بۆچوون‌و ڕادەربڕینـە، ئەمە کۆڕای جەماوەری زانایانی لەسەر بەستراوە، نموونەشی بـەم ئایەتـە دێننـەوە: کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الـدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ، يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْـسِنَتُهُمْ وَأَيْـدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُـمْ بِمَـا كَانُوا يَعْمَلُونَ ، يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ – النور/٢٣ – ٢٥﴾ ئەم ئایەتە بەتایبەتی دەربارەی خاتو عائیشە (حـەرەمـی)

---

[1] بڕوانە بوخاری حەدیثی ژمارە (٤٥٦٨) وە موسلیم ژمارە (٧٠٣٤).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازڵ بووە، یان دەربارەی ئەوو باقی خێزانەکانی تری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازڵ بووە.

لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ................﴾ بە تایبەتی دەرحەق بە خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) نازڵ بووە.[1]

هەر لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایەتکراوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی خاتو عائیشەو خێزانەکانی تری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازڵ بووە، هەرکەسێك بوختان بەو خێزانانەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکا تۆبەی بۆ نیە، بەلاّم کەسێك بوختان بە ئافرەتێکی تری موسوڵمان بکا، بەدەر لە خێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر دوایی تۆبە بکا خودا تۆبەکەی لێ وەردەگرێ.

پاشان ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ ، إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ – النور/٤ – ٥﴾ خوێندەوە، لەسەر ئەم بنەمایە قبوڵکردنی تۆبەی بوختانکەر هەرچەندە تەخصیصی ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ – النور/٢٣﴾ دەکا، وەلێ ئەم تەخصیصو تایبەتکردنە کەسێك ناگرێتەوە بوختانی بۆ عائیشە، یان بە خێزانەکانی تری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردبێ، دەی ئەم جۆرە کەسە تەوبەی لێ قبوڵ ناکرێ،

[1] أخرجه الحاكم (٦٧٣١).

چونکە داخڵبوونی وێنەی هۆکاری نازڵ بوونەکە لە لەفظە گشتگیرەکە قەطعییە.

د/ زانینی سەبەب نزول باشترین ڕێگایە بۆ تێگەیشتن لەمانای قورئانو لابردنی تەمومژێك کە دەورەی مانای هەندێك ئایەتی قورئانی داوەو تەفسیرەکەی باش ڕون نابێتەوە تا هۆکاری نازڵبوونەکەی نەزانی، بۆیە ئیمامی واحیدی دەفەرموێ: هەندێك ئایەت هەن مومکین نیە بتواندرێ تەفسیر بکرێو مانای بە ڕونی بزاندرێ بەبێ ئەوەی هۆکاری نازڵبوونیو ئەو بارودۆخەی تێیدا نازڵ بووە بزانی، واتە: بەبێ زانینی ئەو هۆکارو بارودۆخە ناتواندرێ مانای ئایەتەکە بزاندرێ.

ئیبنو دەقیق العید دەڵێ: زانینی سەبەب نزولی ئایەت ڕێگەی بەهێزە بۆ تێگەیشتن لە مانای قورئان.

ئیبنو تەیمیە دەڵێ: زانینی سەبەب نزول یارمەتیدەرێکی بەهێزە بۆ تێگەیشتن لە مانای ئایەت، بێگومان زانینی سەبەب نزول زانینی مانای (مُسبَب)ەکەی لێ وەدی دێ کە خودی ئایەتەکەیە.[1]

بۆ نموونە مەروانی کوڕی الحکم مانای ئایەتی ﴿لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – آل عمران/١٨٨﴾ی لێ چەواشە بوبوو، لێی حاڵی نەدەبوو، هەتا ئیبنو عەبباس هۆکاری نازڵبوونەکەی بۆ ڕوونکردەوەو تێی گەیاند، هەروا ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ – البقرة/١٥٨﴾ ئەوەتا ظاهیری ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ کە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە فەرزو واجب بێ چونکە ڕستەی ﴿فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ......﴾.

---

[1] بڕوانە الإتقان ص٧١.

مفیدی ئیباحەیە نەك وجوب، تەنانەت هەندێ لە زانایانو هاوەڵان کاریان بە ظاهیری ئایەتەکە کردووەو فەرموویانە ئەو هاتوچۆیە واجب نیە.[1]

ئەوەبوو خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم باسەی بۆ ئیبنو زوبەیر شیکردەوە، بەهۆی ڕوونکردنەوەی سەبەب نزولی ئایەتەکە تێگەیشتنە هەڵەکەی ئیبنو زوبەیری ڕاست کردەوە، ئەوەبوو هاوەڵان پێیان وابوو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە هەرئەوەندەیە گوناهو تاوان نیە، لەم ڕووەوە کە ئەمە کردەوەی سەردەمی نەزانی بوو مابووەوە بۆ زەمانی ئیسلام.

ئەوەبوو لەسەردەمی نەزانیدا (ئیساف) کە بتێك بوو لەسەر لوتکەی صەفا دانرابوو، لەسەر لوتکەی مەروەش بتی (نائیلة) دانرابوو، ئەم دوو بتە خەڵکی سەردەمی نەزانی ڕێزیان لێ دەگرتن، لەکاتی هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە کە دەگەیشتنە لایان دەستیان پێدا دەهێنانو خۆیانیان پێ پیرۆز دەکرد.

لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە دەفەرموێ: (عوروة) وتی: ئەتۆ نابینی ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ – البقرة/١٥٨﴾ چ حوکمێك دەگەیەنێ؟ من پێم وایە بەگوێرەی مانای ئەم ئایەتە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە کەسێك نەیکا هیچی ناکەوێتە سەر، خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی: بەڕاستی خراپ لە ئایەتەکە حاڵی بووی، مانای ئەم ئایەتە وەکوو تۆ بۆی چوی هەڵەی، ئەگەر ئەو مانایە مەبەست بوایە دەبوایە بیگوتایە (فلا جناح علیە أن لایطوف بهما) بەڵام ئەوەتا فەرمووی: ﴿فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ وەلێ تۆ بزانە ئەم ئایەتە

---

[1] زومەخشەی دەڵێ: ئەبو حەنیفە فەرموویەتی: هاتوچۆی نێوان صەفا واجبە روکنی حەج نیە، ئیبنو عەبباسو ئیبنو زوبەیرو ئەنەسی کوڕی مالیكو ئیبنو سیرین فەرموویانە واجب نیە.

كه نازڵ بووه، هۆكارەكەی ئەوەبوو ئەنصارەكان پێش ئەوەی موسوڵمان بن، طقوس‌و هەراوقولەقولیان بۆ بتی (مناة) دەكردو دەیانپەرست، جا ئەوانە دەكەوتنە حەرەج‌و دڵەڕاوكێوە: كە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە بكەن، پرسیاریان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد دەربارەی ئەو حاڵەی خۆیان‌و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لە ڕۆژگاری نەفامی‌دا دەكەوتینە حەرەج‌و نەماندەویست بەو حاڵەمانەوە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە بكەین، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ – البقرة/١٥٨﴾ی نازڵ كرد.

پاشان خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی داهێناو كردی بە بەشێك لە ڕوكن‌و پێداویستی كاروباری حەج‌و كەس بۆی نیە تەركی هاتوچۆی نێوانیان بكا.[1]

هـ- سەبەب نزول ئەوە ڕون دەكاتەوە: كە فلان ئایەت دەرحەق بە فلان كەس نازڵ بووە، بۆ ئەوەی لەكاتی كێشەو دوژمنایەتی‌دا بەبێ بەڵگەو دەلیل بە ملی ناحەزەكەی بدا، وەكوو ئەو حیكایەتەی دەربارەی ئایەتی ﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتْ الْقُرُونُ مِن قَبْلِي وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ وَيْلَكَ آمِنْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ – الأحقاف/١٧﴾ دەگێڕدرێتەوە دەڵێن: مەعاویە ویستی یەزید بخاتە شوێنی خۆی بیكاتە خەلیفەی موسوڵمانان دوای خۆی، نامەی بۆ مەروان نووسی كە كاربەدەستی خۆی بوو لەسەر مەدینە: كە بانگەشەی بۆ بكا ڕازیبوونی خەڵكی بۆ بەدەست بێنێ، ئەویش خەڵكی كۆكردەوەو وتاری بۆ دان‌و بانگەوازی كردن بۆ ئەوەی بەیعەت بە یەزید بكەن (عبدالرحمن)ی كوڕی

---

[1] بوخاری ژمارە (١٦٤٣) ومسلم (٣٠٨١) وأحمد (٢٥١١٢).

ئەبو بەکر نارەزایی دەربڕیو بەیعەتی نەدایە، مەروان ویسی ئەزیەتی بدا عەبدوڕەحمان خۆی خستە ماڵی خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەگەر پەنای بۆ ماڵی عائیشە نەبردایە مەروان سزای دەدا، ئەمجار مەروان وتی: ئەم (عبدالرحمن)ە ئەوکەسەیە کە ئایەتی ﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتْ الْقُرُونُ مِن قَبْلِي وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ وَيْلَكَ آمِنْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ – الأحقاف/١٧﴾ی دەرحەق نازڵ بوو، خاتو عائیشە ڕەدی دایەوەو فەرمووی: نەخەیر وانیە، ئەمجار سەبەب نزولی ئایەتەکەی بۆ ڕوون کردەوە.........................

## عیبرەت بە گشتگیری لەفظەکەیە نەك تایبەتمەندی سەبەبی نازڵبوونی

ئەگەر وا ڕێکەوت لەفظو سەبەب هەردووکیان گشتگیر بوون، یان هەردووکیان تایبەتمەندبوون، ئەوە گشتگیرەکە حەمل دەکرێ بۆ سەر گشتی‌یەکەو تایبەتەکە بۆسەر تایبەتمەندییەکەی خۆی.

نموونەی ئەوە لەفظ گشتگیر بێو هۆکاریشی گشتگیر بێ ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ – البقرة/٢٢٢﴾ لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە دەڵێ: جولەکەکان دابو نەریتیان وابوو کە ئافرەتیان دەکەوتە عادەی مانگانەوە، لەناو خێزان وەدەریان دەنا، لەگەڵیان نانیان نەدەخواردو ئاویان نەدەخواردەوە، لەماڵدا دانیشتنو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نەدەکرد، لەمبارەوە پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ

إِنَّ اللّـهَ يُحِـبُّ التَّـوَّابِينَ وَيُحِـبُّ الْمُتَطَهِّـرِينَ – البقـرة/٢٢٢﴾ دابەزانـد ئـيتر پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) پێـی فـەرموون: ئێـوەی موسـوڵمان وامەکـەن، لەماڵدا دانیـشتن‌و هەڵس‌وکـەوتیان لەگەڵدا ئـەنجام بـدەن هـەموو تێکەلاوی‌و لەگـەڵ نوسـتن‌و لەگـەڵ خـواردن‌و خواردنـەوەیان لەگەڵدا بکـەن جگە لە جیماع‌و شتی وا.[1]

نموونەی ئەوە لەفظ خاص بێ‌و هۆکار خاص بێ ئایەتی ﴿وَسَـيُجَنَّبُهَا الأَتْقَى ، الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى ، وَمَا لأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى ، إِلاَّ ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّـهِ الأَعْلَـى ، وَلَـسَوْفَ يَرْضَـى – الليـل/١٧ - ٢١﴾ ئـەم ئایەتانـە دەرحـەق بـە حـەزرەتی ئـەبو بـەکر (رەزای خـودای لێ بـێ) نـازڵ بـوو وشـەی (الأَتْقَـى) ئەفضەلو تەفضیلە (أل)ی عەهـدی پێوەیـەو تایبەتـە بـەو کەسـەی دەربـارەی نازڵ بـووە، وشـەی (أل) کاتێـك موفیـدی عمومـە: کـە (موصـولە) بـێ یـان بـۆ تەعریف بێ بچێتە سـەر وشـەیەکی (جـەمع) دەی وشـەی (أل) لـە (الأَتْقَـى)دا (موصـولە) نیـە چـونکە (أل)ی (موصـولە) بـە (أفـضل التفـضيل)ەوە نالکـێ، وشەی (الأَتْقَى) جەمعیش نیە، بـەڵکوو تاکـە عەهدییەتەکـە هـەبوونی هەیـە، بەتایبەتی: کە صیغەی (أفعل) تەمیزو جیاکردنەوە دەگەیەنێ، ئـەم تـەمیزو جیایی‌یە کیفایەتە بۆ ئەوەی قەصرو کورتهـەڵێنان لـە ئایەتەکـەدا بێتـەدی‌و تاییبـەت بـێ بـەو کەسـەی دەربـارەی نـازڵ بـووە بۆیـە ئیمـامی واحیـدی فەرموویەتی وشـەی (الأَتْقَـى) لـە قورئانـدا مەبەسـت ئـەبو بـەکری صـدیقەو زۆربەی راڤەکەرانی قورئان لەسەر ئەوە یەك دەنگن.

لە عوروەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: ئەبوبـەکری صـدیق (رەزای خـودای لێ بـێ) حـەوت کۆیلـەی کڕینـەوە ئـازادی کـردن، هـەر حـەوتیان لەسـەر موسوڵمانبوونیان خرابوونە ژێر تەعزیب‌و ئەشکەنجەدانەوە، (بیلال، عامیری

---

[1] مسلم/٦٩٤ وأحمد/١٢٣٥٤.

كوڕی فوهەیرە، النهدیەو كچەكەی، أم عیسی، أمة بنی المؤمل) دەربارەی ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الأَتْقَى ، الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى ، وَمَا لأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى ، إِلاَّ ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الأَعْلَى ، وَلَسَوْفَ يَرْضَى – الليل/١٧ - ٢١﴾ تا كۆتایی سورەتەكە نازڵ بووە.[١]

لە عامیری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر زانیاریەكی لەم جۆرە ڕیوایەت كراوەو ئەمەشی زیاد كردووە: كە دەڵێ: ئەم ئایەتە ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى ، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى ، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى ، وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى ، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى ، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى ، وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى ، إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَى ، وَإِنَّ لَنَا لَلآخِرَةَ وَالأُولَى ، فَأَنْذَرْتُكُمْ نَاراً تَلَظَّى ، لا يَصْلاهَا إِلاَّ الأَشْقَى ، الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى ، وَسَيُجَنَّبُهَا الأَتْقَى ، الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى ، وَمَا لأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى ، إِلاَّ ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الأَعْلَى ، وَلَسَوْفَ يَرْضَى – الليل/٥ – ٢١﴾ دەربارەی ئەو واتە ئەبوبەكر (ڕەزای خودای لێ بێ) نازڵ بووە.

وەڵێ ئەگەر سەبەب تایبەت بوو ئایەتەكە بەشێوەی گشتی نازڵ بوبوو، ئەوە زانایانی ئوصول تێیدا كەوتوونە ڕاجیاییەوە: لەوەدا ئاخۆ عیبرەت بە عمومی لەفظە، یان بە خصوصی سەبەب؟!

١- جەماوەری زانایان پێیان وایە عیبرەت بەگشتگیری لەفظەكەیە نەك بە تایبەتمەندی هۆكارەكەی، كەوابێ ئەو حوكمەی لە لەفظە گشتگیرەكە وەردەگیرێ تایبەت نیە بە سەبەبە خاصەكەوە بەڵكوو تەجاوەز دەكا بۆ هاوشێوەكانیشی، وەكوو ئایاتی لیعانو شەڕمنەفرین كە دەربارەی بوختانكردنی هیلالی كوڕی ئومەییە بە ژنەكەی نازڵبوو.

لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوكی بێ) ڕیوایەت كراوە دەڵێ: هیلالی كوڕی ئومییە لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای

---

[١] أخرجه إبن أبى حاتم فى التفسير/١٩٣٦٧.

لەسەر بێ) تۆمەتی زیناکردنی پاڵ ژنەکەی داو وتی: لەگەڵ شورەیکی کوڕی سەمماءدا زینای کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو شایەت بێنە لەسەر ئەم داوایەت ئەگینا داری حەددی بوختانکردنت لەپشت دەدرێ.. هیلال وتی ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەبێو دەگونجێ یەکێك لەئێمە پیاو بەسەر ژنی خۆیەوە بگرێ، بچێ هەوڵ بدا شایەت پەیدا بکا بێنو روداو ببینن‌و ئەمجار شایەتی بۆ بدەن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەر دەیفەرموو شایەت بێنە، یان داری حەدی بوختانکردنت لەپشت دەدرێ، هیلال وتی: سوێندم بەوکەسەی تۆی بە پێغەمبەری رەوانەکردووە من راست دەکەم‌و ئەم خێزانەم لەگەڵ فلاندا زینای کردووەو دڵنیام پەروەردگار حوکمێك نازڵ دەکا پشتی من داری حەدی بوختانی لێ نەدرێ، حەزرەتی جوبرائیل دابەزیو هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتەکانی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنْ الْكَاذِبِينَ ، وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ – النور/٦ – ٩﴾ی بۆ هێنا، دەی ئەم حوکمە گشتگیرەی لەم لەفظە عامە وەردەگیرێ هەموو روداوێکی لەو جۆرەی روداوی هیلال‌و خێزانەکەی دەگرێتەوەو هیچ پێویست بە بەڵگەی تر ناکا.

ئەمە رای راجیح‌و راست‌و دروستەو لەگەڵ گشتگیری ئەحکامی شەریعەتدا یەك دەگرێتەوەو هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موجتەهیدو زانا پایە بەرزەکانی ئیسلام کاریان پێ کردووە، حوکمی وەرگیرانی ئایاتی لەم جۆرەیان تەجاوەز پێ کردووە بۆ سەر غەیری هۆکاری نازڵبوونەکە بۆ نموونە وەکوو نازڵ بوونی ئایاتی ظیهار دەربارەی ئەوسی کوڕی صامیت، یان سەلەمەی کوڕی صەخر: کە ئیختیلاف لە ریوایەتەکاندا

هەیە، هەروا وەكوو ئیحتیجاج بەگشتگیری ئایەتێك كە بەهۆكاری تایبەت نازڵ بوونو زانایان بۆ ڕوداوی هاوشێوەی هۆكارەكان حوكمیان پێ كردوون یاسای (عیبرەت بە گشتگیری لەفظە نەك بە تایبەتمەندی هۆكاری نازڵبوون)یان پەیڕەو كردووە.

ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ: ئەم قاعیدەیە زۆر ڕویداوەو زۆریش پەیڕەوكراوە، لەم نموونەو وێنانەی وتەی زانایان كە دەفەرموون: ئەم ئایەتە دەربارەی فلان شت نازڵ بووە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو شتەی دەیكەنە هۆكاری نازڵبوونی ئایەتە: كە مرۆڤێك بێ، وەكوو ئەوە دەڵێن: ئایەتی (ظیهار) دەربارەی ئەوسی كوڕی صامیت نازڵ بووە، یان دەڵێن: ئایەتی (كلالە) دەرحەق بە جابیری كوڕی عەبدوڵلا نازڵ بووە، هەروا ئایەتی ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ – المائدة/٤٩﴾ دەربارەی خێڵی بەنو قوریظەو بەنو نەضیر هاتۆتە خوارێ.

وێنەو نموونەی تریش: كە دەگوترێ ئەم ئایەتە، یان ئەم چەند ئایەتە دەربارەی كۆمەڵێك لە موشریكەكانی مەككە دابەزیون، یان دەرحەق بە قەومێكی جولەكەو مەسیحی، یان دەربارەی پێڕێك لە موسوڵمانان هاتۆنە خوار، دەی ئەم زانایانەی ئەم قسانەیان گوتوون مەبەستیان ئەوە نەبووە حوكمی ئەم ئایەتانە تایبەت بێ بەو كەسو تاقمانەی دەربارەیان نازڵبوونو حوكمەكەیان شمولی كەسانی دیكە ناكا، قسەی لەم جۆرە موسوڵمانو مرۆڤی عاقڵ نایكەن، زانایان هەرچەندە ڕای جیاوازیان هەبێ لە مانای ئەو لەفظە گشتییەی: كە بە هۆكارێك نازڵ بووە، ئاخۆ تایبەتە بە هۆكارەكەیەوە یان نا، هیچ لەو زانایانە نەیانگوتووە دەقە گشتگیرەكانی قورئانو سوننەت تایبەتن بە سەخصی موعەیەنو بەس!

کۆتا قسەیەك لەم بارەوە گوتبێتیان ئەوەیە کە گوتویانە ئەم دەقانە تایبەتن بە نەوع‌و پێڕی ئەوەی دەربارەی نازڵ بووەو شمولی هاوشێوەکانی دەکا (یکون العموم فیها بحسب اللفظ) مانای گشتگیری تێیدا بەگوێرەی لەفظەکەی دەبێ.

ئەو ئایەتەی هۆکاری موعەیەن هەبێ بۆ نازڵبوونی ئەگەر فەرمان بێ، یان نەهی بێ، ئەوە ئەو شەخصە تایبەتیەو ئەوانی وەکوو ئەویشن دەگرێتەوە، ئەگەر هەواڵ بوو (مەدح، یان ذەم) بوو، ئەوە ئەو شەخصە دەگرێتەوەو ئەوەش کە لە پلەو مەقامی ئەودا بێ.

٢- کۆمەڵێك لە عولەما پێیان وایە عیبرەت بە خصوصی سەبەبە نەك بە عمومی لەفظ، بە ڕای ئەمان لەفظە عامەکە بەڵگەیە لەسەر وێنەی هۆکارە تایبەتییەکە بۆ ئەوەی دەلالەت بکا لەسەر غەیری ئەو، پێویستە دەلیلێکی تر هەبێ، وەکوو قیاس‌و شتی وا، بۆ ئەوەی بۆ نەقلی ڕیوایەتی سەبەبە تایبەتیەکە هۆکاری خۆی بمێنێ‌و سەبەب‌و موسەبەب پێکەڵ پێك بن وەکوو پرسیارو وەڵام.

## صیغەو داڕێژگەی سەبەب نزول

صیغەی سەبەب نزول وادەبێ دەقێکی صەریح‌و راست‌و ڕەوان دەبێ لە هۆکاری نازڵبوندا، یان وێدەچێ هۆکاری نازڵ بوون بێ، دەبێتە دەقێکی صەریح‌و بێ پێچ‌و پەنا ئەگەر راوییەکە راستەوخۆ وتی (سەبەبی نازڵ بوونی ئەم ئایەتە ئەوەیە) یان ئەگەر ڕیوایەتەکەی وا هێنا (فا)ی تەعقیبی خستە سەر مادەی (نزل)ە دوابەدوای هێنانی ڕوداوەکە، یان پرسیارەکە، بەمجۆرە بڵێ: (ئەوە ڕویدا، واهات، واچوو، یان پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا دەربارەی فلان شت (فنزل هذه الآیة) ئیتر ئایەتەکە دابەزی).

ئەم دوو صیغەو شێوازە ڕاستەوخۆ سەبەبیەت دەگەیەنن وەکوو لەوە دوا نموونەکانیان دەخەینە ڕوو[1] وادەبێ صیغەکە ئیحتیمالی سەبەب نزولی دەبێ‌و لە هەمان کاتیشدا مانای حوکمی ئایەتەکەشی لێ فەهم دەکرێ بەمجۆرە (راوی) بڵێ: (نزل هذه الآیة فی کذا) ئەم ئایەتە بۆ فلان شت دابەزیوە، ئەم جۆرە تەعبیرە جاری وا هەیە مەبەست لێی سەبەب نزولە، وایش دەبێ مەبەستەکە ئەوەیە ئەو سەبەب نزولە داخڵی مانای ئایەتەکەیە.

هەروا ئەگەر وتی (أحسب هذه الآیة نزلت فی کذا) یان (ما أحسب هذه الآیة فی کذا) بێگومان (راوی) بەمجۆرە صیغەو تەعبیرە بە قەطعی دان نانێ بە سەبەبەکەدا، کەوابێ ئەم دوو جۆرە تەعبیرانە ئیحتیمالی ئەوەیان هەیە سەبەب نزول بن ئیحتیمالی تریشیان هەیە.

نموونەی صیغەی یەکەم ئەو ڕیوایەتەی ئیبنو عومەرە کە دەفەرموێ: ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ - البقرة/٢٢٣﴾ دەربارەی چوونە لای ئافرەت لە پاشیانەوە هاتۆتە خوارێ.[2]

نموونەی صیغەی دووەم: ئەو ڕیوایەتەیە کە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە هاتووە دەفەرموێ: زوبەیر لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاری بەشداربووی غەزای بەدر بووبە کێشەیان دەربارەی ئاوێك کە لە (الحرة) دەهاتە خوارو زوبەیرو کابرای ئەنصاری هەردووکیان بەو ئاوە باخە خورماکانی خۆیان ئاو دەدا، کابرای ئەنصاری دەیگوت: ئاوەکەم بۆ ڕەوان بکە با من لەپێش تۆدا خورماکانم ئاو بدەم، زوبەیریش ڕازی نەدەبوو، بۆ حەللی ئەم کێشەیە چوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کێشەکەیان خستە بەردەمی، فەرمووی: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ ، ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ» ئەی زوبەیر

---

[1] بڕوانە باسی ڕیوایاتی جۆراوجۆر.

[2] أخرجه البخاری مختصراً/٤٥٢٦ وأخرجه إبن جریر تاماً فی تفسیر:٤٣٢٦.

ئـەتۆ لەپێـشدا باخـە خورماكـەت ئـاو بـدە، پاشـان ئاوەكـە بـەردەوە بـۆ جیرانەكـەت، كـابرای ئەنـصاری پێـی نـاخۆش بـوو ڕقـی هەڵـساو وتـی: ئـەی پێغەمبەری خودا! لەبەر ئەوەیە زوبەیر كوڕی پورتـە بۆیـە ئـاوا بڕیـارت دا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەنگی گۆڕا، پاشـان فـەرمووی: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ ، ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاء إِلَى جَـارِكَ» بـەم فەرموودەیەی دووەم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواوی مافی بۆ زوبەیر دەستەبەر كرد، بەڵام لەپێش‌دا ڕەئیەكی وای دەربڕی ئاسانكاری تێـدا بـێ بـۆ كـابرای ئەنـصاری، بـەڵام كـە كـابرا ڕقـی پێغەمبـەری هەڵـساند، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) داوای ئاسـانكارییەكەی لـە زوبـەیر كشاندەوەو بە صەریحی حوكم‌و مافی تـەواوی دا بـە زوبـەیر، زوبـەیر دوایـی دەیگوت پێم وانیە ئایەتی ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُـونَ حَتَّـىَ يُحَكِّمُـوكَ فِيمَـا شَـجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا – النساء/٦٥﴾ جگە لەم ڕوداوە دەربارەی هیچی تر نازڵ بووبێ.

ئیبنو تەیمییە فەرموویەتی: قسەی زاناو راوی: كە دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربـارەی ئـەوە هاتۆتـە خـوار (نزلـت هـذە الآيـة فـی كـذا) جـاری وا هەیـە مەبەستیان پێی سەبەب نزولە، جاری وایش دەبێ مەبەستیان ئەوەیە بڵێن: ئەو شتە داخڵی مانای ئەم ئایەتەیە با ئەو شتە سەبەبیش بێ.

بێگومان زانایان كەوتوونە خیلافـەوە لـەوەدا ئـاخۆ قـسەی صـەحابی: كە دەڵێ: (نزلت هذە الآية فی كذا) ئاخۆ مامەڵەی موسنەدی لەگەڵ دەكـرێ‌و ئـەو حوكمـەی هەیـەو وەكوو ئـەوە وایـە: كـە ئـەو سـەبەبەكە ذیكـر بكـا كـە ئایەتەكـەی دەربـارە نـازڵ بـووە، یـان وا دادەنـرێ: كـە ئـەوە تەفـسیری صەحابییەكەیەو بە موسنەد دانانرێ؟ واتە: (بەوە نـاژمێردرێ كـە حـوكمی حەدیثی مەرفوعی هەبێ‌و قسەكە هی پێغەمبەر بێ (دروودی خودای لەسـەر بێ).

ئیمامی بوخاری ئەو جۆرە تەعبیرانە دەخاتە پێڕی موسنەدەوە، غەیری بوخاری ئەو ڕایەیان نیە، زۆربەی زۆری مەسانیدەکان لەسەر ئەم ئیصطیلاح‌و زاراوەیەن وەکوو موسنەدی ئیمام ئەحمەد، بەپێچەوانەی ئەوە: کە سەبەب نزولەکە بڵێ: کە ئایەتەکەی دووابەدوا نازڵ بووە، ئەمەیان هەموو زانایان دەیخەنە پێڕی موسنەدەوە.

ئیمامی زەڕکەشی لە کتێبی (البرهان)دا دەفەرموێ: بێگومان زانراوە: کە داب‌و نەریتی هاوەڵان‌و چینی دوا ئەوانیش وابووە: کە یەکێکیان فەرموویەتی (نزلت هذه الآیة فی کذا) مەبەستی ئەوەبوو ئەو ئایەتە ئەو حوکمەی لەخۆ گرتووە، نەك ئەو شتە هۆکاری نازڵبوونی ئایەتەکە بووبێ، کەوابێ ئەوە خۆی بەشێکە لە بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتەکە لەسەر حوکمەکە، نەك بەشێك بێ لەوەی ڕوداوەکە نەقڵ دەکا.

## جۆراوجۆر بوونی ڕیوایات دەربارەی سەبەب نزول

**وادەبێ ڕیوایاتی جۆراوجۆر دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتێک دەستەبەر دەبن، لەم حاڵەتەدا هەڵوێستی موفەسیر بەم جۆرە دەبێ:**

أ/ ئەگەر صیغەو داڕێژگەکەی کە وارید بووە صەریح نەبوو لە سەبەب نزولدا وەکوو ئەوە بڵێ: (نزلت هذه الآیة فی کذا) یان (أحسبها نزلت فی کذا) ئەوە هیچ کێشەیەك نابیندرێ تێیدا، چونکە ئاشکرایە مەبەستەکە ڕاڤەو تەفسیرە، واتە: ئەو شتە داخڵی مانای ئایەتەکەیەو لێی وەردەگیرێ، نەك مەبەست ئەوە بێ ئەو شتە سەبەب نزولی ئایەتەکە بێ، مەگەر قەرینەیەکی تر هەبێ لەسەر ئەوە کە مەبەست بەوە سەبەبییەتە.

ب/ ئەگەر یەکێك لە صیغەو داڕێژگەکان صەریح نەبوو بەلایەکیدا نەدەخست، وەکوو ئەوە دەقەکە بەمجۆرە بوو (نزلت فی کذا) لە ڕیوایەتێکی تردا هاتبوو سەبەبێکی دژ بەو خرابووە ڕوو، ئەوە قسەی ڕاست‌و پشت پێ

بەستراو ئەوەیە ذیکری سەبەبەکەی کردووە، ڕیوایەتەکەی تر حەمل دەکرێ بۆ سەر ئەوە: کە ئەو شتە داخڵی حوکمەکانی ئایەتەکەیە، نموونەی ئەمە ئەو ڕیوایەتانەیە: کە دەربارەی ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ – البقرة/٢٢٣﴾ وارید بووە.

نافیع دەفەرموێ: ڕۆژێك ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ – البقرة/٢٢٣﴾م خوێندەوە، ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) وتی: دەزانی ئەم ئایەتە دەربارەی چی نازڵ بووە؟ وتم: نەخەیر، فەرمووی: (دەربارەی چوونە لای ئافرەت لە دواوە) هاتۆتە خوارێ، دەی ئەم قسەیەی ئیبنو عومەر صەریح نیە لەوەدا ئەوکارە سەبەب نزول بێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە بە صەراحەت باسی سەبەبێك دەکا پێچەوانەی ئەوەی ئیبنو عومەرە (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) ئەوەتا جابیر دەفەرموێ: جولەکەکان بڕوایان وابوو دەیانگوت: ئەگەر مێرد چووە لای ژنی خۆی لەدواوەو هێنی خۆی ئاراستەی پێشەوەی ئافرەتەکە کرد، منداڵی خیلی لێ بەرهەم دێ، ئیتر بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەو بڕوا پوچە، ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ – البقرة/٢٢٣﴾ دابەزی.[١]

دەی لێرەدا ڕای پشت پێ بەستراو ڕایوایەتی جابیرە، چونکە قسەکەی گێڕانەوەیەکی صەریحەو دەق سەبەبەکە دەگەیەنێ، ڕیوایەتەکەی ئیبنو عومەر نەص نیە لە سەبەبییەتدا، کەوابوو وای مەزەندە دەکەین کە تەفسیرو تێگەیشتنیەتی بۆ مانای ئایەتەکە.

---

[١] أخرجه البخاری/٤٥٢٨ ومسلم/٣٥٣٥.

ج/ ئەگەر ڕیوایەتەکان جۆراوجۆر بوونو هەموویان نەص بوون لە سەبەبییەتدا، وەلێ ئیسنادی یەکێکیان صەریح بوو ئەوانی تر وانەبوون، ئەوە لێرەدا ڕیوایەتی موعتەمەدو پشت پێ بەستراو ڕیوایەتە صەریحەکەیە.

وەکوو ئەوەی موسلیمو بوخاریو هی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە (جندب الجبلی) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆش بوو دوو شەو، یان سێ شەو هەڵنەستا، ئافرەتێك هاتە لایو پێی گوت: ئەی موحەممەد! من وادەزانم شەیتانەکەت وازی لێ هێناوی، ئەوە دوو شەوو سێ شەوە نەهاتۆتە لات، ئیتر پەروەردگار ﴿وَالضُّحَى ، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى ، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى – الضحى/١ – ٣﴾ی بۆ نازڵ کرد.[١]

طەبەرانیو ئیبنو ئەبی شەیبە لە حەفصی کوڕی مەیسەرەوە لە دایکییەوە ئەویش لە دایکییەوە: کە کارەکەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، دەگێڕێتەوە دەڵێ: توتکە سەگێك چوبووە ماڵی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) چوبووە ژێر تەختەی لەسەر نووستنیو تۆپیبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوار ڕۆژ نیگای لێ بڕا، فەرمووی: ئەی خەولە چی لە ماڵی پێغەمبەردا ڕویداوە؟ جوبرائیل نایە بۆلام! خەولە دەڵێ: لە دڵی خۆمدا وتم با تۆزێك ماڵەکە هەڵوێژیرمو گەسکی بدەم، گەسکەکەم برد بۆ ژێر تەختەکە بیماڵم، توتیلە تۆپیوەکەم بە گەسکەکە هێنایە دەر، لەو سەروبەندەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە ڕیشی دەلەرزی، عادەتی وابوو کە نیگای بۆ نازڵ دەبوو لەرزینێك دەیگرت، فەرمووی: ئەی خەولە داپۆشە سەرمامە، ئیتر پەروەردگار ﴿وَالضُّحَى﴾ی تا ﴿فَتَرْضَى﴾ بۆ سەر نازڵ کرد.

ئیبنو حەجەر لە شەرحی بوخاری (فتح الباری)دا دەفەرموێ: چیرۆکی دواکەوتنی هاتنی جوبرائیل بەهۆی بوونی توتکە سەگ لەماڵی

---

[١] بوخاری/٤٩٨٣ ومسلم/٤٦٥٨ وأحمد/١٨٨.

پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) مەشهورە، وەڵێ بوونی بە سەبەب نزولی بۆ سورەتی ﴿وَالضُّحَى﴾ غەریبو نامەشهورە، لە ئیسنادەکەشیدا کەسانێك هەن نەناسراون، کەوابوو ئەوەی پشتی پی دەبەسترێ ئەوەیە لە بوخاریو موسلیمدایە.[1]

د/ ئەگەر ڕیوایەتەکان هەموویان لەبارەی صەحیحەوە چوونیەك بوون، وەڵێ جۆرە تەرجیحێك لە یەکیاندا هەبوو لەوانی تردا نەبوو، وەکوو ئەوە راویەکە خۆی ئاگاداری بەسەرهاتەکە بێ، یان ڕیوایەتێکیان لەوانی تر صەحیحتر بوو، ئەوە ڕیوایەتە راجیحەکە پێش دەخرێ.

نموونەی ئەمە ئەو ڕیوایەتەی کە بوخاری لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە: کە دەڵێ: من بۆخۆم لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەدینەدا دەڕۆیشتین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لقە دارخورمایەکی پێ بوو وەکوو عەصا خۆی بەسەردا دەدا، لە خزمەتیدا بووم بەلای کۆمەڵێك جولەکەدا تێپەڕی، هەندێکیان وتیان: خۆزگە پرسیارتان لێ بکردایە، وتیان: دەربارەی رۆح بۆمان بدوێ بزانین رۆح چیە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەیەك راوەستاو سەری بەرز کردەوە، ئەمن زانیم کە نیگای بۆ دێ، کە وەحیەکە تەواو بوو، پاشان فەرمووی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً - الإسراء/٨٥﴾.[2]

ئیمامی تیرمذی لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایەتی کردووە: کە دەڵێ: قوڕیش بە جولەکەکانیان گوت: شتێکمان پێ بڵێن: بیکەینە پرسیارو لەم پیاوەی بکەین، وتیان دەربارەی رۆح پرسیاری لێ بکەن، ئەوانیش پرسیاریان لێ کرد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی

---

[1] بڕوانە کتێبی الإتقان ص٧٧.

[2] أخرجە البخاری/١٢٥ ومسلم/٧٠٥٩.

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً – الإسراء/٨٥﴾ نازڵ کرد.[1]

دەی ئەم ڕیوایەتە ئەوە دەگەیەنێ ئایەتەکە لە مەککە دابەزیبێ، لەم ڕووەوە کە لایەنی سەرەکی ڕوداوەکە قوڕەیشییەکانن، ڕیوایەتی یەکەمیش ئەوە دەگەیەنێ لە مەدینە دابەزیبێ، لێرەدا ڕیوایەتی یەکەم تەرجیح دەدرێ لەبەر ئامادەبوونی ئیبنو مەسعود بۆ ڕوداوەکە، زیاد لەوە ئەم ڕیوایەتە لەبوخاریدایەو ئوممەتی موسوڵمان صەحیحی بوخارییان بەلاوە پەسەندەو مەقبولەو بەسەر هەموو صەحیحێکی تردا تەرجیحی دەدەن.

ئیمامی زەرکەشی ئەم نموونەیەی وا مەزەندە کردووە: کە دابەزینەکەی تیکرار بووبێتەوە، وای داناوە ئەم ئایەتە جارێك لە مەککە نازڵ بووبێ‌و جارێك لە مەدینە بەڵگەشی ئەوەیە دەڵێ: بەکۆڕای زانایان سورەتی (سبحان) مەککی‌یە.

وەڵێ دەگونجێ بگوترێ: با سورەتەکە مەککی بێ‌و ئەم ئایەتەی مەدینەیی بێ.

ئەوەی بوخاری لە ئیبنو مەسعوودەوە ڕیوایەتی کردووە ئەوە دەگەیەنێ: کە ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً – الإسراء/٨٥﴾ مەدینەیی‌یە، کەوابێ ئەو ڕێبازەی ئێمە هەڵمان بژارد لەوەدا تەرجیحی ڕیوایەتی ئیبنو مەسعوودمان دا بەسەر ڕیوایەتی تیرمذیدا لە ئیبنو عەبباسەوە، چاکترو وێچوترە لەوەی بۆ ئەوە بچین: کە ئایەتەکە زیاد لە جارێك دابەزیبێ، خۆ ئەگەر صەحیح بێ ئایەتەکە مەککی بێ‌و لە ئاکامی پرسیارێکدا دابەزیبێ، ئەوە دووبارە بوونەوەی هەمان پرسیار لە مەدینەدا داخوازی ئەوە نیە وەحی جارێکی تر بۆ وەڵامی هەمان پرسیار دابەزێ، بەڵکوو داخوازی ئەوەیە پێغەمبەر

[1] الترمذی/٣٤٠٧ وأخرج النسائی فی الکبری/١١٢٥٢ وأحمد/٢٣٠٩.

(دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو وەڵامە بداتەوە کە لەوەپێش دابەزیوەتە سەری.

ﻫ/ ئەگەر ڕیوایەتەکان لە بارەی تەرجیحەوە چوونیەك بوون، دەبێ تا بۆمان دەکرێ هەوڵ بدەین لەنێوانیاندا جەمع بکەین، وای دابنێین ئایەتەکە دوای دوو جۆرە سەبەبەکان، یان زیاتر، نازڵ بووبێ، لەبەر نزیکی ماوە لەنێوانیاندا بۆ نموونە:

بوخاریو تیرمذیو ئیبنو ماجە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) گێڕاویانەتەوە: کە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنْ الْكَاذِبِينَ ، وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ – النور/٦ – ٩﴾ دەربارەی هیلالی کوڕی ئوممەیە نازڵ بوون، ئەوەبوو هیلال لای پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەی خۆی تۆمەتبار کرد بەوە: کە لەگەڵ هیلالی کوڕی سەممادا زینای کردووە[1].

دووبارە بوخاریو موسلیمو هی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە سەهلی کوڕی سەعید: دەڵێ: عووەیمیر هات بۆلای (عاصم)ی کوڕی عەدی، وتی: بۆم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیار بکە دەربارەی پیاوێك لەتەك ژنەکەیدا پیاوێك ببینێ؟ ئایا بیکوژێو دوایی بە قیصاص بکوژرێتەوە؟ یان کە ئاوا نەکا چی بکا؟[2]

ئەم دوو ڕیوایەتە جەمع لەنێوانیاندا کراوەتەوە بەوە کە ڕوداوی هیلال یەکەمجار ڕویداوەو بە ڕێکەوتیش هاوکات بووە لەگەڵ هاتنی عووەیمیر، ئیتر ئایەتەکە دوابەدوای ئەم دوو ڕیوایەتە دەربارەیان نازڵ بووە.

---

(١) البخاری/٤٧٤٧ والترمذی/٣٤٥٣ وإبن ماجه/٢٠٦٧ وأخرجه مسلم/٣٧٥٨.

(٢) البخاری/٤٧٤٥ ومسلم/٣٧٤٣ واحمد/٨٣٠.

ئیبنو حەجەریش لەم بارەوە دەفەرموێ: (لامانع من تعدد الأسباب) هیچ لەمپەرێك نیە بۆ ئەوەی چەند هۆكارێك هەبن بۆ نازڵبوونی ئایەتێك یان بەشێك لە قورئان.

و/ ئەگەر جەمع لەنێوان ڕیوایەتەكاندا نەدەگونجا لەبەر ماوە دووری نێوانیان، ئەوە ئەوكاتە ڕیوایەتەكان حەمل دەكرێن بۆ سەر دووبارەو سێ بارە بوونەوەی دابەزینی دەقە قورئانییەكە.

نموونەكەی: ئەوەیە: كە بوخاریو موسلیم لە (المسیب)ەوە نەقڵیان كردووە، دەڵێ: كە ئەبو طالیب كەوتە گیانەڵاوەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای، لەوكاتەدا ئەبو جەهلو عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی ئومەییەی لابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئەی مامە! بڵێ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ» ئیمان بێنە «أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ» بۆ ئەوەی لای پەروەردگار شەفاعەتكارت بم، ئەبو جەهل وتی: ئەبو طالیب ئایا تۆ هەڵەی وا دەكەی لە ئایینی عەبدولموطەلیب وازبێنیو بچیە سەر ئایینێكی تر؟ ئیتر وازیان لێ نەهێناو دەنە دەنەیان دا كە لەسەر بیروباوەڕی بتپەرستی بمێنێتەوە ئەویش لە كۆتاییدا وتی: بەڵێ من لەسەر بیروباوەڕی عەبدولموطەلیبم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْهُ» ئەمن هەر داوای لێخۆشبوونت بۆ دەكەم مەگەر نەهیم لێ بكرێ، ئیتر ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ – التوبة/١١٣﴾[1].

تیرمذی ڕیوایەتی كردووە لە ئیمام عەلیەوە دەڵێ: گوێم لێ بوو پیاوێك دەپاڕایەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ باوكو دایكی دەكردو موشریكیش

[1] رواه البخاری/٣٨٨٤ ومسلم/١٣٢.

بوون، پێم گوت: ئەوە چۆن داوای لێخۆشبوون بۆ باوك‌و دایکت دەکەی؟ وەلحالْ ئەوان موشریك بوون، پیاوەکە وتی: حەزرەتی ئیبراهیم داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی کردو باوکیشی موشریك بوو، عەلی دەفەرموێ: ئەمەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە، ئیتر ئەو ئایەتە دابەزی.(١)

حاکم‌و هی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو مەسعوودەوە، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو بەرەو گۆڕستان لەپاڵ گۆڕێکدا دانیشت، لەبەر خۆیەوە زۆری قسە کردن‌و دوایی دەستی کرد بە گریان، پاشان فەرمووی: «أن القبر الذی جلست عنده قبر أُمی، وإنی إستأذنت ربی فی الدعاء لها، فلم یأذن لی فأنزل علی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ – التوبة/١١٣﴾ دەی کۆکردنەوەو سازان لەنێوان ئەم ڕیوایەتانەدا بەوە دەبێ بڵێین: ئایەتەکە زیاد لە جارێك دابەزیوەو تەعەددودی (نزول)ە.

هەر لە نموونەی ئەوە ئەو ڕیوایەتەی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر گۆڕی حەمزە وەستا: کە شەهید کرابوو جەستەکەشی شێوێندرابوو ئەتك کرابوو، فەرمووی: «لأمثلن بسبعین منهم مكانك» دەبێ لە تۆڵەی ئەو بێ ڕێزیەی بەتۆیان کردووە ئەتکی حەفتا کەسیان بکەم، هێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە شوێنی خۆیدا ڕاوەستا بوو نەجولابوو حەزرەتی جوبرائیل ئایەتە کۆتاییەکانی سورەتی (النحل)ی بەنیگا بۆ هێنا ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ ، وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللَّهِ وَلا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِمَّا يَمْكُرُونَ ، إِنَّ اللَّهَ مَعَ

---

(١) الترمذی/٣٣٥٨ وأخرجه النسائی/٢٠٣٨ وأحمد/١٠٨٥.

الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ – النحل/١٢٦ – ١٢٨﴾ ئەم ڕیوایەتە ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەم ئایەتانە ڕۆژی ئوحود دابەزی بن.[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە دابەزیون[2] سورەتەکەش مەککییە.

ئەم ڕیوایەتانە جەمعیان لەنێواندا کراوەتەوە بەوە کە ئەم ئایەتانە لەگەڵ سورەتەکەدا پێش هیجرەت لە مەککە دابەزیون، پاشان ئایەتەکان بۆخۆیان لە ڕۆژی ئوحوددا جارێکی تر دابەزیون، ئەمجار لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا جاری سێیەم دابەزیون.

ئەم دیاردەیەش هیچ مانیعێکی تێدا بەدی ناکرێ، چونکە یادخستنەوەی نیعمەتی خودایان لەخۆ گرتووە کە بەخشیونی بە بەندەکانیو چەسپاندنی شەریعەتیان تێدا دووبارە بۆتەوە.

ئیمامی زەرکەشی لە (البرهان)دا دەڵێ: وادەبێ دەقێکی قورئان دووجار دادەبەزێ بۆ ڕێزلێنانو گرنگی پێدانیو یادخستنەوەی مەردووم لەکاتی پەیدابوونی هۆکارەکەی، بۆ ئەوەی لە یاد نەچنەوەو هەمیشە لەبەر چاوبن، وەکوو دەربارەی فاتیحە گوتراوە: کە دووجار دابەزیوە جارێك لە مەککەو جارێك لە مەدینە.

ئەمە ڕاوبۆچووونی زانایانی بواری عولومی قورئانە دەربارەی تەعەددودی نزولو دووبارە بوونەوەی، وەڵێ من ئەمە بە وێچو نازانمو پێم وانیە ئەمە ڕاست بێ، چونکە دووبارە بوونەوەی نازڵبوونی ئایەتێك، یان زیاتر چەند جارێك هیچ حیکمەتێکی تێدا دەرناکەوێ، من وای بۆ دەچم: کە ئەو ڕیوایەتە جۆراوجۆرانەی دەربارەی سەبەب نزول تۆمار کراونو جەمع کردن لەنێوانیاندا ناگونجێ، دەبێ پەنا بەرینە بەر پرۆسەی تەرجیحو پاساو

---

[1] أخرجه البزار/٩٥٣٠ واالطبرانی فی الکبیر/٢٩٣٧ والحاکم/٤٨٩٤.

[2] الترمذی/٣٣٩٥ والنسائی فی الکبر/١١٢١٥.

دانەوە: کەوابێ ئەو ڕیوایەتانەی دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ – التوبة/١١٣﴾ ڕیوایەتی یەکەمیان بەسەر ئەوانی تردا تەرجیح دەدرێ، چونکە ڕیوایەتی یەکەم لە بوخاریو موسلیمدایەو ئەوانی تر نا، هاتنی ئەو ڕیوایەتە لەو دوو سەرچاوەی صەحیحەدا بەسە بۆ بەهێزی ڕیوایەتەکە، کەوابێ قسەی بەهێزو پەسەند ئەوەیە: کە ئایەتەکە دەربارەی ئەبو طالیب نازڵ بووبێ، هەروەها بەهەمان شێوە دەڕوانینە ئەو ڕیوایەتانەی دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (النحل) هاتوون، چونکە لە یەك ئاستدا نین، وەرگرتنی ڕیوایەتە ڕاجیحەکە زۆر باشترە لەوەی بۆ ئەوە بچین: کە تەعەددودی نزولی دەقە بووەو دووبارەو سێبارە نازڵبوونەتەوە!!

پوختەی قسە، ئەگەر سەبەب نزول زیاد لە یەك بوو، حاڵ خاڵی نیە، یان هەموو ڕیوایەتەکان غەیر صەریحن، یان هەموویان صەریحن، یان بڕێکیان صەریحو هەندێکیان ناصەریحن.

جا ئەگەر هەموویان لە سەبەبییەتدا، ناصەریح بوون ئەوکاتە چ زیانێکی تێدا نیە ڕیوایەتەکان حەمل بکرێن بۆسەر تەفسیرو داخڵ بوونیان لەماناى ئایەتەکەدا.

أ/ ئەگەر بڕێکیان صەریحو بڕێکیان ناصەریح بوون، ئەوە ڕیوایەتی پەسەندو پشت پێ بەستراو ڕیوایەتە صەریحەکەیە.

ب/ ئەگەر هەموویان صەریح بوون لە سەبەبییەتدا حاڵ خاڵی نیە، یان یەکیان صەحیحە، یان هەموویان صەحیحن، ئەگەر یەکیان صەحیح بوو، ئەوی تر نا، ئەوە موعتەمەدو پشت پێ بەستراو صەحیحەکەیە، ئەگەر هەموویان صەحیح بوون ئەوە پەنا بۆ پرۆسەی تەرجیح دەبەین ئەگەر دەگونجا، ئەگینا هەوڵی جەمع کردن دەدەین لەنێوان ڕیوایەتەکاندا.

ئەگەر ئەم هەوڵانە هیچیان دەستەبەر نەبوون ئەوکاتە بە ناچاری پەنا بۆ ئەوە دەبەین: کە تەعەددودی نزول‌و دوبارە بوونەوەی نزولە، ئەمەش ناچێتە دڵەوەو نەفس پێی ئارام نابێ.

## تەعەددودی نزول‌و سەبەب یەکێك بێ

وارێ دەکەوێ چەند ئایەتێك لەکاتی جیادا لە چەند سورەتێکدا نازڵ بوون‌و هۆکاری نازڵبوونەکەیان یەك شتە، ئەمە شتێکی ئاسایی‌یەو هیچ خراپیەکی تێدا بەدی ناکرێ.

نموونەکەی ئەوەتا سەعیدی کوڕی مەنصورو عەبدوڕەزاق‌و تیرمذی‌و ئیبنولمونزیرو ئیبنو ئەبی حاتەم‌و طەبەرانی‌و حاکم ئەمیان تەصحیحیشی کردووە لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێ: بە پێغەمبەرم گوت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمن نابینم پەروەردگار دەربارەی پاداشی کۆچ کردن هیچی بۆ ئافرەتان بڕیار دابێ‌و لەو بوارەدا باسی ئافرەتی نەکردووە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ آل عمران/١٩٥﴾.[1]

ئەحمەدو نەسائی‌و ئیبنو جەریرو ئیبنولمونزیرو طەبەرانی‌و ئیبنو مەردەوەیهی لە ئوممو سەلەمەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! هۆی چیە ئێمەی ئافرەتان لە قورئاندا وەکوو پیاوان ناومان نەهاتووە؟ ئیتر هیچم بەرگوێ نەکەوت لە جەنابی، تا ڕۆژێك گوێم لێ بوو لەسەر دوانگە ئایەتەکەی سورەتی (الأحزاب)ی دەخوێندەوە.

---

[1] الترمذی/٣٢٧١ والطبرانی فی الکبیر ٦٥١/٢٣.

حاكم له ئوممو سهلهمهوه ڕیوایهتی کردووه: که دهڵێ: وتم: پیاوان دهچن بۆ غهزاو پاداشی غهزایان ههیه، ئافرهت ناچن بۆ غهزاو لهو پاداشه بێ بهشن، نیوهی میراتیشمان دهدرێتێ؟ ئیتر پهروهردگار ئایهتی ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا – النساء/٣٢﴾ ههروهها پهروهردگار ئایهتی ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا – الأحزاب/٣٥﴾ نازڵ کرد، ئهم سێ ئایهته بۆ یهك مهبهستو هۆ نازڵ بوون.

## نازڵبوونی ئایهت پێش حوکم

ئیمامی زهرکهشی فهرمایشتێکی ههیه پهیوهندی ههیه به ئهسبابی نزولهوهو ناوی ناوه (تقدم نزول الآية على الحكم) ئهو نمونهی ئهو هێناویهتهوه لهو بوارهدا، ئهوه ناگهیهنێ: که ئایهتهکه دهربارهی حوکمێکی تایبهتی نازڵبووبێو لهدواییدا کاری پێ کرابێ، بهڵکوو ئهوه دهگهیهنێ: کهوا ڕێدهکهوێ ئایهت به لهفظی موجمهل نازڵ دهبێو زیاد له مانایهك ههڵدهگرێ، پاشان تهفسیرهکهی بهسهر یهکێك له ماناکاندا دادهبڕێو ئهو ئایهته دهبێته دهلیل بۆ حوکمێکی دواینه (متأخر).

له (البرهان)دا دهفهرموێ: ئهتۆ بزانه جاری وادهبێ نازڵبوونی ئایهت پێش پهیدابوونی حوکم دهکهوێ، وهکوو ئایهتی ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى – الأعلى/١٤﴾ ئهم ئایهته دهکرێته بهڵگه لهسهر حوکمی زهکاتی سهرفیترهǃ

ئیمامی بهیههقی به سهنهدو ڕوشتهی خۆی بۆسهر ئیبنو عومهر (ڕهزای خودایان لێ بێ) ڕیوایهتی کردووه: که ئهم ئایهته دهربارهی حوکمی

زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزان نازڵ بووە، پاشان فەرموودەیەکی تری مەرفوعی هێناوە بەهەمان مانا، برێ لە زانایان بە تێفکرین لەم ڕیوایەتانە وتوویانە نازانین چۆن راڤەی ئەم ڕیوایەتانە بکەین چونکە سورەتی (الأعلى) کە ئایەتی ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى﴾ی لەخۆ گرتووە مەککەیی‌یە، پێش کۆچکردنی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە بۆ مەدینە نازڵبووە، ئەوکاتەش لە مەککەدا نە جەژنی ڕەمەزان هەبووە نە زەکاتی سەرفیترە.

ئیمامی بەغەوی لە تەفسیرەکەیدا وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە: دەڵێ: دروستە کە نازڵبوونی ئایەت پێش چەسپانی حوکم بکەوێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَا أُقْسِمُ بِهَـٰذَا الْبَلَـدِ ، وَأَنتَ حِلٌّ بِهَـٰذَا الْبَلَدِ - البلد/١ - ٢﴾ سورەتەکە مەککەیی‌یە، دەی ئەثەرو ئاکامی ئەو حەللەی ئایەتەکە ئاماژەی بۆ دەکا لە ڕۆژی ڕزگاررکردنی مەککەدا دەرکەوت تەنانەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أحلت لي ساعة من نهار».[1]

هەروەها هێشتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆچی نەکردبوو بۆ مەدینە، لە مەککەدا بوو ئەم ئایەتەی ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ - القمر/٤٥﴾ی بۆ سەر نازڵ بوو.

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: نەمزانی چ کۆمەڵو پێرێکە دەشکێندرێنو هەڵدێن؟ کە ڕۆژی بەدر هات

---

[1] بەشێکە لە حەدیثی صەحیحی بوخاری/١٣٤٩ ومسلم/٣٣٠٢، ئیبنو عەبباس ڕیوایەتی کردووە، ئایەتەکە سێ مانا هەڵدەگرێ یەکێ لە ماناکانی ئەوەیە ساعەتێك شەڕکردن لە مەککەدا بۆتۆ ئەی موحەممەد حەلاڵ دەکرێ، کەوابێ ئایەتەکە پێش چەسپاندنی حوکمەکەی نازڵ بووە.

بینـیم پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـدەوە ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ – القمر/٤٥﴾.[1]

دەی ئـەتۆ دەبینـی وەكـوو خـاوەنی كتێبـی (البرهـان) فەرموویـەتی: صیغەو داڕێژگەی هۆكاری نازڵبوونەكە ئیحتیمالی ئەوەی هەیە سەبەب نـزول بێ، ئیحتیمالی ئەوەشـی هەیـە حوكمەكـە لـە ئایەتەكـەدا بـێو ئایەتەكـە ئـەو حوكمەی لەخۆ گرتبێ، ئەوەتا بەیهەقی بە سەنەدو روشتەی خۆی لـە ئیبنـو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوكی بێ) ڕیوایەت دەكا: كـە فەرموویـەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی زەكاتی سـەرفیترە دابـەزیوە، ئاشكراشـە ئـەو ئایەتانـەی ئەو ئاماژەی پێ كردوون موجمەلنو ئیحتیمالی زیاد لە مانایەكیان هەیە.

## تەعەددودو فرەیی ئایاتی نازڵبوو دەربارەی یەك شەخص

وا ڕێكـەوتووە بـۆ یـەكێ لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) زیاد لە ڕوداوێكی هاتۆتە پێشو بۆ هـەر ڕووداوێـك لـەو ڕوداوانـە قورئان دەربارەیان دابەزیوە، كەوابی بەگوێرەی ڕوداوەكانی توشی ئەو كەسە هاتوون دابەزینی نیگا هاتۆتە دی.

نموونەكەی ئەوەیە: كە بوخاری لە كتێبـی (الأدب المفـرد)دا دەربـارەی چاكەكردن لەگەڵ باوكو دایك لـە سـەعدی كوڕی ئـەبی وەقاصەوە ڕیوایـەت دەكـا: كـە گوتوویـەتی (نزلـت في أربـع آيـات مـن كتـاب الله عزوجل.................................) دەربارەی من چوار ئایەتی قورئان نازڵ بوون:

١- دایكم سوێندی خوارد خواردن نەخواو ئاو نەخواتەوە هەتا من واز لە ئایینی موحەممەد بەرنەدەم، ئەوەبوو پەروەردگار ئایـەتی ﴿وَإِن جَاهَـدَاكَ

---

[1] أخرجه عبدالرزاق فی تفسیر/٣٠٦٩ والطبرانی فی تفسیره ١٠٨/٢٧ وأخرجه الطبرانی فی الأوسط/٣٨٢٩.

عَلى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ – لقمان/١٥﴾.

٢- دووەم شمشێرێكم لەشەڕا گرتبوو زۆرم پێ خۆش بوو بە تەواوی ببێ بە ملكی خۆم، داوام كرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێم ببەخشێ، عەرزیم كرد «يَا رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَهَبْ لِي هَذَا السَّيْفَ» ئیتر ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ – الأنفال/١﴾ نازڵ بوو.

٣- من نەخۆش بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە لام بەدیدەنی، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا من دەمەوێ ماڵو سامانم دابەش بكەم، نیوەی بكەم بە وەصیەت بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان؟! فەرمووی: نا نابێ، وتم: سێیەكی ماڵم بكەم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێدەنگ بوو لەوە بەولاوە وەصیەت لە سێیەكی ماڵدا دروست بوو.[1]

٤- من پیاوێك بووم شەرابم دەخواردەوە لەگەڵ كۆمەڵێك پیاوی ئەنصاری، پیاوێكیان بەسەرخۆشی لولاكە حوشترێكی بە لوتم كێشا، هاتمە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شكاتم لێ كرد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی بە حەرامبوونی شەراب دابەزاند.[2]

---

[1] دەربارەی وەصیەت ئایەتی ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾.

[2] البخاری فی الأدب المفرد ص٢٤.

# سود وەرگرتن لەزانینی ئەسبابی نزول لەبواری فێرکردن‌و پەروەردەدا

مامۆستایانی بواری زانست‌و پەروەردە زۆر گیروگرفتیان دێتە پێش‌و زۆر ماندو دەبن لەکاتی بەکارهێنانی هۆکارەکانی فێرکردن‌و وروژاندنی سەرەنجی قوتابیان، بۆ ئەوەی درونیان ئامادەباشی تێدا بەرجەستە ببێ بۆ دەرسەکەو بە شەوق‌و حەزەوە هێزە عەقڵییەکانیان کۆبکەنەوەو لێکیان بدەن بۆ تێگەیشتن، هەڵیان بنێن بۆ گوێ ڕاگرتن‌و بەدواداچوون‌و بیرکردنەوە، قۆناغە سەرەتاییەکانی خوێندن‌و دەرس وەرگرتن لەو قۆناغانەن پێویستیان بە لێهاتوویی‌و بەرچاو ڕونی مامۆستا هەیە، دەبێ مامۆستاکە زیت‌و چاوپوك بێ بۆ ئەوەی ئەم صیفاتانەی یارمەتیدەری بن بۆ ڕاکێشانی سەرەنج‌و شعوری قوتابییەکانی بۆلای وانەکەی: کە پێیان دەڵێ، جۆرەها وەسیلەو هۆکاری جیاجیا بەکاربێنێ بۆ ئەوەی ببێتە جێگای سەرەنجی قوتابیەکانی، لەپاڵ ئەمەدا پێویستی بە مومارەسەو ئەزمونێکی دورو درێژ هەیە: کە وای لێهاتبێ بزانێ بە چ شێوەیەکی جوان پەیوەندی دەخاتە نێوان ئەو زانیاریانەی پێیان دەدا، بەبێ زیادە ڕەوی‌و توندو تیژییەك کە خۆشی ماندو دەبێ‌و قوتابیەکانیشی دەڕەنجێنێ.

هەروەها مەرحەلەی سەرەتایی لە دەرس وتنەوەدا ئامانجی وروژاندنی زەین‌و سەرنجی قوتابیەکانەو دەبێ هەوڵی ئەوە بدا هەستی شاگردەکان بۆلای خۆی کێش بکا، چونکە لەم قۆناغەدا هەوڵ دەدرێ بەشێوەیەکی گشتی باسەکە وێنا بکرێ‌و ئاراستەی زەینی قوتابیەکان بکرێ بۆ ئەوەی مامۆستاکە بتوانێ بە ئاسانی سەرنجی قوتابییەکانی لە (الکلی)و هەمووانییەوە بگوێزێتەوە بۆ تاك‌و جوزء، بەم شێوە بەردەوام بێ تا پێکهاتەی دەرسەکە بە تەواوی لە مێشکی قوتابیەکان دەچەسپێ، ئەمەش

دوای ئەوەی کە قوتابیـەکان بەشـێوەیەکی کورتو سـەرەتایی باسـەکەیان بـۆ وێنا کرابوو.

دەی زانینی ئەسبابی نزول باشترین ڕێگایە بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئـەو مەبەستە پەروەردەییانە لەبواری دیراسەو راڤەکردنی قورئاندا.

بێگومـان سـەبەب نـزول، یـان حیکایـەتی ڕوداوێکـە ڕوی داوە، یـان پرسـیارێکە ئاڕاسـتەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـراوە بـۆ دەرخستنی حوکمێکی شەرعی لەبوارێکی ژیانـدا، ئـیتر دوای ئـەو ڕوداوە، یـان ئەو پرسیارە قورئـان دادەبـەزێو حـوکمی ئـەو ڕوداوە یـەکالا دەکاتـەوە، یـان وەلامی پرسـیارەکە دەداتـەوە، کـەوابێ لـەم حالّـەدا مامۆسـتا خـۆی وا نابینـێ پێویستی بـەوە بـێ بـۆ چارەسـەری ڕێخۆشـکردن بـۆ چوونە نـاو دەرسـەکەوە شتێك هەڵکرێنێو دابێنێو هەڵی بژێرێ، پێویـستی بـەو خـۆ مانـدوو کردنـە نیە، چونکە ئەگـەر سـەبەب نزولەکـەی ڕوونکـردەوە، ئـەوە خـۆی لـە خۆیـدا چیرۆکێکی پوخـتو گونجاوە بـۆ وروژانـدنی هەسـتی قوتابیـەکانو راکێـشانی سەنجیان بۆلای بابـەتی دەرسـەکەو کۆکردنـەوەی رایەڵـەکانی توانـای عـەقڵو ئامادەکردنی نەفسو درونیان بۆ وەرگرتنی وانەکەو تەشویقکردنیان بۆ گوێ راگرتنو هەڵنانیان بۆ ئەوەی سووربن لەسەر تێگەیشتن لە وانەکە.

چونکە بە زانینی سەبەب نزولەکە بەشێوەیەکی موجمەلو سەرەتایی وێنـای دەرسـەکە دەکـەن، بـە تەصـەورێکی گـشتی سـەبەب نزولەکـە، وێـڕای ئـەوەی کـە چـیرۆکەکە عونـصوری وروژێنـەری لـەخۆ گرتـوون، زانیارییـەکی سەرەتاییان لەلا دروست دەبێ، حەزی ئەوەیان لەلا دروست دەبـێ بـزانن چـی نازڵ بووە لەگەڵ ئەو سەبەب نزولە چیرۆك ئامێزە گونجاو بـێ، چ نهێنیـەکی تەشریعیو حوکمێکی تەفصیلی لەخۆ گرتووە: کە مرۆڤایەتی شارەزا دەکا بـۆ پەیڕەوکردنی راسـتە ڕێگـای ژیـانو بەختـەوەری هـەردوو جیهـان، ویـژدانیان

دەکەوێتـە جمووجـوڵ بـۆ دۆزینـەوەی شـەقامە ڕێـی راسـتیو بەختـەوەریو سەرفرازیو شکۆمەندی.

ئەرکی سەرشانی مامۆستایانی بواری تەربیەو تەعلیمە لـە هۆڵەکانی وانـە گوتنـەوەدا، یـان ئەوانـەی ئـەرکی تـەوجیهو شـارەزایی کردنیـان لـە ئەسـتۆیە، هـەوڵ بـدەن سـود وەربگـرن لەسـیاقی ئەسـبابی نـزول دەربـارەی کاریگەری بوونیان لەسەر خوێندکارو جەماوەری حەقخوازو موستەرشیدین، ئەم شێوە کارکردنو هەوڵدانە بە سودترو ڕاسـتە ڕێگاترو شـارەزاییکەرتـرە بۆ بە دەستهێنانی ئامانجە پەروەردەییـەکان، بـە بـەرزترین مانـاو جوانترین شێوە.

## ٧) موناسەباتو بەیەکەوە گونجاوی ئایەتو سورەتەکان

جـا هـەروەکوو چـۆن زانینـی سـەبەب نـزول کاریگـەری هەیـە لـە تێگەیشتن لە ماناو تەفسیری ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان، بەهـەمان شـێوە زانینـــی موناســـەبەو پەیوەنـــدی لـــەنێوان ئایەتـــەکانو ســـورەتەکاندا یارمەتیدەرێکی باشو گرنگە بۆ پـەی بـردن بـە تەفسیرو تـەئویلی ئایـەتو تێگەیـشتنی وردو زانـستانە، بۆیـە بـڕێ لـە زانایـان لـەم بـوارەدا کتێبـی تایبەتییان داناوە.[١]

وشـەی (المناسـبة) لـە زمانـەوانیدا بـە مانـا لێـك نزیـك کردنەوەیـە، دەگـوترێ: (فـلان ینـاسـب فلانـا) فلانەکـەس لـە فلانەکـەس نزیـك دەبێتـەوە،

---

[١] لەوانەی لـەم بـوارەدا دانـراوی تایبـەتییان داناوە ئـەبو جەعفـەر (ئیبراهیم)ی کـوڕی زوبەیری ئەندەلوسی نەحوی کتێبێکی داناوە ناوی ناوە (البرهان فی مناسبة ترتیب سور القرآن). شێخ بورهانی البقاعی کتێبێکی داناوە بەناوی (نظم الدرر فی مناسب الآیات والسور).

بۆیه له باسی قیاسدا که پێناسەی (المناسبة) دەکا، دەڵێ: (هی الوصف المقارب للحکم) موناسەبە وەصفێکە حوکم نزیک دەخاتەوە.

مەبەست بە (مناسبة) لێرەدا چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئەم ڕستە بەو ڕستەوە لە ئایەتێکدا، یان لەنێوان ئایەتەکاندا، یان لەنێوان سورەتەکاندا، زانینی موناسەبەو شێوەی پەیوەندی نێوان ئەو شتانە سودو نرخی خۆی هەیە، بۆ زانین‌و هەستکردن بە پێکەوە گونجانی ماناکان‌و سەرئاسایی قورئان لەڕوی بەلاغەو خۆشخوانییەوە، هەروا بەهێزی‌و پتەوی تەعبیرو بەیانی ڕێک‌وپێکی کەلامەکەو جوانی ئوسلوب‌و شێوازی ﴿الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ – هود/١﴾.

زەرکەشی دەڵێ: سودی زانستی ئەسباب نزول ئەوەیە بڕێ لە وشەو ڕستەی کەلام دەستەملانی یەکتر دەبن‌و بەمەش کەلامەکە پتەوو بەهێز دەبێ، ڕستەکان وەکوو تێکەڵکێش‌و چینی دیوار یەکتر دەگرن‌و بەهێز دەبن‌و هەموو پارچەو پێکهاتەی کەلامەکە پێکەوە گونجاو دەبن.

قازی ئەبو بەکر (ئیبنولعربی) دەڵێ: پەیوەندی‌و پێکەوە گونجانی ئایەتەکانی قورئان هەندێکیان بە هەندێکیانەوە بەجۆرێك وایان لێ بێ وەکوو یەك وشە وابن، مانایان ڕوون‌و ڕەوان‌و وشەکان وەکوو دەنکی تەسبیح پێکەوە هۆندرابنەوەو لێك درابن، هەستکردن بە دارشتنی کەلام بەم شێوازە زانیارییەکی گەورەیە.

زانینی موناسەبات‌و پەیوەندی نێوان ئایەتەکان کارێکی تەوقیفی نیەو نەتواندرێ لێکۆڵینەوەیان تێدا بکرێ، بەڵکوو ئیعتیماد دەکاتە سەر هەوڵ‌و تەقەڵلای موفەسیرەکە خۆی‌و ئەندازەی هەست‌و زەوقی بەلاغەت‌و سەرئاسایی قورئان‌و نهێنییە بەلاغەت ئامێزەکانی، شێوازو ئوسلوبی تەعبیرو گەیاندنی ناوازەی، جا ئەگەر موناسەبەکە مانای وردبوو لەگەڵ سیاق‌و شێوازەکەدا گونجاو بوو، لەگەڵ ئوصول‌و بنەماکانی زمانەوانی زمانی

عەرەبی ڕێك دەهاتەوەو پێچەوانەی یاساكانی ئەو زمانە نەبوو، ئەوە بە موناسەبەیەكی پەسەندو ناسك دەژمێردرێ.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ موفەسیر هەوڵ بدا بۆ هەموو ئایەتێك لەگەڵ ئایەتێكی تردا موناسەبە بدۆزێتەوە، چونكە قورئانی پیرۆز بۆخۆی بەگوێرەی ڕوداوو واقیعەكان بەش بەش‌و وەجبە وەجبە نازڵ بووە، وادەبێ موفەسیر هەست بە موناسەبەی نێوان وشەو ڕستەو ئایەتەكان دەكا، وایش دەبێ پەییان پێ نابا، كەوابێ پێویست ناكا بە تەعەسوفو زۆرەملی موناسەبە دیاری بكا، ئەگەر وابێ كارەكەی دەچێتە بواری بەزۆر سەپاندن‌و خۆجەڕاندن‌و زەین گوشینی بێهودەو ناپەسەند.

شێخ عزالدین بن عبدالسلام[1] دەڵێ: زانیاری موناسەبە زانیارییەكی جوان‌و پەسەندە، وەڵێ مەرجی پەسەندی‌و جوانی‌یەكەی ئەوەیە پەیوەندی نێوان كەلامەكە لەشتێكدا سەرەتاو كۆتایی پێكەوە بەستراب‌ن‌و پەیوەندییان هەبێ، ئەگەر كلامەكە پێك هاتبوو بۆ چەند شتێكی لێك جیاو لێك نەچوو ئەوە مەرج نیە ئەم بەشەی كەلامەكە پەیوەندی هەبێ بەو بەشەی تریەوە، پاشان شێخ عزالدین دەڵێ: كەسێك هەوڵ بدا پەیوەندی‌و موناسەبە بخاتە نێوان چەند شتێكی لێك جیاو نامۆ، ئەوە بەزۆر سەپاندن‌و بەزۆر بەسەردا برینێكی خستۆتە ئەستۆی خۆی: كە ناتوانێ بەجێی بێنێ مەگەر بە (رباطیكی) زۆر خوارو لاواز: كە پێویستە بۆ قسەی جوان‌و عادەتی بەكار نەیە چ جای بۆ جوانترین كەلام كە قورئانی پیرۆزە.

بێگومان قورئانی پیرۆز لەماوەی بیست‌و سێ ساڵدا دابەزیوە دەربارەی ئەحكامی جیاجیاو هۆكاری جوداوازی لێك نەچوو، شتێكیش

---

[1] زانایەكی سەدەی حەوتەمی كۆچییەو ساڵی ٦٦٠/ی كۆچی لە دونیا دەرچووە بە (العز)ی كوڕی عبدالسلام مەشهورە.

ئاوابێ هەندێکی پەیوەندی بەهەندێکیەوە نابێ‌و موناسەبە لەنێوانیاندا بەیدەست نابێ.

بێگومان بڕێ لە ڕاڤەکەرانی قورئان گرنگیان داوە بە دەرخستن‌و دیاریکردنی موناسەبە لەنێوان ڕستەکانی قورئان، یان لەنێوان ئایەتەکانیدا، یان لەنێوان سورەتەکانیدا، هەوڵەکانیان سەرکەوتوبوون‌و شتی جوان‌و سەرەنج ڕاکێشیان خستۆتە ڕوو.

ڕستە لە کەلامدا وادەبێ تەئکیدو جەختە بۆ ڕستەی پێشوو، یان بەیان‌و تەفسیریەتی، یان ئیعتیراض‌و تەذییل‌و شتی وا.

ئایەتەکە لەهەر شوێنێکی قورئاندا بێ، پەیوەندییەکی هەیە بە پێشەوە، ئەم جۆرە پەیوەندییە کۆیان دەکاتەوە، جا پەیوەندییەکە موقابەلەو بەرامبەری بێ وەکوو بەراوردکردنی صیفاتی موسوڵمانان‌و صیفاتی موشریکان، هەڕەشە لە ئەمان‌و وادە بەوان، هەروا هێنانی ئایاتی ڕحمەت دوای ئایاتی عەزاب، ڕانواندنی ئایاتی تەرغیب‌و هەڵنان لەدوای ئایاتی تەرهیب، هێنانی ئایاتی تەوحیدو یەکتاپەرستی دوای ئایاتی کەونی‌و سروشت......

وادەبێ موناسەبەکە بە بەرچاوگرتنی حاڵ‌و وەزعی ئەوانەیە کە سەرەتا ئایەتەکە بۆ سەر ئەوان نازڵ بووە وەکوو ئایەتی ﴿أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى الإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ، وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ، وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ، وَإِلَى الأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ - الغاشية/١٧ - ٢٠﴾ لێرەدا دەقەکە باسی وشترو ئاسمان‌و کێوەکانی پێکەوە هێناون‌و لێکی داون، چونکە حاڵی ئەو عەرەبە سارانشینانەی بەرچاوگرتووە کە یەکەمجار خیطابیان ئاڕاستەکراوە، چونکە ئەوان بۆ بەڕێکردنی ژیانیان پشتیان بە حوشتر بەستووە، شتی گرنگ لای ئەوان ئەو ئاژەڵە بووە، هەمیشە لەبەرچاویان بووە، هۆکاری سەرەکی بژێوو ژیانیان بووە.. هەڵبەتە ئەمەشیان بۆ دەستەبەر نەدەبوو

بەبێ باران‌و ئاوێك گیایان بۆ پێ بڕوێ‌و ئاژەڵەكانیان لەو لەوەڕە بلەوەڕێن‌و لە ئاوەكەش بخۆنەوە، ئاو لە باران پەیدا دەبێ، ئەمەش هۆی سەرەكی بووە بۆ ئەوەی لە كاتی پێویستیان بە باران چاو ببڕنە ئاسمان‌و چاوەڕوانی بارانی ڕەحمەت بن، ئەمجار ئەوانە پێویستیان بە پەناگەو شوێنی قایم هەبووە لەكاتی تەنگانەدا پەنای بۆ بەرن‌و خۆیانی تێدا حەشار بدەن، هەڵبەتە هیچ شوێنێك بە ئەندازەی كێوانی دژو سەخت پەناگەی ئەمین نین.. ئەمجار ئەو سارانشین‌و كۆچەریانە هەمیشە بەدوای لەوەڕو ئاودا لە شوێنێكەوە گواستویانەتەوە بۆ جێگایەكی تر، لەدەڤەرێكی لەوەڕ كەم‌و بێ ئاو گواستویانەتەوە بۆ جێگایەكی تری ئاودارو لەوەڕ زۆر، جا كە ئەم عەرەبانەی ئەوە حاڵی هەمیشەییان بووە، ئەم ئایاتانەیان بیستووە لەناخەوە هەژاندونی‌و ماناكانیان تێكەڵاوی خانەو دەزولەی قوڵایی دڵیان بووەو لەگەڵ سروشتی دەوروبەریان پتر جۆشیان خواردووە.

وادەبێ موناسەبە لەنێوان ئەم سورەت‌و ئەو سورەتدا دەبێ، بۆ نموونە وەكوو سەرەتای سورەتی (الأنعام) كە بە وشەی (الحمد) دەست پێ دەكا ﴿الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِم يَعْدِلُونَ﴾ بێگومان ئەمە موناسیبە بۆ كۆتایی سورەتی (المائدة) كە دەربارەی لێپرسینەوەو دادگایی كردنی بەندەكان دەكا لە ڕۆژی حەشرداو دەفەرموێ: ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ، قَالَ اللّهُ هَذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ، لِلّهِ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – المائدة/١١٨ – ١٢٠﴾ وەكوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ – الزمر/٧٥﴾.

هەروەها وەکوو سەرەتای سورەتی (الحديد) کە بە تەسبیحات دەست پێ دەکا ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ئەمە موناسیبە لەگەڵ کۆتایی سورەتی (الواقعة) کە فەرمان بە تەسبیحاتکردن دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾.

هەروەها وەکوو پەیوەندی سورەتی (لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ) بە سورتی (الفيل)ەوە، بێگومان بە هیلاکچوونی ئەصحابولفیل ئاکامەکەی جێگیربوونی قورەیش بوو بۆ ئەنجامدانی کاروانی دوو وەرزی زستانو هاوینیان، تەنانەت (الأخفش) وتویەتی پەیوەندی سورەتی پێشەوە بەهی دواوە لە بابەتی تەعبیری ﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ - القصص/٨﴾.

وادەبێ موناسەبە لەنێوان سەرەتاو کۆتایی سورەتدا دەبێ، بۆ نموونە وەکوو ئەوەی لە سورەتی (القصص)دا هەیە، ئەوەتا سەرەتا بە چیرۆکی حەزرەتی موسا دەست پێ دەکا، چۆن پێگەییو پەروەردە بوو تا گەیشتە ئەوەی ڕۆژێك بینی دووپیاو شەڕیانەو یەکیان کە لە نەتەوەی ئیسرائیل بوو هاواری لێ کرد یارمەتی بدا.................................تاکۆتایی.

پەروەردگار دوعاو پاڕانەوەکەی موسامان بۆ دەگێڕێتەوە: کە دەڵێ: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ - القصص/١٧﴾ پاشان پەروەردگار کۆتایی سورەتەکە بە دلدانەوەی پێغەمبەرمان حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەهێنێ: کە لە زێدو نیشتمانی خۆی دەرکرابوو، وادەی دەداتێ کە بیگێڕێتەوە بۆ مەککەو سەربەرزانەو سەرکەوتووانە بچێتەوە ناوی، لەهەمان کاتدا نەهی ئەوەی لێ دەکا کە پشتگیری کافران بکا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ مَنْ جَاءَ بِالْهُدَى وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ، وَمَا كُنتَ تَرْجُوا أَنْ يُلْقَى

إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلاَّ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ فَلا تَكُونَنَّ ظَهِـيراً لِلْكَـافِرِينَ – القـصص/٨٥ – ٨٦﴾.

کەسێك بەناو کتێبەکانی تەفسیردا بگەڕێو سەرنج بدا زۆر لایەنو شێوەی موناسەباتی جۆراوجۆری دێتە بەرچاو.

## نازڵبوونی قورئان

پەروەردگار قورئانی نازڵ کردووە بۆ سەر عەبدی خۆی حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی هیدایەت بدا بۆ ڕێبازی ڕووناکیو بەختەوەری، ئاشکرایە نازڵبوونی قورئان ڕوداوێکی گەورەو بێ وێنە بوو، ئەهلی ئەرزو ئاسمان هەستیان بە مەکانەتو گەورەیی ئەو ڕوداوە کردووەو دەکەن، نازڵبوونی قورئان یەکەمجار لە شەوی لەیلەتولقەدردا ئیعلامی عالەمی باڵای کرد کە خودا چ ڕێزو شەرەفێکی بە ئوممەتی حەزرەتی موحەممەد بەخشی، بە عالەمی فریشتەی ڕاگەیاند کە خودا پلەو پایەیەکی زۆر بەرزی بەخشی بە مرۆڤایەتیو ڕیسالەیەکی تازەو بێ وێنەی خەڵات کردوون.. بۆ ئەوەی ئەو گەلە خودا پێداوە ببنە باشترین گەلو نەتەوەیەك ڕابەرایەتی مرۆڤ بکەن، فەرمان بکەن بەچاکەو نەهی بکەن لە خراپە، هەڵبەتە دەبێ ئەم نازڵبوونەی یەکەمجاری بریتی بێ لە نازڵبوونی هەموو قورئان لە لەوحولمەحفوظەوە بۆ (بيت العزة) لە ئاسمانی دونیا.

ئەمجار نازڵبوونی دووەمی ئایەت ئایەتو سورەت سورەتو پارچە پارچە بە پێچەوانەی نامە ئاسمانییەکانی تر کە بە یەکجار نێردراون بۆ پێغەمبەرە خاوەن نامەکان، ئەمە بووە جێگای مقۆمقۆی خەڵکەکەو پەیدا بوونی شكو گومانی جۆراوجۆر لایان، تا لە ئاکامدا ڕاستیان بۆ ڕوون بۆوەو هەندێ لە نهێنیو حیکمەتی خودایییان بۆ ئاشکرا بوو، بەڵێ وانەبوو

نەدەگونجا وابێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەموو قورئانی بە یەکجار بۆ بێتە خوارێو ئەو گەلە سەر رەقو دڵرەقە یەکسەر ئیمانی پێ بێنن‌و بەسنگ فراوانی وەری بگرن، بەڵکوو قۆناغ بەقۆناغ‌و بەپێی ڕووداوو پێویستی، قورئان هاتۆتە خوارێ، بۆ ئەوەی سەرەتا لە دڵی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) بچەسپێو پێی ئاشنا بێ، ئەمجار بە گەل‌و نەتەوەی دەوروبەری رابگەیەندرێو ئەوانیش پێی ئاشنا بن، هەروا هەندێ جار بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو ورەبەرزانی کە لەسەر پەیامەکەی بەردەوام بێو کۆڵ نەدا، لەلایەکی ترەوە ڕۆیشتن پێ بەپێو پلە بەپلە (تدرج) لەگەڵ ڕوداوو واقیعات‌و پرسیار، هەتا پەروەردگار ئایینی خۆی تەواو کرد.

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ - البقرة/١٨٥﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ - القدر/١﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ - الدخان/٣﴾.

ئەم سێ ئایەتە هیچ تەعاروض‌و دژایەتییان لەنێواندا نیە، (ليلة المباركة) هەمان شەوی (القدر)ە کە لە مانگی رەمەزاندایە، بەڵکوو ظاهیری ئایەتەکان لەگەڵ واقیعی عەمەلی ژیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە ڕواڵەت دژایەتییەك دەبیندرێ، لەم ڕووەوە کە قورئان لە ماوەی بیست‌و سێ ساڵدا بەیناو بەین وەجبە وەجبە بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نازڵ بووە.

**زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەمە دوو مەزهەبی سەرەکییان هەیە:**

١- **مەزهەبی یەکەم:** ئەوەیە ئیبنو عەبباس‌و کۆمەڵێك لە هاوەڵان‌و جەماوەری عولەماش پێیان وایە مەبەست بە نازڵبوونی قورئان لەوسێ ئایەتەی پێشوو نازڵبوونیەتی بە یەك وەجبە لە لەوحولمەحفوزەوە بۆ

(بيـت العـزة) لـه ئاسمـانى دونيـا بـۆ بەگـەورە زانـينو شـكۆمەندى لـەلاى فريشتەكانى، پاشان لەوێوە لـەماوەى بيـستو سـێ سـاڵدا لـە ڕۆژى بـوونى بـە پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) تـا ڕۆژى لـە دونيـا دەرچـوونى بەگوێرەى پێويست وەجبە وەجبە ئايەت ئايەتو سورەت سورەت بە نيگا بـۆ پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) دابەزێنـدراوە؛ سـيانزە سـاڵ لـە مەككەو دە ساڵيش لە مەدينە دواى كۆچكردنى بۆ ئەوێ.

لـە ئيبنـو عەبباسـەوە (ڕەزاى خـودا لـەخۆىو لـە بـاوكى بـێ) ڕيوايەتكراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لە تەمـەنى چل ساڵيدا نيگاى يەكەمجارى بـۆ هاتو بـوو بـە پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسەر بێ) لە مەككە سيانزە ساڵ مايەوە، ناوە ناوە نيگاى بـۆ دەهات، پاشان فەرمانى پێ كرا كۆچ بكا بۆ مەدينەو دە ساڵ مايـەوە، وەفاتى كـرد تەمـەنى شەصتو سێ ساڵ بوو.[1]

لە ڕاستيدا ئەم مەزهەبە ئەوەيە: كە لـە چـەند حـەديثى صـەحيحدا پشتگيرى لێ دەكرێو حـەديثە صـەحيحەكانيش بـە ڕيوايـاتى جيـا لـە ئيبنـو عەبباسەوە (ڕەزاى خودا لەخۆىو لە باوكى بێ) ڕيوايەتكراون.

أ/ عن إبن عباس قال: أنزل القرآن جملـة واحـدة إلى الـسماء الـدنيا ليلـة القدر، ثم أنزل بعد ذلك في عشرين سنة، ثم قرأ ﴿وَلَا يَأْتُونَـكَ بِمَثَـلٍ إِلَّـا جِئْنَـاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا – الفرقان/٣٣﴾ ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْـرَأَهُ عَلَـى النَّـاسِ عَلَـى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً – الإسراء/١٠٦﴾.[2]

---

[1] بوخارى/٣٨٥١ ومسلم/٦٠٩٧.

[2] أخرجه النسائي في الكبرى/١١٣٠٨ والحاكم/٢٨٧٩ والبيهقي في الأسماء والصفات/٤٩٧.

ب/ وعن إبن عباس (رضى الله عنه) قال: فصل القرآن من الذكر فوضع في بيت العزة من السماء الدنيا فجعل جبريل ينزل به على النبى (صلى الله عليه وسلم).[١]

ج/ وعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قال: أُنْزِلَ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا ، وَكَانَ بِمَوْقِعِ النُّجُومِ وَكَانَ يُنْزِلُهُ عَلَى رَسُولِهِ -صلى الله عليه وسلم- بَعْضَهُ فِي إِثْرِ بَعْضٍ.[٢]

د/ وعن إبن عباس قال: أنزل القرآن في ليلة القدر في شهر رمضان إلى سماء الدنيا جملة واحدة ثم أنزل نجوما.[٣]

٢- **مەزھەبی دووەم:** ئەوەیە لە (الشعبی)*یەوە ڕیوایەت کراوە، دەڵێ: مەبەست بە نازڵبوونی قورئان لەوسێ ئایەتەی پێشوودا، سەرەتای نازڵبوونی قورئانە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەواتە سەرەتای نازڵبوونی قورئان لە شەوی قەدر لە مانگی ڕەمەزاندا دەستی پێ کردووە هەر ئەم شەوەشە بە (لیلة القدر) ناوی هاتووە، پاشان بەگوێرەی پێویستو قۆناغ بەقۆناغ وەجبە وەجبە نازڵبوونەکە درێژەی کێشا، بەگوێرەی ڕوداوو واقیعاتەکان دابەزینی بەردەوام بوو، لە نزیکەی بیستو سێ ساڵدا تەواو بوو، کەوابێ قورئان نازڵبوونەکەی یەك شێوەو یەکجار بووە ئەویش نازڵبوونی بەش بەشو ئایەت ئایەتو سورەت سورەت، چونکە ئاماژە بۆ ئەو حاڵە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً - الإسراء/١٠٦﴾.

---

(١) النسائی فی البری/٧٩٣٧.

(٢) أخرجه الحاكم/٢٨٧٨ والبيهقی فی الكبر/٨٥٢١.

(٣) أخرجه الطبرانی فی الكبير/١٢٤٢٦.

* شعبیی عامیری کوڕی شوراحیلە: تابیعێکی گەورەیە، گەورەترین مامۆستای ئەبو حەنیفە بووە، لە عیلمی حەدیثو فیقهدا پێشەوا بووە، ساڵی (١٠٩)ی کۆچی مردووە.

بۆیە موشریکەکان دەمەدەمێو جیدالیان لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد چونکە ئەوان وایان بۆ گێردرابووەوە: کە کتێبە ئاسمانیەکانی پێشوو بە یەکجار هاتوونە خوار ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا ، وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا – الفرقان/٣٢ – ٣٣﴾.

بۆ مرۆڤ فەضلو زێدەی مانگی ڕەمەزانو گەورەیی شەوی قەدر دەرناکەوێ ئەگەر مەبەست بەو سێ ئایەتە نازڵبوونی قورئان نەبێ بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).. بەم شێوە مانای ئایەتەکان لەگەڵ مانای ئەو ئایەتەی دەربارەی غەزای بەدر هاتۆتە خوارێ ڕێك دەکەون: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – الأنفال/٤١﴾ بێگومان غەزای بەدر لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوویداوە، ئەمەش پشتگیری ئەو ڕایە دەکا: کە زانایانی ڕۆچوو لە زانیاری ئاییندا دەربارەی حەدیثی (بدء الوحی) کە لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: «كَانَ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – من الوحي الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ فَكَانَ يَلْحَقُ بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ – قَالَ وَالتَّحَنُّثُ التَّعَبُّدُ – اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ (رضى الله عنها) فَيَتَزَوَّدُ بِمِثْلِهَا ، حَتَّى فَجِئَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « مَا أَنَا بِقَارِئٍ » . قَالَ « فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجُهْدُ ثُمَّ أَرْسَلَنِي . فَقَالَ اقْرَأْ . قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ . فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجُهْدُ ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي . فَقَالَ اقْرَأْ . قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ . فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجُهْدُ ثُمَّ أَرْسَلَنِي . فَقَالَ ( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِى خَلَقَ * خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ * الَّذِى عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ) » . الآيَاتِ إِلَى قَوْلِهِ ( عَلَّمَ الإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ»

زانایان و لێکۆڵەرەوانی بواری فەرمووده لەسەر ئەوە کۆکن: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرەتا لە مانگی رەبیعی یەکەمدا کە مانگی لەدایکبوونیەتی بە خەو بینین نیگای بۆ هاتووە، شەش مانگ بەم شێوە بووە، پاشان لە حاڵەتی بەخەبەری‌و بە ئاگاییدا لە مانگی رەمەزاندا بە سورەتی (العلق) نیگای بۆ هاتووە، بەم شێوە تەفسیرە دەقەکان؛ ئایەت‌و حەدیثەکان پشتگیری یەکتر دەکەن یەك مانا دەبەخشن‌و دەیچەسپێنن.

٣- مەزهەبێکی سێهەم هەیە پێی وایە قورئان لە لەوحولمەحفوظەوە لەماوەی (٢٣) شەوی قەدردا دابەزێندراوە بۆ ئاسمانی یەکەم، لەهەرشەوێك لەو شەوانەدا نازڵبوونی ساڵێکی تەواوی تێدا نازڵ کراوە، لە شەوی قەدری هەر ساڵێکدا بە یەکجار ئەوەندە نازڵ بووە: کە دوایی وەجبە وەجبە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هێندراوە ئەم مەزهەبە ئیجتیهادی هەندێ لە موفەسیرینە‌و چ بەڵگەیەك نیە پشتگیری بکا!

وەڵێ مەزهەبی دووەم کە ئیمامی شیعبی ڕایگەیاندووە وێڕای ئەوەی کە بەڵگەکانی صەحیحن‌و وەردەگیرێن، هیچ تەعاروض‌و دژایەتیەکی لەگەڵ مەزهەبی یەکەمدا کە لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە تێدا نیە، کەوابێ وای لێ دێتەوە؛ نازڵبوونی قورئان بە یەکجار‌و سەرەتای نازڵبوونی وەجبە وەجبە لە شەوی لەیلەتولقەدری مانگی رەمەزاندا بووە کە بریتییە لە شەوە پیرۆزەکە.

## ڕای ڕاجیح و پەسەند ئەوەیە قورئان دوو جۆر نازڵبوونی هەیە

١- نـــازڵبوونی بـــە کۆمـــەڵ و یـــەکجار لـــە شـــەوی قـــەدردا لـــە لەوحولمەحفوظەوە بۆ (بیت العزة) لە ئاسمانی دونیا.

٢- نازڵبوونی پارچە پارچەو وەجبە وەجبە لە بەیتوالعیزەوە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا.

بێگومـان ئیمـامی قورطـوبی لـە تەفـسیرەکەی لـە موقـاتیلی کـوڕی حەییانــەوە کـۆڕای عولـەمایانی نـەقڵ کـردووە لەسـەر ئـەوە: کـە قورئـان هەمووی بە یەکجار لە لەوحولمەحفوظەوە دابەزێندراون بۆ (بیـت العـزە) لـە ئاسمانی دونیا.

ئیبنــو عــەبباس (ڕەزای خــودا لــەخۆی و لــە بــاوکی بــێ) ئــەوەی ڕەتکردۆتــەوە: کــە دژایــەتی هــەبێ لــەنێوان ئــەو ســێ ئایەتــەدا دەربــارەی نازڵبوونی قورئان و واقیعـی عەمـەلی لـە ژیـانی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەوە: کـە لـە مـاوەی بیـست و سـێ سـاڵدا بـە غـەیری مـانگی ڕەمەزانیش بۆی نازڵ بووە.

لــە ئیبنــو عەبباســەوە (ڕەزای خــودا لــەخۆی و لــە بــاوکی بــێ) ڕیوایــەتکراوە: کــە (عطیــة)ی کــوڕی (الأسـود) پرسـیاری ئاڕاسـتە کـردووە، وتویەتی گومانێکم دەربارەی ئایەتی ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – البقـرة/١٨٥﴾ بۆ پەیدا بووە کە لەگەڵ ئایـەتی ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ بەرامبـەریان دەکـەم لـە کاتێکـدا ئـەم قورئانــە لـە مـانگی شـەوالدا لـە ذیلقەعیـدەدا لـە ذیلحیجـەدا لـە موحـەڕڕەم و صـەفەردا لـە مـانگی ڕەبیعـدا نـازڵ بـووە، ئەمـە چەندی بە چەند؟ ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لە بـاوکی بێ) پێـی

دەڵێ: کاکی برا! قورئان هەمووی بە یەکجار لە ڕەمەزاندا لە شەوی قەدردا هاتۆتە خوارێ بۆ ئاسمانی دونیا بۆ (بیت العزة) ئەمجار پچڕ پچڕو ئایەت ئایەتو سورەت سورەت وردە وردە لە مانگو ڕۆژی ساڵەکاندا بەگوێرەی پێویست هاتۆتە خوارێ.

هەندێ لە زانایان فەرموویانە حیکمەتی ئەو دوو جۆر دابەزینە: جارێك بە کۆو جارێك بە جیاجیاو بەیناو بەین ئاماژە بە گەورەیی‌و گرنگی قورئان‌و ڕێزداری ئەو کەسەی بۆ سەری نازڵ بووە.

شێخی سیوطی دەفەرموێ: حیکمەتو نهێنی لە نازڵبوونی قورئاندا بە جوملەو بەکۆ بۆ ئاسمانی دونیا بە گەورە زانینی قورئان خۆی‌و ڕێزگرتن لەو کەسەی بۆ سەری نازڵ بووە، بەمجۆرە بە دانیشتوانی حەوت ئاسمانەکان ڕاگەیاندرا: کە ئەم کتێبە پیرۆزە دوایین نامەی ئاسمانییە کە دەنێردرێ بۆ خاتەمی پێغەمبەران کە ڕەوانەکراوە بۆ سەر ئوممەتێکی باش‌و پەسەند، ئا ئەوەتا قورئانمان لێ نزیك کردوونەوە بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بۆیان دابەزێنین.

ئەگەر حیکمەتی ئیلاهی ئەوەی نەخواستایە کە جیا جیاو ئایەت ئایەتو وەجبە وەجبە بەگوێرەی وەقائیع‌و ڕوداو پێیان ڕابگەیەندرێ یەکسەر هەمووی تێکڕا وەکوو باقی نامە ئاسمانییەکانی تری پێش خۆی دادەبەزێندرایە سەر زەوی! وەلێ پەروەردگار جوداوازی خستە نێوان قورئان‌و نامە ئاسمانییەکانی تر، بەوە دوو جۆر دابەزینی بۆ بڕیار دا، دابەزینی جوملەو یەکجار بۆ (بیت العزة) پاشان دابەزینی وەجبە وەجبە لە ئاسمانی دونیاوە بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەش بۆ ڕێزگرتن لەو کەسەی قورئانی بۆ دابەزێندراوە.

ئیمامی سەخاوی لە (جمال القراء)دا دەڵێ: دەربارەی نازڵبوونی قورئان بۆ (بیت العزة) لە ئاسمانی دونیا بە یەك وەجبە، ڕێزلێنانی

ئادەمیزادەو بە گەورەو شکۆمەند رانواندنیانە لەلای فریشتە، پێ زاناندنیانە کە لای خودا رێزیان هەیەو گرنگیان پێ دەداو رەحمەتو بەزەیی زۆری هەیە بۆیان، هەر لەبەر ئەم رێزلێنانەیە: کە پەروەردگار فەرمانی بە حەفتا هەزار فریشتە کرد کە سورەتی (الأنعام) بەشێوەی کەرنەفاڵ دابەزێنن![1] بەڵکوو زیاد لەوە پەروەردگار فەرمانی بە جوبرائیل کرد کە بەسەر پێرێك فریشتەدا کە بە (سفرة الكرام) بەناوبانگن بیخوێنێتەوەو ئەوانیش بینووسنەوەو بیخوێننەوە.[2]

٤- برێ لە زانایان رایان وایە قورئان یەکەمجار هەمووی نازڵبووە بۆ لەوحولمەحفوظ، بەڵگەشیان ئەم دوو ئایەتەیە: کە دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ ، فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ – البروج/٢١ – ٢٢﴾ پاشان لە لەوحولمەحفوظەوە دابەزێندراوە بۆ (بيت العزة) لە ئاسمانی دونیا بە یەکجار، پاشان ئایەت ئایەتو وەجبە وەجبە دابەزێندراوە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوابێ ئەمە سێ جار دابەزینە، ئەمەش هیچ دژایەتیو تەعاروض بەدی ناهێنێ لەگەڵ ئەو رایەی لەوەپێش ئێمە بە راجیحو پەسەندمان زانی، چونکە ئەوە چەسپاوەو سەلمێندراوە: کە قورئان لە لەوحولمەحفوظدایەو ثابیتە، وەکوو هەموو ئوموورە غەیبییاتەکانی تر کە لەو شوێنەدا ثابیتو جێگیرن، ئەمجار قورئان بەکۆو جوملە لە لەوحولمەحفوظەوە دابەزێندراوە بۆ (بيت العزة) لە ئاسمانی دونیا.

وەکوو لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ریوایەتکراوە دەربارەی شەوی قەدر، قورئانی پیرۆز بە وەجبە وەجبە – وەکوو ئیمامی شیعبی بۆی چووە – نازڵ بووە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی

---

[1] أخرج الطبراني في الصغير/١٢٩٣٠ وأبو عبيدة في فضائل القرآن ص/٢٤٠ عن إبن عباس قال: نزلت سورة الأنعام بمكة ليلاً جملة حولها سبعون ألف ملك يجأرن بالتسبيح.

[2] الإتقان ص/٩٦.

خودای لەسەر بێ) لە شەوی پیرۆزی مانگی ڕەمەزاندا، چونکە هیچ مانیعێك نیە لەوەدا بەکۆو جوملە نازڵبووبێو سەرەتای نازڵبوونیشی بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجیاجیا هەر لە هەمان شەودا بووبێ، بەمەش تەعاروضو دژایەتی لەنێوان راوبۆچونەکاندا نامێنێو نابێ، ئەگەر مەزهەبە سێیەمەکە چەرت بکەینو گرنگی پێ نەدەین، بە تایبەتی کە مەزهەبێکی ئیجتیهادیەو بێ بەلگەیە!!.

## نازڵبوونی قورئان بەشێوەی وەجبە وەجبە

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ، بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ – الشعراء/١٩٢ – ١٩٥﴾، هەروا دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ – النحل/١٠٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ – الجاثية/٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ – البقرة/٢٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ – البقرة/٩٧﴾.

ئەم ئایەتانە هەموویان بانگی ئەوە هەڵدەدەن: کە قورئانی پیرۆز کەلامی پەروەردگارەو بە وشەو زمانی عەرەبی نازڵ بووەو حەزرەتی جوبرائیل دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم نازڵبوونو دابەزاندنە جیاواز لە دابەزینی یەکەمجاری کە لە لەوحولمەحفوظەوە دابەزێندراوە بۆ (بیت العزە) لە ئاسمانی دونیا، مەبەست بەو نازڵبوونەی ئایەتەکانی پێشوو ئاماژەی پێ دەکەنو دەیچەسپێنن نازڵبوونیەتی بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

هەڵبەتە تەعبیردانەوە بە لەفظی (التنزیل) لەجیاتی (الإنزال) ئاماژەیە بۆ ئەوە کە مەبەست دابەزینیەتی بە وەجبە وەجبەو ناو بەناو، چونکە بێگومان زانایانی زمانەوانی زمانی عەرەبی جوداوازی دەخەن لەنێوان (الإنزال)و (التنزیل)دا ئەمەیان بۆ ئەوە بەکاردێنن کە جیاجیا نازڵ بووبێ، وەلێ (الإنزال) گشتی ترەو بۆ هەردوو شێوەکە بەکار دێ. بڕوانە (مفردات الفاظ القرآن).

بێگومان قورئان لەماوەی بیستو سێساڵدا، سیانزە ساڵ لە مەککەو دە ساڵیش لە مەدینە، بەگوێرەی پێویستو ڕوداو وەجبە وەجبە نازڵ بووە بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەر بەبێ پێچو پەنا قورئان ئاماژە بەوە دەکا: کە بەش بەش نازڵ بووە بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً – الإسراء/١٠٦﴾ واتە نازڵبوونەکەیمان بەش بەش کردووەو ناوبەناو بۆمان دابەزاندوی بۆ ئەوەی بەهێدیو لەسەرەخۆیو چەسپاویو ڕەوانیو بەرچاوڕونی بەسەر خەڵکیدا بیخوێنیەوەو ئەوانیش تێبگەنو هەزمی بکەن، هەروەها وەڵامی پرسیارو حوکمو تەرازوی ڕوداوەکان بێ.

وەلێ کتێبە ئاسمانیەکانی تر وەکوو تەوراتو ئینجیلو زەبور، نازڵبووونەکەیان بە یەك وەجبە بووەو پارچە پارچەو بەش بەش دانەبەزێندراون بەڵگە لەسەر ئەمە ئەم ئایەتەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا – الفرقان/٣٢﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ڕونو ئاشکرایە لەسەر ئەوە کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوو بە یەك وەجبە نازڵبوونو هەریەکەیان لە ڕۆژگاری خۆیدا پەروەردگار بە یەکجار بۆ پێغەمبەرە خاوەن نامەکەی ناردووە، جەماوەری زانایانی ئیسلام لەسەر ئەمە کۆکن.

خۆ ئەگەر ئەو كتێبانە نازڵبوونەكەیان بەش بەش بوایە، هیچ مانایەك نەدەبوو بۆ سەرسوڕمانی كافرەكانی عەرەب كە دەیانزانیو پێیان ڕادەگەیەنرا: كە قورئان بە بەش بەشی دادەبەزێ، چونكە مانای وتەكەیان كە دەیانگوت: (لولا نزل علیه القرآن جملة واحدة) ئەوەیە: بۆچی قورئان بە یەكجار بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانابەزێو كۆتایی پێ بێ وەكوو باقی كتێبە ئاسمانییەكانی پێشوو؟ بۆچی ئاوا پچرپچڕو ئایەت ئایەت قورئانی بۆ دێ، چ حیكمەتێكی تێدایە یاسای دابەزینی ئەم جوداوازە لە كتێبەكانی تر؟

هەڵبەتە پەروەردگار ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی عەرەبەكانی نەدایەوە، بەوە بفەرموێ ئەمە یاساو دابو نەریتی منە لە نازڵكردنی كتێبی ئاسمانی بەگشتی، وەكوو چۆن ڕەدی پرسیاری ئەوەیانی دانەوە كە ﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا – الفرقان/٧﴾ بەمە: كە پێیانی فەرموو: ﴿وَما أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا – الفرقان/٢٠﴾ هەروەكوو چۆن ڕەدی قسەكەیانی دایەوە: كە گوتیان: ﴿أَبَعَثَ اللّهُ بَشَرًا رَّسُولاً – الإسراء/٩٤﴾ فەرمووی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ فِي الأَرْضِ مَلآئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاء مَلَكًا رَّسُولاً – الإسراء/٩٥﴾ یان فەرمووی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِمْ – الأنبياء/٧﴾.

بەڵكوو وەڵامی پەروەردگار بۆیان دەربارەی نازڵبوونی قورئان بەشێوەی وەجبە وەجبەو ئایەت ئایەت وەڵامێك بوو حیكمەتی نازڵبوونەكەی بەو شێوە تێدا ڕوون كراوەتەوە، فەرمووی: ﴿كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ – الفرقان/٣٢﴾ واتە: ئێمە بەو شێوە كە قورئانمان بۆ نازڵ كردوویو وەجبە وەجبەو ئایەت ئایەت بۆت دەنێرین حیكمەتێكی تێدایە: كە بریتییە

لە بەهێزکردنی دڵو دەروونت تا باش وەری بگری‌و لێی حاڵی بی‌و پێی ئاشنا بی‌و بەپێی پێویست بە خەڵکی ڕابگەیەنی ﴿وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا﴾ وامان تەقدیر کردووە ئایەت دوای ئایەت بۆتی نازڵ بکەین، یان بە باشی بۆمان ڕوونکردویەوەو تێمان گەیاندووی.

بێگومان نازڵکردنی قورئان بە وەجبە وەجبەو بەگوێرەی پێویستی‌و ڕوداو بۆ لێ تێگەیشتن‌و لەبەرکردنی نزیکترەو ئاسانترە ئەمەش گەورەترین هۆکاری چەسپاندن‌و جێگیربوونیەتی لە دڵو دەرونی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ).

ئەوەی لە ڕوانگەی حەدیثی صەحیحی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) چەسپاوەو مەشهورە ئەوەیە: کە قورئان بەگوێرەی پێویست، پێنج ئایەت، دە ئایەت کەمتر، زیاتر ئاوا بەو جۆرە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەتا چەسپاوە: کە دەربارەی چیرۆکی بوختان بە یەکجار دە ئایەت نازڵ بوون، هەروا صەحیح‌و چەسپاوە کە دە ئایەتی سەرەتای سورەتی (المؤمنين) بە یەکجار نازڵ بوون، هەروەها ئەوەش صەحیح‌و راستە کە ﴿غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ﴾ کە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە (٩٥)ی سورەتی (النساء) بە تەنها دابەزیوە.[١]

## حیکمەتی نازڵبوونی قورئان بە وەجبە وەجبە

بێگومان ئێمە دەتوانین لە ڕوانگەی ئەو دەقە قورئانیانەو ئەو فەرموودانەی: کە لەم بارەوە وارید بوون پوختەی ئەو حیکمەتانە بدۆزینەوە: کە بۆچی قورئان وەجبە وەجبە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتۆتە خوار، ئاماژەیان بۆ بکەین‌و دیارییان بکەین.

---

[١] بڕوانە الإتقان ص٩٩.

١- حیکمـەتی دڵدانـەوەو جێگیرکردنـی دڵـی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بەردەوام بێ لەسەر بانگەوازی پەیامی خۆی.

بێگومـان پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بانگـەوازی خـۆی ئاراستەی خەڵك کرد، کاردانەوەی بانگەوازییەکەی جۆراوجۆر بوو، هـەیانبوو بە سەر ڕەقیو توندوتیژی وەڵامـی دایـەوە، زۆربـەی زۆریـان دڵـڕەقو مێشك وشـك خـو ناشـیرین بـوون، توندوتیـژیو عـەنادو سـەر ڕەقـی ڕەوشـتی سروشتییان بوو، بۆیە بەجۆرەها ئەزیەتدانو گاڵتـە پێکـردنو وشکەتەبیاتی وەڵامیان دایەوەو کەوتنە خۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی بەهەموو جۆرێك.

هەڵبەتە لەگەڵ ئەم وقیع حاڵەی ئـەوان، پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) زۆر بە دڵسۆزیو لێبڕانـەوە، ڕاستگۆیو ئیخلاصـەوە هـەوڵی دەدا ئـەو پەیامـە خێـرو پـیرۆزەی خراوەتـە ئەسـتۆی بـەوانی بگەیـەنێو لـە بەدبەختی دونیاو قیامـەت ڕزگاریـان بکا، تەنانـەت بـەجۆرێك خـۆی لەگـەڵ ماندوکردنو تەقەڵلای لەگەڵ دان: کە قورئان دەربـارەی بفـەرموێ: ﴿فَلَعَلَّـكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَـى آثَـارِهِمْ إِن لَّـمْ يُؤْمِنُـوا بِهَـٰذَا الْحَـدِيثِ أَسَـفًا – الکهـف/٦﴾ ئـەوەبوو نـاوە نـاوە نیگـا دادەبەزییـە سـەر دڵـی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) بەجۆرێك دڵی پیرۆزی لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی چەسپاو بـێ، کۆڵ نەدا، ورەی بەرز بکاتەوەو عەزمی مشتو ماڵ بکاو بەردەوام بـێ لەسـەر گەیاندنی پەیامەکەیو ڕێبـازی بانگەوازی خـۆی بەرنـەدا، گـوێ نەداتـە ئـەو کۆسپو تەگەرانەی لـە گەلـە سـەر لێشیواوەکەیەوە بـەرەو ڕووی دەکرانـەوە، فەرمانی پێ دەکرا کە ئەو پەیامی خـۆی بگەیـەنێو گـوێ بـە هەڵسوکـەوتی نـەفامو سـەرڕەقانی نەتەوەکـەی نـەداو وابزانـێ هـەوری هاوینـەو زۆر نابـا دەڕەوێتەوە.

پـەروەردگار سـوننەتو دابو نـەریتی خـۆی دەربـارەی پێغەمبـەرانی پێـشوو بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، ئـەو پێغەمبەرانـەی لەلایـەن قەومەکانیانـەوە

ئەزیەتدراون‌و بەدرۆ خراونەوە بەڵام ئەوان صەبریان گرت‌وکۆڵیان نەدا، هەتا نەصرو یارمەتی خودا فریایان کەوت‌و سەری خستن.

پەروەردگار پێی دەفەرموێ: کە قەومەکەت بەدرۆت دەخەنەوە جگە لە لوتبەرزی‌و گێلی‌و خۆبەزلزانی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم سوننەت‌و داب‌و نەریتە نەگۆڕەی خودا بەدرێژایی کاروان‌و قافڵەی پێغەمبەرایەتی لە رابڕدوودا، تەسەللاو دڵدانەوەی بۆ دەستەبەر دەبوو، گرنگی بە ڕوو لێوەرگێڕان‌و بەدرۆخستنەوەی پەیامەکەی لەلایەن گەلەنەفامەکەیەوە نەدەدا ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ ، وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَى مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا وَلاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ وَلَقدْ جَاءكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ – الأنعام/٣٣ – ٣٤﴾ ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآؤُوا بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَالْكِتَابِ الْمُنِيرِ – آل عمران/١٨٤﴾.

پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا: کە بە صەبرو خۆڕاگربێ، وەکوو چون پێغەمبەرانی پێشوو صەبریان گرتووەو پشوو درێژبوون دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنْ الرُّسُلِ – الأحقاف/٣٥﴾ دڵ‌و دەروونی ئارام دەکاتەوەو دڵنیای دەکا کەخودا پاڵپشتیەتی‌و تۆڵە لە ئەوانە دەکاتەوە: کە پەیامەکەی ڕەت دەکەنەوەو بەدرۆی دەخەنەوە، دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ، وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا – المزمل/١٠ – ١١﴾ هەر هەمان مەبەست‌و دڵنەوایی ڕەنگی داوەتەوە لە گێڕانەوەی چیرۆك‌و بەسەرهاتی پێغەمبەرەکانی رابردو لەناو دوو توێی قورئاندا: کە دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءكَ فِي هَـذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ – هود/١٢٠﴾.

هەر كاتێكیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە هەڵوێستی كافرەكان دڵتەنگ بووبێ‌و غەم‌و ناڕەحەتی ڕوی تێكردبێ، ئایاتی قورئان نازڵ بوون بۆ دڵنەوایی‌و پشتگیری كردنی لەلایەك‌و هەڕەشەكردن لەوانەی ئازاریان داوە لەلایەكی تر، هەڕەشەی لە بەدرۆخەرەوەكان كردووە بەوە: كە خودا ئاگاداری هەڵوێستی نامەردانەیانەو تۆڵەیان لێ دەكاتەوەو ناهێڵێ ئەوەیان بەسەرەوە بچێ ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ – یس/٧٦﴾ ﴿وَلاَ يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلّهِ جَمِيعًا هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ – یونس/٦٥﴾.

هەروەها پەروەردگار مزگێنی پێ دەدا بەوەی كە پارێزگاری دەكا لە دوژمنانی، سەرەنجام زاڵبوون‌و سەركەوتن بۆ ئەوە ﴿وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ – المائدة/٦٧﴾ ﴿وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا – الفتح/٣﴾ ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ – المجادلة/٢١﴾ ئاواو بەو جۆرە ئایەتەكانی قورئان بەشوێن یەكدا نازڵ دەبوونە سەر پێغەمبەری خودا بۆ دڵدانەوە دوا دڵدانەوە، هەڵنان دوا هەڵنان بۆ پشوو درێژی‌و سوربوون لەسەر پەیامی ڕاستی خۆی، بۆ ئەوەی غەم‌و خەفەت لە دڵیدا خۆیان نەچەسپێنن، ئەزیەت‌و ئازاری ئەو كافرە دڵڕەقانە كاری لێ نەكەن‌و ورەی نەڕوخێنن یەئس‌و ناهومێدی ڕێگایان نەبی بچنە ناو دەرونیەوە.

بێگومان لە چیرۆك‌و بەسەرهاتی پێغەمبەرانی پێشوودا ئوسوەو سەرمەشق هەیە بۆ حەزرەتی محمد چاویان لێ بكاو شوێنیان بكەوێ، لە سەرەنجام‌و ئاكامی گەلە ستەمكارەكانی رابردودا دڵدانەوەو تەسەللای دڵی پێغەمبەری تێدایە (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وادە پێدانی بە یارمەتیدانی‌و سەركەوتنی بەسەر ناحەزانیدا مزگێنی‌و هیوا هەیە، هەركاتێكیش بەپێی داخوازی سروشتی ئادەمیزادی خەم‌و خەفەتێك خۆی خزانبێتە ناو دڵ‌و دەروونی پیرۆزی، یەكسەر، یان دوای ماوەیەكی كورت‌و

کەمخایەن دڵدانەوەو تەسلییەی خودایی بۆ دووبارە بۆتەوە، ئیتر دڵی لەسەر بانگەوازیو درێژەدان بە پەیامەکەی پتر لای خەست بۆتەوەو زیاتر لە سەرکەوتنی بەسەر ناحەزانیدا دڵنیا بووە.

ئەم حیکمەتە ئەو حیکمەتەیە کە خودا ڕەدی کافرەکانی پێدایەوە کاتێك ڕەخنەیان لەوە گرت: کە بۆچی قورئان بە وەجبە وەجبە دێتە خواریو بۆچی بە یەك وەجبە بۆی نایە؟ دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا – الفرقان/٣٢﴾.

ئەبو شامەی مەقدیسی[1] دەڵێ: ئەگەر بگوترێ نهێنیو حیکمەتی هاتنە خوارەوەی قورئان بەو شێوە بەش بەشە چیە؟ دەڵێین: ئەمە پرسیارێکە خودا بۆخۆی وەڵامی داوەتەوەو فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً – الفرقان/٣٢﴾ مەبەستیان ئەوەبووەو وتوویانە دەبوایە قورئان بە یەکجار نازڵ بوایە وەکوو چۆن نامە ئاسمانیەکانی پێشوو بۆ پێغەمبەرە خاوەن نامەکان بە یەك وەجبە نازڵ بوون، ئیتر پەروەردگار خۆی وەڵامی پرسیارەکەی دانەوەو فەرمووی: ﴿كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا﴾ واتە: ئێمە بۆیە قورئانمان بە وەجبەو وەجبە بۆ نازڵ کردووی، بۆ ئەوەی دڵو دروونتی پێ بەهێز بکەین، چونکە ئاشکرایە نیگا: کە بۆ هەموو ڕوداوو وەڵامی پرسیارو حوکمێك تازە بووەوە، دڵ بەهێز دەکاو بڕوای خاوەن پەیام تۆکمەترو چەسپاوتر دەکا، لەهەمان کاتدا نیشانەی گرنگی دانە بەو کەسەی نیگاکەی بۆ نێردراوە، ئەمەش هەموو ئەوە دەخوازێ فریشتە زۆر دابەزێ بۆلایو زوو زوو عەهدو پەیمانی بۆ تازە بکەنەوە، بەو پەیامەی پێیانەو هێناویانە لەو پەروەردگارە

---

[1] ناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئیسماعیلی مەقدیسیە، شەرعزانێکی شافیعیە کتێبێکی هەیە ناوی (الوجيز إلى علوم تتعلق بالقرآن العزيز)ە شەرحێکیشی لەسەر هۆنراوی (الشاطبية) لەبواری (قرآن)دا کردوو ساڵی/٦٦٥ی کۆچی لەدونیا دەرچووە.

شكۆمەندەوە، ئیتر بەمە ئەوەندە کەیفخۆش دەبێ: کە بە وشەو ڕستە دەرنابڕێ، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕەمەزاندا لەهەموو کات پتر بەخشندەیی پێوە دیار بوو، ئەمەش بەهۆی زۆر هاتنی حەزرەتی جوبرائیل بوو بۆلای.

٢- حیکمەتی دووەم تەحەددا کردنو سەرئاسایی (الإعجاز):

بەڵێ کافرە قورەیشییەکان لە گومڕایی خۆیاندا ڕۆچوون، زۆر زێدە ڕۆییان کرد لەسەرڕەقیو بەرەبەرەکانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری تەعجیزو تەحەددا ئامێزیان لێ دەکرد، پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریان پێ تاقی دەکردەوە، جۆرەها قسەی سەرسوڕهێنەرو پوچو بێ بنەمایان ئاڕاستە دەکرد، پرسیاریان لێ دەکرد قیامەت کەی ڕادەبێ؟ ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ – الأعراف/١٨٧﴾ پەلەی هاتنی سزاو عەزابی ئاسمانییان دەکرد ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ – الحج/٤٧﴾ ئیتر بۆ وەڵامی ئەم پرسیارو هەڵوێستانەیان قورئان دادەبەزی، حەقائیقی بۆ ڕون دەکردنەوە، بەبێ پێچو پەناو بەڕونی وەڵامی پرسیارەکانی دەدانەوە، بەگوێرەی پێویست لایەنی عەقیدەو بیروباوەڕی ڕاستی پێ ڕادەگەیاندن ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا – الفرقان/٣٣﴾ واتە ئەوانە هەر پرسیارێکی سەرسوڕهێنەر ئاراستەی تۆ بکەن لە پرسارە پوچو بەتاڵەکانیان ئێمە وەڵامی حەقو دڵتەزێنیان بەهۆی تۆوە دەدەینەوە، وەڵامەکانی ئێمە هەموو پڕ ماناو جەرگبڕو دەمکوتکەرن، بە پێچەوانەی پرسیارە بێ بنەماکانی ئەوان.

لەکاتێکدا ئەوان سەریان سوڕدەما لەوە کە قورئان بە پچڕ پچڕیو ناوە ناوە دادەبەزی، پەروەردگار ڕاستیو حەقیقەتی بۆ ڕوون دەکردنەوە، چونکە تەحەددا کردنی قورئان بۆیان، کە بە وەجبە وەجبە دادەبەزیو نەیاندەتوانی وێنەی بخەنە ڕوو کەلامێکی لەو جۆرە دابێنن، پتر نیشانەی دەستەوەستانی ئەوانی تێدایە، بەلیغترو کاریگەرترە لەوەی کە قورئان بە

یەکجار دابەزێو نەتوانن نموونەی بخەنەڕو، بۆیە دوابەدوای ڕخنەکەیان کە وتیان ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً - الفرقان/٣٢﴾ ئایەتی ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا - الفرقان/٣٣﴾ نازڵ بوو، واتە: ئەو کافرانە داوای شتێکی سەیرو سەمەرە ناکەن لە دیدو نیگای خۆیانەوە، وەکوو ئەوە دەیانگوت: بۆچی قورئان بە یەك وەجبە دانابەزێ بۆ سەر تۆ؟ ئیللا ئێمە کاروبارێکی وات بۆ دەڕەخسێنین: کە بەگوێرەی حیکمەتی خۆمان ئەوە حەقو ڕاستەو پتر مانای ئیعجازی قورئانی تێدایەو زیاتر دەستەوەستانی ئەوان و بۆڕخواردنیان لە بەرامبەر سەرئاسایی قورئاندا دەچەسپێنێ.

هەندێ ڕیوایاتی حەدیث هەن ئاماژە بۆ بەرجەستەبوونی ئەم حیکمەتە دەکەن، ئەوەتا ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) دەربارەی نازڵبوونی قورئان دەڵێ: هەرکاتێك موشریکەکان پرسیارێکیان لە پێغەمبەر بکردایە، ڕەخنەیەکیان ئاراستە بکردایە، پەروەردگار وەڵامێکی دەمکوتکەرو گورچکبڕی دەدانەوە.[1]

٣- حیکمەتی سێیەم: ئاسان لەبەرکردنیو تێگەیشتنیەتی، بێگومان قورئان نازڵ بووە بۆ سەر گەلو نەتەوەیەکی نەخوێندەوار نە نووسینیان زانیوە نە خوێندنەوە، دەفتەرو کتێبی ڕوداویان بریتییە لە ذاکیرەو بیرەوەری ناو مێشکیان، هیچ شارەزاییو زانینێکیان دەربارەی نووسینو تۆمارکردنی ڕوداوەکانیان نەبوو، هەتا مێژوو بەسەرهاتی خۆیان بنووسنەوەو تۆماری بکەنو پاشان لەبەری بکەن لێی حاڵی بن ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ

---

[1] سیوطی ئەم ڕیوایەتەی لە تەفسیری (الدار المنثور)دا ج٥/٣٤٧ باس کردووەو نیسبەتی ڕیوایەتەکەشی پاڵ نەسائیو ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمو حاکمو ئیبنو مەردەویهیو بەیهەقی داوە.

وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ – الجمعة/٢﴾ ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ – الأعراف/١٥٧﴾.

جا کە ئەمە حاڵو واقیع بێ، نەدەگونجا بۆ گەلو نەتەوەیەکی نەخوێندەواری ئاوها: کە بە ئاسانی قورئان لەبەر بکەنو لێی حاڵی بن ئەگەر بە یەك وەجبە نازڵ بوایە، زەحمەت دەبوو لە ماناو مەبەستی حاڵی بنو بتوانن بیر لە ئایەتەکانی بکەنەوەو تێی بگەن، کەوابێ نازڵبوونی بە وەجبە وەجبەو ئایەت ئایەتو ناوە ناوە باشترین یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی لێی حاڵی بنو لەبەری بکەنو کاری پێ بکەنو لە سینگو مێشکی خۆیاندا هەڵی بگرن، هەر: کە ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك نازڵ دەبوونو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی ڕادەگەیاندن، هاوەڵان لەبەریان دەکردو لە ماناکانی ورد دەبوونەوەو بەگوێرەی حوکمو یاسای ئەو ئایەتانە کاریان دەکردو بەموو لێیان لانەدەدا.

چینی دوای ئەوانیش کە (تابیعین)ن بە ئەو مەنهەجو پەیڕەوو پرۆگرامە کاریان کردو بەو گیانە عیلمییە ژیانیان بەسەر برد.

لە ئەبو نەضرەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: ئەبو سەعیدی (الخدری) قورئانی فێر دەکردین بەیانییان پێنج ئایەتو ئێواران پێنج ئایەت، هەواڵی ئەوشمانی داینێ: کە حەزرەتی جوبرائیل پێنج ئایەت پێنج ئایەت قورئانی بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هێناوە.[1]

لە خالیدی کوڕی دینارەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: ئەبولعالیە پێی گوتین: پێنج ئایەت پێنج ئایەت قورئان فێر ببن، بێگومان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێنج پێنج لە جوبرائیلی وەرگرتووە.[2]

---

[1] أخرجه إبن عساكر فى تاريخ دمشق ج٢٠/٣٩١.

[2] أخرجه إبن أبى شيبة/٢٩٩٣٠ والبيهقى فى شعب الإيمان/١٨٠٦.

له عومەرەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: قورئان فێربن، پێنج ئایەت پێنج ئایەت، بێگومان جوبرائیل پێنج پێنج بۆ پێغەمبەری هێناوەتە خوار.(١)

٤- حیکمەتی چوارەم رەوکردن لەگەڵ ڕووداوەکانو پێ بەپێ ڕۆیشتنو پێدا هەڵکشان لە تەشریعدا، بێگومان هەروا کارێکی ئاسان نەبوو لە ناکاوێكو گۆزو گوممەت خەڵك ملکەچی ئایین ببنو ڕیشی خۆیان بدەنە دەست ئایینی تازە دابەزیو ئەگەر قورئان بە حیکمەت چارەسەی ئەو کارەی نەکردایەو دەرمانی کاریگەریو وەجبە وەجبەی نەدانایە، بۆ ئەوەی چارەسەری رەزیلیو فەسادی عەقیدەییان بکا، حاڵو وەزعییان بەشێوەیەکی تر دەبوو، ئەوەبوو هەرکە ڕوداوێك لەناویاندا ڕوی دەدا، حوکمی ئاسمانی دادەبەزیو بەرچاو ڕونی پێ دەبەخشینو بەگوێرەی پێویستو بنەماکانی شەریعەتی یەك لەدوا یەکی بۆ ڕوون دەکردنەوە، بەمەش دڵیان دادەمرکاو تینوایەتییان دەشکا.

بێگومان قورئانی پیرۆز پێش هەموو شتێك بنەمای عەقیدەو بیروباوەڕی دەچەسپاند، لە تەوەری ئیمان بە خوداو بە فریشتەو نامە ئاسمانییەکانو پێغەمبەرانو ڕۆژی قیامەتو ڕووداوەکانی وەکوو زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداشدا دەسوڕایەوە، لەسەر ئەمانە بەڵگەی دێنایەوە بۆ ئەوە ڕیشەی بتپەرستی لە دڵو دەرونیاندا هەڵکەنێو بیروباوەڕی ئیسلامی لە جێدا بڕوێنێ.

فەرمانی دەکرد بە ڕەوشتی جوانو خۆ پێ ئارایشتدانو پاککردنەوەی دڵو دەروون لەپیسو پۆخەڵی کوفرو بێدینیو ڕاستکردنەوەی هەڵەو خوارەکان، نەهی دەکرد لە فەسادو فەحشاو کاری قیزەون، هەوڵی دەدا ڕەگو ڕیشەی فەسادو شەڕ لە بێخ دەربێنێو یاسای حەڵاڵو حەرام دابمەزرێنێو لێکیان

---

(١) أخرجه البيهقى فى شعب الإيمان/١٨٠٧.

جيا بكاتەوە، ياسايەك: كە باڵەخانەی ئيسلامی لەسەر بينا بكرێ، ياساكانی شۆڕببنەوە بۆ ناو خواردنو خواردنەوەو ماڵو سامانو خوێنو نامووس!!

پاشان بە تەدريجو پێ بەپێ، شەريعەتو ياسای ئيسلامی لەگەڵ ئادەميزاددا ڕۆيیو خەريكی چارەسەری ئەو نەخۆشييانە بوو: كە لەناو دڵو دەروونيانـدا چەكەرەی كردبوو رەگی داكوتابوو، وردە وردە نەخۆشـييە كۆمەڵايەتيەكانيانی قەلاچۆ كردنو تەندروستی بۆ فەراهەم هێنان، هەڵبەتە ئەمە دوا ئەوەی ئەركانی ئيمانو ئيسلامی بۆ دانانو پێی ڕاگەياندنو تێی گەياندن، دڵو دەروونيانی بە ئيمانو باوەڕ زيندو كردەوەو وای لێ كردن تەنيا خودا بناسنو بە ڕاستاڵانە بيپەرستنو هاوەڵی بۆ دانەنێن، لەلايەكی ترەوە قورئان بەردەوام بوو لە هاتنە خوارەوە بەگوێرەی داخوازی ئەو كۆمەڵگايەو ئەو ڕووداوانەی بەسەر ئەو كۆمەڵگايەدا تێدەپەڕين بە درێژايی ماوەی تێكۆشانی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ چەسپاندنی ئايينی ئيسلامو بەرزكردنەوەی دروشمی «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ».

بۆيە ئەگەر ئێمە سەرنج بدەين ئەم ڕاستيانەمان لە دەقەكانی قورئاندا بە مەككیو مەدينەييەوە بە ڕونی بەرچاو دەكەون خۆيان دەنوێننو ياسا تەشريعيەكانی قورئان ئەو تەدەروجو زنجيرە ئايەت دابەزينەی تێدا رەنگ دەداتەوە.

ئەوەتا لەسەردەمی مەككەدا نوێژ تەشريع كراوە، بنەمايەكی گشتی بۆ زەكات بەرامبەر ڕيبا دامەزراوە، ﴿فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ ذَلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ، وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ - الروم/٣٨ - ٣٩﴾.

سورەتی ئەنعام لە مەككە دابەزيوەو بنەمای عەقيدە ڕون دەكاتەوە، بەڵگەی يەكتاپەرستیو تاكو تەنهايی خودای لەخۆ گرتووەو هەڕەشە لە

بتپەرستیو موشریکەکان دەکا، حەلاڵو حەرامیان بۆ ڕون دەکاتەوە، بانگەوازی دەکا بۆ پاراستنو حورمەتگرتنی ماڵو خوێنو ناموس ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ، وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُواْ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ - الأنعام/١٥١ - ١٥٢﴾.

ئەمجار لەدواییدا شیکردنەوەی ئەم حوکمانە دابەزی، بنەمای معامەلاتی مەدەنیو باری شارەستانی لە مەککە نازڵ بوون، وەلێ تەفصیلو شیکردنەوەیان لە مەدینە دابەزی، بۆ نموونە ئایەتی قەرزو قۆڵەو ئایەتەکانی باسی ڕیبا دەکەن بە زەقی ئەمەیان تێدا ڕەنگ دەداتەوە.

هەروەها بنەماکانی پەیوەندی خێزانی لە مەککە نازڵ بوون، وەلێ مافی هەریەکێ لە ژنو مێرد بەسەر یەکتریانەوەو ئەرکی ژیانی خێزانو هاوسەرایەتیو ئاکامی ئەو عەقدو پەیمانەو بەردەوامی پێکەوە ژیان، یان لێك جیابوونەوەیان بەهۆی تەلاقەوە، یان کۆتایی هاتنی بە مردن، پاشان میرات لە یەك گرتنو ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی هەموو ئەمانە لە تەشریعاتی مەدەنیدا هاتووە.

زیناو داوێنپیسی لە مەککە ئایاتی پێ نازڵ بووەو حەرام کراوە ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً - الإسراء/٣٢﴾ وەلێ تەفصیلاتی ئەو سزایانەی لێوەی دەکەونە سەر زیناکەرەکانو کۆمەڵگا لە مەدینە دابەزیون.

ئەصڵی حەرامبوونی خوێن ڕشتن بە ناحەق لە مەککە نازڵ بووە ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ - الإسراء/٣٣﴾ وەلێ تەفصیلاتی

سزای دەستدرێژیکەر بۆ سەر نەفسو ئەندامی جەستەو چۆنیەتی تۆڵە ستاندن لە بکوژو جانی، لە مەدینە هاتۆتە خواری!!

ئاشکراترین نموونەی تەدەروجو چەسپاندنی یاسا پێ بەپێو قۆناغ بەقۆناغ، حەرامکردنی مەیو شەرابە، ئەوەتا یەکەمجار ئایەتی ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – النحل/٦٧﴾ پەروەردگار لە ڕوانگەی نواندنی نیعمەتەکانیدا باسی ئەوەی کردووە کە لە بەروبوومی داری خورماو ترێ شەراب دروست دەکەنو ڕزقی جوانو پاكو خاوێن بەرهەم دێنن.

وەصفی رزقەکەی بە (حَسَن) کردووە بەڵام بۆ شەرابو مەیەکە ئەو وەصفەی نەهێناوە، مەدحی رزقەکەی کردووە بەڵام لە (سُکر)ەکە بێدەنگ بووە، ئەمە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە ئەو بەروبوومەی لە درەختی خورماو ترێ بەرهەم دەهێندرێ پاكوخاوێنو بەسودە، بەڵام ئەوەی دەکرێ بە مەیو شەراب وانیە.

پاشان قۆناخی دووەم دەست پێ دەکا، سودو قازانجی مەی بەراورد دەکاو ئەوە رادەگەیەنێ کە شەرابو مەی گوناهو زیانەکەیان زۆرترە لە سودو قازانجەکەیان، دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا – البقرة/٢١٩﴾ لێرەدا ئایەتەکە قازانجی مەی دیاری کرد کە کەسێك دەیخواتەوە ماوەیەك نەشوە دەیگرێو کەیفخۆش دەبێ، یان ئەوانەی بازرگانی پێوە دەکەن سودیان لێ دەست دەکەوێ، ئەمە بەراورد دەکا بە تاوانی ئەو کەسەی دەیخواتەوەو ئەو کاریگەرییە خراپانەی لە ئاکامی خواردنەوەکەدا لەسەر مرۆڤەکە پەیدایان دەکا وەکوو زیان گەیاندن بە جەستەو تێکچوونی عەقڵو هۆشو فەوتانیماڵو سامانو هەڵگیرساندنو وروژاندنی لایەنە هەڵنەرەکانی فیسقو فجورو لەخودا یاخی بوون، بە ئاشکرا ئایەتەکە موسوڵمانان هەڵدەسڵەمێنێتەوە لە

مەی خواردنــەوەو قومـارکردن بـەوە کـە تـەرجیحی لایـەنی زیانـەکانیان دەدا بەسەر قازانجەکـەیان، ئاشـکرایە کەسـێك هۆشـی هـەبێ ئـالودەی شـتێك نابـێ زیانی لە قازانجی زۆرتر بێ!!

پاشان ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى – النساء/٤٣﴾ نازڵ بووو، ئەمە قۆناغی سێیەمی مـەی حـەرام کردنـە، بـەوەی داوای کرد موسوڵمانان خۆیان لە مەی خواردنەوە دووربخەنەوە لەو کاتانـەدا، کـە وێدەچـێ کاریگـەری مـەیو شـەرابەکە تـا کـاتی ئەنجامـدانی نوێژەکـە بەردەوام بێ، ئایەتەکە نەهی کردووە لە نزیکبوونەوە لە نوێـژو ئەنجامـدانی بەسەرخۆشی، هەتا کاریگەری مەی خواردنەوەکە بەسـەریانەوە بمێنـێ، نابـێ توخنی نوێژ بکەون، بۆ ئەوەی بزانن لە نوێژەکەیاندا چی دەڵێن.

پاشان قۆناغی چوارەم دەستی پێ کردو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ – المائدة/ ٩٠ – ٩١﴾ دابەزی، ئیتر ئەمە بە یەکجاری خواردنەوەی مەیو ئەو شتانەی تـری حـەرام کرد، هیچ مەجالێکی نەهێشتەوە بۆ مەی خواردنەوە.

ئــەوەی ئــەم حیکمەتــەی نــازڵبوونی قورئــان ڕوون دەکاتــەوە ڕیوایەتەکەی خاتو عائیشەیە (ڕەزای خودای لێ بێ) کە دەفەرموێ: «إِنَّمَا نَزَلَ أَوَّلَ مَا نَزَلَ مِنْهُ سُورَةٌ مِنَ الْمُفَصَّلِ فِيهَا ذِكْرُ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ حَتَّى إِذَا ثَابَ النَّاسُ إِلَى الإِسْلاَمِ نَزَلَ الْحَلاَلُ وَالْحَرَامُ ، وَلَوْ نَزَلَ أَوَّلَ شَيْءٍ لاَ تَشْرَبُوا الْخَمْرَ . لَقَالُوا لاَ نَدَعُ الْخَمْرَ أَبَدًا . وَلَوْ نَزَلَ . لاَ تَزْنُوا . لَقَالُوا لاَ نَدَعُ الزِّنَا أَبَدًا».[1]

بەو جۆرەو بەو پێیە تەدەروجو پێ بەپێ ڕۆیشتن لەگەڵ ڕوداوەکانو وەڵامی پرسیارەکانو پێداهەڵچون لـە تەربیـەی ئیسلامیو پـەروەردەکردنی

---

[1] رواه البخاری/٤٩٩٣.

ئوممـەتی موسـوڵمان بـەگوێرەی ئـەو ڕوداوانـەی هاتنـە پێـشیان‌و پێیانـدا تێپـەڕین، قورئـان نـازڵ دەبـوو، چارەسـەری کێـشەکانی دەکـردو هەنـدێ ئـەحکامی دەچەسپاندن‌و هەنـدێ بڕیـاری هەڵدەوەشـاندەوە، لـەدوای غـەزای بـەدر پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕاوێـژی بـە هـاوەڵانی کـرد دەربارەی دیلەکانی شەڕی بەدر، ئیمـامی عومـەر ڕای وابـوو لـە ملیـان بـدرێ، حـەزرەتی ئـەبو بـەکر پێـشنیاری ئـەوەی کـرد عـەفو بکـرێن لـە کوشـتن‌و فیدیـەیان لێ وەربگـیرێ، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕای ئـەبو بەکری پەسەند کرد، ئیتر ئایـەتی ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ، لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ – الأنفال/٦٧ – ٦٨﴾ نـازڵ بوون.

موسـوڵمانان ڕۆژی غـەزای حونـەین بـە زۆری‌و پۆشـتەو پـەرداخی خۆیان نازین، تەنانەت پیاوێکیان بە دڵنیایی‌یەوە وتی: (لن نغلب من قلة) لە ئاکـامی ئـەم بـەخۆ نازینەیانـدا زللەیـەکی میهرەبـانی گـەورەیان وێکـەوت، دەرسێکی قورس‌و کوشندەیان دەرخوارد درا ئایەتـەکانی ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئاً وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ، ثُمَّ أَنَزلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُوداً لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ ، ثُمَّ يَتُوبُ اللّهُ مِن بَعْدِ ذَلِكَ عَلَى مَن يَشَاءُ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – التوبة/٢٥ – ٢٧﴾ نازڵ بوون.

هـەروەها کاتێـك عەبـدوڵلای کـوڕی ئوبـەی (سـەرۆکی دووڕووەکـان) مـرد، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـانگ کـرا بـۆ نوێـژ لەسـەر کردنی‌و خۆی ئامادە کرد بـۆ ئـەو کـارە، حـەزرەتی عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەوە لەسـەر تـەرمی دوژمنـی خـودا

عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی: کـە دەربـارەی جـەنابتو موسـوڵمانان واووای گوتـووەو فـلان بوختـانو فـلان بوختـانی بـۆ ئـەمو ئـەو هەڵبەسـتووە، نوێژدەکەی؟ پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە بەرامبـەر ئـەم قـسانەی عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) زەردەخەنـەی دەهاتـێ پاشـان بـە عومەری فەرموو: (إِنِّي قَدْ خُيِّرْتُ) قيل لي ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ – التوبة/٨٠﴾ ئەمجار فەرمووی: «إِنِّي قَدْ خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ فَلَوْ عَلِمْتُ أَنِّي لَوْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ غُفِرَ لَـهُ لَـزِدْتُ عَلَيْهَـا» پاشـان پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژی لەسـەر کـردو لەگەڵ تەرمەکەی چوو بۆ گۆڕستانو لەسـەر گۆڕەکە وەسـتا تـا هـاوەڵان لـە ناشـتنی بوونەوە، ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) وتی سـەرم لـەخۆم سوڕمابوو چۆن جورئەتم کرد بـەرەوڕوی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەو قسانە بکەم، خوداو پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بۆخۆیـان باشـتر دەزانن، سوێندم بەخودا هێندەی پێ نەچوو ئەم دوو ئایەتە نازڵ بوون ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَمَـاتُواْ وَهُمْ فَاسِقُونَ ، وَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَأَوْلاَدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللّـهُ أَن يُعَـذِّبَهُم بِهَـا فِـي الـدُّنْيَا وَتَزْهَـقَ أَنفُـسُهُمْ وَهُـمْ كَـافِرُونَ – التوبـة/٨٤ – ٨٥﴾ ئـیتر لـەوەدوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تـا لەژیانـدا بـوو لەسـەر تـەرمی هـیچ دووڕویەکی تر نوێژی نەکرد.[1]

کاتێك چەند کەسێکی موسوڵمانی ڕاستاڵ لە چوون بۆ غەزای تـەبوك دواکەوتنو لە مەدینە مانەوە، دوایی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) هـیچ عـوزرو بیـانوێکی نەدۆزییـەوە عوفـو بکـرێن، دەنگـی لێ دابـڕینو موسوڵمانانیش دەنگیان لێ دابڕینو لە کۆمەڵگا تاقکرانـەوە، تـا وایـان لێ هـات تەنگیان پێ هەڵچنراو لە ژیانی خۆیان وەڕز بوون، پاشان قورئـان نـازڵ بـوو

---

[1] أخرجه البخاري/١٣٦٦ ومسلم/٦٢٠٨ والترمذي/٣٣٥٤.

به تۆبه لێ وەرگرتنیان ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ ، وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ – التوبة/١١٧ – ١١٨﴾.

ئیبنو عەبباسیش (ڕەزای خودا لەخۆی و لە باوکی بێ) لە ڕیوایەتێکیدا دەربارەی نازڵبوونی قورئان ئاماژە بۆ ئەم ڕوداوە دەکا، دەڵێ: جوبرائیل ئەم ئایەتانەی هێنا بۆ ئەوەی وەڵام بێ بۆ قسەی بەندەکان و کردەوەیان.

٥- حیکمەتی پێنجەم: بەڵگەی یەکلاکەرەوەو حاشا هەڵنەگر بێ لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز لەلایەن خودای خاوەن حیکمەت و لێزان و سوپاسکراوەوە نازڵ بووە.

بێگومان ئەم قورئانەی کەوا وەجبە وەجبە لە ماوەی بیست و ئەوەندە ساڵەدا نازڵ کراوە ئایەت ئایەت و سورەت سورەت و بەش بەش لە ماوەی جیاجیادا، ئادەمیزاد دەیخوێننەوە، سورەتەکانی دەخوێننەوە، دەبینن دارشتنەکەی پتەوو توندو تۆڵە، مانای وردو وشەی ناسك، ماناکانی پێکەوە گونجاوو ئوسلوب و شێوازی بەهێزو لێك بەستراو ئایات و سورەتی جوان داڕێژراوو پێکەوە گونجاو، هەر دەڵێی تەسبیحی مرواریيە هۆندراوەتەوە، کە لە کەلام و ئاخاوتنی ئادەمیزاددا شتی وا نەبیندراوەو نابیندرێ ﴿الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ – هود/١﴾ ئەگەر ئەم قورئانە قسەو ئاخاوتنی بەشەر بوایەو ئاوا لە موناسەباتی جیاجیادا بگوترایە، باسی ڕوداوی یەك لەدوای یەك و ئەحکامی جۆراوجۆری بکردایە، بەدڵنیاییەوە پەرت و بڵاوی و لێك پچڕان و لێك نەچوونی پێوە دیار دەبوو، تەوافوق و پێکەوە گونجانی لێ نەدەبیندرا!! ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ

اللّــهِ لَوَجَــدُواْ فِيــهِ اخْتِلاَفًــا كَــثِيرًا - النــساء/٨٢﴾ فــەرموودەكانى پێغەمبــەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كە گومـان لـەوەدا نيـە دواى قورئـانى پـيرۆز لـە ترۆپكى بەلاغەتو فەصاحەتدان، پێكەوە ڕێك ناخرێنو لـە كتێبێكـى لـوسو ڕەواندا ناخرێنـە پـەنا يـەك بـەوجۆرە بگونجێنو وا ببينـدرێن كـە وەحـدەو پێكهاتەيــەكى پێكــەوە گونجــاون وەكــوو ئــەو دياردەيــەى بــە قورئانــەوە دەبيندرێ، يان بەلانى كەمەوە لە ڕوى ئاراستەو پێكەوە گونجان لـە قورئـان نزيك ببنەوە، جا لە كاتێكدا ئەمە حالّى فـەرموودەكانى پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) خۆى بێ: كە لە ڕوى ڕەوانبێژىو زەمانڕەوانى سـەرتۆپكى زەمانڕەوانىو ڕەوانبێژى بووە، دەبێ قسەو ئاخاوتنى ئـادەميزادانى تـر چـۆن بێ؟ ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَـأْتُواْ بِمِثْـلِ هَـذَا الْقُـرْآنِ لاَ يَـأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا - الإسراء/٨٨﴾.

## سوود وەرگرتن لە نازڵبوونى قورئان بە وەجبە وەجبە لەبوارى زانستو پەروەردەدا

ئاشكرايە پرۆسەى فێركردنو پەروەردە پـشت بـە دوو شـتى سـەرەكى دەبەسـتێ، بەرچـاوگرتنى ئاسـتى زەينـى قوتابيــەكانو گەشــەكردنى توانــا عەقڵىو نەفسىو جەسـتەييان، بـەجۆرێك وائاراسـتە بكـرێن بـەرەو ئامـانجى ڕاستو بەختەوەرى هەنگاو هەڵێنن!!

ئێمـە كـە سـەرەنجى حيكمـەتى نـازڵبوونى قورئـان دەدەيـن: كـە بـە وەجبــە وەجبــە كۆپلــە كۆپلــە دابــەزيوە، دەبيــنين هــەردوو كۆڵەكــە سـەرەكييەكەى فێربـوونو پـەروەردەى تێـدا بەرچـاو گـيراوە، بـە ڕونـى ئـەو دياردەيـە خـۆى دەنوێنـێ، بێگومـان نـازڵبوونى قورئـان بەوشـێوە تـەدەروجو پێداسـەركەوتنى هێـدى هێـدى، پـەروەردەكردنى ئوممـەتى ئيـسلامى لـەخۆ گرتووە، تەدەروجەكەشى تەدەروجێكى سروشتى هيدايەت ئامێزى ناوازە، بـۆ

چاکسازی دڵو دەروونە جیاجیاو دژبەیەکەکانی ئادەمیزادو راستکردنەوەی سلوكو رەوشتیانو دروستکردنی بینای کەسایەتییانو تەواوکردنی کیانو بونیانە، هەتا لەسەر قاچی خۆیان بوەستنو بوونی خۆیان لەسەر زەوی بچەسپێنن، بەروبوومی ئەو پەروەردەو دەست پێوەگرتنو ئاراستەکردنە بۆ هەموو ئادەمیزاد دەستەبەر ببیٚو خێرو خۆشی دونیاو قیامەتیان بۆ بەرجەستە ببیٚ.

بەڵیٚ دابەزینی قورئان بە پارچە پارچەییو بەش بەش باشترین یارمەتیدەر بوو بۆ مرۆڤەکان: کە بتوانن لەبەری بکەنو لیٚی حاڵی بن، لیٚکۆڵینەوەو دیراسەی تیٚدا بکەنو لە ماناکانی وردببنەوەو کاریشی پیٚ بکەن.

سەرەتای نازڵبوونی قورئان بە فەرمان بە خوێندنو فێرکردن دەست پیٚ دەکا ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ، عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ – العلق/١ – ٥﴾ نازڵبوونی ئایەتەکانی ریباو میراتگرتن لەبواری یاسای ماڵو ساماندا، یان نازڵبوونی ئایەتەکانی بواری جەنگو رووبەڕوبوونەوی کافرو بتپەستەکانو یەکالاکردنەوەی هەڵوێستو رِوداوەکان، لەنێوان ئەم ئایەتانەو ئەو ئایەتانەدا، قۆناغی تەربیەو تەعلیمی زۆر بڕدراونو هەر قۆناغەو ئوسلوبی خۆی هەیەو وادارێژراوە گونجاو بیٚ لەگەڵ کۆمەڵگەی ئیسلامی سەردەمی سەعادەت، بەشێوەی تەدەروجو پیٚ بەپیٚ هەڵکشان لە لاوازییەوە بۆ بەهێزیو لە بەهێزییەوە بۆ پتر بەهێزیو زەبر وەشاندنی گورچکبڕ.

هەر مەنهەجو دیراسەیەك ئاستی زیرەکی قوتابیەکانی لە هەموو قۆناغەکانیدا بەرچاو نەگیریٚ، جوزئیاتی زانیارییەکان نەبرێتەوە سەر بنەماو کلیاتەکانی، لە زانیاری ئیجمالیو کورتو پوختەوە نەچێتە ناو تەفاصیلو وردەکاری، یان گەشەکردنی لایەنەکانی کەسایەتیو عەقڵیو

جەستەیی قوتابیەکان، بەرچاو نەگیری، مەنهەجێکی فاشیلو سەرنەکەوتووەو گەلو نەتەوە جگە لە نەزۆکیو دواکەوتنو سەرلێ شێوان بەولاوە چی تری لی دەست ناکەوێ.

ماموستایەك ئەندازەی پێویستو گونجاو لە زانیاری نەدا بە قوتابیەکانی، ماندوبوونەکەیو بەروبوومی کەمەو کۆڵی قوتابیەکانی گران دەکا، زیاد لەهێزو توانای خۆیان باریان قورس دەکا، چ لەڕوی لەبەر کردن، یان تێگەیشتن، یان بلێ قسەیان لەگەڵ دەکاو ئەوان تێی ناگەن، یان موراعاتی حاڵو وەزعی قوتابیەکانی ناکا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی دێنە ڕێیانو سود لە تەربیەکەی وەرناگرن، یان بەخۆی نازانێ شاگردەکانی عاداتو دابونەریتی ناشیرینیان تێدا گەرا دەکاو بلاو دەبێتەوە ئەوجار توندوتیژی دەنوێنێ بەرامبەریان، قورەکە زیاتر تەڕ دەکاو کێشەکە پتر قوڵ دەکاتەوە.

دەی ماموستایەك ئەمە حاڵو وەزعی بێ ماموستاییەکی فاشیلو دەسەوسانە، عەمەلییەی فێرکردنو تەعلیم بەرەو هەڵدێر دەباو دەیخاتە ناو شیوو دۆڵی سامناکی وەحشیگەریو هۆڵی دەرسو تەعلیم وا لێ دەکا قوتابی نەفرەتی لێ بکا بە دڵو بەگیان گوێ بۆ وانە نەگرێ.

دەی کتێبی قوتابخانەی قوتابی قیاس بکە بۆ سەر ئەوە: کتێبێك سەرەباسو بابو فصولی ڕێكوپێك نەبن، زانیاریەکانی لە ئاسانو ئیجمالەوە سەر نەکەون بۆ باسی وردو گران، جوزئیاتی کتێبەکە بەجوانی ڕیزبەند نەکرابنو ڕێكوپێك نەبن، ئوسلوبی واضیح مانا ڕوون نەبێ، بە ئاسانی مەبەست نەدا بە دەستەوە، بە دڵنیاییەوە بڵێ: ئەوە کتێبێکە قوتابی لە خوێندنەوەی دووردەکەوێتەوە بێ بەش دەبێ لە سود لێ وەرگرتنی.

کەوابێ هەدیی خودایی دەربارەی حیکمەتی نازڵبوونی قورئان بە پارچە پارچەییو بەش بەش باشترین شتێکە چاوی لێ بکرێ لە داڕشتنو دیاریکردنی مەنهەجی قوتابخانەو تەعلیم، پێویستە باشترین ڕێباز پەیرەو

بکرێ لەشێوازی پەروەردەو فێرکردن لە هۆڵەکانی خوێندنداو لە دانانو دارشتنی کتێبی مەنهەجی بۆ قوتابخانەکان.

## ٨) کۆکردنەوەی قورئانو ڕێکخستنی ئایەتو سورەتەکانی

**کە باسی کۆکردنەوەی قورئان دەکرێ، لای زانایان یەکێک لە دوو مانای لێ مەبەست دەبێ:-**

**مەعنای یەکەم:** کۆکردنەوەی قورئان مەبەست لێی لەبەرکردنو تێگەیشتنیەتی: کە دەڵێن: (جمّاع القرآن) واتە: (حفاظە) ئەوانەی لەبەریانە، ئەم ماناو مەبەستە: کە لە قورئاندا خودا خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ – القيامة/١٦ – ١٩﴾.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر مەبەستی بوو زوو قورئانەکە لەبەر بکاو تێی بگا، ئەوەبوو کە جوبرائیل بۆی دەخوێندەوە، ئەویش لە تەکیا زمانو لێوی دەجولاندنو دەیگوتەوە، ڕانەدەوەستا جوبرائیل لێ بێتەوە ئەمجار ئەم بیلێتەوە، دەترسا وشەیەك، ڕستەیەکی لەبیر بچێو نەیەتەوە یادی، بۆیە لەگەڵ خوێندنی جوبرائیلدا ئەمیش لەبەر خۆیەوە دەیگوتەوە، دەیەویست زوو لەبەری بکا، ئیتر ئەم ئایەتانەی پێشەوەی بۆ سەر دابەزینو فەرمانی پێکرا کە پەلە لە خوێندنی نەکا، پێی فەرموو کۆکردنەوەی لە سینگی تۆدا لەسەر ئێمەیەو جێگیری دەکەینو پاشان بۆت دەخوێنینەوە، جا کە بۆمان نازڵ کردیو بۆمان خوێندییەوە گوێ ڕاگرەو بەبێ دەنگی چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی خوێندنەوەکەبە، دڵنیابە ناهێڵین پیتێکت لێ تێك بچێو وشەیەکت لەبیر بچێتەوە.

پاشان لەسەر ئێمەیە: کە لەسەر زوبانی تۆ ڕونی بکەینەوەو بە خەڵکی بگەیەنی، ئەوەبوو دوای نازڵبوونی ئەم ئایەتانە ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە جوبرائیل نیگای بۆ دەهێنا، بێدەنگ گوێی ڕادەگرت: کە جوبرائیل دەڕۆیی وەکوو بۆی خوێندرابووەوە ئاوا دەیخوێندەوە، بەبێ زیادو کەم.[1]

**مەعنای دووەم:** جەمعی قورئان بە مانا نووسینەوەیەتی، نووسینەوەی هەموو ئایاتو سورەتەکانی ڕیزبەند بکرێنو نیشانە لە نێوانیاندا دابندرێ، ئایاتو سورەتەکانی بەشوێن یەکدا لەچەند صەحیفەو پەڕەگرافێکدا کۆبکرێنەوە بەوشێوە تایبەتییەی ئەمڕۆ دەیبینین.

١- جەمعی قورئان بەمانا کۆکردنەوەی لە سینگی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ)و جێگیر کردنی، ئەمجار لەسەر زوبانی ئەو ڕاگەیاندنی بە خەڵك، بەڵێ وەکوو گوتراو زاندراویشە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زۆر بە حەزو ئارەزۆوە چاوەڕوانی وەحی دەکرد، تامەزرۆی نازڵبوونی بوو، هەر کە بەشێك لەقورئان نازڵ دەبوو لەبەری دەکردو فەهمی دەکرد، وەکوو ئەو وادەی خودا پێی دابوو ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ – القيامة/١٧﴾ کەبۆی دادەبەزیو بۆی دەخوێندرایەوە، لە دڵیدا جێگیر دەبوو لەبیری نەدەچووەوە، بەمەش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەیەکەم قورئان لەبەر دادەنرێ.

هاوەڵانیشی چاویان لەو کردو کردیانە (ئوسوەی حەسەنە) چونکە ئەوانیش خۆشەویستی بنەمای ئایینو لەبەرکردنی قورئانیان چوبووە دڵو دەروونەوەو بە تەواوی خویان دابویەو ئەو سەرچاوەی ئایینەیان بەلاوە لە هەموو شتێکی تر گرنگ تر بوو.

---

[1] أخرجه البخاری/٥، ومسلم/١٠٠٥.

بێگومان وەکوو گوترا: قورئان لە ماوەی بیستو ئەوەندە ساڵەدا نازڵ بووە، وا ڕێکەوتووە یەك ئایەت دابەزیوە، وابووە زیاتر تا دە ئایەت، هەر ئایەتێك دادەبەزی خێرا لەبەر دەکراو دەخرایە مێشكو دڵەوەو کۆنترۆڵ دەکرا.

ئاشکراشە عەرەبەکانی هاوچەرخی قورئان نازڵبوون، بە سروشت ذاکیرەیان بەهێز بوو، کەلێنی نەخوێندەوارییەکەیانو نەتوانییان بۆ نووسینەوەی ڕوداوو بەسەرهاتو ڕەچەڵەك ناسییان بەو ذاکیرە بەهێزەی هەیانبوو پڕکردبووەوە، زۆربەی ڕوداوو رشتەی نەسەبو بنەماڵەو شیعری شاعیرانیان لە سنگی خۆیاندا پاراستبوو.

شێخی بوخاری لە صەحیحی خۆیدا سێ ڕیوایاتی لە حەوت لە هاوەڵانی قورئان لەبەر ڕیوایەت کردووە ئەو حەوت هاوەڵە (عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو سالی کوڕی مەعقەل (مولى أبی حذیفة)و مەعاذی کوڕی جەبەلو ئوبەی کوڕی کەعبو زەیدی کوڕی ثابیتو ئەبو زەیدی کوڕی (السکن)و ئەبو دەرداء) بوون.

١- لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی (العاص)ەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «خُذُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ – فَبَدَأَ بِهِ – وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِى حُذَيْفَةَ ، وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ، وَأُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ».[1] ئەم چوار هاوەڵە دوانیان موهاجیرن (عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو سالم) دوانیشیان ئەنصارین (مەعاذو ئوبەی).

٢- لە قەتادە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی: کێ لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی کۆکردەوە؟ لە وەڵامدا وتی: چوار کەس هەرچواریان لە ئەنصار بوون (ئوبەی کوڕی

[1] أخرجه البخاری/٣٨٠٨ ومسلم/٦٣٣٨.

کەعب، مەعاذی کوڕی جەبەل، زەیدی کوڕی ثابیت، ئەبو زەید) وتم: ئەبو زەید کێیە؟ وتی مامێکی من بوو.[(١)]

٣- لە ڕێگەی چەسپاوەوە ئاوا ڕیوایەتکراوە لە ئەنەسەوە دەڵێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دونیا دەرچوو، جگە لە چوار کەس کەسی تر قورئانی لەبەر نەکردبوو، ئەو چوار کەسە (ئەبو دەرداو، مەعاذی کوڕی جەبەل، زەیدی کوڕی ثابیت، ئەبو زەید).[(٢)]

ئەو ئەبو زەیدەی ناوی هات لەم فەرموودانەدا، بنەچەو ناوی لە نەقڵێکی ئیبنو حەجەردا بە مەرجی بوخاری لە ئەنەسەوە ڕوونکراوەتەوە، دەڵێ ئەو ئەبو زەیدەی قورئانی کۆکردەوە ناوی (قیس بن سکن)ە وتیشی پیاوێك بوو لە بنەماڵەی ئێمە بنەماڵەی عەدی لە (بنی النجار) یەکێکە لە مامەکانی من، بە وەجاخکوێری مردو ئێمە میراتگری بووین‌و میراتەکەیمان لەخۆمان بەشکرد.

ئیبنو حەجەر لە ژیاننامەی سەعیدی کوڕی عوبەیددا دەڵێ: ئەم زاتە واتە: سەعید لە هاوەڵانی قورئان لەبەر بوو، نازناوی (القارئ) بووە.[(٣)]

باسکردن‌و ناوهێنانی ئەم حەوت، یان هەشت قورئان لەبەرانە، ئەوە ناگەیەنێ قورئان لەبەر هەر ئەو حەوت، یان ئەو هەشت هاوەڵە بووبن‌و کەسی تر قورئانی لەبەر نەبووبێ، بێگومان کۆمەڵێك دەق (نصوص) لە کتێبەکانی سیەرو سوننەکاندا وارید بوون، ئەوە دەگەیەنن: کە هاوەڵان پێشبڕکێیان دەکرد لە قورئان لەبەر کردندا، بە خێزان‌و منداڵەکانیشیان لەبەر دەکرد، بە شەو لە شەونوێژیاندا دەیانخوێند بەجۆرێك کەسێك شەو

---

(١) أخرجه البخاری/٢٨١٠ ومسلم/٦٣٤٠.

(٢) أخرجه البخاری/٥٠٠٤.

(٣) الأصابة فی غیر لصاحبة ٢٨/٢.

بەلای ماڵەکانیانـدا تێپەڕیایـە دەنگـی قورئـان خوێنـدنیانی وەکـوو ویـزەی پورەهەنگ دەهاتە بەرگوێ.

پێغەمبـەری خـودا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کەبـەلای ماڵـە ئەنـصارییەکاندا بەشـەو تێدەپـەڕی گـوێی بـۆ مۆسـیقای دەنگـی قورئـان خوێندنیانی دەگرت: کە لە ماڵەکانیان دەیانخوێند.

لـە ئـەبو موسـای ئەلئەشـعەرییەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ڕیوایـەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: «لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ».[١]

لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمرەوە ڕیوایـەتکراوە: گوتوویـەتی قورئـانم کۆکردبووەوە، هـەموو شـەوێ دەمخوێنـد، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەم حاڵـەی منـی زانـی فـەرمووی: «إقــرأه فــی شــهر» لـە مانگێکـدا بیخوێنەوە.

لـە ئـەبو موسـای ئەلئەشـعەرییەوە ڕیوایـەتکراوە دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنِّي لأَعْرِفُ أَصْـوَاتَ رُفْقَـةِ الأَشْـعَرِيِّينَ بِالْقُرْآنِ ، حِينَ يَدْخُلُونَ بِاللَّيْلِ ، وَأَعْرِفُ مَنَازِلَهُمْ مِـنْ أَصْـوَاتِهِمْ بِـالْقُرْآنِ بِاللَّيْـلِ ، وَإِنْ كُنْتُ لَمْ أَرَ مَنَازِلَهُمْ حِينَ نَزَلُوا بِالنَّهَارِ».[٢]

وێڕای ئەوەی: کـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) زۆر سـوربوون لەسـەر دیراسـەکردنی قورئـانو فێربـوونیو لەبـەرکردنی، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەمیـشە هـەڵی دەنـان بـۆ ئـەو کارەو مامۆستای بۆ هەڵدەبژاردن بۆ ئەوەی فێری قورئانیان بکەن.

لـەعوبادەی کـوڕی صـامیتەوە ڕیوایـەتکراوە دەڵـێ: ئەگـەر یـەکێك هیجرەتی دەکرد بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیدایە

---

[١] أخرجه البخاری/٥٠٤٨ وختصرا ومسلم/١٨٥٢.

[٢] أخرجه البخاری/٤٢٣٢ ومسلم/٦٤٠٧.

دەست یەكێك لەئێمە قورئانی فێربكا، لەناو مزگەوتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشە گرمەی قورئان خوێنانی لێوە دەبیسترا، هەتا كارگەیشتە ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كردن كەدەنگیان نزم بكەنەوە بۆ ئەوەی لەخوێندنەوەدا هەڵە بەیەكتر نەكەن.[١]

ئەم كورت هەڵێنانە بۆ ئەو حەوت قورئان لەبەرە كە بوخاری بەو سێ ڕیوایەتەی پێشوو باسی كردوون بەوە لێك دەدرێتەوە: كە ئەم حەوت هاوەڵە قورئانیان هەموو لە سینەی خۆیاندا كۆكردۆتەوەو لەبەریان بووەو هەموویان بۆ پێغەمبەریان (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندۆتەوەو رشتەكانیان دەماودەم بە ئێمە گەیشتووە بێ پچڕان، غەیری ئەم حەوتە لە قورئان لەبەران — كە زۆرو زەبەندەن — هەموو ئەم صیفەتانەیان تێدا كۆبوونەتەوە، بەتایبەتی: كە هاوەڵان بەناو شارو وڵاتاندا بڵاوبوونەوە هەندێكیان لە هەندێكیانەوە قورئانی بۆ خوێندراوەو لەبەری كردووە، بەڵگە لەسەر ئەمە ئەو هاوەڵانەی لە بیئری (المعونە) شەهیدكران حەفتا قورئان لەبەر بوون.

قورطوبی دەڵێ: لە جەنگی یەمامەدا حەفتا قورئان لەبەر شەهیدبوون، لەسەردەمی پێغەمبەریش لەبیری (مەعونە) هێندەی ئەم ژمارەیە شەهیدبوون. ئەمەیە ئەو مانایەی زانایان تێی گەیشتوونو ئەو حەدیثانەیان لە روانگەیەوە تەئویل كردوە: كە قورئان لەبەرەكان لەحەوت كەس كورت هەڵدێنێ.

ئیمامی المازری كە تەعلیقی لەسەر ریوایەتێكی ئەنەس داوە: كە دەڵێ: (لم يجمع القرآن غير أربعة) جگە لەچوار هاوەڵ كەسی تر قورئانی كۆنەكردۆتەوە. دەفەرموێ: ئەم قسەیەی ئەنەس ئەوە ناگەیەنێ كە لەواقیعدا جگە لەچوار كەس كەسی تر قورئانی كۆنەكردبێتەوە دەبێ مانای

---

[١] مناهل العرفان للزرقاوی/٢٣٤.

قسەی ئەنەس وابکەین: کە ئەو جگە لەو چوارە ئاگاداری کەسی تر نەبووە قورئانی کۆکردبێتەوە، ئەگینا ئەنەس لەکوێ توانای ئەوەی هەبووە کۆنترۆڵی ئەو مەوزوعەی کردبێ وێڕای زۆری هاوەڵانو بڵاوبوونەوەیان بە وڵاتدا؟[1]

ئەم قسەیەی بەو ڕەهاییە کاتێك ڕاست دەردەچێ: کە یەکە یەکە بەهاوەڵان گەیشتبێو هەریەکەیان لەلای خۆیەوە پێی ڕاگەیاندبێ کە لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیتوانیوە هەموو قورئان لەبەربکا، ئەمەش لە ئەوپەڕی دووریدایەو لەمحال نزیك دەبێتەوە. کەوابێ کە سەرچاوەی ئەم هەواڵە زانیاری خۆی بێو بەس ئەوە ناگەیەنێ: کە واقیعەکە وابووبێ.

لەلایەکی ترەوە مەرجی تەواتور ئەوە نیە هەموو تاکێك لە هاوەڵان هەموو قورئانی لەبەر بووبێ، بەڵکوو بە هەموویان هەموو قورئانیان لەبەر بووبێ، با بەشێوەی تەوزیعو دابەشبوونیش بووبێ یاسای تەواتوری تێدا هاتۆتە جێو کیفایەتە.

ئیمامی (المازری) کە ئەم شیکردنەوەی بەو ئوسلوبە جوانە نووسیوە مەبەستی قەڵاچۆکردنی ئەو شوبهەو گومانانە بووە: کە وا دەخاتە گومانەوە ژمارەی قورئان لەبەران کەم بن، دەیەوێ ئیحتیمالاتی گونجاو بخاتە ڕوو بۆ ئەو شێوە حەصرو کورت هەڵێنانەی لە حەدیثەکەی ئەنەسدا دەبینرێ، دەیەوێ بە شێوەیەکی مەقبول ئەو شێوە حەصرە ڕون بکاتەوەو بەمانایەکی وا ئاراستەی بکا لەلای زانایان ڕەت نەکرێتەوە.

بێگومان ئەبو عوبەید (القاسم بن سلام الهروی) لە کتێبی (القرآت)دا هاوەڵانی قورئان لەبەری (الحفاظ)ی هەژمار کردوون، لە موهاجیرین چوار جێنشینەکانو طەلحەو سەعدو ئیبنو مەسعودو حوذەیفەو سالمو ئەبو

---

[1] مناهل العرفان ج١/٢٣٤.

هـورەیرەو عەبـدوڵڵای (الـسائب)و چـوار عەبـدوڵڵاكان (العبادلـه)و خـاتو عائیشەو حەفصەو ئوممو سەلەمەی دەست نیشان كردوون.

لـە ئەنـصاریش: عوبادەی كوڕی (الـصامت)و مـەعاذ ئـەوەی كونیـەی ئـەبو حەلیمەیـە، مەجمـەعی كـوڕی جاریـەو فـەضـالـەی كـوڕی عوبەیـدو مەسـلەمەی كـوڕی موخەلـەدی نـاوزەد كـردوون، ئەوەشـی ڕاگەیانـدووە كـە هەندێ لەو قورئان لەبەرانە لەدوای لـەدونیا دەرچوونی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواویان كردووە.

حـافظی ذەهـەبی لـە كتێبـی (طبقـات القـراء)دا فەرمووویـەتی ئـەم ژمارەیـەی قورئـان لەبەرانـە هـەموویان لـە خزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانیان سـەرتاپا دەور كردۆتـەوە، ڕشـتە سـەنەدەكانیان بە ئێمە گەیشتووە، لەم دەقانە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ: كە قورئـان لەبـەران لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كۆمـەڵێكی زۆر بـوون، چونكە پشت بەستن بە حـیفظو ذاكیرە لـەبواری گێڕانـەوەی ڕووداوو شتی وادا تایبەتمەندی ئەم گەلو نەتەوەیە.

ئیبنو جەزەری: كە مامۆستای قورئان خوێنانی ڕۆژگاری خـۆی بـووە، دەڵێ: پشت بەستن بـە حـیفظو ذاكیرەی سـنگو مێشك لـە نـەقڵی قورئـانو زانیـاری تـردا لـەم چینە بـۆ چـینی دوایـی تایبەتمەندییەكە خـودا بـە ئـەم نەتەوەیەی بەخشیوەو ڕێزداری كردووە.

## كۆكردنەوەی قورئان بەمانا نووسینەوەی سەردەمی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ)

١- پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ نووسـینەوەی وەحـی چەند كـاتبێكی دانـابوون لـە گـەورە گـەورەی هـاوەڵان وەكـوو ئیمـامی عـەلیو موعاوییـەو ئوبـەی كـوڕی كـەعبو زەیـدی كـوڕی ثابیـت، هـەر ئایـەتێك

دابەزییایە فەرمانی پێ دەکردن بە نووسینەوەی‌و شارەزایشی دەکردن کە لە چ سورەتێکداو لەکوێی سورەتەکەدا بینووسنەوەو دایبنێن، بۆ ئەوەی نووسینەوەی بەشێوەی کلێشەو دێڕ یارمەتیدەر بێ بۆ ئەوەی لە سینگی هاوەڵاندا کۆکرابووەوەو خەزن کرابوو.

هەروەکوو چۆن هەندێ لە هاوەڵان بە خۆبەخشی‌و دەست پێشخەری هەر ئایەتێك نازڵ بوایە دەیانووسیەوە بەبێ ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیان پێ بکا، ئەوانە قورئانیان دەنووسیەوە لەسەر لقەدارخورماو تەنکە بەردو بنکی لقە خورمای ئەستورو ئێسقانی شەپیلکی حوشترو ئاژەڵی تر.

لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانمان لەسەر پارچە پێستی بچوك دەنووسیەوە.

ئەمەش ئەندازەی گرنگیدانی هاوەڵان بە قورئان‌و ماندو بوونییان بە نووسینەوەی دەردەخا، چونکە جگە لەو شتانە هیچی تریان دەست نەکەوتووە قورئانی تێدا بنووسنەوە، لەسەر ئەم کەرەسە سەرەتاییانە قورئانیان نووسیوەتەوە بۆ ئەوەی یارمەتیدەریان بێ بۆ ئەوەی لەبەریانە، ئەگەر هەڵەیەك بوو بە نووسراوەکە ڕاستی بکەنەوە.

حەزرەتی جوبرائیل هەموو ساڵێ لە ڕەمەزاندا قورئانی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەور دەکردەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەخیترین مرۆڤ بوو، کاتێکیش لە ڕەمەزاندا جوبرائیل دادەبەزییە لای، لەهەموو کاتێك سەخی تر دەبوو، هەموو شەوێکی ڕەمەزان جوبرائیل دەهاتە لای‌و قورئانی بۆ دەخوێندەوە، سوێندم وابێ لەو کاتانەدا

که جوبرائیل دەهاته لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر لەبارانی ڕەحمەت سەخی تر بوو.

هاوەڵانیش بەپێی پێویستو بۆ لوان، ئەوەی لایان بوو لە قورئانو ئەوەی لەبەریان بوو بۆ پێغەمبەریان دەخوێندەوە.

ئەم نووسینەوەی قورئان لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمووی لە یەك موصحەفدا کۆنەکرابووە، بەڵکوو ئەوەی لای ئەم نووسرابووەوە لای ئەویان نەبوو بە پێچەوانەشەوە.

زانایان گێڕاویانەتەوە کە چەند کەسێك لە هاوەڵان وەکوو عەلی کوڕی ئەبوطالیبو مەعاذی کوڕی جەبەلو ئوبەی کوڕی کەعبو زەیدی کوڕی ثابیتو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ئەمانە هەموویان قورئانیان لەبەر بووەو نووسیویانەتەوەو بۆ پێغەمبەریشیان خوێندۆتەوە.

زانایان وتوویانە: زەیدی کوڕی ثابیت دواکەس بووە کە قورئانی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندۆتەوە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدونیا دەرچوو، قورئانی پیرۆز لە سینگی هاوەڵانیدا پارێزراو بوو، لەسەر شتی جۆراوجۆر نووسرابووەوە، ئایاتو سورەتەکانی لێك جیاکرابوونەوە، یان ئایەتەکانی ڕێکخرابوونو هەر سورەتەو بەجیا لەسەر شتێك نووسرابووەوەو هەر حەوت جۆرە خوێندنەوەکەی دیاری کرابوو، بەلام لە موصحەفێکی گشتیدا لێك نەدرابوون، چونکە تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیاندا بوو ئایەتەکان بەشوێن یەکدا دادەبەزین هاوەڵان بە تایبەتی قورئان لەبەرەکان لەبەریان دەکردنو نووسەرەوەکان دەیاننووسینەوە، پێویستی ئەوە نەبوو لە یەك موصحەفدا تەدوین بکرێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەیناو بەین چاوەڕوانی نازڵبوونی نیگای تازەی دەکرد، وێدەچوو ئەو نیگا تازەیە حوکمێکی چەسپاوی لەوەپێش نەسخ بکاتەوە، نووسینەوەی

قورئـانیش بـه تـەرتیبی نازڵبوونەکـەی نـەبوو، بـەڵکوو ئایەتەکـە: کـە نـازڵ دەبـوو پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەستنیـشانی دەکـرد لـە چ سـورەتێکداو لـەکوێی سـورەتەکەداو لـەپاش چ ئایـەتێك و پـێش چ ئایـەتێك دابندرێ، ئەگەر قورئان هەمووی لە یەك نوسخەدا بنووسرایەوە دەبوایـە کـە ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك نازڵ دەبوون نوسخەکە گۆڕانکاری تێدا بکرایە!!

ئیمـامی زەرکەشـی فەرموویـەتی: بۆیـە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) قورئـان لەیـەك نوسـخەدا نەنووسـرایەوە هـەتا گۆڕانکاری تێدا ڕوونەدا هەموو کاتێ بەهۆی نازڵبوونی نیگـای تـازەوە، لەبـەر ئەم هۆیە نووسینەوەی قورئان لە یەك نوسخەدا دواکەوت هەتا نیگا دابەزین، بەهۆی لـەدونیا دەرچوونی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کۆتـایی هات.

بـەم شـێوەیە ڕیوایـەتی زەیـدی کـوڕی ثابیـت (ڕەزای خـودای لێ بـێ) تەفسیر دەکرێ: کـە دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەدونیا دەرچوو قورئان لە هـیچ شـتێکدا کۆنـەکرابووەوە واتـە: کۆکردنەوەیـەکی وای بـۆ ئـەنجام نـەدرابوو ئایـات و سـورەتی بـە تـەواوی ڕێکخـرابن و لەیـەك موصحەفدا نووسرابێتەوە.

ئیمامی (الخطابی) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە قورئـانی لـە یـەك موصـحەفدا کۆنـەکردەوە، چـونکە چـاوەڕوانی نـازڵبوونی هەندێ لە نیگا بوو بۆ سڕینەوەی هەندێ لە ئەحکامی چەسپاو، یان نەسـخی خوێندنـەوەی، جـا کـە نیگـا نـازڵبوون کۆتـایی هـات بـە لـەدونیا دەرچـوونی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پـەروەردگار ئیلـهامی خـستە دڵـی خەلیفە ڕاشیدینەکان بۆ ئەوەی ئەو کارە پیرۆزە ئەنجام بدەن، بـۆ جێبـەجێ کردنـی ئـەو وادە خـودایییـە کـە خـۆی پارێزگـاری ئـەو قورئانەیـەو ناهێڵـێ گۆڕانی بەسەردا بێ، سەرەتای دەستکردن بەو کارە پیرۆزە لەلایەن خەلیفـەی

یەکەم حەزرەتی ئەبو بەکر بوو، لەسەر ڕاوێژو داخوازی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئەو جەمعەی بۆ قورئان ئەنجام درا لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) بە مانا لەبەرکردن‌و نووسینەوە دێ‌و پێی دەگوترێ جەمعی یەکەم.

## ا- جەمعی قورئان لەسەردەمی حەزرەتی ئەبو بەکردا

لەدوای لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) حەزرەتی ئەبو بەکر بوو بەفەرمانڕەوای موسوڵمانان‌و ڕووبەڕوی کۆمەڵێك ڕوداوو مەشاکیلی گەورە بووەوە، جەماوەرێکی زۆری عەرەب لە ئیسلام پاشگەزبوونەوە، حەزرەتی ئەبو بەکر بە ورەیەکی پۆلایینەوە بەرەنگاری ئەم ڕوداوانە بووەوە، چەند لەشکرێکی پێك هێنان‌و ناردنی بۆ سەر پاشگەزبووەکان.

ساڵی دوانزەی کۆچی غەزای ئەهلی یەمامە ڕویدا، ئەو لەشکرەی نێردرا بۆ سەریان ژمارەیەکی زۆری لە هاوەڵانی قورئان لەبەری تێدا بوو، لەم غەزایەدا حەفتا صەحابەی قورئان لەبەرو قورئان خوێن شەهید بوون، ئەم ڕوداوە حەزرەتی عومەری ڕاچڵەکاندو ترساندی، چووە لای حەزرەتی ئەبوبەکرو پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد قورئان کۆبکرێتەوەو لە یەك موصحەفدا بنووسرێتەوە، نەوەکوو بە شەهیدبوونی ژمارەی تر لە هاوەڵانی قورئان لەبەر، قورئان لێی بفەوتێ، چونکە بێگومان شەهیدبوونی هاوەڵان لەو شەڕەدا زۆر کاریگەرو ترسناك بوو، ترسی ئەوە هەبوو لەشوێنی تر هاوەڵی تر شەهید بن‌و قورئان لێی بفەوتێ، یان لەبیر بچێتەوە، سەرەتا ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) بەو کارە ناڕازی بوو، بەلایەوە زۆر قورس‌و گران بوو کارێك بکا، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەژیانیدا نەیکردووە، بەڵام حەزرەتی عومەر کۆڵی لێ نەداو ئەم پێشنیارەی ناوە ناوە

بۆ دوباره دەكردەوە، هەتا خودا خستیه دڵی ئەبوبەكر: كه ئەم كاره پێویسته ئەنجام بدرێ‌و پێشنیارەكەی عومەر جێبەجێ بكرێ، پاشان ناردی بەشوێن زەیدی كوڕی ثابیتدا: كه جێگەو مەقامی لەبواری قورئان لەبەربوون‌و نووسینەوەیدا بەرزو بەرچاو بوو، تێگەیشتن‌و عەقڵی ناوازه بوو، لەناو قورئان لەبەرەكانیشدا دواكەس بوو: كه قورئانی بەسەر پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندبووەوە، ئیتر كه زەید هات حەزرەتی ئەبو بەكر پێشنیارەكەی حەزرەتی عومەری بۆ باس كرد، زەیدیش وەكوو هەڵوێستی سەرەتای ئەبوبەكر ئەو كارەی ڕەت كردەوەو پێی وابوو نابێ شتی وا بكرێ، بەڵام هەردووكیان بیریان لێ كردەوەو مەوزوعەكەیان دەندەشە كرد لەناو خۆیانداو دڵیان گۆڕاو هاتنه سەر ڕایەكەی عومەرو بڕیاریاندا كارەكه دەست پێ بكرێ.

ئیتر زەید قۆڵی لێ هەڵماڵی‌و شانی بەر ئەم كاره قورسەدا، دەستی كرد بە نووسینەوەی قورئان پشت بەستوو بەوەی لە سینگی قورئان لەبەراندا بوو، ئەوەی لای هاوەڵان لەسەر شتی جۆراوجۆر نووسرابووەوە، ئیتر كه تەواوی كرد لەلای حەزرەتی ئەبوبەكر داینا.

كه ئەبو بەكر ساڵی سیانزەی كۆچی لەدونیا دەرچوو، ئەو نوسخه موصحەفه كامڵه كەوته لای حەزرەتی عومەر، كه عومەر شەهید بوو كەوته لای حەفصەی كچی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) كه حەزرەتی عوسمان بووبە جێنشین پاش ماوەیەك داوای لەخاتو حەفصه كرد نوسخه قورئانەكەی تەسلیم بكا ئەویش پێیدا.

له زەیدی كوڕی ثابیتەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت كراوه دەڵێ: ئەبوبەكر - دوای شەهید بوونی كۆمەڵێك له هاوەڵان لەشەڕی یەمامەدا — ناردی بۆلام، كه چوومه خزمەتی عومەری كوڕی خەتتابی لەلابوو، ئەبوبەكر فەرمووی: ئەوە عومەرە هاتووە بۆلام‌و دەڵێ: كۆشتار زۆر بووە

لەشەڕی یەمامەداو زۆر لە قورئان لەبەران شەهید بوون، دەڵێ: مـن دەترسـم لەشوێنی ترو شەڕی تردا قورئان لەبەری ترمـان شـەهید بـبن‌و بـەو هۆیـەوە زۆر لـە قورئـان بفـەوتێ دەڵـێ: مـن دەمـەوێ فـەرمان دەربکـەی قورئـان کۆبکرێتـەوە ئـەمنیش بـە عومـەرم گوتـووە: چۆن شـتێك بکـەین پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خـۆی نـەیکردبێ؟ عومـەر وتـی: بـەخودا ئـەوە کارێکی خێرو باشـە ئەگـەر بکرێ، ئـیتر چـەند جارێـك ئـەم باسـەی دووبـارە کردەوە، تا خـودا دڵـی وا لێ کـردم منـیش بێمـە سـەر ڕای ئـەوو ڕای عومـەرم پەسەند کردو وەکوو ئەو پێم وایە، ئەوە کارێکە دەبێ بکرێ.

جـا زەیـد دەڵـێ: ئەبوبـەکر پێـی گـوتم: ئـەتۆ گـەنجێکی عـاقڵ‌و تێگەیـشتووی، جێگـای بتمانـەی ئێمـەی‌و دڵمـان لێـت ئەمینـە، کـاتی خـۆی نووسەرەوەی وەحی بوی لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) قـۆڵی لێ هەڵکەو پشت بەخودا دەست بکە بە کۆکردنەوەی قورئان.

سوێندم بەخودا ئەگەر داوام لێ بکرایـە کێوێـك بگوێزمـەوە بەلامـەوە ئاسانتر بوو لەوەی ئەبوبەکر فەرمانی پێ کردم بە کۆکردنەوەی قورئـان، وتم باشە ئەی تۆو عومەر چۆن پێکیشی کارێـك دەکـەن: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەیکردووە؟ ئەبوبـەکر فـەرمووی: بـەخوا کـارێکی پێویست‌و خێرئاوەرە، دەبێ بیکەین، ئیتر وازی لێ نەهێنام‌و قسەی بۆ کـردم‌و داواکەی دووبارەو سێ بارە کـردەوە تـاخودا دڵـی کردمـەوەو هاتمـە سـەر ڕای ئەبوبەکرو عومەر، منیش وەکوو ئەوان ئەوکارەم بە پێویست زانی.

ئیتر کەوتمە بەشـوێندا گـەڕانی قورئـان‌و کۆکردنـەوەی کـە لـەوەپێش لەسەر لقە دارخورماو تەنکە بەردو شتی وا نووسرابووەوە، هەروا لە سـینگی پیاوانی قورئان لەبەردا هەڵگیرابوو، تەنانەت کۆتایی سورەتی (التوبة)م لەلای ئەبو خوزەیمەی ئەلئەنصاری دەستکەوت، کەسی ترم نەبینی لەبەری بێ.

﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – التوبة/١٢٨﴾ هەتا کۆتایی سورەتی (براءة) ئیتر ئەم قورئانە نووسراوەی من کۆمکردەوە لەلای حەزرەتی ئەبوبەکر دانراو لای ئەو مایەوە، تا وەفاتی کرد، پاشان کەوتە لای ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) تا لەژیاندا بوو، ئەمجار کەوتە لای خاتو حەفصەی کچی عومەر.[1]

بێگومان زەیدی کوڕی ثابیت لەم کارە گرنگەیدا ئەوپەڕی وردبینیو زانستی بەرچاوگرتووە، ئەوەبوو ئیکتیفای بە لەبەربوونی بێ نووسراو نەدەکرد، کاتێك دەقەکەی دەنووسییەوەو دەیچەسپاند کە لەگەڵ نووسراوەکەدا بەراوردی بکردایەو یەکسان بوونایە.

کە لێیەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: کۆتایی سورەتی (التوبة)م لای ئەبو خوزەیمە دەست کەوت لای کەسی تر چنگم نەکەوت، ئەوە ناگەیەنێ ئەو بەشە قورئانەی کۆتایی سورەتی ناوبراو موتەواتر نەبێ، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە بەنووسراوی لای ئەبو خوزەیمە بووەو لای کەسی تر بە نووسراوی چنگی نەکەوتووە، ئەگینا زەید بۆخۆی ئەوەی لەبەر بووە، زۆر لە هاوەڵان ئەو بەشەیان لەبەر بووە، چونکە زەید پشتی بە حیفظو بە نووسراو پێکەوە بەستووە، ئەم ئایەتە لای زۆر لە هاوەڵان بە مەحفوظی هەبوو، هەمووشیان شایەتی ئەوەیاندا: کە نووسراوەتەوە، بەڵام بەشێوەی نووسراوەیی تەنها لای ئەبو خوزەیمەی ئەنصاری دەستی کەوت.

کوڕی ئەبوداود[2] لەڕێگەی یەحیای کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاطیبەوە ڕیوایەتی کردووە: کە دەڵێ: عومەر هاتە ناو کۆمەڵی موسوڵمانانو وتی: کێ لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی لە قورئان وەرگرتووە با بیهێنێ بۆمان، هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەردا

---

[1] أخرجه البخاري/٤٦٧٩.

[2] ناوی عەبدوڵڵای کوڕی سلێمانی کوڕی (الأشعث)ی (الأزدي)یە.

(درroodی خودای لەسەر بێ) قورئانیان لە صوحوف پارچە تەختەدارو لقە خورما دەنووسییەوە، هیچ شتێك لەوانەی دەهاتن‌و قورئانی نووسراویان دەهێنا وەرنەدەگیرا، قبوڵ نەدەکرا، هەتا دوو شایەت شایەتییان بۆ نەدایە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە زەید بە نووسراویش کیفایەتی نەدەکرد، هەتا دوو شایەتی بڕوا پێکراو شایەتییان نەدایە لەسەر ئەوە: کە بەڵێ ئەوەی لە پێغەمبەرەوە بیستووە! زەید وێڕای ئەوەی کە بۆخۆی قورئانی هەمووی لەبەر بوو بۆ ئیحتیات‌و دڵنیایی‌و زێدە وردەکاری ئەو شایەتانەشی داوا دەکرد!!

هەر ئیبنو ئەبی داود لەڕێگەی هیشامی کوڕی عوروە ئەویش لە باوکییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: ئەبوبەکر بە عومەرو زەیدی گوت: لە دەرگای مزگەوت دابنیشن هەرکەسێك شتێکی نووسراوی قورئانی هێناو دوو شایەتیان لەگەڵ بوو، شایەتییان دا کە ئەوە قورئانە، بینووسنەوە.

پیاوانی ڕشتەی ئەم حەدیثە بتمانە پێکراون، هەرچەندە ڕشتەکە پچڕانی تێدایە، ئیبنو حەجەر دەڵێ: وادیارە مەبەست بە دوو شایەتەکە لەبەربوون‌و نووسراوەکەیە.

ئیمامی (السخاوی) لە کتێبێکیدا بەناوی (جمال القراء) دەڵێ: مەبەست بە دوو شایەتەکە ئەوەیە هەردووکیان شایەتی بدەن: کە ئەو نووسراوە کاتی خۆی لەژێر چاودێری پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) نووسراوەتەوە، یان مەبەست ئەوەیە: ئەو دوو شایەتە شایەتی بدەن: کە ئەو شێوە خوێندنەوەیە لەوشێوە قیرائەتانەیە: کە قورئانی پێ نازڵ بووە.

ئەبو شامە دەڵێ: مەبەستی هاوەڵان لەم وردبینی‌و گرنگی پێدانە ئەوەبووە هیچ شتێك نەنووسنەوە ئیللا لەخودی ئەو نووسینەی کە بە چاودێری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خۆی نووسراوەتەوە، ڕاگوێزی بکەن، نەك تەنها پشت بە حیفظی هاوەڵان ببەستن‌و بەس، بۆیە

دەربارەی کۆتایی سورەتی (التوبة) زەید دەڵێ: (لم أجدها مع غيره) واتە: ئەم ئایەتەم بە نووسراوی هەرلای ئەبو خوزەیمە چنگ کەوتو لەلای کەسی تر نەم بینی، چونکە زەید لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا ئیکتیفای بەتەنها لەبەربوون نەدەکرد بەبێ ئەوەی بەنووسراوەیی دەستی بکەوێ.[1]

بێگومان ئێمە زانیمان قورئان لەوەپێش لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نووسرابووەوە، بەڵام بە پارچە پارچەیی‌و بەش بەش لەسەر لقە دارخورماو تەنکە بەردو چەرمو ئێسقانی شەپیلکی ئاژەڵ، حەزرەتی ئەبوبەکر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمانی کرد بە کۆکردنەوەی لە دوو تویێ یەك موصحەفدا بەشێوەیەك ئایەت‌و سورەتەکانی ڕێکخراو ڕێزکراو بن وەکوو ئێستا، هەروەها نووسینەوەکەی بە ئەوپەڕی وردبینی‌و زانستی بێ، ئاماژەی تێدا بێ بۆ هەر حەوت قیرائەتەکانی: کە قورئان پێیان نازڵ بووە.

کەوابوو حەزرەتی ئەبوبەکر (رەزای خودای لێ بێ) یەکەم کەس بووە کە بەم شێوە قورئانی کۆکردۆتەوە لە یەك موصحەفدا، هەرچەند هەندێ موصحەفی تایبەتی لای هەندێ لە هاوەڵان هەبوون وەکوو موصحەفی عەلی، موصحەفی ئوبەی، موصحەفی ئیبنو مەسعود، بەڵام ئەم موصحەفانە بەوشێوە وردبینی‌و ڕیزبەندی بۆ ئایەتەکان‌و سورەتەکانی تێدا نەکرابوو، نووسینەکەیان کورت هەڵنەهێنرا بوو، لەسەر ئەو ئایەتانەی خوێندنەوەکەیان نەسخ بوبووەوە،، کۆڕای هاوەڵانی لەسەر بێ.

هەندێ لە زانایان پێیان وایە ناونانی قورئان بە موصحەف لەوکاتەوە پەیدا بووە کە ئەبوبەکر (رەزای خودای لێ بێ) کۆکردنەوەی بۆ ئەنجام دا.

ئیمامی عەلی دەفەرموێ: خاوەنی گەورەترین خێرو پاداش دەربارەی قورئان حەزرەتی ئەبو بەکرە، ڕەحمەتی خودا لە ئەبوبەکر بێ ئەو یەکەم

---

[1] الإتقان ص١٣١.

کەس بوو نامەی خودای کۆکردەوە، ئەم کۆکردنەوە بە کۆکردنەوەی دووەم دەناسرێ.

## ٢- کۆکردنەوەی قورئان لەسەردەمی عوسماندا

لەم سەردەمەدا فتوحاتی ئیسلامی بەرفراوان بوو، قورئان لە بەرو (قراء)ەکان بەناو شارو ولاتی بەرفراوانی ئەو رۆژگارەدا بلاوبوونەوە، قوتابیو دانیشتوانی هەر شارو دەڤەرێك خوێندنەوەی قورئانیان لەوانە وەرگرتو فێربوون، کە نێردرابوون بۆلایانو ئەو ئەرکەیان خرابووە ئەستۆ، جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان: کە ئەوان فێریان دەکردن بەگوێرەی ئەو قیرائاتانە بوو کە قورئان پێی نازڵ بوبوو، هەندێ بەم جۆرە قیرائەتەو هەندێ بە قیرائەتێکی تر قورئانی دەخوێندو فێری بوبوو، ئەگەر رێبکەوتایە مەجلیسێك، یان غەزایەك، یان کۆبوونەوەیەك کەسانێکی ئەم شارو کەسانێکی ئەو شاری بەیەك بگەیاندایەو بکەوتنایە سەر باسی خوێندنەوەی قورئان، هەندێکیان سەریان سوڕدەما لەو جوداوازییەی هەندێکی تریان قورئانیان پێ دەخوێند، لەوانەبوو ئەوان بۆخۆیان قەناعەتیان بۆ پەیدابوایە بەوەی هەموو ئەو جۆرە خوێندنەوانە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستراونو دەچنەوە سەر ئەو.

وەلێ ئەمە نەدەبووە مانیعو لەمپەڕ لەوەی شكو گومان لەلای چینی تازەپێگەیشتوانی موسوڵمان دروست نەبێ، بەتایبەتی ئەوانەیان: کە بە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەگەیشتبوون، ئیتر وێدەچوو قسە بێتە سەر ئەوە کام خوێندنەوە ڕەوانەو کامەیان ڕەوانترە، ئەمەش بە تێپەڕبوونی رۆژگار سەری دەکێشا بۆ دەمەدەمێو بێنەو بەرە پاشان بۆ یەکتر تۆمەتبارکردنو شتی وا ئەمەش فیتنەیەك بوو پێویستی بە چارەسەری بنبڕکەر هەبوو.

کـه غــەزای ئەرمینیــەو غــەزای ئازەربایجـان لەلایـەن دانیـشتوانی عێراقەوە ئەنجام درا، یەکێ لەوانە هاوبەشی ئـەو غەزایانـە بـوو حوزەیفـەی کـوڕی (الیمـان) بـوو، ئـەم زاتـە جـوداوازی زۆری بـەرگوی کـەوت لەشـێوەی قورئـان خوێنـدنی خەڵکەکـەدا، شـێوە قیرائـاتی وای دەبیـست تێکـەڵ بـوو بـە لەحنو زمانخواری، هەرکەسەشیان قیرائـەتی خـۆی پـێ پەسـەند بـوو، خـوی پێوە گرتبوو، وازی لێ نەدەهێناو پێچەوانەی بەرامبەرەکەی دەکردو خۆی پێ ڕاستو ئەوی پی هەڵە بوو، تەنانەت هەندێکیان تەکفیری موخـالیفی خۆیـان دەکـرد، بۆیــە حوزەیفــە: کــە ئــەم دیــاردە نەخوازراوانــەی بینــی لــەناو خەڵکەکـەدا، هانـای بـۆ ئیمـامی عوسمـان هێنـاو هـەواڵی ئـەو نـاکۆکیو جـوداوازییـەی لـەناو جـەنگاوەرانی ئیـسلام بـە تایبـەتیو نـاو خـەڵکی تـردا بەگشتی پەیدا بوبوو، گەیاندە حەزرەتی عوسمان: کە خەلیفـەی موسـوڵمانان بوو، لەهـەمان کاتـدا عوسمـان بۆخـۆی لـەوەپێش بەگوێیانـدا سـرکاندبوو کـە هەندێ جوداوازیو خـیلاف لـە قیرائاتـدا لـەناو ئەوانـەدا: کـە منـداڵان فێـری قورئان خوێنـدن دەکـەن سـەری هەڵداوە، ئـەو مامۆسـتایانە لـەناو خۆشـیاندا دووبـەرەکیو سـێبەرەکییان تێـدا دروسـت بـووە، هـاوەڵانیش ئـەم دیـاردەو حاڵەتـەیان بـە خەتـەرێکی گـەورە هاتـە پـێش چـاوو ترسـان: کـە ئەمـە سەربکێشێ بۆ گۆڕانکاری لە قورئاندا، تەبدیلی ماناو کەلیماتی لێ وەبـەر بـێ، بۆیە بە کۆڕا هاتنە سەر ئەوە کە ئەو موصحەفەی کاتی خـۆی لای ئەبوبـەکر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) بـووە سـەرلەنوێ بینووسـنەوەو وابکـەن خەڵکەکـە (موسوڵمانان) پابەندی شێوە خوێندنەوە چەسپاوەکانی قورئان ببنو بە یەك زاراوە بیخوێننەوە.

ئەوەبوو خەلیفە عوسمان ناردی بـۆلای خـاتو حەفصە داوای لێ کـرد، ئـەو موصـحەفە نووسـراوانەی کـاتی خـۆی لای ئەبوبـەکر بـوونو ئێـستا کەوتوونە لای ئەو، بۆیان بنێرێ، ئەویش بۆی ناردن، ئەمجار عوسمـان نـاردی

بـەدوای زەیـدی کـوڕی ثـابیتی (الأنـصاری)دا، هـەروا بـانگی هەریـەکێ لـە عەبدوڵڵای کوڕی زوبـەیرو سـەعیدی کـوڕی ئـەلعاص‌و عەبـدوڕحمانی کوڕی (الحارث)ی کوڕی هیشامی کرد، کە هـەموویان قوڕەیـشی بـوون، فـەرمانی پـی کـردن: کـە چـەند نوسـخەیەك لەبـەر ئـەو موصـحەفەی دواجـار کەوتـە لای حەفصەی کچی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) بنووسنەوە، لە هـەر شـوێنێك زەیـد کەوتـە خیلافـەوە لەگـەڵ پێـڕە قوڕەیـشییەکەی لـە تـەکیان‌دایـە، بـە زاراوەی قـوڕەیش بینووسـنەوە، چـونکە بێگومـان قورئـان بـە زاراوەی ئـەوان دابەزیوە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەت کـراوە کـە حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان سـەردانی خەلیفە عوسمانی کرد، حوزەیفە لـە غـەزای ئەرمینیـەو غـەزای ئازربایجانـدا بەشـدار بـوو لەگـەڵ ئـەهلی عێـراق، حوزەیفـە لـە جـوداوازی خوێندنـەوەی قورئانـدا مەترسـییەکی گـەورەی لەلاپەیـدا بوبـوو بۆیـە بـە ئیمام عوسمـانی گوت: فریـای گـەلی موسـوڵمان بکـەوە پـێش ئـەوەی وەکوو جولەکـەو نـەصارا لەنامـەی خـودادا کێـشەیان لێ پەیـدا بـێ! ئـەویش خێـرا نـاردی بـۆلای خـاتو حەفصە داوای لێ کرد کە ئەو قورئانەی کاتی خـۆی بـە فـەرمانی ئـەبو بـەکر کۆکرابووەوە پاشان کەوتبووە لای ئـەو بۆیـان بنێـرێ، تـا چـەند نوسـخەیەکی لەبــەر بنووســنەوە دوای بــۆی بگێڕنــەوە! خــاتو حەفـصە دەســت بــەجێ نوسخەکەی بۆ نارد، ئیتر عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمانی بـە زەیـدی کـوڕی ثابیــت‌و عەبــدوڵڵای کــوڕی زوبــەیرو ســەعیدی کــوڕی ئــەلعاص‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئـەلحارثی کوڕی هیـشام کـرد کـە چـەند نوسـخەیەکی لەبەر بنووسنەوە، خەلیفە عوسمان بەسێ نووسەرە قوڕەیشییەکانی فەرموو: ئەگەر ئێوەو زەید لە وشـەو ڕسـتەیەکی قورئـان کێـشەتان لێ پەیـدا بـوو، بـە زاراوەی قـوڕیش بینووسـنەوە، چـونکە قورئـان بەشـێوە زاراوەی ئـەوان نـازڵ بــووە، ئــەوانیش پــەیڕەوی فەرمایــشتەکەیان کــرد، کــە لــە نووســینەوەی

نوسخەکان بوونـەوە، خەلیفـە عوسمـان موصحەفە کۆنەکـە (صـوحوفەکان)ی گێڕایەوە بۆ خاتو حەفصە.

ئـەمجار بـۆ هـەر وڵاتێکـی ئیـسلامی نوسـخەیەکی لـەو موصـحەفە نووسراوانە ناردو فەرمانی کرد هەموو صەحیفەو موصحەفێکی تر جگە لەو نوسخە تازە نووسراوانە هەموویان بسوتێنـدرێن.

زەید دەڵێ: لە کاتی نووسینەوەدا ئایەتێکم لـە سـورەتی (الأحـزاب) لێ دیار نەما، بۆخـۆم ئـەو ئایەتـەم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بیستبوو دەیخوێندەوە هـەوڵی دۆزینەوەیمانـدا لای خوزەیمـەی کـوڕی ثـابیتی (الأنصاری) دەستمان کـەوت ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَـا عَاهَـدُوا اللَّـهَ عَلَيْـهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْـدِيلًا - الأحـزاب/٢٣﴾ ئـیتر لەشوێنی خۆی لە سورەتەکەیدا دامان نا.[(١)]

ئاثارو ڕیوایەتی هاوەڵان ئەوە دەگەیـەنن: کـە جوداوازیو ئیختـیلاف لەشـێوەکانی خوێنـدنی قورئانـدا، هـەر حوزەیفـەی نەترسـاندبوو، بـەڵکوو کەسانی تریش لە هاوەڵان هـەمان ترسـیان لـەلا پەیدا بوبـوو، ئیبنـو جـەریر دەڵێ: یەعقوبی کوڕی ئیبراهیم بـۆی گێڕامـەوە وتـی: ئیبنـو عولەییـە گـوتی: ئـەییوب لـە ئـەبو قەلابـەوە بـۆی گێڕامـەوە وتـی: کاتێـك کەوتینـە ڕۆژگـاری خەلافەتی عوسمانەوە، مامۆستای واهەبوو شێوە خوێندنی قورئـان لەبـەرێکی بە شاگردەکانی دەگوت، هی واهەبوو شێوە خوێندنی قورئـان لەبـەرێکی تـری بە قوتابییەکانی فێر دەکرد، دوایی کە قوتابیەکان لـەناو خۆیانـدا دەکەوتنـە گفتوگـۆو خوێندنـــەوەی قورئـــان جـــوداوازی خوێنـــدنی قورئانیـــان تێـــدا بەرجەســـتە دەبـــوو، پاشـــان ئـــەم کێـــشەو جوداوازیـــەیان گەیـــشتەوە مامۆستاکانیان، ئەیوب کە ئەم قسانە دەگێڕێتـەوە دەڵێ: ئـەبو قەلابـە وتـی: کار گەیشتە ئەوە هەندێکیان قیرائەتی هەندێکیان بە کوفرو لادان لە ئیسلام

---

(١) أخرجه البخاری/٤٩٨٧، ٤٩٨٨.

دانا، بە ئاشکرا تەکفیر پاڵ هەندێ لە مامۆستایان درا، ئەم حاڵە گەیشتەوە بە خەلیفە عوسمان، چووە سەر مینبەرو خوتبەی بۆ خەڵك داو پێی گوتن: ئێوە لەلای من قورئان خوێندنتان جوداوازی تێدەکەوێ‌و لەحنتان لێ دەردەکەوێ، ئەوانەی لەمن دوورن‌و دانیشتوی شارەکانی ترن، حەتمەن ئیختیلاف‌و جوداوازییان زۆرتر لێ ڕودەدا، لەحن‌و زمانخوارییان زۆرتر دەبێ، ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆببنەوەو قورئانێك بۆ موسوڵمانان بنووسنەوە پێیەوە پابەند بن.

ئەبو قەلابە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆی گێڕامەوە وتی: من یەکێکم لەوانەی قورئانیان بەسەردا دەخوێندرایەوە، وتی: وادەبوو لە ئایەتێکدا دەکەوتنە (بێنەو بەرەوە) دەیانگوت: ئەم ئایەتە فلان کەس لە دەمی پێغەمبەری بیستووە (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێستا ئەو پیاوە لە دەرەوەی مەدینە ژیان بەسەر دەبا، لە بادییەو سارایەك ژیان بەسەر دەبا ئایەتی پێشەوەی ئایەتەکەو ئایەتی دواوەیان دەنووسیەوە شوێنی ئایەتەکەی ببوە جێگای مشتومڕیان بە بەتاڵی دەهێشتەوە، تا پیاوەکە دەهات، یان دەچوون بۆلای، جا کە لە نووسینەوەی قورئانەکە بوونەوە ئیمامی عوسمان نامەی نووسی بۆ دانیشتوانی شارەکان، بۆی ڕوون کردنەوە: کە ئێمە ئاواو ئاوامان کردووەو فلان شتم سڕیوەتەوە ئێوەش لە موصحەفی خۆتان بیسڕنەوە.[1]

ئیبنو ئەشنە: کە یەکێکە لە زانایانی علومی قورئان ساڵی (٣٦٠)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە، لەڕێگەی ئەییوب ئەبو قەلابەوە هەمان چیرۆکی گێڕاوەتەوە، ئیبنو حەجەریش لە فەتحولباریدا دەڵێ: ئیبنو ئەبی داود لە (المصاحف)دا ئەم چیرۆکەی لە ڕێگەی ئەبو قەلابەوە ڕیوایەت کردووە.

---

[1] بڕوانە تەفسیری طەبەری جڵدی یەکەم لێکۆڵینەوەی محمد شاکرو أحمد محمد شاکر طبعە دارالمعارف.

لە سوەیدی کوڕی غەفلەوە ڕیوایەتکراوە وتویەتی: عەلی وتی: دەرحەق بە عوسمان لە خێرو چاکە بەولاوە هیچی تر مەڵێن، سوێندم بەخودا ئەوەی دەربارەی نووسینەوەی موصحەفەکان کردی بە ئاگاداریو ڕا لەسەر بوونی کۆمەڵێکی زۆر لە ئێمە ئەنجامیدا، ڕوی تێدەکردینو دەیوت: ئێوە دەربارەی ئەم قیرائەتە چ دەڵێن؟ دڵنیابن ئەمن پێم گەیشتۆتەوە هەندێ لە مامۆستاو قورئان لەبەران لە هەندێکی تریان دەڵێن خوێندنەوەی من لە خوێندنەوەی تۆ باشترە، ڕاسترە، لەوانەیە ئەم جۆرە قسانە سەربکێشن بۆ کوفرو لەڕێ دەرچوون، ئێمە عەرزمان کرد تۆ چی بەباش دەزانی بکرێ؟ وتی: من وای بەباش دەزانم: کە موسوڵمانان هەموویان لەسەر یەك شێوە خوێندنی قورئان کۆبکەینەوە، جوداوازی لەخوێندنەوەی قورئاندا نەمێنێ، ئێمەیش گوتمان رایەکەت پەسەندە!![1]

ئەم ڕیوایەتە ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەوەی حەزرەتی عوسمان ئەنجامی دا کۆڕای هاوەڵانی لەسەر بووەو هەموویان پەسەندیان کردووە، قورئانەکان (نوسخە موصحەفەکان) هەموویان لەسەر یەك شێوە نووسراونەوە لە حەوت قیرائەتەکەی قورئانی پێ نازڵ بووە، بۆ ئەوەی موسوڵمانان هەموویان لەسەر یەك شێوە قیرائەت ران بێنو بەشێوازی تر نەیخوێنن، ئەمجار حەزرەتی عوسمان صوحوفەکانی ناردنەوە بۆلای خاتو حەفصە، بۆ هەموو وڵاتو دەڤەرێك نوسخەیەکی لەو قورئانە تازە نووسراوانەی ناردو نوسخەیەکیشی لە مەدینە هێشتەوە: کە ناوی لێ نرا (مصحف الإمام) ئەم ناوەشی لەوە وەرگرت، وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان بۆ کرد لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە: کە ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) بە هاوەڵانی فەرموو: (یا أصحاب محمد فاکتبوا للناس اماماً).

[1] أخرجه أبو داود فی المصاحف ص٩٦ بسند صحیح.

ئەمجار ئیمام عوسمان فەرمانی کرد: کە جگە لەم موصحەفە تازە کۆکراوەو نووسراوانە هەرچی نووسراوی تری قورئان هەیە بسوتێندرێ، موسوڵمانان هەموو ئەم فەرمانەیان بەسنگی فراوانەوە وەرگرتو جێبەجێیان کرد، وازیان لە خوێندنی قورئان بەشەش قیرائەتەکەی تر هێناو پابەندی یەك جۆر قیرائەت بوون، ئەمەش هیچ خراپەیەکی تێدانابیندرێ، چونکە خوێندنەوەی قورئان بەهەر حەوت قیرائەتەکە واجب نیە. ئەگەر واجب بوایەو پێغەمبەر لەسەر موسوڵمانانی بە واجب دابنایە، واجب بوو هەموو وشەو پیتێکی ئەو قیرائەتانە بەشێوەی تەواتور نەقڵ بکرایە بۆئەوەی بتوانرایە بکرێ بە حوججەو بەڵگە. وەلێ هاوەڵانو چینی دوا ئەوانیش ئەوەیان نەکردوە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە خوێندنەوەی قورئان بەو شەش قیرائەتە هەر ئەوەندەیە ڕێگە پێدراوە.

ئیبنو جەریر دەربارەی ئەو کارەی ئیمام عوسمان کردی وتوویەتی: (موسوڵمانانی لەسەر یەك موصحەف کۆکردەوە هەموویانی وا راهێنا بەیەك شێوە خوێندنەوە بیخوێننەوە جگە لەو موصحەفەی کە کۆڕای هاوەڵانی لەسەر چەسپا، ئەوانی تری سوتاندن یان دڕاندنی، داوای لەهەموو ئەوانە کرد کە نوسخەی موصحەفێکی لابێ جوداوازی هەبێ لەگەڵ ئەو موصحەفەی کە کۆڕای لەسەر چەسپا یان بیسوتێنی یان بیدڕێنێ. هەموو موسوڵمانان لەم بوارەدا فەرمانبەرداری بوونو دڵنیابوون لەوەی کارەکەی هیدایەت ئامێزو خێرو پەسندە. ئیتر خوێندنەوەی قورئان بە شەش قیرائەتەکەی ئیمام بڕیاریدا پاشگوێ بخرێ وازی لێ هێندراو هەموو موسوڵمانان پابەندی فەرمانەکەی بوون، ئیتر لە ئاکامی ئەم فەرمانە موسوڵمانان ئەو قیرائەتانەیان پاشگوێ خستو بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار زانینەکەیان سڕایەوەو شوێنەواریان نەما، بەجۆرێك ئەمڕۆ کەس ناتوانێ ئەو قیرائەتانە بێنێتەوە کایەو قورئانیان پێ بخوێنێتەوە، لەبەر ئەوەی دیاردەو نیشانەیان نەماوەو

چین لەدوای چینیش موسوڵمانان خوێندنەوەی قورئان بەو قیرائەتانەیان رەفض کردووەو هەوڵیان نەداوە قورئانیان پێ بخوێننەوە، بەبێ ئەوەی ئینکاری ڕاستی ئەو قیرائەتانە بکەن، یان ئینکاری راستی بەشێکیان بکەن، بەڵام بە مەبەستی یەکڕیزی موسوڵمانانو بەرچاوگرتنی باقی دینەکانی ترو راجیاییو گۆڕانکاری لە نامە ئاسمانییەکاندا، ئەمڕۆ موسوڵمانان قورئان ناخوێنن مەگەر بە یەك شێوە ئەویش ئەو شێوە خوێندنەوەو قیرائەتەیە: کە ئیمام عوسمان بۆی هەڵبژاردوونو هاوەڵان بە کۆڕا پەسەندیان کرد.

ئەگەر کەسێکی سادەو نەخوێندەوار بڵێ: چۆن ڕەوا بووە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) واز لەشێوە خوێندنەوەیەکی قورئان بێنن: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بۆی خوێندونەوەو فەرمانی پێکردوون بەخوێندنی؟!

لە وەڵامدا دەگوترێ: فەرمانکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێیان بەو شێوە خوێندنەوەیە، فەرمانێك نەبووە وجوب بگەیەنێو ئەو شێوە خوێندنەوەیە فەرز بکا لەسەریان، بەڵکوو فەرمانێك بووە بۆ ئیباحەو روخصەت نەك بۆ عەزیمەت، چونکە ئەگەر خوێندنەوەی قورئان بە غەیری ئەو قیرائەتەی کە ئیمام عوسمانو هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریان لەسەردا، فەرزو واجب بوایە، پێوویست بوو دوای تێگەیشتن لە هەر قیرائەتێك لەو قیرائەتانە، بەڵگەو حوججە بوایە لەلای ئەو کەسەی قیرائەتەکە ڕیوایەت دەکا، حوکمی خەبەرەکەی بە جۆرێك بوایە عوزی نەهێشتایە شكو گومانی لابردایە.

جا لەوەدوا کە هاوەڵان وازیان لە نەقڵ کردنی ئەو قیرائاتانە بەو شێوە هێناوە، بەڵگەی بەهێز هەیە: کە ئەوان لە خوێندنەوەی قورئان بەو قیرائاتانە موخەیەرو سەرپشك بوونو موجبەر نەبوون، ئەمە دوای ئەوەی کە لەناو ئەوانەدا کە نەقڵی قورئانیان کردووە لە هاوەڵان کەسانێك هەبوون

به نەقڵ کردنی یەکێك لەو قیرائەتانە لەلایەن ئەوەوە حوججە بەرجەستە بووە؟!

جا کە واقیعەکە بەوجۆرە بووبێ، موسوڵمانان کە وازیان لە نەقڵ کردنی هەموو قیرائەتەکان هێناوە، واحیساب ناکرێن کە وازیان لە ئەرکێکی واجب هێناوەو تەرکی شتێکیان کردووە دەبوایە جێبەجێی بکەن، بەڵکوو ئەوەی کردویانە ئەوەیە: کە دەبوو بیکەن، چونکە ئەوەی کردوویانە ئەوە تێڕوانینو بیروبۆچونی موسوڵمانان بووەو واجبیان بەجێ هێناوەو ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام داوە.

کەوابێ ئەم کارەی ئەوان کردیان، کۆڕای موسوڵمانانی لەسەر بوو لەگەڵ ڕاستە ڕێی ئیسلام یەك دەهاتەوە، ئەرکێك بوو پێویست بوو ئەنجامی بدەنو ئەم ئەرکە لەپێشترو پێویست تربوو لە ئەرکێك ئەگەر بیانکردایە لەوە نزیك بووبێتەوە دەستدرێژیکردنو ستەم کردن بێ لە ئیسلامو موسوڵمانان.

## جوداوازی نێوان جەمعکردنی قورئان لەلایەن ئەبوبەکرو لەلایەن عوسمانەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ)

وەکوو لە ڕیوایەتەکان دەردەکەوێ جەمعکردنەوەی ئەبوبەکرو جەمعکردنەوەی عوسمان (ڕەزای خودایان لێ بێ) جوداوازییان لەنێواندا هەیە چ لەڕوی داخوازیو هەڵنەرەوە چ لەڕوی چۆنیەتیەوە.

هەڵنەرو داخوازی کۆکردنەوەی قورئان لای حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) ترسان بوو لە فەوتانی قورئان، بەهۆی مردنو شەهیدبوونی قورئان لەبەرەکان، دوای ئەوەی لە شەڕی یەمامەدا زۆر لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو شەهید بوون!

داخـوازی کۆکردنـەوەی قورئـان لـەلای حـەزرەتی عوسمـان (ڕەزای خـودای لێ بـێ) پەیـدابوونی ئیختیـیلاف بـوو لـە شـێوازە جۆراوجۆرەکـانی خوێندنـەوەی قورئـان، کاتێـك هەسـتی کـردو بینـی ئـەو هـەموو ئیختـیلافو شێوازە خوێندنەوانـەی قورئـان لـە وڵاتـانی ئیـسلامیداو لـەلای مامۆسـتایانی قوتابیانی قورئان: کە سەری هەڵداوەو هەنـدێکیان بـە ئاشکرا خوێندنـەوەی هەندێکیان بە هەڵەو دەرچوون لە قەڵەم دەدا.

جـەمع کردنــەوەی ئـەبو بـەکر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) بـۆ قورئـان کۆکردنەوەیەك بوو لە پارچە چەرمو تەنکە بـەردو شـەپیلکە ئـاژەڵو شـتی واوە نەقڵ دەکرا بـۆ نـاو موصحەفێك ئایـاتو سـورەتەکانی ڕیزبەنـد بکـرێن، هەرچـی تیلاوەتـێ نەسـخ نـەکرابووەوە ڕاگـوێز کرابـوو، هـەر حـەوت قیرائەتەکەی لەخۆ گرتبوو: کە پێیان نازڵ بوبوو.

کۆکردنـەوەی حـەزرەتی عوسمـان (ڕەزای خـودای لێ بـێ) بـۆ قورئـان بریتـی بـوو لـە نووسـینەوەی لەسـەر یـەك قیرائـەتو پـشتگوێ خـستنی قیرائەتـەکانی تـر، بـە مەبەسـتی کۆبوونـەوەی موسـوڵمانان لەسـەر یـەك موصحەفو یـەك قیرائـەتو یـەك شـێوە خوێندنـەوەو وازهێنـان لـە شـەش قیرائەتەکانی ترو پاشگوێ خستنیان.

إبن التینو هی تریش وتوویانـە: جوداوازی نێوان جەمعکردنـەوەی قورئان لەسەردەمی ئەبوبەکرداو لەسـەردەمی عووسمانـدا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) ئەوەیـە: جەمعکردنـەوەی ئەبوبـەکر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لەترسـی ئـەوەبوو بـە شـەهید بـوونو مردنـی قورئـان لەبـەرەکان بەشـێك لـە قورئـان بفـەوتێ، چـونکە ئەوکاتـە قورئـان هـەمووی لـە یـەك موصـحەفدا کۆنـەکرابووەوە، حـەزرەتی ئەبوبـەکر کـۆی کـردەوە بەوشـێوەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێنموی کردبوون، ئایـاتو سـورەتەکانی ڕیزبـەن کردن.

بەڵام جەمعكردنەوەی ئیمامی عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) لەبەر سەرهەڵدانی ئیختیلافی زۆر لە قیرائەتەكاندا بوو، تەنانەت هەندێ لە قورئانخوێن‌و مامۆستاكانی قورئان فێركردن بە لەهجەو زاراوەی خۆیان دەیانخوێندەوەو وێڕای ئەو هەموو زاراوە جیاجیایانەی باوبوو لەناو خێڵە عەرەبەكاندا، ئەمە سەری بۆ ئەوە كێشا هەندێ لەو مامۆستاو قورئان لەبەرانە هەندێكی تریان بە هەڵە بزانن‌و تۆمەتی لەڕێ دەرچوون‌و بەهەڵە خوێندنەوەی قورئانیان بخەنە پاڵ‌و بە پێچەوانەشەوە.

ئەوەبوو ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) ترسی لێ نیشت كە ئەم دیاردە تا بێ‌و بەرفراونترو گەورەتر بێ، بۆیە كەوتە خۆو لیژنەی پێك هێنا، ئەو صوحوفانەی حەزرەتی ئەبو بەكر (ڕەزای خودای لێ بێ) كۆی كردبوونەوە لە دوتوێی یەك موصحەفدا نووسییانەوەو سورەتەكانی ڕیزبەند كردن‌و لەناو هەموو زاراوەكاندا لۆغەتی قوڕیشی هەڵبژاردو بەیەك شێوە قیرائەت چەسپاندی، بۆیەش زاراوەی قوڕەیشی ئیختیار كرد چونكە قورئان بە زاراوەی ئەوان نازڵ بووە، هەرچەندە لەوەپێش ڕێگە درابوو بە زاراوەكانی تر (شەش قیرائەتەكان) بخوێندرێنەوە ئەم ڕێگە پێدانە بە مەبەستی لابردنی حەرج‌و ناخۆشی بوو لەبەردەم خوێنەراندا، كارئاسانی‌و بارسوكی بوو بۆیان لەسەرەتادا.

بەڵام ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) گەیشتە ئەو بڕوایە: كە پێویستی بە بارسوكی‌و كارئاسانی لەو بوارەدا نەماوەو پێویستە دەقی قورئان لەسەر یەك شێوە قیرائەت بچەسپێ‌و بە یەك زاراوەو لوغەت بخوێندرێتەوە.

الحارث المحاسبی: دەڵێ: مەشهورو باوە: كە ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) كۆكەرەوەی قورئانە، بەڵام ئەمە وانیە بەڵكوو ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) خەڵكی هەڵنا: كە قورئان بە یەك لوغەت‌و قیرائەت بخوێندرێتەوە، ئەمەش بە ویست‌و ئیختیاری خۆی‌و هاوەڵانی پێغەمبەر

(دروودی خودای لەسەر بێ) لە موهاجیرو ئەنصار، ئەمەش کاتێك بوو ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) ترسی بەرپابوونی فیتنەو دژایەتی نێوان هاوەڵان و قورئانخوێنانی لێ نیشتو هەستی کرد دووبەرەکیو ڕاجیایی لە خوێندنەوەی قورئاندا کەوتۆتە نێوان ئەهلی عێراقو شام لەشێوازی قیرائەتەکاندا بەڵام پێش ئەوکاتە مەصاحیفەکان بە هەر حەوت قیرائەتەکان دەخوێندران: کە لە واقیعدا قورئان بەو حەوت قیرائەتە نازڵ بووە.

وەڵێ ئەو کەسەی دەستپێشخەری کردووە بۆ کۆکردنەوەی قورئانو ئەنجامدانی، حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق بووە (ڕەزای خودای لێ بێ).[١]

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) بەم کارەی ئاسەواری فیتنەی بڕیەوەو مادەی خیلافو دووبەرەکی ڕیشەکێش کردو قورئانی پاراست لەوەی کەموکوڕیو زیادەو گۆڕانی تێدا پەیدا بێ، بۆ هەتا هەتاییو تا دونیا دونیا بێ ئەو نامە پیرۆزە بە پارێزراوی دەمێنێتەوەو خودا بۆخۆی وادەی داوە پارێزگاری بکاو نەهێڵێ گۆڕان ڕوی تێ بکا.

بێگومان هاوەڵان ڕاجیاییان هەیە دەربارەی ژمارەی ئەو موصحەفانەی حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) ناردنی بۆ هەرێمەکان

أ/ هەندێك وتوویانە ژمارەی موصحەفەکان حەوت موصحەف بووە، بۆ هەر یەکێ لە شارەکانی مەککەو بەصرەو کوفەو مەدینەو وڵاتی شامو یەمەنو بەحرەین نوسخەیەکی بۆ ناردوون.

ئیبنو ئەبو داود دەڵێ: بیستم ئەبو حاتەمی سەجستانی دەیگوت: حەوت نوسخە موصحەف نووسرانەوە، نێردران بۆ مەککەو بۆ شامو بۆ یەمەنو بۆ بەحرەینو بۆ بەصرەو بۆ کوفە، نوسخەیەکیش لە مەدینە هێڵدرایەوە.

---

[١] الإتقان ص١٣٣ – ١٣٤.

ب/ هەندێك گوتوویانە ژمارەیان چوار موصحەف بووە، ئاوا ناوزەد کراون موصحەفی عێراقی، موصحەفی شامی، موصحەفی میصری، موصحەفی ئیمام، یان موصحەفی بەصری‌و موصحەفی کوفی‌و موصحەفی شامی‌و موصحەفی ئیمام.

ئەبو عەمری (الدانی) لەکتێبی (المقنع فی رسم القرآن)دا دەڵێ: زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن: کە ئیمام عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) موصحەفەکانی نووسینەوە چوار نوسخە بوون، بۆ هەر هەرێمێك نوسخەیەکی نارد، نوسخەیەك بۆ کوفە، دانەیەك بۆ بەصرە، یەکێکی تر بۆ شام، نوسخەیەکیش لای خۆی هێشتەوە.

ج/ هەندێك گوتوویانە: ژمارەی موصحەفەکان پێنج بووە، ئیمامی سیوطی پێی وایە ئەمە مەشهورو باوە، ئەو صوحوفەی گێڕدرایەوە بۆ خاتو حەفصە ئەوەلای ئەو ُمایەوە تا لەژیاندا بوو، پاشان شۆردراو ئاسەواری نووسینەکەی نەما.

ڕایەکیش هەیە دەڵێ: مەڕوانی کوڕی الحکم بردی‌و سوتاندی.

ئەو موصحەفانەی ئیمام عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) نووسینیەوە ئەمڕۆ هیچیان نەماون، ئەوەی لە ئیبنو کەثیرەوە ڕیوایەت دەکرێ لە کتێبی (فضائل القرآن)دا ئەوەیە کە خۆی بەچاوی خۆی نوسخەیەکی لەو موصحەفانە لە مزگەوتی دیمەشق لەشام بینیوەو لەسەر پێستێك نووسرابووەوەو پێی وابوو پێستەکە پێستی حوشتر بووە، دەشگوترێ: موصحەفە شامی‌یەکە گواستراوەتەوە بۆ ئینگلتەرە دوای ئەوەی ماوەیەك لە (دار الکتب لنینگراد)دا لەژێر دەستی قەیصەرەکانی ڕۆمدا بووە، هەندێکیش دەڵێن نەخەیر ئەم موصحەفە لە مزگەوتی دیمەشقدا ماوەتەوە تاساڵی (١٣١٠)ی ز، ئەو ساڵە لە مزگەوتەکەدا سوتاوە.

# پوچەڵکردنەوەی چەند گومانێك

ناوە ناوە دڵکرمیو هەوەسبازو دژە قورئان گومانی جۆراوجۆر دەخەنە ڕوو دەیانەوێ بتمانە بە قورئان لاواز بکەنو گومان بخەنە سەر دیقەتو وردەکاری کۆکردنەوەی قورئان ئێمە لەم نووسینەدا هەندێ لەو گومانانە رادەنوێنینو رەدیان دەدەینەوە.

١- گوتوویانە قسەی ڕیوایەتکراو لە هاوەڵانەوە ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەو قورئانەی ئەمڕۆ بەدەست ئێمەوەیە شتێکی لێ فەوتاوەو بە تەواوی بە دەستی ئێمە نەگەیشتووە.

أ/ لە خاتو عائیشەوە ڕیوایەت کراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مزگەوتدا گوێی لێ بوو پیاوێك قورئانی دەخوێند فەرمووی: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً مِنْ سُورَةِ كَذَا».[1] لە ڕیوایەتێکدا «أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا».[2] لە ڕیوایەتێکدا «كُنْتُ أُنْسِيتُهَا».[3]

وەڵامی ئەم ئیشکالە دەدرێتەوە دەگوترێ: بیرکەوتنەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یان بەهۆی لەبیرچوونەوە پەڕاندبنی، گومان ناخاتە سەر کۆکردنەوەی قورئانو شك بۆ ئەوە بچێ لێی فەوتابێو هەمووی کۆنەکرابێتەوە، چونکە ئەو ڕیوایەتەی تەعبیری ئیسقاطو لێ پەڕینی تێدا هاتووە، ڕیوایەتێکی تر تەفسیری دەکاتەوە کە ڕستەی «كُنْتُ أُنْسِيتُهَا» ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە مەبەست بە (إسقاط) کردنی لەبیرچووونەوەیەتی، وەکوو وشەی (أذكرني) دەیگەیەنێ، لەبیرچوونەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دروستە بۆ شتێك زیان بە گەیاندنی پەیامەکەی نەگەیەنێ.

---

[1] أخرجه البخاري (٥٠٣٧).

[2] أخرجه البخاري (٢٦٥٥) ومسلم (١٨٣٧).

[3] أخرجه البخاري (٥٠٣٨) ومسلم )(١٨٣٧).

ئـەم ئایەتانــە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) لەبــەری کردبــوون، نووســەرەوەکانی وەحــی نووســیبوویاننەوە، هــاوەڵان لەبــەریان کردبوون‌و لەسـینەی خۆیـان هـەڵیان گرتبـوون، لەبـەرکردنیان‌و گەیانـدنیان گەیشتبووە ئاستی تەواتور، دەی دوای ئەم واقیعە چەسپاوە حاشا هەڵنـەگرە، لەبیرچوونەوەیان لەلایـەن پێغەمبـەرەوە (درودی خـودای لەسـەر بـێ) هـیچ کاریگەرییەکی نەبووەو نیـە لـەبواری وردەکاری‌و وردبینـی لـە کۆکردنـەوەی قورئاندا.

ئەمــەش ئەوپــەڕی ئــەو مانایەیــە حــەدیثــەکــە «کُنْــتُ أُنْــسِیتُهَا» دەیگەیەنێ، بۆیە قیرائەتی ئەم پیـاوە — کـە یەکێکـە لـەو قورئـان لەبەرانـەی ژمارەیـان گەیـشتۆتە ئاسـتی تـەواتور — وەبیرهێنانــەوە بــوو بــۆ پێغەمبــەر (درودی خودای لەسەر بێ) «لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا كَذَا وَكَذَا آيَةً».

ب/ خودا لە سورەتی (الأعلى)دا فەرموویـەتی ﴿سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى ، إِلَّا مَا شَاء اللَّهُ – الأعلى/٦ – ٧﴾ ئەم ئیستیثناءو چەرتکردنە ئـەوە دەگەیـەنێ: کـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) هەنـدێ ئایـەتی قورئـانی لـەبیر چووبنەوە!

وەڵامـی ئەمـە وا دەدرێتـەوە: کـە پـەروەردگار وادەی بـە پێغەمبـەری خۆی داوە (درودی خودای لەسەر بێ) : کە قورئانی فێر بکاو پێی لەبەر بکا دڵنیاشی کردەوە: کە ناهێڵێ لەیادی بچێتەوە ﴿سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى﴾ جا لەبـەر ئەوە ئایەتەکە وا دەخاتە زیهنەوە: کە ئەوە کارێك بێ لەسەر خـودا لازم بـێ، خـوداش بۆخـۆی فـاعیلی موختـارە ﴿لَـا يُـسْأَلُ عَمَّـا يَفْعَـلُ وَهُـمْ يُـسْأَلُونَ – الأنبياء/٢٣﴾ ئەم چەرتکردنەوەی هێنـا ﴿إِلَّا مَا شَاء اللَّهُ﴾ بـۆ ئـەوەی ئامـاژەو دەلالـەت بـێ لەســەر ئـەوە: ئـەم هەواڵـە، دەربـارەی فێرکردنـی پێغەمبــەر (درودی خـودای لەســەر بـێ) بـۆ قورئـان‌و دڵنیـاکردنی لـەوە: کـە لـەیادی

ناچێتەوە، لە دەرەوەی ئیرادەو دەسەڵاتی خودادا نیە، چونکە هیچ شتێك بۆ خودا مەحاڵ نیەو لەژێر دەسەڵاتی ئەو دەرناچێ.

مامۆستا شێخ موحەممەد عەبدە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: لە کاتێکدا وادەی خودا بەشێوەی (تأبیدو لزوم) بۆ هەتا هەتاییو پێویستبوونی دەگەیانـد، ئەمـەش وای دەخـستە وەهمـەوە کـە دەسـەڵاتی خـودا توانـای پێچەوانەکەی نیەو لە دەرەوەی ئیرادەی زاتی پاکیدایە.

ئەم چەرتکردنە ﴿إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ﴾ی هێناو ئەوەی گەیانـد: کە ئەگەر خودا بیەوێ شتێکت لەم قورئانە لەیاد بەرێتەوە هیچ هێزێك نیە بتوانێ ببێتە لەمپەڕو نەهێڵێ لە یادت بباتەوە، مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە ڕاستەوخۆ نەفیی لەبیرچوونەوەی بەشێك لە قورئان بکا لەلایەن پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو چۆن پیاو بە هاوەڵەکەی بڵێ: ئەتۆ شەریكو هاوبەشمی لە هەموو ئەو سامانەی هەمە مەگەر ئەوەی خودا مەیلی لێ نەبێ، ئەو پیاوە بەم قسەی مەبەستی ئەوە نیە شتێك لە ماڵەکەی دەربهاوێو بڵێ تۆ لەوەدا شەریکم نی.

ئەم دەستەواژەیە بەکارهێنانی کەمە بۆ گەیاندنی مانای نەفی، هەر لەسەر ئەم شێوازەیە: کە لە سورەتی (هود)دا چەرتکردنو ئیستیثناء هاتووە: کە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاء رَبُّكَ عَطَاء غَيْرَ مَجْذُوذٍ – هود/١٠٨﴾ واتە: عەتاو بەخششێکی نەبراوە، دەی ئەم ئیستیثنائەی لە ئایەتەکەدا هاتووە بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەوەیە: کە ئەم مانەوەیەی بەختەوەرانو خوداپەرستان لە بەهەشتا بۆ هەتا هەتایەو بێ برانەوەو کۆتایی هاتنی، بەهۆی کەرەمو بەخشندەیی خودایە نەك لەڕووی ئەوەوە بێ: کە لەسەری پێویست بێو دەبێ وابکا، تەنانەت هەرکاتێ بیەوێ ئەوەی بەخشیوەیەتی بیگرێتەوە هیچ لەمپەڕو مانیعێك نیە بتوانێ نەهێڵێ ویستەکەی بینێتە دی!!

ئەوەی نەقڵ کراوە: گوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی لە قورئان لەبیر چۆتەوەو بیری کەوتۆتەوە، ئەوە ئەگەر ڕاست بێو ڕوویدا بێ، لە غەیری بواری قورئاندا بووە، لە دەرەوەی ئەو ئەحکامانەدا بووە: کە خودا فەرمانی پێکردووە بە خەڵکی ڕابگەیەنێ بە تەئکید هەرچی بگوترێ: لەو بوارانەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتی لەبیر چۆتەوە لە چەواشەکاری بێدینان‌و مولحیدانەو گواستراوەتەوە بۆ سەر دڵ‌و دەرونی موسوڵمانانی بێ ئاگاو گێل، پێغەمبەریان (دروودی خودای لەسەر بێ) پێ تۆمەتبار کردووە، هەرگیز شیاو نیە بۆ کەسێك ڕێزو قەدری خاوەنی شەریعەت (پێغەمبەر) بزانێ‌و ئیمانی بە قورئان هەبێ، دڵی بڕوا بدا شتێکی لەو جۆرەی وەکوو لەبیرچوونەوەی بەشێك لە قورئان پاڵ ئەو پێغەمبەرە بدا!!

٢- وتوویانە: قورئان شتی وای تێدا نووسراوە کە لە واقیعدا قورئان نیە، بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە گوایە ئیبنو مەسعوود ئینکاری ئەوەی کردووە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ لە قورئان بن!!

وەڵامی ئەمە دراوەتەوە: کە ئەوەی لە ئیبنو مەسعود نەقڵ کراوە صەحیح نیەو درۆیەکی شاخدارە، ئەو ڕیوایەتە پێچەوانەی کۆڕای ئوممەتی ئیسلامە.

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی (المهذب)دا دەڵێ: موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە ﴿قُلْ أَعُوذُ﴾ەکان‌و فاتیحە بەشێکن لە قورئان، هەرکەسێك ئینکاری شتێك بکا لەمانەو پێی وابێ لە قورئان نین پێی کافر دەبێ.

ئەوەی لە ئیبنو مەسعود نەقڵ کراوە بەتاڵ‌و پوچ‌و بێ بنەمایەو ڕاست نیە، ئیبنو حەزم گوتوویەتی ئەمە درۆیەکی شاخدارە بە دەم ئیبنو مەسعوودەوە هەڵبەستراوەو ڕیوایەتێکی مەوضوع‌و بێ بنەمایە، ئەگەر لە فەرزێکدا ئیبنو مەسعود ئەمەشی گوتبێ ئەوەی ئیحتیمالی هەیە ئەوەیە:

ئیبنو مەسعود بۆ خۆی ﴿قُلْ أَعُـوذُ﴾وەكانی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەبیستبن‌و دەربارەیان هەڵوێستەی كردبێ.

ئاشكراشە ئینكاریكردنی ئیبنو مەسعود ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامی پێ هەڵناوەشێتەوە: كە كە كۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە سورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ لە قورئانی موتەواتەرن، هەر ئەم وەڵامە دەكرێ بكرێتە وەڵامی ئەوانەی دەڵێن موصحەفی ئیبنو مەسعود سورەتی (الفاتحە)ی تێدا نەبووە، گومانیش لەوەدا نیە فاتیحە ئەممول قورئانەو هیچ كەسێك گومانی لە قورئانیبوونی نەبووەو نیە.

٣- كۆمەڵێك لە شیعە توندڕەوەكان پێیان وایە ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان (رەزای خودایان لێ بێ) سێ خەلیفە ڕاشیدینەكان گۆڕانكارییان لە قورئاندا كردووە، بڕێ ئایەت‌و سورەتیان لێ لابردووە، دەڵێن ئەوانە لە سورەتی (النحل)دا وشەی ﴿أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ﴾یان گۆڕیوە لە ئەصڵدا (أئمة هي أربى من أئمتكم) بووەو گۆڕیویانە بەوەی ئێستا لە قورئاندا نووسراوە.

هەروەها ئەو سەرلێ شێواوانە دەڵێن: ئەو سێ كەسە (ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان) (رەزای خودایان لێ بێ) چەند ئایەتێكیان لە سورەتی (الأحزاب) لابردووە: كە دەربارەی (فەضائیلی ئەهلی بەیت) نازڵبوون، دەڵێن: سورەتی (الأحزاب) پێش ئەوەی ئەو ئایەتانەی لێ لابرێن بە ئەندازەی سورەتی (الأنعام) درێژ بووە، هەروا دەڵێن: لە قورئاندا سورەتێك هەبووە بەناوی (سورة الولایة) سەرلەبەر هەموویان لە قورئاندا لابردووە.

لە وەڵامی ئەو شیعە توندڕەوانەدا دەگوترێ: ئەم قسە بێ سەروبەرانەتان پوچ‌و بێ بنەمان‌و هیچ سەنەدو رشتەیەك پشتگیریتان ناكاو داوایەكی هەڵبەستراوی بێ بەڵگەی لە پوچ پوچترە، قسەیەكی بێ عەقڵانەی گیلانەیەو جێگای پێكەنینە، بێگومان هەندێ لە زانایانی شیعە مەزهەب خۆیان لەم قسەو قسەڵۆكانەی شیعە توندڕەوەكان بێ بەری كردووە، ئەو

وتـەو فەرمایـشتانەی لـە ئیمـام عـەلیـیـەوە نـەقڵ کـراون‌و شـیعە خۆیـان بـە شــوێنکەوتەی ئــەو دەزانــن پێــچەوانەی ئــەم راو بۆچــوونانەی شــیعە گومڕابووەکانە.

بەڵگەی ئەوە کە کۆڕا هەیە لەسەر تەواتوری ئەم قورئانەی ئێستا لە دووتوێی بەرگدا بەدەست ئێمەوەیە‌و دەیخوێنین، ئەو ڕیوایەتە: کە لە خودی ئیمـام عـەلیـیـەوە ڕیوایـەت کـراوە‌و دەربـارەی جەمعکردنـەوەی ئـەبو بـەکر فەرموویەتی (أعظم الناس أجراً في المصاحف أبوبكر، رحمه الله على أبى بكر، هو أول من جمع كتاب الله) خێری گەورە‌و پاداشی مـەزن بـۆ حـەزرەتی ئـەبو بەکرە‌و پاداشی هەر گەورە بۆ ئەوە‌و پێی بەختەوەر بووە، ڕەحمەتی خـودای لێ بێ، ئەو یەکەم کەسە: کە قورئانی کۆکردەوە.

دەربارەی کۆکردنـەوە‌و نووسینەوەی قورئـانیش لەلایـەن عوسمانـەوە فەرموویەتی (يامعشر الناس: أتقوا الله، وأياكم والغلوّ في عثمان، وقولكم حراق المصاحف، فوالله ماحرقها إلا عـن ملأمنـا أصحاب رسـول الله — صـلى الله عليـه وسـلم) ئـەی خەڵکینـە! تـەقوای خـودا بکـەن خۆتـان لـە عـەزابی بەئێـشی بپـارێزن، ئاگاتـان لـەخۆتان بـێ‌و دەربـارەی حـەزرەتی عوسمـان زیـدەڕۆیی مەکـەن ناسـناوی ناشـیرینی وەکـوو (قورئـان سـوتێن) مەدەنـە پـاڵی، سـوێند بەخودا قورئانەکانی نەسوتاندن ئیللا دوای بڕیاردان‌و ڕەزامەندی کۆمـەڵێکی زۆر لە ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە هەموومان پێمـان کـارێکی بـاش‌و واجب بـوو، دەبـو بکرایـە‌و نـەکردنی زیـانی زۆری بـە موسـوڵمانان دەگەیانـد، ئـەمجار وتـی (لوكنـت الـوالي وقـت عثمـان لفعلـت فـى المصاحف مثل الذى فعل عثمان) ئەگەر من لەجێی عوسمان خەلیفە بوومایـە ئەوکاتەی عوسمان خەلیفە بوو، هەمان هەڵوێستی عوسمانم دەبـوو دەربـارەی مەصاحیف‌و هەمان کاریشم دەکرد.

دەی ئەم وتە بەپێزو بەنرخەی کە لە خودی ئیمام عەلیـەوە نـەقڵ کراوە، دەمی ئەوانە دەبەستێ کە ئەم بوختانە گەورەیە بۆ سێ خەلیفە بەڕێزەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵدەبەستن و بانگەشـەی بۆ دەکەن، زمانی ئەوانە دەبڕێ: کەپێیان وایە شیعەی ئەون و یارمەتیدەرنی، چەنە دەدەن بەشتێك: کە نازانن چیەو چۆنە؟ وڕێنـە دەکەن و نازانن چۆن شیعەیەکی ئەون، ئەو لێیان بەرییەو خوداش لێیان ناڕازی!!

## ڕیزکردنی ئایەت و سورەتەکان

قورئانی پیرۆز پێکهاتووە لە سورەت و ئایەت، هەیانە کورتـەو هەیانـە درێژ، ئایەت: ڕستەیەك، یـان زیـاتر لـە کـەلامی پـەروەردگار پێـك دێنـێ و بـە چەند ئایەتێك سورەتیان لێ پێك دێ، سورەت: کۆمەڵێك ئایـاتی قورئـانن: کـە سەرەتاو بڕانەوەی تایبەتیان هەیە.

ڕیزکردنی ئایەتەکان لە قورئانی پیرۆزدا تەوقیفی‌یەو بە ڕەهنومایی پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕیزبەنـدو دابەشکراون، هەنـدێ لـە زانایـان لەوانـە زەرکەشـی لـە (البرهـان)داو ئـەبو جەعفـەر لـە (مناسـباتە)دا ئاماژەیان بـەوە کـردووە کـە کـۆڕای زانایـانی لەسـەرەو هـیچ خیلافێکی تێدا نابینـدرێ، ئـەبو جەعفـەر دەڵـێ: ڕیزبەنـدیکردنی ئایەتـەکانی قورئـان لـە سورەتەکاندا بە فەرمان و ڕەهنومایی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) خۆی بووە، لەمـەدا موسوڵمانان یەکدەنگن و هـیچ خیلافێکیـان نیـە، شـێخی سیوطیش هەمان مانای دووبارە کردۆتەوەو وتوویـەتی: کـۆڕای موسـوڵمانان و دەقـی موتـەرادیف ئامـاژە بـەوە دەکـەن: کـە ڕیزبەنـدی ئایەتـەکان لـەناو سورەتەکاندا تەوقیفی‌یەو بە ڕەهنومایی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) بووەو شوبهەو گومانی تێدا نیە.

بێگومان حەزرەتی جوبرائیل ئایەت ئایەتو بەش بەش قورئانی دەهێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شارەزایشی دەکرد بۆ ئەوەی لە کوێی قورئاندا دای بنێو بیخاتە کوێی سورەتەکەوە، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە نووسەرەوانی نیگا دەکرد بیخەنە جێی خۆیو دەیفەرموو: ئەم ئایەتانە بخەنە فلان سورەت کە باسی فلان شتو فلان شتی تێدایە.

یان فەرموویەتی: فلان ئایەت بخەنە فلان سورەتو لە فلان شوێنیدا دایبنێن، ئەمە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوای لێ ڕیوایەت دەکەن، ئەوە عوسمانی ئەبولعاص دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووم لە ناکاوێك چاوی گێڕاو دوایی ئاراستەی کرد، پاشان فەرمووی: « أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ فَأَمَرَنِي أَنْ أَضَعَ هَذِهِ الآيَةَ بِهَذَا الْمَوْضِعِ مِنْ هَذِهِ السُّورَةِ» جوبرائیل هاتە لامو فەرمانی پێکردم ئەم ئایەتە بخەمە ئەم شوێنەی ئەم سورەتەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ – النحل/٩٠﴾.

ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) لەکاتی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا لەسەر هەموو ئایەتێك لە سورەتەکەیدا لەناو قورئان هەڵوێستەی دەکردو سەرنجی دەدایە، تەنانەت ئەگەر ئایەتەکە حوکمەکەشی مەنسوخ بوایە، نەی دەگۆڕی.

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە: کە نووسینەوەی قورئان بەم ڕیزبەندیو شێوەیەی ئێستای تەوقیفییە.

ئیبنو زوبەیر دەڵێ: بە عوسمانم گوت: ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ –

البقرة/٢٤٠﴾ ئایەتێکی تر نەسخی کردۆتەوە، ئەدی بۆ دەینووسیەوە؟ یان بۆ بە نووسراوی دەیهێڵیتەوەو دەشزانی نەسخ کراوەتەوە؟ وتی ئەی کوڕی برام! دڵنیابە هیچ شتێك لە قورئان ناگۆڕمو هەمووی لەشوێنی خۆی دەهێڵمەوە.[1]

فەرمووده هاتووه لەسەر فەضڵو گەورەیی چەند ئایەتێك لە سورەتەکاندا بە خودی خۆیان، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە ڕیزبەندی ئەم ئایەتانە تەوقیفی بێ، چونکە ئەگەر دروست بوایە جێ گۆڕکێیان پێ بکرێ حەدیثەکانیان بەسەردا تەطبیق نەدەکرا.

لە ئەبو دەردائەوە بە مەرفوعی ڕیوایەتکراوە «مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ».[2] لە وتەیەکی تردا «مَنْ قَرَأَ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ سُورَةِ الكَهْفِ».[3] هەروەها ڕیوایەتی تر هاتووە بۆ ئایەتێکی تایبەتی شوێنی تایبەتی دیاری کردووە.

لە عومەرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: لە هیچ شتێك پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکردووە هێندەی دەربارەی (الكلالة) پرسیارم لێ کردووە، هەتا پرسیار کردنەکەم گەیشتە ئەو حاڵە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەی موبارەکی لە سینگم کوتاو فەرمووی: «يَا عُمَرُ أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ».[4]

ئەوەش چەسپاوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆرێك لە سورەتەکانی قورئانی لەنوێژدا، یان لە وتاری هەینیدا خوێندەوە بەو تەرتیبو ڕیزبەندییەی ئێستاو وەکوو سورەتی (البقرة – آل عمران –

---

[1] رواه البخاري/٤٥٣٠.

[2] مسلم/١٨٨٣.

[3] اخرجه مسلم/١٨٨٤ وأحمد/٢٧٥١٦.

[4] اخرجه مسلم/١٢٥٨

النساء) چەسپاویشە کە لە نوێژی مەغریبدا سورەتی (الأعراف)ی خوێندووە.[١]

هەروا ڕیوایەتکراوە: کە لەنوێژی بەیانی ڕۆژانی جومعەدا ﴿الر، تَنزِيلُ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ - السجدة/١ - ٢﴾ ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا - الإنسان/١﴾ خوێندووە، سورەتی (ق)ی لە وتاری جومعەدا خوێندووە،[٢] سورەتی (الجمعة)و (المنافقون)ی لە نوێژی جومعەدا خوێندووە.[٣]

حەزرەتی جوبرائیل هەموو ساڵێ لە ڕەمەزاندا جارێك قورئانی نازڵبووی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەور دەکردەوە، بەرامبەریان دەکرد، لە ئاخر ساڵی تەمەنیدا دووجار بۆی خوێندەوەو بەرامبەر کردنو گوێ لێ گرتنی بۆ ئەنجام دا.[٤]

ئەم بەراورد کردنو خوێندنەوەی دواجاری قورئان، لەسەر ئەم شێوە ڕیزبەندیو تەرتیبە بووە: کە ئێستا هەیە، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە: کە تەرتیبی ئایەتەکانی قورئان بەم شێوەیەی ئێستا هەیەو لەبەردەستی موسوڵماناندایە تەوقیفیەو بە ڕەهنومایی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنجام دراوە هیچ گومان لەوەدا نیە.

شێخی سیوطی دوای ئەوەی هەندێ فەرموودەی هێناون کە دەربارەی چەند سورەتێکی تایبەتی ڕیوایەتکراون دەڵێ: خوێندنەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم سورەتانە بە بەرچاوی هاوەڵانەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ڕیزبەندی ئایەتەکانی ئەو سورەتانە تەوقیفیە،

---

[١] بوخاری/٧٦٤.

[٢] بوخاری/٨٩١.

[٣] مسلم/٢٠٢٦.

[٤] أخرجه البخاری/٤٩٩٨.

هـەرگیز هـاوەڵان ڕێگـەیان بـەخۆیان نـەداوە تـەرتیبو ڕیزبەندییـەك لـە پێغەمبەریان بیستبێ پاشگوێی بخەنو بۆخۆیان تـەرتیبێکی تـری بـۆ ئـەنجام بـدەنو بـە پێـچەوانەی تـەرتیبی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بیخوێننەوە، ئەمە ڕاستییەکی بەڵگە نەویستەو گەیشتۆتە پلەی تەواتور.[1]

## تەرتیبی سورەتەکانی قورئان

**زانایانی ئیسلام راجیاییان هەیە دەربارەی تەرتیبی سورەتەکان:**

أ/ هەندێ گوتوویانە تەوقیفییەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) بۆخـۆی سـەروکاری کـردووە، جوبرائیـل چـۆن بـە فـەرمانی خـودا ڕەهنومـایی کـردووە، ئـەویش ئـاوا بـە هـاوەڵانی گەیانـدووەو ئـەوانیش تەنفیزیان کردووە، کەوابێ قورئان لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) سورەتەکانی تـەرتیب کراون، وەکوو چۆن ئایەتـەکانی ڕیزبەنـد کـراون بـەم شـێوەی ئـەمڕۆ لەبەردەسـتی ئێمەدایـە: کـە ئـەویش تـەرتیبی موصحەفی ئیمام عوسمانـەو کـەس نـەبووە لـە هاوەڵان دژی بوەسـتێو بـەو تەرتیبە ڕازی نەبێ، بەجۆرێك دەتوانین بڵێین: کۆڕای هاوەڵانی لەسەر بووە.

ئـەوەی پـشتگیری ئـەم ڕایـە دەکـا ئەوەیـە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) هەنـدی سورەتی لـە نوێـژدا بـەڕیز خوێنـدن: کـە ئیبنـو ئەبی شەیبە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دوو سورەتی لە (المفصل)ەکان لە ڕکاتێکدا دەخوێند.

بوخـاری لـە ئیبنـو مەسـعوودەوە ڕیوایـەتی کـردووە کـە دەربـارەی سورەتی (بنی إسرائيل – الكهف – مريم – طه) وتوویەتی: ئەوانە لە شتە هەر بـە نرخـەکانن، ئەوانـە سامانو ماڵـە نـاوازە لـە نـرخ نـەهاتووی مـنن، ئـیتر سورەتەکانی ناوهێنان بەو تەرتیبەی ئێستا لە موصحەفا جێگیر بووە.

---

[1] بڕوانە الإتقان/١٣٥.

له ڕێگەی ئیبنو وەهەبەوە لە سولەیمانی کوڕی بیلالەوە ڕیوایەت کراوە گوتوویەتی: گوێم لێ بوو ڕەبیعە پرسیاری لێ کرا وتی: بۆچی (البقرة)و (آل عمران) خراونە سەرەتای قورئانەوە؟ لە کاتێکدا پێش هەشتاو ئەوەندە سورەتی مەککەیی نازڵ بوون، ئەم دوو سورەتەش لە مەدینە نازڵ بوون؟! لە وەڵامدا ڕەبیعە وتی: ئەو دوو سورەتە پێش خراونو قورئان ڕێکخراوە بەگوێرەی زانیاری ئەوکەسەی بەو شێوە ڕێکی خستووە، ئەمە لەو شتانەیە لەسەری ڕادەوەستیو تەوفیقیيە، پابەندی دەبیو پرسیاری لێ ناکەی.

ئیبنو لحەصار دەڵێ: تەرتیبی سورەتەکانی قورئانو دانانی ئایەتەکان لەناو سورەتەکاندا لەڕێگەی وەحیو نیگاوە بووە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە نووسەرەوانی نیگای فەرمووە «ضَعُوا الآيَةَ كَذَا فِي موضع كَذَا» فلان ئایەت لە فلان شوێن جێگیر بکەن.

بێگومان موسوڵمانان دڵنیاییو یەقینیان بۆ پەیدا بووە بەم تەرتیبو ڕیزبەندییەی بە نەقڵی موتەواتەر لە خوێندنەوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چین دوا چین کە بە ئێمە گەیشتووە، سەرەڕای ئەمەش کۆڕای هاوەڵان دامەزراوە لەسەر ڕیزکردنی سورەتەکان بەم شێوەی ئێستا لە موصحەفدایە.

ب/ بڕێك لە زانایان وتوویانە تەرتیب کردنی سورەتەکان بە ئیجتیهادو ڕای هاوەڵان بووەو تەوقیفی نیە، بە بەڵگەی هەبوونی ئیختیلاف لەبارەی تەرتیبەوە لەناو موصحەفی هاوەڵان خۆیاندا، ئەوەتا لە موصحەفی ئیمام عەلی تەرتیبی سورەتەکان بەپێی نازڵبوونیان بووە، سەرەتای موصحەفەکەی بە سورەتی (إقرأ) دەستی پێکردووە، پاشان (المدثر) ئەمجار (ن والقلم) دوای ئەو (المزمل)و بەوشێوە تا کۆتایی سورەتەکان بە مەککیو مەدینەییيەوە.

موصـحەفی ئیبنـو مەسـعود سـەرەتا بـە سـورەتی (البقـرة) دەسـتی پێکردووە، ئەمجار (النساء) پاشان (آل عمران).

سـەرەتای موصـحەفی ئوبـەی سورتی (الفاتحـه) بـووە، پاشـان (البقـرة) پاشان (النساء) ئەمجار (آل عمران).

لەلایەکی ترەوە ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆیو لـە بـاوکی بـێ) دەڵێ: بە ئیمام عوسمانم گوت: چی وای لەئێوە کرد سورەتی (الأنفال) کـە لـە پێڕی (المثانی)یە سورەتی (براءة) کە لەپێڕی (میئین)خستوتاننە پەنا یەکـەوەو لەنێوانیانـدا دێـڕی ﴿بِسْمِ اللّـهِ الـرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ﴾تـان نەنووسـیوەو لـەپێڕی (السبع الطـوال)دا داتـان نـاوە؟ لـە وەڵامـدا وتـی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) سورەتو ئایاتی زۆری بـۆ سـەر نـازڵ دەبـوون، جا کـە شـتێکی لـە قورئـان بـۆ نـازڵ دەبـوو بـانگی لـە یـەکێ لـە نووسـەرەوانی نیگـا دەکـرد پێـی دەفەرموو: «ضَعُوا هَذِهِ الآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا» ئـەم ئایەتـە بخەنە فلاَن سورەت کە باسی ئەوەو ئەوەی تێدایە.

سـورەتی (الأنفـال) لـەو سـورەتانەیە لەسـەرەتای عەهـدی مەدینـەدا نازڵبوون، سورەتی (بـراءة)یـش کۆتـا سـورەتی قورئانـە لـەبارەی نازڵبوونـەوە، چیرۆکو ڕوداوی لەخۆی گرتوون، دەشوبهایە چیرۆکو ڕوداوی (الأنفـال) مـن وام دەزانی گومانم بۆ ئەوە دەچوو کە (براءة) بەشێکی ئەنفال بێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) لـەدونیا دەرچـوو بـۆی ڕوون نەکردینـەوە ئـاخۆ (بـراءة) بەشـێکی (الأنفـال)ە یـان نـا؟ لەبـەر ئـەوە خـستمنە پـەنا یەکـەوەو لەنێوانیاندا دێڕی ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ﴾م نەنووسـیو لـەپێڕی (الـسبع الطوال)دا جێگیرم کرد.

ج/ بـڕێ لـە زانایـان وتوویانــە هەنـدێ سـورەتی قورئـان تـەرتیب کردنەکـەیان تـەوقیفی‌یـەو هەنـدێکی تریـان بـە ئیجتیهـادو رای هـاوەڵان ڕیزکـراون، چـونکە هەنـدی ڕیوایـەت هـەن ئـەوە دەگەیـەنن کـە بـڕێ لـە

سورەتەکان لەسەردەمی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕیزبەند کراون.

ئەوەتا ڕیوایەتی صەریح‌و صەحیح هەیە: کە تەرتیب کردنی سورەتەکانی (السبع الطوال)و (الحواميم)و (المفصل)ەکان لە ژیانی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) بە ڕەهنومایی‌و ئاگاداری ئەو ڕیزکراون.

هەروا ڕیوایەتکراوە کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ».[١]

هەروەها ڕیوایەت کراوە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە دەچووە سەر جێگای نووستنی هەموو شەوێك دوو دەستی پان دەکردنەوەو دەیخستنە پەنا یەك‌و فووی لێ دەکردن‌و سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾و ﴿المعوذتين﴾ی دەخوێند.[٢]

ئیبنو حەجەر دەڵێ: تەرتیبی بڕێ سورەت لەگەڵ هەندێکی تریان، یان زۆربەی سورەتەکان هیچ مانیعێك نیە تەوقیفی بن، بەلگەشی هێناوەتەوە بە حەدیثی (حذيفة الثقفی): کە تێیدا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) پێی گوتین «طَرَأَ عَلَيَّ حِزْبٌ مِنَ الْقُرْآنِ فَأَرَدْتُ أَنْ لاَ أَخْرُجَ حَتَّى أَقْضِيَهُ» خوێندنی حیزبێکی قورئانم هاتە پێش ویستم نەیەم بۆلاتان تا هەمووی نەخوێنم، جا ئەوس کە ڕاوی فەرموودەکەیە دەڵێ: لە هاوەڵانی پێغەمبەرم پرسیار کرد، ئێوە چۆن قورئان دەکەن بە حیزب حیزب؟ وتیان سێ سورەت، پێنج سورەت، حەوت سورەت، نۆ سورەت، یانزە سورەت، سیانزە سورەت، ئاوا دابەشی دەکەین بەسەر حیزبەکاندا، حیزبی (المفصل) لە سورەتی (ق)وە تا کۆتایی قورئانە.[٣]

---

[١] اخرجه مسلم/١٨٦٠ من حديث أبى أمامة الباهلى.

[٢] البخاری/٥٠١٧ من حديث عائيشة.

[٣] بڕوانە الإتقان ص١١٩ دار إبن حزم/٢٠٨ سنن أبو داود/١٣٩٣.

ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەم ڕیوایەتە بەڵگەی ئەوەیە: تەرتیبی سورەتەکان بەو شێوەی کە ئێستا لە قورئانی بەردەستی ئێمەدا چەسپاوە، لە ڕۆژگاری ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) تەرتیب کرابێ.

ئەمجار ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئیحتیمالی ئەوە هەیە ئەوەی ئەوکاتە تەرتیب کراوە حیزبی (المفصل) بووبێو بەس! جا کە ئێمە بێین موناقەشەی ئەم سێ ڕایە بکەین بۆمان دەردەکەوێ:

کە ڕای دووەم: کە پێی وایە تەرتیبی سورەتەکانی قورئان بە ئیجتیهادی هاوەڵان خۆیان بووە، ڕایەکی بێ بەڵگەیەو پشتی بە هیچ شتێکی بڕوا پێکراو نەبەستووە.

ئەمجار ئیجتیهاد کردنی هاوەڵان بۆ تەرتیب کردنی موصحەفی تایبەت بەخۆیان، ئەوە ئیختیارو حەزو هەڵبژاردنی خۆیان بووەو کاتێك بووە کە قورئان کۆنەکرابووەوە ڕیزبەندی سورەتو ئایەتەکانی نەکرابوو، کە لەسەردەمی ئیمام عوسماندا قورئان کۆکرایەوەو تەرتیبی ئایەتو سورەتەکانی کراو هەموو هاوەڵان کۆڕایان لەسەر ئەوە هەبووە، ئەوان وازیان لە موصحەفە تایبەتەکانی خۆیان هێنا، ئەگەر تەرتیبەکەیان لە ڕێگەی ئیجتیهادەوە بوایە پێیەوە پابەند دەبوونو وازیان لە موصحەفەکانیان نەدەهێنا.

ئەو حەدیشەی دەربارەی سورەتی (الأنفال)و (التوبة) لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت کراوە لە هەموو سەنەدەکانیدا ڕیوایەتەکان دەچنەوە سەر (یزید الفارسی) ئەمیش بوخاری لە پێڕی (الضعفاء)دا دایناوە، لەهەمان کاتدا ئەو ڕیوایەتە گومان دەخاتە سەر چەسپاندنی ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ لە سەرەتای سورەتەکاندا، چونکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) بە ڕای خۆی جاری وابووە نووسیویەتیو جاری وایش بووە تەرکی کردووە، بۆیە شێخ ئەحمەد شاکر کە تەعلیقی

لەسەر موسنەدی ئیمام ئەحمەد نووسیوە دەربارەی ئەم ڕیوایەتە وتویەتی (إنه حديث لا أصل له) ئەم حەدیثە هیچ ئەصڵو بنەمایەکی نیە، هەر ئەوەندەی تێدایە: کە تەرتیب لەنێوان ئەم دوو سورەتەدا نیەو بەس![1]

ڕای سێیەم کە دەڵێ: برێ سورەت تەرتیبەکەیان تەوقیفیـیە برێکیان ئیجتیهادییە، ئەمیش بەڵگەکانی هەموو پشت بەو دەقانە دەبەستن کە دەبنە بەڵگەو ئامـاژە بـۆ ئـەو سـورەتانەی تەرتیبەکـەیان تـەوقیفیـیـە، بـۆ ئـەو سورەتانەی گوایە تەرتیبەکەیان ئیجتیهادییە هیچ بەڵگەیەکیان بـە دەستەوە نیە ئەوە بگەیەنێ: کە ڕیزبەندییەکـەیان ئیجتیهادییـە چونکە چەسپاندنی بەشە تەوقیفیـیەکە بە لگەی ئـەوە ناگەیـەنێ کـە بەشـەکەی تـر ئیجتیهادی بێ، وێڕای ئەوە: کە ئەم بەشە زۆر کەمیشە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە تەرتیبی سـورەتەکانیش تـەوقیفیـیـەو وەکوو تەرتیبی ئایەتەکان.

ئەبوبـەکری الأنبـاری دەڵـێ: پـەروەردگار هـەموو قورئـانی بـە یـەك وەجبە نازڵ کرد بۆ ئاسمانی دونیا، پاشان لـە مـاوەی بیـستو ئەوەنـدە ساڵ بەش بەش نازڵی کرد بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەبوو سورەت نازڵ دەبوو بۆ وەڵامی پرسیارو زانینی هەواڵێك، حەزرەتی جوبرائیل شـوێنی ئایـەتو سـورەتەکانی دیـاری دەکـرد، کـەوابێ ڕیزکردنـی سـورەتەکان وەکـوو ڕیزکردنــی ئایــاتو پیتــەکان هــەمووی بــە ڕەهنومــاییو فــەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووە.

---

[1] ڕیوایەت کراوە: کە ﴿بِسْمِ اللّـهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ لـە موصحەفی ئیبنو مەسعوودا لەپێشەوەی سـورەتی (بـراءة)دا هـەبووە لـە (المستدرك)ی حـاکم حـەدیثی ژمـارە (٣٢٧٣) ئەوەی تێدایە گوایە پرسیار لە عەلی کراوە بۆ سورەتی (براءة) لە پێشیەوە ﴿بِسْمِ اللّـهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ نیە؟ وتویەتی (لإنها أمان براءة نزلت بالسيف).

کەسێك سورەتێك لەشوێنی بخاتە پێشەوە، یان دوای بخا ئەوە بێگومان شێوازی قورئانی تێکداوە، الكرمانی لە کتێبی (البرهان)دا وتوویەتی: تەرتیبی سورەتەکان لەلای خودا خۆی لە (لەوحولەحفوظ)دا وەکوو ئەم تەرتیبەی ئێرە وایە، لەسەر ئەم بنەمایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سالآنە چی لا کۆبوایەوە لە قورئانی نازلکراو بۆ حەزرەتی جوبرائیلی دەخوێندەوەو موقابەلەی دەکرد، لە سالّی کۆتای تەمەنیدا دووجار هەموو قورئانی بۆ خوێندۆتەوە، کۆتا ئایەتێك نازلّ بووبێ ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ – البقرة/٢٨١﴾ جوبرائیل فەرمانی پێ کرد: کە لەنێوان ئایەتی (ربا)و ئایەتی (الدین) دایبنێ.[١]

## سورەتەکانی قورئان و ئایەتەکانی

**سورەتەکانی قورئان چوار جۆرن:**

١- (الطوال)، ٢- (المیئین)، ٣- (المثانی)، ٤- (المفصل).

**بەکورتی رای پەسەند لە بارەیانەوە دەنوێنین:-**

١- ئەو سورەتانەی پێیان دەگوترێ: (الطوال) حەوت سورەتن (البقرة – آل عمران – النساء – المائدة – الأنعام – الأعراف) حەوتەم هەندێ پێیان وایە (الأنفال و براءة) پێکەوە حەوتەمی (الطوال)ە چونکە ناوانیان بە ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ نەکراوە، هەندێ پێیان وایە سورەتی (یونس)ە.

٢- سورەتە (المئون)ەکان ئەوانەی ئایەتەکانیان دەگەنە سەد، یان نزیك لەو ژمارە.

---

[١] بڕوانە: الإتقان/١٣٧ – ١٣٨.

٣- (المثاني) ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەكانیان كەمترە لە ئایاتی (المئون) بۆیەش پێیان دەگوترێ: (المثانی) چونكە لە خوێندنەوەدا دووبارە دەكرێنەوە، زیاتر لە سورەتەكانی (الطوال)و (المئون) دەخوێندرێنەوە.

٤- (المفصل) ئەم جۆرەی سورەتەكانی قورئان لە سورەتی (ق) دەست پێ دەكا تا كۆتایی قورئان، هەندێك دەڵێن لە (الحجرات)ەوە دەست پێ دەكا، هەندێكی تر غەیری ئەمانە دیاری دەكەن.

ئەم جۆرە قورئانە دەبێتە سێ بەش (درێژەكانی، مام ناوەندییەكانی، كورتەكانی) درێژەكانی لە (ق)ەوە، یان لە (الحجرات)ەوە تا سورەتی (عمّ)، یان (البروج) مام ناوەدییەكانی لە (عمّ)ەوە یان لە (البروج)ەوە تا (الضّحی)، یان (لم یكن) كورتەكان لە (الضّحی)وە، یان (لم یكن)ەوە تا كۆتایی قورئان، ئەم بەشە بۆ یە ناونراوە (المفصل) چونكە زۆر ناوانی بە ڕستەی ﴿بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾تێداكراوە.

ژمارەی سورەتەكانی قورئان (١١٤) سەدو چواردە سورەتن، هەندێك دەڵێن: (١١٣) لەم ڕووەوە (الأنفال)و (براءة) بە یەك سورەت حیساب بكرێن، ژمارەی ئایەتەكان (٦٢٠٠) شەش هەزارو دووسەد ئایەتە، لەمە زیاتر ڕاجیایی تێدایە، درێژترین ئایەت ئایەتی (الدین)ە، درێژترین سورەت سورەتی (البقرة)یە.

ئەم دابەشكردنو لێك جیاكردنەوەو ناوانكردنە ئاسانكارییە بۆ ئەوانەی بیانەوێ لەبەری بكەنو هەڵنانیانە بۆ تەفسیرو لێكۆڵینەوە تێیدا، خوێنەر كە لە سورەتێكەوە دەگوازێتەوە بۆ سورەتێكی تر هەست بەوە دەكا، بەشێكی لە بنەمای ئایینیو كۆمەڵێك ئەحكامی سەربەخۆو بنەمای ئایینی پاكو خاوێنو ئەحكامی شەریعەت فێربووە.

# ڕەسمی عوسمانی

لەوەپێش باسی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان کرا لەسەردەمی خەلیفەی سێیەم ئیمامی عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێ) بێگومان زەیدی کوڕ ثابیتو سێ کەسەکەی هاوەڵی کە قوڕیشی بوون بە یەکەوە ڕێو ڕەسمێکی تایبەتیان پەیڕەو کرد بۆ نووسینەوەی قورئان، حەزرەتی عوسمانیش (ڕەزای خودای لێ بێ) بە نەخشە ڕێگایەکەیان ڕازی بوو، ئەم قاعیدەو نەخشە ڕێگایەی زەیدو هاوەڵانی، زانایانی ئیسلام بە (الرسم العثمانی للمصحف) ناویان بردووەو نیسبەتیان بۆلای ئیمام عوسمان داوە، ئەمجار زانایان کەوتوونە خیلافەوە دەربارەی حوکمەکەی:-

١- بڕێ لە زانایان پێیان وایە ئەم شێوە ڕەسمی عوسمانییە بۆ نووسینی قورئان تەوقیفیەو پێویستە پابەندی بینو لە نووسینەوەو چاپکردنی قورئان لێی لانەدەین، زێدەڕەوییان لە پیرۆزی ئەو شێوە نووسینەوەدا کردووەو پێیان وایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەو شێوە بنووسرێتەوە، ئەوەشیان باس کردووە گوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە موعاوییەی فەرمووە – کە یەکێك بووە لەوانەی سەرەتا کاتبی وەحی بووە - «ألق الدواة، وحرف القلم، وانصب الياء، وفرق السين، ولاتعور الميم، وحسن الله، ومدّ الرحمن، وجود الرحيم، وضع قلمك على أذنك اليسرى فإنه أذكر لك».[1]

ئیبنولموبارەك لە شێخ عەبدولعەزیزی مامۆستایەوە نەقڵی کردووە دەڵێ: پێی گوتم: نە هاوەڵانی پێغەمبەرو نە کەسانی تر دەربارەی شێوە نووسینی قورئان بە ئەندازەی تاڵە موێك دەسەڵاتیان نەبووەو ڕێگایان نەدراوە گۆڕانکاری تێدا بکەن، بەڵکوو شێوە نووسینەوەکەی تەوقیفیەو بە فەرمانو ڕەهنومایی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

---

[1] أخرجه المستغفری فی فضائل القرآن/٥٥٦.

نووسیوویانەتەوە، ئەو فەرمانی پێ کردوون؛ کە بەو شێوە بینووسنەوە، بە زیادکردنی ئەلفێك، یان بەلابردنی، ئەمەش لەبەر نهێنییەك کە عەقڵی ئێمەی مرۆڤ پەی پێ نابا، نهێنییەکە لە نهێنییەکانی پەروەردگارەو تایبەتی کردووە بە نامە پیرۆزەکەی خۆیەوەو ئەم تایبەتمەندییە بۆ نامە ئاسمانییەکانی تر نییە، جا وەکوو چۆن نەظمو لێکدانو ڕێکخستنەکە موعجیزەیە، شێوە نووسینو ڕەسمەکەشی موعجیزەیە.

زانایان بۆ ئەو شێوە (رسم المصحف)ەی قورئان چەند نهێنییەکیان دۆزیوەتەوە کردوویانە بە بەڵگەو نیشانەی چەند مانای وردو خەفی، بۆ نموونە زیادکردنی پیتی (ی) لە وشەی (أيـد)دا؛ کە دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ – الذاريات/٤٧﴾ دەڵێن: نووسینی ئەو وشەیە بەشێوەی (أييد) ئاماژەیە بۆ گەورەیی دەسەڵاتی خودا ئەو هێزو دەسەڵاتەی ئاسمانی پێ بەدیهێناوەو نیشانەی ئەوەیە هیچ هێزێك نییە هاوشانی هێزی خودا بکا، ئەمەش بەپێی قاعیدەی (زيادة المبنى تدل على زيادة المعنى) زێدەی پیتی وشە زێدەی مەعنا دەگەیەنێ.[1]

دەربارەی ئەم ڕایە هیچ لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەر بێ) نەگێڕدراوەتەوە، هەتا بیکەینە بەڵگەو بڵێین: شێوە نووسینەکەی تەوقیفییە، تەنها ئەوەندە هەیە نووسەرەوەکانی قورئان (زەیدو هاوەڵەکانی) پەیڕەوی ئەم شێوە نووسینەیان کردو ئیمام عوسمانیش پێی ڕازی بوو، قاعیدەو یاسایەکی بۆ دانانو فەرمانی پێ کردن پەیڕەوی بکەن، ئەوەبوو بە سێ هاوەڵە قوڕەیشییەکەی زەیدی فەرموو: هەرکاتێ ئێوەو زەید لە وشەیەکی قورئاندا کەوتنە خیلافەوە، بەشێوە زاراوەی قوڕەیش بینووسنەوە چونکە قورئان بەشێوە زاراوەی ئەوان نازڵ بووە.[2]

---

[1] بڕوانە: مناهل العرفان للزرقانی ج١/٣٧٠دوایی.

[2] اخرجه البخاری/٣٥٠٦ من حدیث أنس.

جا کاتێك کەوتنە کێشەوە دەربارەی نووووسینی وشەی (التـابوت):
زەید وتی: دەبێ (التابوه) بنووسین، سێ نەفەرە قورەیشییەکان وتیان دەبێ (التابوت) بنووسین، کێشەکەیان بردە لای ئیمام عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی بنووسن (التابوت) ئەمە شێوە زاراوەی قورەیشەو قورئان بە زاراوەی ئەوان نازڵ بووە.[1]

٢- زۆر لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە شێوە نووسینی قورئان بە (رەسمی عوسمانی) تەوقیفی نیەو لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نەبووە، بەڵکوو شێوە نووسینێك بوو عوسمان پەسەندی کردو موسوڵمانانیش بە سینگ فراوانیەوە وەریان گرتو پێویستە ئێمە پێوەی پابەندبینو لێی لانەدەین.

ئیمام ئەشهەب دەڵێ: پرسیار لە ئیمام مالیك کرا ئاخۆ دروستە قورئان بەو شێوە نووسینەی ئەمڕۆ خەڵك دایهێناوە بنووسرێتەوە؟ وتی: نەخەیر، هەردەبێ بە ڕێنووسی نووسەرەوەکانی یەکەمی بنووسرێتەوە.

ئەبو عەمری (الدانی) لە (المقنع)دا ئەم قسەی هێناوە، پاشان هیچ کەس لە زانایانی ئوممەتی ئیسلام لەمەدا ڕای جیاوازی نیە، لە شوێنێکی تردا دەڵێ: پرسیار لە ئیمام مالیك کرا دەربارەی هەندێ پیتی ناو قورئان وەکوو (واو ئەلف) ئایا دروستە شێوە نووسینەکەیان بگۆڕدرێ ئەگەر داخوازی گۆڕانیان هەبوو؟ لە وەڵامدا وتی: نەخەیر، ئەبو عەمر دەڵێ: بۆ نموونە (واو ئەلفی) ناو وشەی (أولوا) بە نووسین زیادنو بە لەفظ ناخوێندرێنەوە.

---

[1] الترمذی/٣٣٦١.

ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: حەرامە موخالەفەی شێوە نووسینی (رەسمی موصحەفی عوسمانی) بکرێ دەبارەی نووسینی (واو) یان (یاء) یان (ئەلف) یان غەیری ئەوانیش.[1]

٣- کۆمەڵێکی تر لە زانایان پێیان وایە (رەسمی موصحەفی عوسمانی) زاراوەو شێوە نووسینێکی هاوەڵان بووەو هیچ مانیعێك لەوەدا نیە لێی لادەین‌و بۆ شێوە ئیملایەکی تر، ئەگەر خەڵکەکە شێوە ئیملایەکی تری گونجاوتریان داهێناو لەناویاندا بڵاوبۆوەو پەرەی سەند!

قازی ئەبو بەکری (الباقلانی) لە کتێبی دانراوی خۆیدا (الإنتصار) دەڵێ: (......... بەڵام بۆ شێوە نووسینی قورئان، پەروەردگار هیچ شێوە نووسینێکی بۆ قورئان لەسەر موسوڵمانان واجب نەکردووە، فەرمانی نەکردووە بە نووسەرەوەکانی قورئان شێوە نووسینێك پەیڕەو بکەن‌و واز لەشێوە نووسینەکانی تر بێنن!) چونکە واجببوونی پەیڕەوکردنی شێوە نووسینێکی تایبەتی بەشێوەی بیستن لە (شارع)ەوە نەبێ نابێ، دەبێ ڕیوایەتی صەحیحی صەریح هەبێ بۆ چەسپاندنی لایەنی تەوقیفی ئەو شێوە نووسینەو وازهێنان لەشێوە نووسینی تر بۆی.

دەی لە دەقەکانی قورئاندا نە بەڕاستەوخۆو صەریح نە بە ناڕاستەوخۆو مەفهوم ئاماژەی ئەوەی تێدا نیە کە شێوە نووسینی قورئان‌و زەبتکردنی بەشێوەیەکی تایبەتی نەبێ دروست نیە، سنووڕێکی دانەناوە بڵێ نابێ لەو سنووڕە ئەودیوکەوی! لە حەدیث‌و فەرموودەی پێغەمبەریشدا دەقێك ڕیوایەت نەکراوە ئەوەمان لەسەر پێویست بکا، کۆڕای ئوممەتی ئیسلامیش لەسەر ئەوە دانەمەزراوە: کە دەبێ قورئان بە یەك شێوە نووسینی تایبەتی بنووسرێتەوە، هیچ قیاسێکی ئوصولی‌و شەرعیشمان دەست ناکەوێ ئەوە بگەیەنێ، بەڵکوو سوننەتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر

---

[1] بڕوانە الإتقان/٧٤٣ والبرهان للزرکشی ٣٧٩/١.

بێ) ئەوە دەگەیەنێ: کە دروستە قورئان بە هەر شێوەیەك ئاسان بێ بۆ فێربوونیو خوێندنەوەی بنووسرێتەوە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە نووسەرەوەکانی نیگا دەکرد بینووسنەوە، بەڵام هیچ شێوە نووسینێکی تایبەتی بۆ دەستنیشان نەدەکردن، نەهی لە کەسیشیان نەکردووە لە نووسینەوەی قورئان! بۆیە جوداوازی شێوە نووسینەکان لە موصحەفەکان ڕەنگی داوەتەوە، هەبوە وشەکەی بەگوێرەی مەخرەجی لەفظەکە نووسیوە، هەبووە زیادو کەمی تێدا کردووە، بەلای خۆیەوە ئەوەی بە ئیصطیلاحو نەخشە بۆ دارێژراو زانیوە پێی وابووە خەڵك لە ئەو نەخشەو ڕێوڕەسمە ئاگادارنو لێیان تێك ناچێ، لەبەر خودی ئەم هۆکارە دروستە قورئان بەشێوەی ڕێنووسی کوفیو لەسەر ڕەسمولخەتی یەکەمجاری بنووسرێتەوە، پیتی (لام) بەشێوەی (ك) بنوسرێ، (ألف) بەکەوانەیی دابندرێ، هەروا دروستیشە بە غەیری ئەو شێوەش بنووسێ!.

هەروەها دروستە قورئان بەوشێوە خەتو هیجائە کۆنەکەشی بنووسرێتەوە، لە هەمان کاتدا چ مانیعێك نیە لەوەدا بەشێوە خەتو هیجائی تازەش بنووسرێتەوە، دروستیشە هەندێ بەشێوەی کۆنو هەندێ بەشێوەی تازە بنووسرێتەوە.

جا ئەگەر شێوە خەتەکانی موصحەفو شێوە نووسینی زۆر لە پیتەکانی جوداوازو لێك نەچوون ڕێگە دراوە بە موسوڵمانان هەریەکەو بەشێوە نووسینی خۆی بینووسێتەوە، چۆن بۆیان ئاسانو باشو مەشهورە لایان، ئاوا ڕەسمی بکەنو چاپی بکەن، بەبێ ئەوەی بە تاوانی بزاننو ئینکارییان بکرێ، بۆمان دەردەکەوێو دەزانین: کە سنوورێکی دیاریکراو لەو بارەوە بۆ خەڵك دانەنراوە: کە بۆیان نەبێ لێی لابدەن، وەکوو دەربارەی قیرائاتو شێوازی خوێندنەوەی دیاریکراوەو پابەندبوون پێیەوە واجب کراوە.

هۆكاری ئەمەش ئەوەیە: خەتو وێنە نووسراوەكانی پیتو وشەكان نیشانەو وێنەو ڕەسمن، دەشوبهێتە ئیشاراتو رموزو شتی وا، هەموو رەسمو خەتێكی دەلالەت دەكا لەسەر وشەیەك كە بەشێوەیەكی تایبەتی دەخوێندرێتەوەو لایەنی قیرائەتەكەی دیاری دەكا، پێویستە بەڕاستی بزانینو دەستخۆشی لە نووسەرەوەكە بكەین.

بە كورتی هەركەسێك لافی ئەوە لێدەداو داوا دەكا موسوڵمانان پابەندی (رسم الخط)ێكی تایبەت بن، پێویستە بەڵگەی چەسپێنەری بخاتە ڕوو، بەڵگەشی دەست ناكەویٚ كوا بەڵگە هەیە تا ئەو بیخاتە ڕوو؟.

لە قەناعەت كردن بەم ڕەئیەو پابەندبوون پێیەوە، هەندیٚ كەس ئەمڕۆ داوای ئەوە دەكەن قورئانی پیرۆز بەگوێرەی قاعیدەی ئیملای تازەو بارپێوەگرتووی كارپێكراوی سەردەم بنووسرێتەوە، بۆ ئەوەی خوێندنەوەی لەسەر خوێنەرانی بە قوتابیو مامۆستاوە ئاسان بیٚو قوتابیو فێرخواز لەكاتی خوێندنیدا هەست بە جوداوازی ئەم شێوە نووسین تا ئەو شێوە نووسینەكان نەكا.

ئەوەی كە من پەسەندی دەكەمو پێم وایە گونجاوە بۆ پەیڕەوكردنی، ڕای دووەمە پێم وایە ئەو راجیحەو پێویستە قورئان بە ڕێنووسو ڕەسمی عوسمانی كە ئەمڕۆ باوەو لە موصحەفەكانی بەردەستماندا دەیبینین، بەڵیٚ: بەڕاستی ئەو نووسینە كارپێكراوە كە سەدان ساڵە موسوڵمانان چین دوای چین باریان پێوە گرتووەو لە ڕۆژگاری ئیمام عوسمانەوە پابەندی بوونو پارێزگاری دەكەن هۆكارێكی بەهێزە بۆ پاراستنی قورئان لە گۆڕانو تەبدیلكردنی پیتەكانی!

خۆ ئەگەر ڕێگە بدریٚ قورئان بە ڕێنووسی ڕەچاوكراوی ئەم سەردەمو ئەو سەردەم بنووسرێتەوە، ئەمە سەر دەكێشیٚ بۆ گۆڕانكاری لە ڕێنووسو خەتی موصحەفدا، ئەم چەرخە بەجۆرێك دەنووسریٚو چەرخێكی

تر بەجۆرێکی تر، ئاشکراشە قاعیدەو یاسای ڕێنووس لە چەرخو سەردەمێکیشدا جێگای ئیختیلافو سەرەنجی جوداواز بووە، بەڵکوو نووسینی هەندێ وشە لەم وڵات بۆ ئەو وڵات جوداوازی بەرچاوی تێدایە.

ئەو ئیختلافە خەتییانەی ئیمامی باقلانی ئاماژەیان پێ دەکا شتێکن‌و شێوازو ڕەسمی ئیملائی جوداواز شتێکی ترن، جوداوازی خەت گۆڕانکارییە لەوێنەی پیتەکە خۆیدا نەك لە ڕەسم‌و شێوازی وشەکەدا، پاساو هێنانەوە بەوەی نەهێشتنی جوداوازی لەنێوان ڕەسمی قورئان‌و وێنەو شێوازی ئیصطیلاحی (الرسم الإملائي الإصطلاحي) گوایە ئاسانکارییە بۆ قوتابی‌و خوێنەرانی قورئان‌و فێربوونی، نابێتە پاساوو موبەڕیر بۆ گۆڕانکاری لە نووسینەوەیدا بەجۆرێك سەربکێشێ بۆ کەمتەرخەمی‌و گرنگی نەدان بە وردەکاری لە نووسینەوەی قورئاندا.

ئەوکەسەی خوی بە خوێندنەوەی قورئانەوە گرتبێ لەناو موصحەفدا، جوداوازی شێوە نووسینەکانی تێدەگا بەهۆی ئەو نیشانەو هێمایانەوە کە لەسەر وشەکان دانراون، بە ئاسانی وەکوو پێویست خوێندنەوەکەی ئەنجام دەدا ئەو مامۆستایانەی قورئان فێری قوتابی‌و منداڵەکانیان دەکەن‌و لەبواری فێرکاریدا ئیش دەکەن دەزانن؛ کە ئەو قورسایی‌و گرانیەی سەرەتا دێتە بەردەم فێرخوازی قورئان، دوای ماوەیەکی کورت بۆی دەبێتە ئاسانکاری‌و چ نارەحەتیەکی تێدا نابینێ.

بەیهەقی لە کتێبی (شعب الإيمان)دا دەفەرموێ: کەسێك قورئان دەنووسێتەوە (چاپی) دەکا پێویستە پارێزگاری ئەو پیت‌و شێوە نووسینە بکا، کە نووسەرەوەکانی قورئان کاتی خۆی پەیڕەوییان کردووە موصحەفەکانی سەردەمی ئیمام عوسمانیان پێ نووسیوەتەوە، نابێ لە ڕێنووسی ئەوان لابدا، نابێ هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لەشێوە نووسینی ئەواندا بکا، بێگومان ئەوان لەو بوارەدا لەئێمە شارەزاترو زاناتر بوون، دڵو

دەرونیان لە ئێمە راستاڵ ترو دڵسۆزتر بووە، لەئێمە زیاتر پابەندی ئەمانەتو حەق پارێزی بوون، نابێ ئێمە واگومان بەرین ئەوان کەموکوڕییان تێدا بووە ئێمە بۆیان پڕ دەکەینەوە، هەڵەیان کردووە بۆیان ڕاست دەکەینەوە.[1]

## جوانکاریو ڕازاندنەوەی ڕەسمی عوسمانی

ئەو موصحەفانەی لەسەردەمی عوسمانیدا نووسراونەوە، نوختەو بزوێنیان بۆ نەکرابوو، پشت بەستوبوون بە سەلیقەی عەرەبیو زمانخاوێنی خۆیان، کە پێویستیان بە دانانی بزوێنو نوختە نەبوو، بە ئاسانی بەبێ هەبوونی ئەوانە قورئانیان دەخوێندەوەو هەڵەیان تێدا نەدەکرد، بەلام دووایی کە بەهۆی زۆر تیکەلاویو فرە زمانی ئەو گەلو نەتەوە جیاجیانەی موسوڵمان بوونو تێکەڵ بە کۆمەڵگای عەرەب بوون، فەرمانڕەوای موسوڵمانانو کاربەدەستانو دڵسۆزانی ئایین هەستیان بەوە کرد، کە پێویستە نووسینی موصحەف بە دانانی نوختەو بزوێنو نیشانەو هێمای تر جوانکاری تێدا بکرێ، بەجۆرێك یارمەتیدەر بێ بۆ خوێندنەوەی قورئان بەشێوەی صەحیحو راستو دروست.

زانایان کەوتوونە ڕاجیاییەوە دەربارەی ئەوە کێ یەکەمجار هەوڵو تەقەللای خۆی خستۆتە گەڕو لەم بوارەدا ئەسپی خۆی هەلنگ داوە.

زۆرێك لەوانە پێیان وایە یەکەم کەس کە ئەو کارەی ئەنجام داوە، ئەبولئەسوەدی (الدؤلی) بووە، گوایە بە ڕەهنومایيو فەرمانی ئیمام عەلی ئەوەی کردووە، دەگێڕنەوە گوایە ئەبولئەسوەد گوێی لێ بووە ڕۆژێك قورئانخوێنێك ئایەتی ﴿وَأَذَانٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ

---

[1] الإتقان/ص٧٤٤.

غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ - التوبة/٣﴾ى خوێندەوە لەجیاتی ﴿وَرَسُولُهُ﴾ (ورسولِهِ) خوێندەوە، بزوێنی کەسرەی خستە سەر لامەکە، ئەبولئەسوەد بەمە هەڵوێستەی کردو ترسی لێ نیشت ئەم لەحن‌و زمانخوارییە تەشەنە بکا، وتی خودا زۆر لەوە بەریۆ دوورە لە پێغەمبەری خۆی، خۆی بەری بکا، ئەمجار چوو بۆلای زیاد؛ کە والی بەصرە بوو، پێی گوت لەوەپێش داوات لێ کردم نیشانەو هێما بخەمە سەر وشەکانی قورئان، خەڵکی بەهۆی ئەو نیشانەو هێمایانەوە بتوانن بە ئاسانی قورئان بخوێننەوە ئەمن کەمتەرخەمیم کردو زوو بەپیر داواکەتەوە نەهاتم، ئێستا وامن هەوڵ دەدەم داواکەت جێبەجێ بکەم، ئیتر ئەوەبوو ئەبولئەسوەد لێ بڕاو کەوتە بیرکردنەوەو هەوڵدان، تا گەیشتە ئەو ئاکامە کە بۆ نیشانەی بزوێنی (فتحة) نوختەیەك لەسەر پیتەکە دابنێ، بۆ نیشانەی ژێر (کسرة) نوختە بخاتە لای خواروی پیتەکە، بۆ نیشانەی بۆر (ضمة) نوختەیەك بخاتە ناو پیتەکەوە، بۆ نیشانەی (سکون)یش دوو نوختە دابنێ.

سیوطی دەڵێ: ئەبولئەسوەد ئەوکارەی بە فەرمانی (عبدالملك)ی کوڕی مەروان ئەنجام داوە نەك بە فەرمانی زیاد، چونکە موسوڵمان بۆ ماوەی چل‌و ئەوەندە ساڵە قورئانیان لەو موصحەفانەدا دەخوێندەوەو کە لە ڕوی موصحەفەکانی ئیمام عوسمانەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) نووسرابوونەوە، تا سەردەمی خەلافەتی عەبدولمەلیك، کاتێك زمانخواری‌و تەصحیف‌و تەحریف لەناو خەڵکدا تەشەنەی کردو بڵاوبۆوە بەزۆری لە وڵاتی عێراقدا پەرەی سەند، ئیتر والی‌و فەرمانڕەوایان بیریان لەوە کردەوە نوختەو بزوێن بۆ وشەکان دابنێن.

ڕیوایەتی تر هەن ئەم بیر لێ کردنەوەو هەوڵدانە پاڵ کەسانی تری وەکوو حەسەنی بەصری‌و نەصری کوڕی عاصم (الليثى) دەدەن، بەڵام ئەوەی مەشهورو چەسپاوە ئەوەیە: کە یەکەم کەس‌و گرنگیدەر بەو بوارە

ئەبولئەسوەد بووە، دەشگونجێ ئەوانەی ناومان هێنان لێرەداو کەسانی تریش ڕۆڵیان هەبووبێو هەوڵیان دابێ لەم بوارەداو سەرکەوتنیشیان بەدەست هێنابێ.

بێگومان ڕازاندنەوەو ئاسانکردنی خوێندنەوەی قورئان بە تەدریجو پلە بەپلە هاتۆتە دی، لەسەرتادا بزوێنەکانو سکونیشیان بەهۆی نوختەوە خستۆتە ڕوو، ئەوەبوو وەکوو وتمان نیشانەی (فتحة) نوختەیەکی دەخستە سەر پیتەکە، بۆ نیشانەی (کسرة) نوختەی دەخستە ژێرەوە، بۆ نیشانەی (ضمة) نوختەی دەخستە ئاخر پیتەکە، پاشان نیشانەو هێمایان بە بزوێنەکان ئەنجامدا کە لە خودی پیتەکان وەریان گرت، بۆ بزوێنی (فتحة) خەتێکی ئاسۆیی بچوکیان دەخستە سەر پیتەکە، بۆ (کسرة) خەتە ئاسۆییەکەیان دەخستە ژێر پیتەکە، بۆ نیشانەی (ضمة) شکلی واوێکی بچوکیان دەخستە سەر پیتەکە، بۆ نیشانەی تەنوین ئەو شکلانەیان دەکردنە دوو

---

ئەلفی حەذفکراو، یان هەلبکراو بە پیتێکی تر لەشوێنی بە حیبری سور دەنووسرا، جاری وایش بووە ئەلفی حەذفکراوی بە هەمزە دەنووسی بەبێ ئەوە بە ڕەنگی سور بێ، لەسەر نوونو تەنوین ئەگەر بکەوتایە پێش پیتی (ب) نیشانەی قەلب کردنیان بە (م) بە سووری دەنوسی، ئەگەر بکەوتنایە پێش پیتەکانی حەلق، نیشانەی سکونیان دادەنا، ئەگەر ئیدغامو ئیخفا بکرانەیە هیچ نیشانەیان بۆ دانەدەنا، پیتە دەغمکراوەکەیان بێ نیشانە دەنووسیو داواکەیان دوو چەندانەو (مشدد) دەنووسی مەگەر پیتە دواییەکە (ط) بێ پێش (ت) ئەوکاتە لەسەری دەنووسرا (سکون) وەکوو وشەی ﴿ فَرَّطتُ – الزمر/٥٦﴾.

ئـەمجار چـەرخی سـێیەمی کۆچـی هـات شـێوە نووسـینی قورئـان قاعیدەو یاسای بۆ دانرا، لە نووسینەوەیدا خەتی خۆش‌و ناپابیان بەکارهێنا، خەڵك کەوتنە پێشبڕکێ‌و داهێنان لە ڕەچاوکردن‌و هەڵبـژاردنی شێوە خـەتی جوان‌و سەرەنج ڕاکێش‌و داهێنانی نیشانەو هێمای جیاکەرەوە، ئەوە بۆ پیتی موشەدەد نیشانەیەکی کەوانەییان دادەنا، بۆ ئەلفی وەصل خـەتێکی ئاسـۆیی بـچوکیان دادەنـا لـە ژێریـەوە، یـان لەسـەریەوە، یـان لەناوەڕاستی بـەگوێرەی بزوێنی پیتی پێشووی.

پاشان خەڵك پەرەیان بە جوانکاری کـرد لـە قورئانـدا نـاوی سـورەت‌و ژمـارەی ئایـەت‌و هێمـای سـەرەئایەت‌و نیـشانەی (وقـف)ی لازم (م) وەقفـی مـەمنوع (لا) وەقفی جـائیز کـە هـەردوو لا یەکسان بـن (ج) وەقفـی جـائیز بەلام وەصلی باشتر بێ (صلی) وەقفی جـائیز بـەلام وەقفی باشـتر بـێ (قلی) دوو وقـف لەسـەریەکیان ڕاوەسـتانی نابـێ لەسـەر ئـەویتریان بووەسـتێ (∴) بەشـکردنی بـۆ جوزئـو حیـزب‌و گـەلێ نیـشانەو هێمـای تـر لـەناو قورئانـدا دایاننان‌و قورئانیان پێ ئاسانخوێن کرد.

هەڵبەتە زانایانی ئیسلام لەسـەرەتادا دانـانی ئـەو هێمـاو ڕەمزانـەیان بـەلاوە مـەکروهو نالـەبار بـوو، ترسـی ئـەوەیان هـەبوو زیـادە بکەوێتـە نـاو قورئانەوەو بە زێدە بـژمێردرێن، بەلگەشیان قسەکەی ئیبنـو مەسـعود بـوو، کـە دەڵـێ: (جـرّدوا القـرآن ولا تخلطـوه بـشيئ) هـیچ شـتێ تێکـەڵی قورئـان مەکەن.

هەنـدێ لـە زانایـان بـڕێ لـەو ڕەمـزو هێمایانـە بـە ڕەوا نـازانن‌و هەندێکیان پێیان دروستە، دەڵێن: دانانی نوختە بـۆ وشـەکان دروسـتە، بـەلام ڕەمزو هێمای تر نادروستن.

حولەیمی دەڵێ: دانانی ڕەمزی ئەعشارو ئەخماس‌و ناوی سورەتەکان‌و ژمارەی ئایەتەکان مەکروهـە، ئامـاژە بـە قسەکەی ئیبنـو مەسـعود کـە دەڵێ:

(جرّدوا القرآن) بەڵام دانانی نوختە ئەوە دروستە چونکە ئەم وێنەیەکی وا پیشان نادا بەهۆیەوە شتێك لە قورئان نەبێ بە قورئان بزاندرێ، بەڵکوو نیشانەو عەلاماتن بۆ شێوەی خوێندراوەکە، کەوابێ دانانی چ زیانێکی تێدا نابیندرێ، پاشان کار بەوە گەیشت ئەو ڕەمزو هێمایانە بە ڕەوا دانران و بە باشیان لە قەڵەم دان.

ئیبنو ئەبو داود لە الحسن و لە ئیبنو سیرینەوە گێڕاویەتیەوە: کە گووتویانە نوختە دانان لەسەر وشەکانی قورئان هیچ خراپیەکی تێدا نیە، لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕەحمانەوە دەگێڕێتەوە: کە گوتوویەتی: دانانی بزوێن (سەرو ژێرو بۆرو تەنوین و سکون) چ خراپیەکی تێدا نابینم.[1]

ئەوەوی دەڵێ: نوختە دانان و بزوێن لەسەر وشەکانی موصحەف پەسەندو باشە، چونکە قورئان دەپارێزێ لە لەحن و تەصحیف و تەحریف.[2]

بێگومان ئەمڕۆ گرنگی دان بە جوانکاری و رازاندنەوەی شێوە نووسینی موصحەف گەیشتۆتە فەن و دەست ڕەنگینی لەبواری خەتی عەرەبیدا.

## نێوان و سەرە ئایەت

قورئانی پیرۆز لە هەموو کتێبەکانی تر جیا دەبێتەوە بە پەیڕەو پرۆگرام و ڕێوشوێنێك کە تاقە مەنهەج و ڕێبازی تایبەتە بە قورئانەوە: کە بریتییە لە (فواصل) کۆی (فاصلە) و سەرە ئایەت، مەبەست بە فاصیلە جیاکەرەوەی کەلامی پێشەوەی لە دواوەوەی، جا ڕێدەکەوێ ئەو فاصیلە سەرە ئایەت دەبێ و غەیری سەرە ئایەتیش بێ، فاصیلە دەکەوێتە کۆتایی

---

[1] المصاحف ص٣٢٩ – ٣٣٠.

[2] بڕوانە (الإتقان) ص٧٥٥.

مەقطەعی خیطاب، بۆیەش ئەو ناوەیان بۆ داناوە چونکە کەلامەکە بەو کۆتایی دێ.

مەبەستیش بە سەرە ئایەت کۆتایی ئایەتەکەیە؛ کە نیشانەی نێوان و سنور دادەنرێ لەنێوان ئەم ئایەت و ئەو ئایەت، بۆیە گوتوویانە هەموو سەرە ئایەتێك فاصیلەیە بەڵام مەرج نیە هەموو فاصیلەیەك سەرە ئایەت بێ، کەوابێ فاصیلە عامەو هەردوو جۆرەکان دەگرێتەوە، چونکە هەموو سەرە ئایەتێك دەبێتە ناوبڕ لەنێوان خۆی و ئەوەی لە دواوەی دێ.

هاو وێنەی ئەمە لە قسەو ئاخاوتنی ئادەمیزاد پێی دەگوترێ: (سەجع) وەکوو لە عیلمی بەدیعدا مەشهورو زاندراوە، وەلێ زۆر لە عولەمایانی ئیسلام ئەم وەصفە بۆ قورئان بەکار ناهێنن، بۆ زێدە ڕێزو بەرزکردنەوەی قورئان بەسەر کەلامی ئەدیبان و قسەو عیباراتی پێغەمبەران و شێوازی ئاخاوتنی زمانڕەوان و خۆشخوانەکان.

جوداوازی خراوەتە نێوان فەواصیل و سەجع، لەم ڕووەوە فەواصیل لە قورئاندا تابیعی مەعانین و بۆخۆیان مەبەست نین، بەڵام سەجع بۆخۆی مەبەستەو پاشان مەعنای بۆ دادەنرێ، چونکە ئەم بریتییە لە دارشتنی کەلام لەسەر یەك کێش.

قازی ئەبو بەکری باقلانی رەدی ئەوانەی داوەتەوە؛ کە دەڵێن: سەجع لە قورئاندا هەیە، دەڵێ: ئەم بۆچوونانە بۆچونێکی هەڵەیە، چونکە ئەگەر قورئان سەجع بوایە بەدەر نەدەبوو لەشێوازی ئاخاوتنی عەرەب، خۆ ئەگەر داخڵی ئاخاوتنی ئەوان بوایە، لایەنی ئیعجازی تێدا دەستەبەر نەدەبوو، خۆ ئەگەر دروست بێ بگوترێ: سەجعی موعجیزە، دروستە بڵێین شێعری موعجیزە، چۆن ئەوە گونجاوە؟ چۆن شتی وا دەگوترێ؟ لەکاتێکدا سەجع لەو جۆرە ئاخاوتنانەیە کاهینە عەرەبەکان خویان پێوەگرتبوو، بە دوورگرتنی قورئان لەوەی سەجعی تێدا بێ زۆر پێویست تروشیاوترە لە بەدوورگرتنی

لـەوەی قورئـان شـیعر بـێ، چـونکە کەهانــەت و کوڵـەوەنانی پێـچەوانەی پێغەمبەرایـەتی و پـەیامی پێغەمبەرانـە، بـەڵام شـیعر بـەو جۆرە نیـە، ئـەو بۆچـوونەیان کــە گووتوویانــە قورئــان ســەجعە ســەجعی لــەخۆ گرتــووە، بۆچوونێکی هەڵەو بێ بناغەیە، چونکە هاتنی هەندێ لە قورئان بەشێوەی سەجع ئەوە ناگەیەنێ کە سەجع بێ، چونکە سەجع لە کەلامدا مانا تابیعی ئەو لەفظەیە کە بە سەجع ئەدا دەکرێ، دەی ئەوەی لە قورئان وا دەردەکەوێ سەجع بێ بەو شێوە نیە، بەڵکوو لەفظەکە لەو شوێنانەی قورئان کە وەکوو سـەجع دەچێ تـابیعی مەعنایـە، ئاشکراشـە جوداوازییـەکی بـەرفراوان هەیـە لەنێوان کەلامێکدا ڕیز ببەستێ لـە خـودی خـۆی بـە وشـە گـەلێك کـە مانـای مەبەسـت بگەیـەنێ لەگـەڵ کـەلامێك کـە مانـای مونتـەظەمو ڕێـك بـێ نـەك لەفظەکانی ئەم پەڕگرافە، عەرەبییەکەی ئاوایە (وفرق بين أن ينتظم الكلام فـى نفـسه بألفاظـه التـى تـؤدى المعنــى المقـصود فيـه، وبـين أن يكـون المعنــى منتظماً دون اللفظ).

ئــەوەی مــن بــۆی دەچــم ئەوەیــە: ئەگــەر مەبەســت بــە ســەجع بەرچـاوگرتنی کـەلام بـێ لەسـەر یـەك کـێش و وەزن بـەبێ موراعـاتکردنی مەعنا، بێگومان ئەوە تەکەللوفێکی بێزراوە لە ئاخاوتنی خەڵکدا چ جایی لـە کەلامی خودادا، بەڵام ئەگەر موراعاتی ماناکراو بە ڕێکەوت لـەفظەکە وابـوو تابیعی مەعناکە بوو بەبێ تەکەللوف، ئەوە بێگومـان جۆرێکـە لـە جۆرەکـانی بەلاغە، لە قورئانیشدا هەیە وەکوو لە غەیری قورئانـدا هەیـە، جا کـە ئێمـە بەوە دەڵێین (فواصل)و پێی ناڵێین سەجع، ئەوە تـەنها بـۆ ئەوەیـە ئیطلاقـی سەجع نەکەین بەسەر قورئاندا بە مەعنای یەکەم.

## فەواصیل لە قورئانی پیرۆزدا چەند جۆرێکە

أ/ فەواصیلی هاوشێوە وەکوو ﴿وَالطُّورِ ، وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ ، فِي رَقٍّ مَّنشُورٍ ، وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ – الطور/١ – ٤﴾، یان ئایاتی ﴿وَالْفَجْرِ ، وَلَيَالٍ عَشْرٍ ، وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ، وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ – الفجر/١ – ٤﴾. یان ئایەتی ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ ، الْجَوَارِ الْكُنَّسِ ، وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ، وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ – التكوير/١٥ – ١٨﴾.

ب/ فەواصیلی لێك نزیك لەڕوی پیتەوە وەکوو ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ – الفاتحة/٣ – ٤﴾ یان ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ، بَلْ عَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ – ق/١ – ٢﴾ بەهۆی لێك نزیکی هەردوو بڕگەی (دال‌و باء).

ج/ فەواصیلی موتەوازی؛ ئەم جۆرە بریتییە لەوە بڕگەی کۆتایی لە هەردوو وشەکەدا یەکسانی هەبێ لە کێش‌و پیتەکانی سەجعدا وەکوو ﴿وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ، وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ – الغاشية/١٥ – ١٦﴾ یان وەکوو ﴿فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ، وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ – الغاشية/١٣ – ١٤﴾.

د/ فەواصیلی موتەوازین کە لە بڕگەکەدا موراعاتی کێش دەکرێ‌و بەس، جاری وا دەبێ لە فەواصیلدا زێدە پیتێك بەرچاو دەگیرێ، وەکوو ﴿وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا – الأحزاب/١٠﴾ بە لکاندنی ئەلفێك، چونکە بڕگەی فەواصیلی ئەم سورەتە بریتین لە ئەلفی ودی هاتوو لە تەنوین لەکاتی لەسەر وەستان، بۆیە ئەلفێك لەسەر نونەکە زیادکراوە بۆ ئەوەی بڕگەکان وەکوو یەکیان لێ بێ‌و کۆتایی فاصیلەکانیش پێکەوە گونجاوبن، یان پیتێك حەذف بکرێ وەکوو ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ – الفجر/٤﴾ پیتی (ی) لە کۆتاییەوە لابراوە، چونکە بڕگەی فاصیلەکانی پێشەوەو دواوە پیتی (ر)ێیە.

یان دواخستنی وشەیەك کە دەبوایە پێش بخرێ لەبەر نوکتەیەکی بەلاغی تر: کە بریتییە لە حەزلێبوونی نەفس، نەفسەکە وا لێ بکەی

ئاواتەخواز بێ، زوبزانێ فاعیلەکە کێیە وەکوو ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى – طـه/٦٧﴾ چونکە ئەصڵ لە ئاخاوتنی عەرەبیدا ئەوەیە فاعیل (بکەر) بە کردارەوە بلکێ‌و مەفعول دوا بکەوێ، وەڵێ لێرەدا بکەر؛ کە (موسی)یە لەبەر نوکتەیەکی بەلاغی دواخراوە ئەمەش ئەوەیە؛ کە لە پێشەوە ئاماژەی بۆ کراو بەرچاوگرتنی فاصیلەیە.

## ٩ نازڵ بوونی قورئان بەحەوت زاراوە (احرف)

بێگومان عەرەبەکان لەنیوە دورگەی عەرەبی‌دا بە چەند لەهجە (زاراوە)ی جیاجیا ئاخاوتنیان دەکرد، ئەم زاراوانە هەموویان هەڵقوڵاوی شێوە ژیانی خێڵایەتی‌و سروشت‌و فیطرەتی زمانەکەیان بوو لەڕوی موسیقاو دەنگ‌و پیتەکانیەوە، کتێبەکانی ئەدەب زۆر لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنیان لەبارەی ئەم زاراوانەوە ئەنجام داوە، کۆمەڵگای عەرەب لە نیوەدورگەی عەرەبیدا کۆمەڵگایەکی خێڵەکی داخراو بوون، هەرخێڵەو زاراوەیەکی نیمچە تایبەتی هەبوو، لەزۆر وشەدا ئەم خێڵە لەحنێکی هەبوو زۆر لە خێڵەکانی تر نەیانبوو، وەڵێ هۆزی قورەیش لەناو عەرەبدا خودا چەند تایبەتمەندی‌و هۆکاری بۆ ڕەخساندبوون، زمانەکەیان ببوە زمانی ستاندەر بۆ هەموو خێڵەکان ئەوانە بەهۆی ئەوەوە؛ کە جیرانی کەعبە بوون، ئامادەکردنی خواردن‌و ئاو بۆ حاجیانی کەعبە لە ئەستۆی ئەواندا بوو، ئاوەدانکردنەوەو پاك ڕاگرتنی ئەو ماڵە پیرۆزەیان لە ئەستۆ بوو، جەمسەرو هەڵسوڕێنەری پرۆسەی بازرگانی بوون لەو وڵاتەدا، هەرخۆیان کاربەدەست‌و قسە ڕۆیشتووی ئەو بوارانە بوون، لەبەر ئەم هۆیانەو گەلێك هۆی تر هەموو عەرەبەکان زاراوەی قورەیشیان بە باوکی زاراوەکانی خۆیان دەزانی‌و بە زمانێکی ستاندەر بۆخۆیان لێیان دەڕوانی.

كەوابوو شتێكی سروشتیو ئاسایی بوو، قورئانی پیرۆز بە لوغەتو زاراوەی قورەیش نازڵ ببێ بۆ سەر پێغەمبەری ڕەچەڵەك قورەیش، بۆ ڕێكخستنو یەكدیگرتنو دروستبوونی یەكیەتی عەرەبەكان هەموویان، هەم بۆ چەسپاندنی ئیعجازی قورئانو سەرئاساییی ئەو كەلامە پیرۆزە كاتێك دەستەوەستان دەبن لەوەدا كە ناتوانن نموونەی تەنانەت نموونەی سورەتێكیشی بخەنە ڕوو.

خۆ كە زانیمان عەرەبەكان بە لەهجەی جیاجیا ئاخاوتنیان دەكردو، بە چەند ڕستەو لەفظی جیاجیا تەعبیریان لە مەعنایەك دەدایەوە، دەبێ بزانین ئەو قورئانەی خودا بە نیگا بۆ پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) نازڵ كردووە، كاتێك مەعنای ئیعجازی بۆ دەستەبەر دەبێ؛ كە بە لەهجەو شێوازی قیرائاتو خوێندنەوەی كۆكەرەوەی لوغەتە پاڵفتەكراوەكە بێ، كەلای هەموو عەرەب مەفهومو دان پیانراوە، بۆ ئەوەی خوێندنەوەو لەبەركردنو تێگەیشتنی بۆیان ئاسان بێ.

دەقەكانی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی نازڵ بوونی قورئان لەسەر حەوت زاراوەو لەهجە، گەیشتوونە پلەی تەواتورو ئەو ڕاستیە دەچەسپێنن.

یەكێ لەو فەرموودانە ڕیوایەتی ئیبنو عەبباسە (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوكی بێ) كە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ فَرَاجَعْتُهُ ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ وَيَزِيدُنِي حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ».[1] جوبرائیل لەسەر زاراوەیەك قورئانی بۆ خوێندمو فێری كردم، دوایی داوام لێ كرد بە لەهجەی تریش بۆم بخوێنێتەوەو فێرم بكا، ئیتر وازم نەهێنا داوای زیاترم لێ كردو ئەویش بۆی زیاد كردم تا بە تەواوی حەوت زاراوەی فێركردم.

---

[1] رواه البخاري/٤٩٩١ ومسلم/١٩٠٢.

له ئوبەی کوڕی کەعبەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای گۆلاوی بەنی غەفار بوو، دەڵێ: لەو شوێنە حەزرەتی جوبرائیل هات بۆلای فەرمووی: «إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفٍ. فَقَالَ « أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ» واتە: خودا فەرمانت پێ دەکا: کە قورئان فێری نەتەوەکەت بکەی بە یەك زاراوە، ئەویش فەرمووی: داوای عەفو لێخۆشبوون دەکەم لە خودا، بێگومان ئوممەتی من ناتوانن هەموویان قورئان بە یەك زاراوە فێر ببن‌و بیخوێننەوە.

پاشان بۆ جاری دووەم حەزرەتی جوبرائیل هاتەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفَيْنِ فَقَالَ « أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ» واتە خودا فەرمانت پێ دەکا بە دوو زاراوەو لەهجە قورئان فێری نەتەوەکەت بکەی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: داوای عەفوی خوداو لێخۆشبوونی دەکەم، نەتەوەکەم توانای ئەوەیان نیە بە دوو زاراوە قورئان بخوێنن.

پاشان بۆ جاری سێیەم حەزرەتی جوبرائیل هاتەوە بە پێغەمبەری فەرموو: «إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى ثَلاَثَةِ أَحْرُفٍ. فَقَالَ « أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ» ثُمَّ جَاءَهُ الرَّابِعَةَ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَأَيُّمَا حَرْفٍ قَرَءُوا عَلَيْهِ فَقَدْ أَصَابُوا».[1]

لەجاری چوارەمدا پێی فەرموو: پەروەردگار فەرمانت پێ دەکا قوورئان فێری ئوممەتت بکەو بۆیان بخوێنەوە بە حەوت زاراوە، ئەوانیش لەو حەوت زاراوانە بەهەرکامیان بیخوێننەوە دروستەو لە حەق لایان نەداوە.

---

[1] اخرجه مسلم/١٩٠٦ واحمد/٢١١٧٢.

عومـــەری کـــوڕی خـــەتتاب (ڕەزای خـــودای لێ بـــێ) دەگێڕێتـــەوە دەفـەرموێ: گـوێم لێ بـوو هیـشامی کـوڕی حـەکیم سـورەتی (الفرقـان)ی دەخوێند، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) لـە ژیانـدا بـوو، گوێم لـە خوێندنەکەی گرت، سەرەنجم دایە بە چەند شێوازو لەهجەیـەك دەیخوێنـێ، کـە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) بــەم شــێوازانە بــە منــی نەخوێندبوو، ویستم لە نوێژەکەیدا پەلاماری بدەم، چاوەڕێم کرد تا سەلامی دایەوە، پێم گوت: ئەوە کێ ئەم سورەتەی ئاوا فێرکردووی؟ وتـی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـاوا فێـری خوێندنـەوەی کـردووم، وتم درۆت کرد، سوێندم بەخودا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) ئـەم سـورەتەی لەتۆم بیست خوێندت بـە منـی گوتـووە، وای پـێ نـەگوتووم، یەخـەیم گـرتو بـردم بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وتم: ئـەی پێغەمبـەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) ئــەمن گــوێم لێ بــوو ئــەم کابرایــە ســورەتی (الفرقـان)ی بـە چـەند زاراوەیـەك خوێنـد، ئـەتۆ بـەو زاراوانـە بـە منـت نەخوێندووە، تۆ خۆت سورەتی (الفرقان)نت پێ گوتووم، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: ئـەی عومـەر! دەسـتت لـە یەخـەی بکـەرەوە، دادەی هیشام بیخوێنەوە، هەمان ئەو سورەتەو بـەو جـۆرەی خوێنـدنی گـوێم لێ بـوو لـەوەپێش خوێندیـەوە، پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فـەرمووی: قورئانەکـەی ڕەوانـەو ئـاوا نـازڵ بـووە، پاشـان فـەرمووی: دادەی عومەر تۆیش بیخوێنەوە، منیش ئەو شێوازە خوێندنەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری کردبووم بـۆم خوێنـد، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: ڕاسـتەو ئـاوا نـازڵ بـووە پاشـان پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَاقْرَءُوا مَا

تَيَسَّرَ مِنْها».[١] ئەم قورئانە بە حەوت زاراوە نازڵ بووە بە کام زاراوە بۆتان ئاسان بووە بەوە بیخوێنن.

فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بوارەدا زۆرو زەبەندن ئیبنو جەریری طەبەری زۆربەی فەرموودەی ڕیوایەتکراو لەو بارەوەی لە پێشەکی تەفسیرەکەیدا چەسپاندون، سیوطی دەڵێ: ئەو حەدیثانە لە بیستو یەك هاوەڵی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەت کراون، بێگومان ئەبو عوبەید (القاسم بن سلام) بە ڕوونی ئەو فەرموودانەی بە موتەواتیر داناون: کە دەربارەی نازڵبوونی قورئان لەسەر حەوت زاراوە ڕیوایەتکراون.

ڕاجیاییو ئیختیلافێکی زۆر لەناو زانایاندا هەیە دەربارەی ڕاڤەکردنی ئەو حەوت زاراوەی قورئانی پێ نازڵ بووە، تەنانەت ئیبنو حیبان دەڵێ: ئەهلی زانست دەربارەی مەعناو مەبەست بە (سبعة أحرف) سیو پێنج ڕەئیان هەیە، زۆربەی ئەم ڕەئیانە دەچنەوە ناو یەكو (متداخلن) ئێمە لەم نووسینەدا هەوڵ دەدەین بۆچوونە گرنگەکان بخەینە ڕوو.

أ/ زۆربەی عولەما پێیان وایە مەبەست بە (سبعة أحرف) حەوت زمانە لە زمانەکانی عەرەب دەربارەی یەك مەعنا بەم واتایە کە هەرکاتێ زاراوەکانی عەرەب جوداوازبوون دەربارەی مەعنایەك لە مەعانی، قورئانی پیرۆز بەهەموو ئەو لەفظانە دابەزیوە کە ئەو مانایە دەگەیەنن، لەهەر جێگایەکیش جوداوازی لەنێوان زاراوەکاندا نەبوو، ئەوە ماناکەی بە وشەیەك گەیاندووە، یان بە زیاتر.

---

[١] انظر: الإتقان/١٠٤.

ئەمجار زانایان کەوتوونە خیلافەوە دەربارەی (سبعة أحرف) حەوت لوغەتەکان، هەندێ وتوویانە مەبەست بە (سبعە أحرف) زاراوەکانی (قورەیش – هوذەیل – ثەقیف – هەوازن – کەنانە – تەمیم - یەمەن)ە.

ئەبو حاتەمی سەجستانی دەڵێ: قورئان بە لوغەتی قورەیش‌و هوذەیل‌و تەمیم‌و ئەزدو رەبیعەو هەوازین‌و سەعدی کوڕی بەکر نازڵ بووە، لەم بارەوە رای تریش هەیە.

ب/ کۆمەڵێکی تر لە زانایان وتوویانە مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت لوغەتە لە زاراوەکانی عەرەب؛ کە قورئان بەو حەوت زاراوانە نازڵ بووە بەم مانایە قورئان تێکڕا وشەکانی لەم حەوت زاراوە دەرناچێ؛ کە رەوانترین لوغەتی عەرەبن، زۆربەشی بە لوغەتی قورەیش دابەزیوە، بڕێکیشی بە لوغەتی هوذەیل، یان ثەقیف، یان هەوازین، یان کینانە، یان تەمیم، یان یەمەن، قورئانی پیرۆز بەتێکڕا ئەم حەوت لوغەتەی لەخۆگرتووە.

هەڵبەتە ئەم رەئیە جوداوازی بنەڕەتی هەیە لەگەڵ رای پێشوو، چونکە ئەم رایە ئەوە دەگەیەنێ: کە مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت لوغەت‌و زاراوەی جیاجیا لە سورەتەکانی قورئاندا جێگایان بۆتەوە، نەك حەوت لوغەتی جیاجیابن لە وشەیەکداو ماناکانیان یەك بێ.

ئەبو عوبەید دەڵێ: مەبەست ئەوە نیە هەر کەلیمەیەکی قورئان بە حەوت زاراوەو لوغەت بخوێندرێتەوە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە حەوت زاراوەو لوغەتەکەی تێدا کۆبۆتەوە، هەندێکی بە لوغەتی قورەیشە، بڕێکی بە لوغەتی هوذەیلە بڕێکی بە لوغەتی هەوازینە، بڕێکی بە لوغەتی یەمەنە، بە لوغەتی خێڵ‌و هۆزی تریشە.

ئەمجار ئەبو عوبەید وتوویەتی هەندێ لوغەت‌و زاراوە لەمان پشکی زیاتریان بەرکەوتووە، زۆرربەی زۆری بە لوغەتی هۆزێك، یان زیاتر نازڵ

بووەو ئەو زاراوەی زۆرترینی قورئانی پێ نازڵ بووە بەختەوەری زیاتری بۆ دەستەبەر بووە.

ج/ هەندێ وتوویانە مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت جۆرە لەشێوەی کەلام (ئەمر، نەهی، وادە، هەڕەشە، جەدەل، چیرۆك، پەند) یان (ئەمر، نەهی، حەڵاڵ، حەرام، موحکەم، موتەشابیە، پەند).[1]

د/ هەندێکی تر وتوویانە مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت جۆرە شێوەی گۆڕانە لە کەلیمەو ڕستەدا: بەم شێوەیە:-

١- گۆڕانی ناوو جوداوازی تێیدا لەڕووی ئیفرادو تەذکیرو فەرعەکانیان: کە تەثنیەو جەمعو تەئنیثە، وەکوو ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ – المؤمنون/٨﴾ وشەی ﴿لِأَمَانَاتِهِمْ﴾ جارێك خوێندراوەتەوە (الأماناتهم) بەشێوەی جەمع، هەندێکیش بە (الأمانتهم) خوێندویانەتەوە بەشێوەی موفرەد، شێوەی نووسینی وشەکە لە (رسم المصحف)دا ئیحتیمالی هەردوو قیرائەتەکەی لێ دەکرێ، چونکە دوای (نوون)ەکەی ئەلفی ساکینە نیە، سەرەنجامی هەردوو قیرائەتەکەش لە مانادا دەبێتەوە یەك، ئەگەر بەشێوەی جەمع بخوێندرێتەوە، مەبەست داگرندەبوونی هەموو ئەمانەتەکانە واتە: ئیستیغراقی جینس دەگەیەنێ.

ئەگەر بەشێوەی موفرەد بخوێندرێتەوە مەبەست جینسەو دەلالەت دەکا لەسەر مەعنای زۆر، واتە جینسی ئەمانەت هەڵبەتە لەژێر خێمەی ئەم جینسەدا جوزئیاتی زۆر هەن.

٢- ئیختیلافو جوداوازی لەڕوی ئیعرابەوە وەکوو ڕستەی ﴿مَا هَـٰذَا بَشَرًا – یوسف/٣١﴾ جەماوەری قورئانخوێنان وشەی ﴿بَشَرًا﴾ بە مەنصوبی خوێندۆتەوە، لەم ڕووەوە (ما) وەکوو (لیس) ئیسمی مەرفوعو خەبەری خۆی

---

[1] اخرجه الحاكم/٣١٤٤.

مەنصوب دەکا، ئەمەش لوغەتی ئەهلی حیجازەو قورئانیش بەو زاراوە نازڵ بووە.

ئیبنو مەسعوود (ماهذا بشرٌ) خوێندۆتەوە، لەسەر زاراوەی بەنو تەمیم، چونکە ئەوان عەمەلی (لیس) نادەنە (ما) بەلایانەوە عامیل نیە.

هەروا ئایەتی ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ – البقرة/٣٧﴾ ئادەم بە مەرفوعی خوێندراوەتەوە، (كلماتٍ) بە مەجروری خوێندراوەتەوە.

هەروا لە قیرائەتێکی تردا (آدم) بە مەنصوبی خوێندراوەتەوە (کلمات) بە مەرفوعی.

٣- ئیختیلافو جوداوازی لە تەصریفی وشەکەدا، وەکوو ئایەتی ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا سبأ/١٩﴾ وشەی (رَبَّنَا) بە مەنصوبی خوێندراوەتەوە لەسەر ئەساسی ئەوە مونادای موضاف بێ، وشەی (بَاعِدْ)یش بەشێوەی فیعلی ئەمر خوێندراوەتەوە.

لە قیرائەتێکی تردا وشەی (رَبَّنَا) بە مەرفوعی خوێندراوەتەوەو وشەی (بَاعِدْ) بەشێوەی فیعلی ماضی خوێندراوەتەوە، هەروا بەشێوەی فیعلی ماضی (مشدد العين) (بَعَّدَ)و (ربُّنا) بە مەرفوعی خوێندراوەتەوە.

هەر لەم جۆرەیە گۆڕانکاری بە گۆڕینی پیتێك بە پیتێکی تر وەکوو (یعلمون، تعلمون) بە (یاء)و (تا) یان (الصراط)و (السراط) لە ئایەتی ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ الُمستَقِيمَ – الفاتحة/٦﴾.

٤- جوداوازی بەپێش خستنو دواخستن لە پیتدا وەکوو ﴿أَفَلَمْ يَيْأَسِ الرعد/٣١﴾ کە لە قیرائەتێکدا (أفلم يأيس) خوێندراوەتەوە، یان لە وشەدا، وەکوو ﴿فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ – التوبة/١١١﴾ یەکەم بینا فاعیلو دووەم بینا مەفعول، قیرائەتێکی تر هەیە بە پێچەوانەوەن واتە: یەکەم بینا مەفعولو دووەم بینا فاعیل.

وەلێ قیرائەتی ﴿وَجَاءتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ – ق/١٩﴾ لەجیاتی (وجاءت سكرة الحق بالموت) ئەوە قیرائەتی ئاحادەو بە شاز دادەنرێو نەگەیشتۆتە پلەی تەواتور.

٥- جوداوازی بەگۆڕینی پیت لەجیاتی پیت وەکوو ﴿وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا البقرة/٢٥٩﴾ کە وشەی (ننشز) بە (ز) خوێندراوەتەوە لەگەڵ (مەضموم) کردنی (نون) بە (ر)ی بێ نوختە خوێندراوەتەوە لەگەڵ مەفتوح کردنی (نون) یان گۆڕینی وشە لەجیاتی وشە وەکوو ﴿كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ – القارعة/٥﴾ ئیبنو مەسعوود هی تریش بە (كالصوف المنفوش)یان خوێندۆتەوە، جاری وا هەیە ئەم گۆڕینە بەهۆی لێك نزیکی مەخرەجی پیتەوە دەبێ وەکوو ﴿وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ – الواقعة/٢٩﴾ بە (طلع منضود)یش خوێندراوەتەوە مەخرەجی (ح، ع) گەروەو لێك نزیکن.

جوداوازی بە زیادەو کەمی نموونەی زیادە وەکوو ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ – التوبة/١٠٠﴾ خوێندراوەتەوە (من تحتها الأنهار) بە زیادکردنی (من) ئەم دوو قیرائەتە هەردووکیان موتەواترن.

نموونەی کەمی ﴿قَالُوا اتَّخَذَ اللّهُ وَلَدًا – الكهف/٤﴾ بەبێ (و) لەپێشەوەی قیرائەتی جەماوەری قورئانخوێنان ﴿وَقَالُواْ اتَّخَذَ اللّهُ وَلَدًا – البقرة/١١٦﴾ بەبوونی (و) لەپێشەوەی، وادەبێ نموونەی زیادە لە قیرائەتی (ئاحاد)دا بە قیرائەتی ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) دەهێنینەوە (وكان أمامهم ملك يأخذ كل سفينة صالحة غصباً) بە زیادکردنی وشەی (صالحة)و گۆڕینی وشەی (وراء) بە (أمام) قیرائەتی جەماوەر ﴿وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا – الكهف/٧٩﴾ هەروەکوو نموونەی کەمیو نوقصان بە قیرائەتی (والذكر والأنثى) دەهێنینەوە کە لە جیاتی ﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى – الليل/٣﴾ خوێندراوەتەوە.

٦- جوداوازی لەهجەکان بە تەفخیمو تەرقیق، بە فەتحو ئیمالە، بە (إظهار)و ئیدغام، بە هەمزەو تەسهیل، بە ئیشمامو ئەو جۆرە شتانە، وەکوو ئیمالە پێ کردنو نەکردنی، لە ئایەتی ﴿وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى – طـه/٩﴾ (أتى)و (موسى) بەشێوەی ئیمالە خوێندرانەوە.

بە بچوك خوێندنەوەی (ر) لە ﴿خَبِيرًا بَصِيرًا – الإسراء/١٧﴾ بە قەڵەو خوێندنەوەی (اللام) لە وشەی (الطلاق)دا تەسهیل خوێندنەوەی (همزة) لە ﴿قَدْ أَفْلَحَ – المؤمنون/١﴾ ئیشمامی (غ) لەگەڵ مەکسور کردنی ﴿وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ – هود/٤٤﴾ هتد.

٧- هەندێ لە زانایان پێیان وایە ژمارەی (سبعة) لە زاراوەی عەرەبدا مەعناو مەفهومی نیە، بەڵکوو ڕەمزو هێمایە بۆ شتی کامڵو تێروتەسەلی وا گەیشتبێتە سەر ترۆپکی کامڵی، کەوابوو: کە دەگوترێ: قورئان لەسەر (سبعة احرف) نازڵ بووە، ئاماژەیە بۆ ئەوە قورئان لە لوغەتو تەرکیبیدا سنوورو ئەبوابی کەلامی عەرەبی هەموو لەخۆ گرتووەو لە کامڵیو تەواوی گەیشتۆتە ئەوپەڕو ترۆپکی کەماڵ.

بەم شێوە وشەی (سبعة) جاری وایە دەگوترێ: مەبەست زۆریو کەماڵی ئاحادەکان دەگەیەنێ، هەروەکوو چۆن (سبعون)و (سبعمائة) جاری وا دەبێ مەبەست زۆریو زەبەندەیی دەگەیەنێ نەك ژمارەی دیاریکراو.[1]

و/کۆمەڵێکی تر لە زانایان فەرموویانە مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت قیرائەتە.

ڕای ڕاجیحو پەسەند لەم ڕەئیانە، ڕەئی یەکەمەو مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت لوغەتە لە لوغەتی عەرەب: کە بۆ یەك مەعنا هاتبن، وەکوو (أقبل – تعال – هلم – عجل – أسرع) ئەمانە وشەی جیاجیان

---

[1] الإتقان/١٢٥.

بۆ یەك مانا، سوفیانی كوڕی عویەینە، ئیبنو جەریر، ئیبنو وەهەبو خەڵكێكی زۆر ئەم رایەیان پەسەند كردووە، ئیبنو عەبدولبەر ئەم ڕایەی پاڵ زۆرینەی عولەما داوە، یەكێك لە بەڵگەی ئەم رایە حەدیثی ئەبی بەكرەیە: كە تێیدا هاتووە: جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی گوت ئەی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئان لەسەر یەك زاراوەو لەهجە بخوێنە، میكائیل وتی: بۆی زیاد بكە، فەرمووی لەسەر دوو زاراوەو لەهجە بیخوێنە، دوای ئەم داوای كردو ئەو زیادی كرد تا گەیشتە شەش‌و حەوت زاراوەو لەهجە، ئەمجار فەرمووی: «كُلُّهَا شَافٍ كَافٍ مَا لَمْ تُخْتَمْ آيَةُ رَحْمَةٍ بِعَذَابٍ أَوْ آيَةُ عَذَابٍ بِرَحْمَةٍ».[1] وەكوو بڵێی (هلم – تعال – أقبل – أذهب – أسرع – عجل).

ئیبنو عەبدولبەر دەڵێ: مەبەستی بەمە پەند هێنانەوەو نموونەی رانواندن بووە بۆ ئەو زاراوانەی قورئانیان پێ نازڵ بووە، ئەوانە چەند مەعنایەكن مەفهوومیان یەكەو بیستراویان جیایە، هیچ لەو بیستراوانە مەعنایەك‌و دژەكەی ناگەیەنێ، شێوازێك نەبێ پێچەوانەی شێوازێكی تر بێ‌و نەفی بكاو دژی نەبێ، وەكوو رەحمەت: كە دەق پێچەوانەی عەزابە، زۆربەی ڕیوایەت پشتگیری ئەم مەعنایە دەكەن.

لەوانە ڕیوایەتكراوە: كە پیاوێك لای عومەری كوڕی خەتتاب قورئانی خوێندەوە، ئیمام عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕەخنەی لێ گرت‌و لێی ڕاپەڕی، كابرا گوتی: لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەم خوێند ڕەخنەی لێ نەگرتم، بووبە نیزاعیان‌و چوونەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كابرا گوتی ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە جەنابت ئایەتی فلان‌و فلانت پێ نەگوتم، فێرت نەكردم؟ ئیمام عومەر دڵی شتێكی تێكەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستی پێ كردو لە ڕوخساریدا ئەو

---

[1] اخرجه أحمد/٢٠٤٢٥ والطبراني في تفسير/١٦.

دلگۆڕانەی عومەری بینی، ئیتر بەدەستی لە سینگی عومەری داو فەرمووی: «ابعَدْ شیطاناً» شەیتان لەخۆت دوور خەرەوە، سێ جار ئەم ڕستەیەی فەرموو، پاشان فەرمووی: ئەی عومەر «إِنَّ الْقُرْآنَ كُلُّهُ صَوَابٌ مَا لَمْ يُجْعَلْ عَذَابٌ مَغْفِرَةً أَوْ مَغْفِرَةٌ عَذَاباً».[1]

لە بوسری کوڕی سەعیدەوە، دەڵێ: ئەبو جوهەیمی ئەنصاری بۆیگێڕامەوە: دوو پیاو لە ئایەتێکی قورئاندا بووبە کێشەیان، ئەمیان وتی: من ئاوام لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەرگرتووە، ئەویتریشیان وتی: من بەو شێوە لە پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، هەردووکیان چوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْقُرْآنُ نَزَلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ عَلَى أَيِّ حَرْفٍ قَرَأْتُمْ فَقَدْ أَصَبْتُمْ فَلاَ تَتَمَارَوْا فِيهِ فَإِنَّ الْمِرَاءَ فِيهِ كُفْرٌ».[2]

لە ئەعمەشەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْءًا وَأصوب قِيلًا – المزمل/٦﴾ هەندێ لەوانەی گوێیان لێ بوو وتیان: ئەی ئەبو حەمزە ئایەتەکە (واقوم)وە، تۆ بۆ وات خوێندەوە؟ وتی: (أقوم – وأصوب - وأهيأ) هەموویان یەك مانا دەبەخشن.

لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: بۆیان گێڕامەوە: کە جوبرائیلو میکائیل هاتوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جوبرائیل بە پێغەمبەری فەرمووە (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئان بە دوو زاراوەو لەهجە بخوێنە، میکائیل وتی بۆی زیاد بکە ئەویش بۆی زیاد کرد تا گەیشتە (سبعة أحرف) حەوت لەهجەو زاراوە، جا موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: ئەو لەهجەو زاراوانە دژی یەك نین لە

---

[1] اخرجه أحمد/١٦٣٦٦ من حديث أبى طلحة الأنصارى .

[2] اخرجه أحمد/١٧٨٢٠ والطبرانى فى تفسيره/٤١.

حەلاڵو حەرامدا لە ئەمرو لە نەهی‌دا، ئەوە وەكوو ئەوە وایە تۆ بڵێی (تعال – وهلم - وأقبل) ئەمجار لەشێوە خوێندنەوەی ئێمەدا ﴿إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً – يـــس/٢٩و ٥٣﴾ كە لە قیرائەتی ئیبنو مەسعووددا ئاوایە (ان كانت إلا زقية واحدة).

وەلامی ڕای دووەم (ب) كە دەڵێ: مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت لوغەتە لە لوغاتی عەرەبو قورئانیان پێ نازڵ بووە، مەبەست ئەوەیە: قورئان تێكڕا وشەكانی لەو زاراوەو لەهجانە دەرناچێ، واتە: قورئان تێكڕا لە مەجموعی‌دا شمولی هەموو لەهجەكانی كردووە، وەلامی ئەمە بەوە دەدرێتەوە: كە لەهجەو زاراوەی عەرەب لە حەوت زیاترن، لەلایەكی ترەوە ئێمە دەبینین عومەری كوڕی خەتتابو هیشامی كوڕی حەكیم هەردووكیان قوڕەیشی بوون لە یەك هۆزو بنەماڵە بوون، كەچی قیرائەتیان جوداوازی هەبووە ناشگونجێ عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ئینكاری زاراوەو لەهجەی خۆی لە هیشام بكا: كە هەردووكیان یەك لوغەتو لەهجەیان هەبووە، كەوابێ دەبێ مەبەست بە (الأحرف السبعة) غەیری مەبەستی ئەوان بێ، ئەمەش نایەتەجێ مەگەر بە ئیختیلافی ئەلفاظ لە یەك مانادا: كە ئێمە بەلامانەوە ڕاجیحو بژاردەیە.

ئیبنو جەریری طەبەری دوای ڕانواندنی كۆمەڵێك بەڵگە ئەم ڕایە بە بەتاڵو بێ بنەما دەزانێو دەڵێ: مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت زاراوەو لەهجەن لە بارەی پیتێكەوە، وشەیەكەوە، بە جوداوازی ئەلفاظەكانو یەكیەتی ماناكان، وەكوو یەكێك بڵێ: (هلم – أقبل – تعال – إلى – وقصدي – ونحوي - وقربي) نموونەی ئەمانە لەو كەلیمانەی بەگوێرەی گوتن جوداوازییان هەیەو بەلام مەعنایان یەكە، با لەكاتی دەربڕیندا زوبان بە دەنگی جیاجیا بیانگۆڕێ، وەكوو ئەو نموونانەی لەوەپێش لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەت كران، یان وەكوو ئەو نموونانەی: كە

هاوەڵان لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتیان کردوونو ئێمە ئاماژەمان پێکردن، ئەمە دەق وەکوو ئەوە وایە تۆ بڵێی: (هلم – تعال - أقبل): کە سێ لەفظی جیانو یەك مانا دەبەخشن، هەروەهاش (ما ینظرون إلا زقیة) و (إلا صیحة).

طەبەری وەڵامی پرسیارێکی مەزەندەکراوی داوەتەوە، دەڵێ: ئەگەر یەکێك پرسیار بکا بڵێ: لەکوێی قورئاندا ئێمە حەرفێکمان دەست دەکەوێ بە حەوت لەهجەو لوغەتی جیاجیا بخوێندرێتەوە، (ألفاظ)یان جیاو مەعنایان یەك بێ؟ هەر بۆخۆی وەڵامی داوەتەوەو دەڵێ: ئێمە ئیدیعای ئەوەمان نەکردووە؛ کە ئەمڕۆ شتی وا لە قورئاندا هەبێ.

دەربارەی پرسیارێکی تری مەزەندە کراو؛ کە بگوترێ: ئەمڕۆ قورئان لەسەر یەك حەرفو لەهجەو زاراوە دەخوێندرێتەوە، ئەی شەش حەرفو لەهجەکانی تر چیان لێ هاتووە؟! لە وەڵامدا دەڵێ: ئوممەتی موسوڵمان فەرمانی پێکراوە قورئان فێر ببنو لەبەری بکەن، سەرپشك کراون لە خوێندنەوەو لەبەرکردنیدا بەکام لەهجەو حەرفانە لەو حەوت لەهجەو حەرفانە دەیخوێننەوە بیخوێننەوە، پاشان لە ترسی فیتنەو چەواشەکاری پێویست بوو لە زەمانی ئیمام عوسماندا (ڕەزای خودای لێ بێ) خەڵکەکە بە یەك لەهجەو زاراوە بیخوێننەوە، ئیتر کۆڕای موسوڵمانان لەسەر ئەمە دامەزرا، هەموویان لەسەر یەك لەهجە کۆك بوون، کۆڕای موسوڵمانانیش لەگومڕاییو درۆ پارێزراوە، موسوڵمانان لەسەر شتی بەتاڵو پوچ کۆنابنەوە.

وەڵامی ڕای سێیەم (ج) کە دەڵێ: مەبەست بە (سبعة أحرف) حەوت جۆر لە (فەرمان – نەهی – حەلاڵ – حەرام – موحکەم – موتەشابیه - پەند) وەڵام دراوەتەوە بەوە: کە ظاهیری فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە دەگەیەنن: کە مەبەست بە (الأحرف السبعة) ئەوەیە کەلیمەیەك بە دوو شێوە، یان سێ شێوە تا حەوت شێوە دەخوێندرێتەوە،

ئەمەش بۆ ئاسانكاری لەسەر موسوڵمانان، ئاشكراشە یەك شت لە یەك ئایەتدا ناگونجێ حەڵاڵیش بێو حەرامیش بێ، ئاسانكاریو كراوەیی بەوە نابێ حەڵاڵ حەرام بكەی حەرام حەڵاڵ بكرێ، یان مەعنایەك لەو مەعنایانەی گوتران گۆڕانكاریان تێدا بكرێ.

ئەوەی چەسپاوە لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) كە لەوەپێش ئاماژەمان پێ كردن، ئەوەیە هاوەڵان: كە ڕاجیاییان بۆ دروست بوو، بۆ یەكالاكردنەوەی ڕاجیاوازەكان چوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش گوێی لەشێوە خوێندنەوەی هەموانیان گرتووە، پاشان هەموویانی بە ڕاستو صەحیح داناوەو بە هیچیانی نەفەرمووە شێوە خوێندنەوەی تۆ هەڵەیە، یان ئەمەیان باشترە لەوە، وێڕای جوداوازی خوێندنەوەكەیان تەنانەت هەندێك لەو هاوەڵانە شكو گومانێكی بۆ دروستبووەو بەلایەوە جێگای سەرسوڕمان بووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو شێوە خوێندنەوە لێك جیایانەی قبوڵ بێو هیچیان بە هەڵە دانەنێ، بۆیە بەو هاوەڵەی فەرمووە: كە كەوتە گومانەوە لە بەڕاست زانینی هەموو شێوە خوێندنەوەكان «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِی أَنْ أَقْرَأَ عَلَیْكَ الْقُرْآنَ علی سبعة أحرف».[1]

ئاشكراشە شكو گومانی هاوەڵان لەو بارەوە، ئەگەر گومانو ڕاجیاوازەكانیان دەربارەی حەڵاڵكردنو حەرامكردنو وادەو هەڕەشە بوایە، واتە: ئەگەر شێوە خوێندنەوەی ئەمیان شتێكی حەرام بكردایەو خوێندنەوەی ئەویتریان حەڵاڵی بكردایە، شێوە خوێندنەوەی ئەم هاوەڵە وابوایە (وعید) ئامێزبوایەو هی ئەو هاوەڵە وادەو (وعد) بوایە، محاڵ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندنەوەی هەردووكیان بە ڕاست دابنێو فەرمان بە هەموو ئەوانە بكا: كە هەریەكەیان پابەندی شێوە

[1] ذكره الطبری فی تفسیره ٤٨/١ واخرجه مسلم/١٩٠٦ واحمد/٢١١٧٢.

خوێندنەوەی خۆی بێو خوێندنەوەکەی صەحیحو دروستە، چونکە ئەگەر ئەوە دروست بوایە، لێیەوە لازم دەهات پەروەردگار فەرمان بە کردنی شتێك بکاو بە واجبی دابنێ بەگوێرەی شێوەی خوێندنەوەی ئەو کەسەی خوێندنەوەکەی واجببوونی ئەو شتە دەگەیەنێ، لەهەمان کاتدا نەهی لە کردنی هەمان شت بکاو داوا بکا خۆی لێ بپارێزن بەگوێرەی شێوە خوێندنەوەی ئەو کەسەی خوێندنەوەکەی نەهیو خۆپاراستن لەو شتە بگەیەنێ، یان موسوڵمانان سەرپشك بکا لە کردنو نەکردنی هەمان شتو رێگە بدا هەندێ لە بەندەکانی ئەگەر ویستیان ئەو شتە بکەنو هەندێکیشیان ئەگەر نەیان ویست نەیکەن، ئەمەش بەگوێرەی شێوە خوێندنەوەی ئەوکەسەی خوێندنەوەکەی (تخییر)و سەرپشکی دەگەیەنێ.

هەڵبەتە ئەمە ڕاوبۆچوونێکە ئەگەر کەسێك بیڵێ ئیثباتکردنی شتێکە: کە خودا نەفی کردووەو قورئانی خۆی لێ پاراستووە، دەفەرموێ: ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا – النساء/٨٢﴾ جا کە پەروەردگار بۆخۆی ئەو حاڵەتەی نەفی کردو بە دەقێکی صەریح ئەو صیفەتەی لە قورئان دارنی، ئەمە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە: کە ئەو قورئانەی بۆ پێغەمبەری ناردووە (دروودی خودای لەسەر بێ) یەك حوکمو مانا دەگەیەنێو بۆ هەموو مەخلوقاتی خۆی یەکسانە، هەرگیز شتی وای تێدا نیە بە قیرائەتێك بۆ زەید فلان شت حەرام بێو بە قیرائەتێکی تر هەمان شت بۆ عەمر حەڵاڵ بێ!!

بۆ وەڵامی ڕەئی چوارەم (د) کەپێی وایە مەبەست بە (الأحرف السبعة) ئەو وجوهە گۆڕانکارییانەن کە ئیختیلافیان تێدا دێتە دی وەکوو (لامنتهم) کە دەکرێ بە کۆ (لأماناتهم) بخوێندرێتەوە، یان بە تاك (لأمانتهم) بخوێندرێتەوە، هەروا نموونەکانی کە لە برگەی (د)دا ئاماژەیان پێ کراوە.

بۆ وەڵامی ئەم رەئیە دەگوترێ: هەرچەندە ئەم بۆچوونە باوو شائیعەو مەقبول‌و وێچوشە، وەلێ لە بەرامبەر بەلگە بەهێزەکانی رەئی یەکەمدا بێ نمودو لاوازە، برێ لەو وجوهو ئیختیلافانەی باسیان کردوون‌و بەشێوەی بەلگە ئاراستەیان کردوون بە قیرائاتی ئاحاد وارید بوون، ئاشکراشە: کە دەبێ هەرچی قورئان بێ پێویستە موتەواتەر بێ‌و لەرێگەی تەواتورەوە نەقڵ کرابێ‌و بەئێمەش گەیشتبێ.

زۆربەی ئەو جوداوازییانەی لەم برگەی (د)دا باس کراون، دەگەرێندرێنەوە بۆ شکڵ‌و شێوەی کەلیمەکە، یان شێوەی دەربرینی کە گۆرانێکی ئەوتۆ لە لەفظەکە پەیدا ناکەن، وەکوو ئیختیلاف لە ئیعرابدا، یان لە تەصریف، یان تەفخیم، یان تەرقیق، یان فەتح‌و ئیمالەو ئیظهارو ئیدغام‌و ئیشمام‌و شتی وا، ئەم جۆرە جوداوازییانە لەوانە نین لەفظو مەعنا بگۆرن، چونکە ئەم صیفاتە جۆراو جۆرانە کەلیمە لە ئەداکردندا لەفظەکە وا لێ ناکەن بەدوو لەفظی لێك جیا دابندرێن.

خاوەنانی ئەم رایە پێیان وایە موصحەفەکانی عوسمان شێوە نووسینەکەیان بەجۆرێکە هەر حەوت قیرائەتەکەیان تێدا دەستەبەر ببێ بۆ نموونە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ – المؤمنون/٨﴾: کە بەشێوەی کۆو تاك دەخوێندرێتەوە لە (رسم المصحف)ی عوسمانی‌دا (لِأَمَانَاتِهِمْ) بەبێ لێك بچران نووسراوە ئەلفێکی پچوك لەسەر میمەکە کراوە. هەروا ئایەتی ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا – سبأ/١٩﴾ لە رەسمی عوسمانی دا (بَاعِدْ) نووسراو بەبێ لێك پچران‌و ئەلفێکی پچوك لەسەر (با)کە کراوە.

بەڵام ئەمە بۆ ئەوان نابێتە بەلگە بۆ هەموو ئەو جوداوازییانەی باسیان دەکەن، وەکوو جوداوازی بەزێدەو کەمی لە ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ – التوبة/١٠٠﴾ کە لە قیرائەتێکدا (مِنْ تَحْتَهَا الأَنْهَارُ) خوێندراوەتەوە بەزێدەی (مِنْ) یان ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى –

الليـل/٣﴾: کـه لـه قیرائەتێکدا (الـذَّكَرَ وَالْـأُنثَى) خوێندراوەتـەوە، بـەبێ (مَـا خَلَقَ).

هـەروەها ئیختـیلاف بـەپێش خـستنو پـاش خـستن وەکـوو ئایـەتی ﴿وَجَاءتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ – ق/١٩﴾ لـه قیرائەتێکدا ﴿وَجَـاءتْ سَـكْرَةُ الحقّ بالموت﴾ خوێندراوەتەوە.

یـان جـوداوازی بـەگۆڕینی وشـەیەك بـە یـەکێکی تـر وەکـوو ئایـەتی ﴿وَتَكُــونُ الْجِبَــالُ كَــالْعِهْنِ الْمَنفُــوشِ – القارعــة/٥﴾ لــه قیرائەتێکـدا خوێندراوەتەوە ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْصوف الْمَنفُوشِ﴾.

خۆ ئەگەر موصحەفی عوسمـان ئـەم هـەموو جـوداوازیو قیرائاتانـەی لەخۆی بگرتنایە، (رسم المصحف)ی عوسمان نـەدەبوە یەکالاکـەرەوەی نیـزاعو جـوداوازی قیرائەتـەکانی: کـە عوسمـان ترسـا فیتنــەو ئاشـوبی لێ وەدی بـێ، بەڵکوو یەکالاکردنەوەی نیزاعەکە بـەوە تـەواوبوو: کـە خەڵکەکـە هـەموویان لەسەر یـەك شـێوە خوێندنـەوە رایـان یەکدیگیر بـوو کـۆڕای لەسـەر دامـەزرا، هەموو هاوەڵان بڕیاریاندا قورئـان لەسـەر یـەك شـێوەزاراوە (قیرائـەت) لـەناو ئەو حەوت لەهجەو زاراوەی قورئـانی پـێ نـازڵ بـوو بـوو، بخوێنـدرێ، ئەگـەر وانــەبێو ئەمــە نــەبووبێ، جـوداوازی لــە قیرائەتەکانــدا درێــژەی دەکێـشاو مەترسـییەکەی ئیمـام عوسمـان بـەردەوام دەبـوو، هـیچ جـوداوازی نـەدەبوو لەنێوان کۆکردنەوەی قورئان لەسەردەمی ئەبوبەکرو کۆکردنەوەی لـەزەمانی عوسماندا. ئەوەی: کە ئاثارو ریوایەتەکان ئاماژەی پێ دەکەنو دەیـچەسپێنن. کۆکردنەوەو نووسـینەوەی قورئـان لەسـەردەمی ئیمـام عوسمانـدا بریتـی بـوو لەنووسینەوەی لەسـەریەك شێوە زاراوە لەحـەوت شێوە زاراوەکـان، بۆئـەوەی موسوڵمانان لەسەر یەك قیرائەتو شێوەزاراوە رابـێن، ئـەویش شـێوە زاراوەی قـورەیش بـوو، چـونکە ئیمـام عوسمـان پێـی وابـوو، خوێندنـەوەی قورئـان لەسەرەتادا بـە (سبعة أحرف) حـەوت زاراوەو قیرائـەت بـۆ رەفعـی حـەرەجو

ئاسانكاری لەسەر موسوڵمانان بووەو كارێكی پێویست بووە، ئێستا ئەو پێویستییە نەماوە، حەسمی مادەی جوداوازی نێوان قیرائەتەكان بەوە دەكرێ خەڵكەكە لەسەر یەك قیرائەت كۆبكرێنەوە، ئیتر ئەوەبوو هاوەڵان بەم پێشنیارەی ئیمام عوسمان ڕازیبوونو بووبە كۆڕاو ئیجماع.

لە ڕۆژگاری ئەبوبەكرو عومەردا (ڕەزای خودایان لێ بێ) هاوەڵان پێویستیان بەو جۆرە كۆكردنەوەی قورئان نەبوو كە لەسەردەمی عوسماندا ئەنجام درا، چونكە لە ڕۆژگاری ئەواندا (واتە: ئەبوبەكرو عومەر) ئەو خیلافو راجیاییەیە لە قیرائەتدا سەری هەڵنەدابوو: كە لە زەمانی ئیمام عوسماندا پەرەی سەندبوو، بەمەش ئیمام كارێكی گەورەو سودبەخشی ئەنجام داو خیلافو فیتنەیەكی گەورەی خاموش كردو كەلیمەی موسوڵمانانی یەك خستەوەو ئوممەتی موسوڵمانی خستە دڵنیاییەوە.

دەربارەی ڕای پێنجەم: كە بەم پێیە ژمارەی (حەوت) مەعنای نیەو رەمزو هێمایە بۆ كامڵبوونو گەیشتن بە پلەی كەماڵ، وەڵام دەدرێتەوە بەوە فەرموودەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە دەقی صەریحو ڕوونو ئاشكرا حەقیقەتی ژمارەی حەوتو سنوورەكانی دەگەیەنن «أَقْرَأَنِـي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ فَرَاجَعْتُهُ ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ وَيَزِيدُنِي حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ». [1] یان دەفەرموێ: «إن ربي أرسل إلي: أن أقرأ القرآن على حرف، فرددت عليه: أن هوّن على أمتي فأرسل إلي: أن أقرأ على سبعة أحرف». [2] دەی ئەم دوو فەرموودە بە ئاشكرا حەقیقەتی ژمارەی حەوت دەگەیەنن سنوورەكەی دیاری دەكەن.

ڕای شەشەم: كە دەڵێ: مەبەست بە (الأحرف السبعة) حەوت قیرائەتەكەیە، بەوە وەڵام دەدرێتەوە دەگوترێ: قورئان غەیری قیرائاتە،

---

[1] أخرجه البخار/٤٩٩١ ومسلم/١٩٠٢.

[2] أخرجه مسلم/١٩٠٦ وأخرجه الطبري/٣٠

قورئان وەحیی نازڵ کراوە بۆ سەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بە مەبەستی بەیانو ئیعجاز، قیرائەتەکان بریتین لە جوداوازی چۆنیەتی گوتنو دەربڕینی وشەکانی وەحی لەڕوی تەخفیفو قورسکردنو درێژکردنەوەی ئەم کەلیمەو ئەو کەلیمە.

ئەبو شامە دەڵێ: کۆمەڵێك لە زانایان پێیان وایە مەبەست بە (سبعة أحرف) لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) حەوت قیرائەتە موتەواتەرەکانن، ئەمەش پێچەوانەی کۆڕای زانایانی ئیسلامەو بیروبۆچونی هەندێ نەزانە.[1]

ئیمامی طەبەری دەڵێ: ئەو ئیختیلافو جوداوازییەی لە قیرائەتەکاندا هەیە وەکوو ئەوە حەرفێك بە مەرفوع بکەی، یان مەنصوب بکەی، یان مەجرور بکەی، یان سکونی بدرێتێ، یان حەرەکەی بخرێتە سەر، هەروا گواستنەوەی حەرفێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ویڕای مانەوەی شکڵی نووسینەکەی لەسەر یەك شێوە، ئەوە بەهیچ جۆرێ مانای حەدیثەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) «أمرت أن أقرأ القرآن على سبعة أحرف» نایگرێتەوە، چونکە ئاشکراو عەیانە حەرفێك نیە لە حەرفەکانی قورئان بەوجۆرە جوداوازی قیرائەتەکان لە خوێندنەوەیدا هەبێ، بەم مەعنایە گومان لێکردنی ببێتە هۆکاری کافربوونی گومانبەر، کەس لە زانایانی ئوممەت ئەم قسەیەی نەکردووە.

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی چەسپاندووە: کە هەرکەسێك گومانی لە قیرائەتە موتەواتەرەکاندا بێ پێی کافر دەبێ، ڕیوایەتەکان بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنن.

وێدەچێ ئەوەی ئەم ڕاجیایی‌و ئیختیلافەی زەق کردۆتەوە ئەومیە (سبعة أحرف) کە بەمانا حەوت لوغەتو زاراوەیە لەگەڵ (سبع قرآت): کە

---

[1] بڕوانە: الإتقان ص١٧٢.

بەمانا حەوت شێوازی خوێندنەوەیە لە ژمارەکەدا: کە حەوتە، یەکن، بۆیە زانایان لێیان تێکچووەو کەوتوونە ئەم خیلافو راجیاییەوە.

ئیبنو عەممار دەڵێ: ئەوەی ژمارەی ئەم (حەوت)ەی بەسەر قیرائاتەکاندا سەپاندووە، کارێکی کردووە نەدەبوو بیکا، موشکیلەو چەواشەکارییەکی بۆ خەڵکەکە بەگشتی ناوەتەوە، هەرکەسێك تێگەیشتنی وردی نەبێ وادەزانێ ئەم قیرائاتانەی لێرەدا باس دەکرێن هەمان ئەو قیرائاتانەن: کە لە فەرموودەکەدا ئاماژەیان بۆ کراوە، خۆزگە ئەو کاتەی قیرائەتەکانی لە ژمارەی (حەوت)دا قەتیس کردن وای نەکردایە، یان لە خوار حەوتەوە، یان لە ژوور حەوتەوەی دیاری بکردنایە، بۆ ئەوەی ئەم شوبهەو گۆڕینەوەی حەوت قیرائەت بە حەوت لۆغەت نەهاتایە دیو سەری هەڵنەدایە.

بەم توێژینەوەو بەراوردکردنە بۆمان دەردەکەوێ رای یەکەم (أ) ئەو رایەی پێی وایە مەبەست بە (سبعة أحرف) حەوت زاراوەیە لە زاراوەی عەرەب دەربارەی یەك مانا، هەر ئەمەیە: کە لەگەڵ ظاهیری دەقەکان دێتەوەو بەڵگە صەحیحەکان پشتگیری دەکەن.

ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم «إن الله أمرني أن أقرأ القرآن على حرف واحد فقلت رب خفف عن أمتي، فأمرني إقرأ على حرفين، فقلت رب خفف عن أمتي فأمرني أن أقرأ على سبعة أحرف من سبعة أبواب الجنة كلها شافٍ كافٍ».[1]

شێخی طەبەری دەڵێ: حەوتەکەی تر ئەوەیە: کە وتمان بریتین لە حەوت زمانەکان، حەوت دەرگای بەهەشت ئەو مەعنایانەن: کە لەخۆی گرتوون لە ئەمرو نەهی لە تەرغیبو تەرهیبو قەصەصو مەثەلو پەند.

---

[1] رواه مسلم والطبرى.

ئەم مەعانییانەی: کە مرۆڤ کاری پێ بکاو بە تەواوی ئەنجامیان بدا، مافی چوونە ناو بەهەشتی بۆ دەستەبەر دەبێ، سوپاس بۆ خودا لە ڕاوبۆچوونی ئەوانەی ئەم قسەیان کردووە، خیلافێك نابیندرێ بۆ ئەوەی ئێمە گوتومانە مانای (کلها شافٍ کافٍ) وەکوو پەروەردگار لە وەصفی قورئاندا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ – يونس/٥٧﴾ پوختەی مەعنای ئەوەیە: خودا قورئانی کردووە بە شیفا بۆ موسوڵمانان بە ئامۆژگارییەکانی شیفای نەخۆشییەکانی دڵو دەروونیان دێ، ئەو دەردو نەخۆشییانەی بە وەسوەسەو ختوکەی شەیتان دەکەوێتە ناو دڵیانەوە، قورئان چارەسەریان دەکا.

قورئان بەسیانەو لە هەموو ئامۆژگارییەکی بێ ئاتاجیان دەکا، بە ئایەتەکانی هەموو شتێك ڕون دەکاتەوە.

## حیکمەتی نازڵبوونی قورئان بە حەوت زاراوەو لەهجە

حیکمەتی نازڵبوونی قورئان بە حەوت زاراوە لە سێ خاڵدا چڕ دەبێتەوە:

١- ئاسانکاری خوێندنەوەو لەبەر کردنی بۆ گەلو نەتەوەیەکی نەخوێندەواری وەکوو عەرەبی ئەو سەردەمە: کە هەر هۆزەو زاراوەیەکی نیمچە تایبەتی خۆی هەبوو، هیچ شەریعەتو یاسایەکی ئاسمانییان ئاگا لێ نەبوو چ جایی خوی پێوەبگرنو پێی ئاشنابن، ئەم حیکمەتە بەڕوونی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆ دەکەن.

لە ئوبەیەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای (أحجار المراء) بە جوبرائیل گەیشت، پێی فەرموو: «إِنِّي بُعِثْتُ إِلَى أُمَّةٍ أُمِّيِّينَ فِيهِمُ الشَّيْخُ الْعَاصِي وَالْعَجُوزَةُ الْكَبِيرَةُ وَالْغُلَامُ ». قَالَ فَمُرْهُمْ فَلْيَقْرَءُوا

الْقُرْآنَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ».[1] ئەمن كراوم بە پێغەمبەرو ڕەوانە كراوم بۆ سەر نەتەوەیەكی نەخوێندەوار، غولامی تازە پێگەیشتووی نەزانو خزمەتكارو پیرەمێردی بەسالاچووی لاوازو پیرەژنی پۆلكاویان تێدایە، چۆن فێری ئەم كەلامە ئاسمانییە دەبن؟ جوبرائیل فەرمووی: با قورئان فێر ببنو بیخوێننو بە حەوت زاراوەو لەهجە، بە كامەیان بۆیان ئاسانە بەوە بیخوێنن.

هەروەها فەرموودەی: «إن الله أمرني أن أقرأ القرآن على حرف، فقلت اللهم خفف عن أمتي» یان فەرموودەی «إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفٍ. فَقَالَ « أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ».[2]

٢- ئیعجازی قورئان بەو سروشتە لوغەوییەی لای عەرەبەكان باو بوو، چونكە فرە لایەنی پێكهاتە دەنگییەكان بۆ قورئانی پیرۆز، بەجۆرێك هەموو لقو پۆپی لەهجەو زاراوە زمانیەكانی عەرەب بگرێتەوە، ئەو لقو فروعە زمانیانەی سروشتی لوغەتی عەرەبی لێ پێك هاتووە، بۆ ئەوەی هەموو عەرەبێك بتوانێ بە پیتو وشەی خۆیو لەحنە سروشتییەكەیو لوغەتو زاراوەی خۆی قورئان بخوێنێو وێڕای لەدەست نەدانی ئەو ئیعجازو سەرئاساییەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەحەدای عەرەبی پێكردو بۆڕی دانو نائومێد بوون لە بەرامبەریكردنی، ئەم ئیعجازەش ناگونجێ بۆ لەهجەو زاراوەیەك بێو بۆ لەهجەو زاراوەیەكی تر نەبێ بەڵكوو ئیعجازەكە بۆ سروشتە زمانەوانیەكەی خودی عەرەبییەكەیە لای عەرەب!

٣- سەرئاسایی قورئان لەڕوی مەعناو حیكمەتەوە، بێگومان گۆڕانی وێنە لەفظییەكانی قورئان لەبڕێ پیتو وشەدا، ئامادەباشی ئەوەیان تێدا دەخولقێ حوكمی شەرعییان لێ وەرگیرێ بەجۆرێك: كە قورئان وا لێ بكا بۆ هەموو چەرخو ڕۆژگارێك بگونجێ، هەر بۆیە فەقیهو موجتەهیدەكان

---

[1] أخرجه الترمذی/٣١٧٢ وأحمد/٢١٢٠٤ (أحجار المراء) شوێنێكە لە مەككە.

[2] ئەم دوو فەرموودە لەپێشەوە تێپەڕین.

لەبواری دەرهێنانی ئەحکام لە قورئان بەڵگەیان بەقیرائاتی (الأحرف السبعة) هێناوەتەوە.

## ١٠) قیرائاتی قورئانو قاریئەکان

قیرائات (القرآت) کۆی قیرائەتە ئەویش چاوگی (قرأ)یە لە زاراوەو ئیصطیلاحی عیلمیدا ڕێبازێکە، شێوازێکە لەشێوازەکانی خوێندنی قورئان: کە پێشەوایەك لە پێشەوایانی قورئانخوێنان بەشێوازێك خوێندبیەتیەوە جیاواز بێ لەشێوازی خوێندنەوەی ئیمامێکی تر.

قیرائەتەکان بە ڕشتەو سەنەد بردراوەنەوە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی ثابیتو چەسپاوە.

ڕۆژگاری قاریئەکان کە موسوڵمانان پەیڕەوی شێوازی قورئانخوێندنەوەی ئەوان دەکەن، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێگومان لەناو هاوەڵاندا چەند کەسێك مەشهور بوون بە قورئانخوێنی شارەزاو قورئانلەبەر، لەوانە: ئوبەی، عەلی، زەیدی کوڕی ثابیت، ئیبنو مەسعود، ئەبو موسای ئەشعەری، هی تریش، زۆربەی هاوەڵانو تابیعین لە شارە گەورەکانی موسوڵمانیشینی ئەو سەردەمە لەم هاوەڵانە قورئانخوێندن فێربوونو هەموو ئەمانەش لە پێغەمبەریان بیستووەو لەوەوە قورئان فێربوون.

ئیمامی (الذهبی) لە (طبقات القراء)دا دەڵێ: ئەو هاوەڵانەی بەناو بانگ بوون بە قورئانخوێنی لێزان حەوت کەسن: عوسمان، عەلی، ئوبەی، زەیدی کوڕی ثابیت، ئەبو دەرداو، ئیبنو مەسعوود، ئەبوموسای ئەشعەری، ئەمجار دەڵێ: کۆمەڵێك لە هاوەڵان لەلای ئوبەی قورئانیان خوێندووە، لەوانە: ئەبو هورەیرە، ئیبنو عەبباس، عەبدوڵڵای کوڕی سائیب، ئیبنو عەبباس لەلای زەیدی کوڕی (ثابت)یش خوێندویەتی.

ئەمجار لەم هاوەڵانەوە خەڵكێكی زۆر لە تابیعین لە شارە گەورە موسوڵمانئنیشینەكانی ئەو ڕۆژگارەدا فێری قورئان خوێندن بوون.

لەوانەی تابیعی بوونو لە مەدینە فێری قورئانخوێندن بوون سەعیدی كوڕی المسیب، عوروە، سالم، عومەری كوڕی عەبدولعزیز، سولەیمانو عەطاء، كە كوڕێ یەسار بوون، مەعاذی كوڕی (الحارث) كە ناسراوە بە (المعاذ القارئ) عەبدوڕەحمانی كوڕی هورموز (الأعرج)، ئیبنو شیهابی (الزهری)، موسلیمی كوڕی جوندوب، زەیدی كوڕی ئەسلەم.

لەو تابیعییانەی لە مەككە فێری قورئان خوێندن بوون: عوبەیدی كوڕی عومەیر، عەطائی كوڕی ئەبی رەباح، طاووس، موجاهید، عیكریمە، ئیبنو أبی ملیكە.

ئەوانەی لە كوفە فێر بوون عەلقەمە، الأسود، مەسروق، عوبەیدە، عەمری كوڕی شورەحبیل (الحارث)ی كوڕی قەیس، عەمری كوڕی مەیمون، ئەبو عبدالرحمن السلمی، سەعیدی كوڕی جوبەیر، النخعی، الشعبی.

لەو تابیعیانەی لە بەصرە فێری قورئان بوون، ئەبو عالیە، ئەبو رەجاء، نەصری كوڕی عاصم، یەحیای كوڕی یعمر، الحسن، ئیبنو سیرین، قەتادە.

لە وڵاتی شامیش (المغیرة)ی كوڕی ئەبو شیهابی المخزومی، صاحب عثمان، خەلیفەی كوڕی سەعد، صاحب أبی الدرداء.

لە ڕۆژگاری تابیعیندا لەكۆتایی سەدەی یەكەمی كۆچیدا كۆمەڵێك لێ بڕان بۆ خزمەتكردنی قورئانو كۆنترۆڵ كردنی خوێندنەوەی، ئەوپەڕی گرنگیان بەم بوارە داو خۆیان بۆ تەرخان كرد، ئەمەش بارودۆخێك بوو پێویست بوو ئەوە بكرێ، بەڵێ: پەرەیان پێداو كردیانە عیلمێكی سەربەخۆو گرنگ، وەكوو چۆن زانستە شەرعیەكانی تریان ئاوا لێكردن، ئەم كۆمەڵە قورئانخوێنو گرنگیدەرانە بە بواری قیرائاتو زانستە قورئانییەكان بوونە

پێشەواو رابەر لەو بوارەداو خەڵکی شوێنیان کەوتن‌و تێشوویان لەکۆڵ داو بۆ خزمەتیان سەفەریان کرد، لەنێو ئەوان‌و چینی دوا ئەوان حەوت پێشەواکانی کە ئەمڕۆ قیرائاتی سەبعەیان پاڵ دەدرێ دەرکەوتن‌و ناویان بە جیهانی ئیسلامی‌دا بڵاوبۆوەو بوونە حەوت ئەستێرەی پرشنگداری ئاسمانی زانستە قورئانییەکان لەشاری مەدینەدا، ئەبو جەعفەر، یەزیدی کوڕی القعقاع، پاشان نافیعی کوڕی عەبدولڕحمان ناوبانگیان دەرکرد، لە مەککەش: عبدالله بن کثیر، حمید بن قیس الأعرج بوون بە سەردەستەی قورائەکان.

لە شاری کوفەش عاصم بن أبی النجود، سلیمان الأعمش، پاشان حمزة، دوایی الکسائی بوونە رابەرو پێشەوا، لە بەصرەشدا عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئیسحاق، عیسای کوڕی عەمر، ئەبو عەمری کوڕی العلاء، عاصم الجحدری، پاشان یعقووب الحضرمی، لەبواری قیرائەتدا نازناوی ئیمامەتیان بەدەست هێنا، لە وڵاتی شامیشدا عەبدوڵلای کوڕی عامیر ئیسماعیلی کوڕی عەبدوڵلای (المهاجر) پاشان یەحیای کوڕی (الحارث) ئەمجار شورەیحی کوڕی یەزیدی (الخضرمی) لەم بوارەدا پێشەوایەتییان بەدەست هێناوە.

حەوت ئیمامە قورئانخوێنەکان: کە لەناو ئەم حەمکە قاریئانەدا ناویان دەرکردووەو لەناو جیهانی ئیسلامی‌دا مەشهورو ناوسراون: بریتیین لە (ئەبو عەمر، نافیع، عاصم، حمزة، الکسائی، ئیبنو عامیر، ئیبنو کەثیر).

بەگوێرەی ئەصەحی ڕاوبۆچوونەکان قیرائات غەیری (االأحرف السبعة)ن هەرچەندە یەکسانی ژمارەکەیان وادەخاتە زەینی هەندێ کەسەوە: کە دوو ناون‌و بۆیەك مانا، بەڵام ئەمە هەڵەیە، چونکە قیرائات مەزهەب‌و ڕێبازی ئیمامەکانن، ئەم قیرائەتە جۆراوجۆرانە باقین‌و خەڵك بەو قیرائاتانە قورئان دەخوێنێ، بنەمای ئەم قیرائاتانەش جوداوازی لەهجەو زاراوەکانی عەرەب‌و چۆنیەتی دەربڕینیان‌و شێوەی ئەدا کردنیان لەڕوی تەفخیم‌و تەرقیق‌و ئیمالە ئیدغام‌و ئیظهارو ئیشباع‌و مەدو قەصرو تەشدیدو

تــەخفيف، هــەموو ئەمانــەش لــە يــەك لۆغەتــدا: كــە لۆغــەتى قورەيــشە كۆبوونەوە.

وەلێ (الأحرف السبعة) وەكوو لەپێشەوە ئاماژەمان پێكرد جياوازە لـە قيرائــاتى (ســبعة) بێگومــان لــە (عرضــة الأخــيرة) دواجــارى رانوانــدنو خوێندنەوەى قورئاندا لەلايەن پێغەمبەرەوە (دروودى خوداى لەسەر بێ) بـە ئامادەبوونى جوبرائيل ديـاردەى (الأحـرف السبعة) كۆتـايى پـێ هێنـدرا، بـە تايبــەتى كاتێــك فتوحــاتى ئيــسلامى بــەرفراوان بــوو، ئــيتر بيــانوو بــۆ فــرە لوغــەتى نــەماو ترســى فيتنــەو فەســاد هاتــە كايــەوەو لەســەردەمى ئيمــام عوسمانـدا هـاوەڵان وا ئاراستەكران لەسـەر يـەك حـەرف – نـەك بـە حـەوت حەرف – قورئان بخوێنن، كـە بريتـى بـوو لـە لوغـەتى قـورەيشو بـەگوێرەى زمانى ئەوان نووسرايەوە لە مەصاحيفداو بڵاوكرايەوەو چەسپا.

## قاريئەكان زۆرن و كەچى لەسەر حەوت كورت كراوەتەوە

شـێوە خوێنـدنى ئـەو حـەوت قاريئـە جێگـاى هـاوڕاى عولەمايـەو هەموويان پەسەنديان كردوون، ئەمجار زانايان وێـڕاى قيرائـەتى ئـەو حەوتـە سێ قـاريئى تريـشيان هەڵبـژاردووە: كـە قيرائەتەكـەيان صـەحيحەو جێگـاى متمانەيەو بە تەواتور بەئێمە گەيشتووە، ئەوانيش (ئەبو جەعفەر يزيد بـن القعقــاع المــدنىو يــەعقوبى كــوڕى ئيــسحاقى الحـضرمىو خەلــەفى كــوڕى هيشام)ن ئەم سێيەو حەوتـەكانى پێشوو هەريەكـەيان خـاوەنى قيرائەتێكـەو بـە (أصـحاب االقـرآت العـشر) مەشـهورن، خاوەنـانى دە قيرائەتـە موتـەواترو صەحيحەكانن.

جگـە لـەم (دە) قيرائەتــە ئــەوانى تــر بــە (شــاذ) دادەنــرێن، وەكــوو قيرائەتى (اليزيـدى، الحسن، الأعمـش، إبـن جـبير)و هـى تـيش، دەبـێ ئـەوەش بـــزانين (دە) قيرائەتـــە موتەواتەرەكـــەش تەنانـــەت حـــەوت قيرائەتـــە

مەشهورەكانیش لە (شاذ) خالّی نینو زۆر (شاذ)یان تێدا هەن، پێویستە ئاماژە بەوەش بكرێ: كە ئیختیاری حەوت قاریئەكان (القراء السبعة) پیشەی عولەمای (متأخرین)ە لەسەدەی سێیەمدا ئەوان ئەم دەستەواژەیان داهێنا، ئەگینا پێشەوایانی متمانەپێكراو بە زانیاریو راستاڵییان زۆرن، موسوڵمانان لە كۆتایی سەدەی دووەمدا لە بەصرە بەشێوەی قیرائەتی ئەبو عەمرو یەعقوب قورئانیان دەخوێند، لە كوفە بە قیرائەتی حەمزەو عاصم قورئانیان دەخوێند، لە شام بەشێوازی قیرائەتی ئیبنو عامیرو لە مەككە بە قیرائەتی ئیبنو كەثیرو لە مەدینە بە قیرائەتی نافیع قورئانیان دەخوێند، ئەم زاتانە قورای سەبعە بوون، لە كۆتایی سەدەی سێیەمی كۆچیدا ئەبو بەكری كوڕی موجاهید ناوی (الكسائی) چەسپاندو ناوی یەعقوبی سڕیەوە.

سیوطی دەڵێ: یەكەم كەس كە لەبواری قیرائاتدا كتێبی دانابێ ئەبو عوبەید (القاسم بن السلام) بوو، پاشان ئەحمەدی كوڕی جوبەیر (الكوفی) پاشان ئیسماعیلی كوڕی ئیسحاقی (المالكی) هاوەڵی (قالون)، پاشان ئەبو جەعفەری كوڕی جەریری (الدجونی) دوایی ئەبوبەكری كوڕی موجاهید ئەمجار لە ڕۆژگاری ئەم (إبن مجاهد)ەو دوای سەردەمی ئەویش خەڵكی دەستیان كرد بە كتێب نووسین لەهەموو بوارەكانی قیرائاتدا، بەكۆو بەتاكو بە كورتیو بەدرێژی، زۆریان كتێب نووسینو نامەخانەی ئیسلامییان دەوڵەمەند كرد، پێشەواو ئیمامانی قیرائات ئەوەندە زۆرن لە هەژمار نایەن (حافظ الذهبی) ئەبو عەبدوڵلا كتێبێكی نووسیوە بەناوی (طبقات القراء) پاشان (حافظ القراء) ئەبولخەیری كوڕی جەزەری كتێبێكی نووسیوە ناوی ناوە (النشر فی قرآت العشر).

ئیمام موحەممەدی جەزەری خاوەنی (النشر........) دەڵێ: یەكەم ئیمامێك موعتەبەرو متمانە پێكراو قیرائاتی جەم كردبێ لە كتێبێكی سەربەخۆدا (ئەبو عوبەید القاسم بن سلام)ە وەكوو بزانم لەگەڵ ئەو حەوت

قاریئە مەشهورانەدا کردوونی بە بیستو پێنج قاریئ، ساڵی (٢٢٤)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە، پاشان دەڵێ: بەدوا ئەودا ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی موسای کوڕی (العباس) کوڕی موجاهید یەکەم کەسە قیرائاتی لەسەر ئەو حەوتە کورت هەڵێناوە، ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی دونیای جێهێشتووە، پاشان دەڵێ: بۆیە ئەم باسەمان درێژە پێ دا، چونکە پێمان گەیشتووە: کە هەندێ لەوانەی هیچ نازانن پێیان وایە قیرائاتی صەحیحو دروست ئەوەیە لەو حەوت ئیمامە قورڕائەوە نەقڵ کراوە، بەڵکوو زۆرێك لە نەزانەکان ئەوەیان لاچەسپاوە کە قیرائاتی صەحیحو راست تەنیا ئەو قیرائاتانەن کە لە (الشاطبیە)و (التیسیر)دا ئاماژەیان پێکراوە.

هۆی کورت هەڵێنانی قاریئەکان لەچوارچێوەی حەوتدا، وێڕای ئەوەی ئیمامی تر هەن لەبواری قیرائەتدا زۆر لەو حەوتانە ڕێزدارترن، یان وەك ئەوانن، ژمارەشیان زۆرترە لە حەوت، ئەوەیە: ئەو راویانەی لە ئیمامەکانەوە ڕیوایەتیان کردوون زۆرن، جا کە هیمەتو تێکۆشان بۆ زانیاری ئەو بوارە ڕووی لە سستی کرد، ئەو قیرائاتانەیان هەڵبژارد: کە لەگەڵ (ڕەسمولخەطی) موصحەفدا دەگونجاو خوێندنەوەو کۆنترۆڵ کردنی ئاسان بوو، ئەمجار تێفکرین لەو ئیمامە زۆرانەی کێیان مەشهور بوو بۆ ئەمینو بتمانە پێکراو، کێیان بە درێژایی تەمەنی لەوبوارەدا ئیشی کردووەو خەریکی قیرائات بووەو زانایان کۆڕایان لەسەر ئەوە هەبووە قیرائەتی لێ وەربگیرێ ئەوانەیان هەڵبژاردوون، هاتوون لەهەر شارێك ئیمامێکیان هەڵبژاردووە، لەگەڵ ئەوەشدا نەهاتوون تەرکی قیرائاتی ئیمامەکانی تریش بکەنو پاشگوێیان بخەن، بەڵکوو بە قیرائاتی ئەوانیش خوێندویانە، وەکوو قیرائەتی یەعقوب الحضرمیو ئەبو جەعفەری المدنیو (شیبە)ی کوڕی (نصاع)و هی تریش.

ئەمجار ئەوانەی لەم بوارەدا کتێبیان داناون لە نووسینەوەکانیاندا، ژمارەیەکی دیاریکراویان لە قیرائاتدا دیاریکردووە، چونکە ئەوان کە کتێبیان

لەســەر نوســیوون ژمارەیــەکی دیاریکراویــان لــە پێــشەوا قورئانخوێنــەکان خــستۆتە نــاو نوســینەکانیانو پــشتیان بــە شــۆرەتو ناویــان بەســتووەو لــەو ڕوانگــەوە بۆیــان ڕوانیــون، هەرچــەندە لــەناو غــەیری ئەوانــدا کەســانێکی زۆر هەبوون، لەوان ڕێزدارترو زاناتر بــوون، ئــەمجار خــەڵکی بــەهۆی ئــەوەی ئــەو نووســەرانە قاریئــەکانیان لــەو حــەوت کەســەدا چــڕ کردۆتــەوە وایــان زانیــوە ئیمامی موعتەبەرو خاوەن شەئن لەبواری قیرائەتدا ئەو حەوت کەسە گرنگی پێدراوەنو بەس!

ئــەوەتا ئیبنــو جــەبری (المکــی) کتێبێکــی دانــاوە لــە قیرائاتــدا، قاریئــەکانی کــورت هــەڵێناوە لــە پێنجــدا، لــە هــەر شــارەی ئیمــامێکی هەڵبژاردووە، بۆیەش لە پێنجدا کورتی هــەڵێناوە چونکە ئــەو موصحەفانەی ئیمام عوسمان ناردنی بۆ شارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی ئــەو دەمــە پێــنج موصحەف بــوون، دەشــگوترێ موصحەفەکانی ئیمــام عوسمــان نــاردنی حــەوت بوون، ئەو پێنجەو موصحەفێك بۆ یەمەنو موصحــەفێك بــۆ بــەحرەین، وەڵێ چــونکە ئــەم دوو موصــحەفە هــیچ هــەواڵێکیان دەربــارە نــەگوتراوە ئیبنــو موجاهیــدو هــی تــریش ویــستوویانە ژمــارەی موصــحەفەکان بەرچــاو بگــرن هاتوون لەجیاتی موصحەفی یەمەنو بــەحرەین دوو قاریئیــان دەســت نیــشان کــردوون، ژمارەکــەیان پــێ تــەواو کــردوون، بۆیــە عولــەما فەرموویانــە: پابەندبوونو تەمەسوك بــە قیرائــەتی حــەوت قاریئــەکانو پــشتگوێ خــستنی قاریئی تر نە ئەثەر نە حەدیث هــیچ کــام لەوانــەیان دەربــارە واریــد نــەبووە، بــەڵکوو کۆکردنــەوەو هەڵبــژاردنی کۆمــەڵێك لــە زانایــانی موتەئــەخیرینو بڵاوی کردەوەو ناویان مەشهور بووە، خــۆ ئەگــەر ئیبنــو موجاهیــد دەربــارەی قاریئەکانی تر زانیاری بنووسیایەو بیخستنایە گــەڵ ئــەم حەوتــە، ئــەوانیش ناوبانگیان دەردەکردو مەشهور دەبوون!.

ئەبو بەکری (إبن العربی) دەڵێ: ئەم حەوت قاریئە دیاری نەکراون بۆ پابەندبوون بە قیرائەتەکانیانو بەس بەم مانایە قیرائەتی ئەوانی تر دروست نەبێ، وەکوو قیرائەتی ئەبو جەعفەرو شەیبەو الأعمشو وێنەی ئەوان، چونکە گومان لەوەدا نیە ئەمانەش هاوتای حەوت قاریئەکانن، یان لە ژوور ئەوانەوەن، هەروەها زۆر لە پێشەوایانی قورئانخوێنان ئەم جۆرە حەقائیقانەیان درکاندووەو ڕازی نەبوون بە کورتهەڵێنانی قاریئەکان لەسەر حەوت.

ئەبو حەییان دەڵێ: لە کتێبی ئیبنو موجاهیدو ئەوانی شوێنی کەوتوون، کەمێك نەبێ قیرئاتی مەشهوریان تێدا نین، ئەوە ئەبو عەمری کوڕی (العلاء)ە هەژدە راوی موعتەبەر قیرائەتی لێوە نەقڵ دەکەن، ئەمجار ناوی هەموویانی نووسیوە، کەچی لە کتێبی ئیبنو موجاهیددا هەر باسی (الیزیدی) هاتووە، لە (الیزیدی)شەوە (دە) کەس ڕیوایەتیان کردووە! دەی چۆن بە تەنیا ناوی (السوسی)و (الدوری) دەهێندرێو بەس، لە کاتێکدا ئەم دوو زاتە چ مەزییەتو تایبەتمەندێکیان تێدا نابیندرێ لەوانی تردا نەبێ، چونکە هەموویان هاوبەشن لە زەبتو ئیتقانو هاوبەشیکردن لەوەرگرتنی عیلمو قیرائەتدا بۆیە من هەرچی دەکەمو بیردەکەمەوە هۆکارێکی مەعقول نادۆزمەوە بۆ ئەم چەواشەکاریو ماف ژێرلێودانە جگە لە جەهلو نەزانی!! بڕوانە الإتقان/ص١٧٢.

## جۆرەکانی قیرائاتو حوکمەکانیانو زەبتو کۆنتڕۆڵ کردنیان

بڕێ لە عولەما فەرموویانە قیرائات سێ جۆرە: موتەواتەر، ئاحاد، شاذ، حەوت قیرائەتە مەشهورەکەیان داناوە بە موتەواتەر، سێ قیرائەتە ئاحادەکانیان کردوون بە تەواوکەری (دە) قیرائەتەکە، پاشان چی قیرائەتی صەحابە هەیەو قیرائەتەکانی تریش هەموویان شاذن.

(قیل)ێك هەیە دەڵێ: هەر (دە)یان موتەواتەرن، (قیل)ێك دەڵێ: ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێ لەم بوارەدا ضەوابیطەکانە، جا قیرائەتەکە لە حەوت قیرائەتەکان بێ، یان لە (دە) قیرائەتەکان بێ، یان لە غەیری ئەوان بێ، ئەبو شامە لە (المرشد الوجیز)دا دەڵێ: پێویست ناکا بە هەر قیرائەتێك پاڵ حەوت قیرائەتەکە بدرێ هەڵبخەڵەتێین پێمان وابێ صەحیحەو صیفەتی صەحیحی پاڵدەین‌و بڵێین ئاوا نازڵ بووە، مەگەر بچێتە چوارچێوەی ئەو (ضابطە)و قاعیدەوە ئەوکاتەیش موصەنیفێك تاك نابێتەوە بەوە لەغەیری خۆیەوە نەقڵی بکا، تایبەتیش نیە بەوە لە حەوت قاریئەکان نەقڵی بکا، بەڵکوو ئەگەر لە غەیری ئەوانیش نەقڵ کرا، لە بازنەی صیحەتی وەدەر نانێ، چونکە ئیعتیمادو پشت بەستن بە قیرائەتەکە لەسەر ئەوەیە ئەوصافەکانی تێدا کۆ ببێتەوە، نەك لەسەر نیسبەتدانی بۆلای کەسێك، چونکە قیرائەتی نیسبەتدراو بۆلای هەریەکێك لە حەوت قاریئەکان‌و غەیری ئەوانیش، دابەش دەبێ بۆ قیرائەتی (متواتر)و موجمەعو عولەیهی‌و قیرائەتی (شاذ) وەڵێ ئەو حەوت قاریئە بەهۆی بەناوبانگیانەوە بەهۆی ئەوەی زۆری قیرائەتەکانیان صەحیح‌و (مجمع علیە)ین، نەفس زۆر مەیلی ئەوە دەکا: کە لەوانەوە نەقڵ کراوە، تا ئەوەی لە غەیری ئەوانەوە نەقڵ کراوە.

**قیاس‌و قاعیدە لای ئەوان دەربارەی ضوابیطی قیرائەتی صەحیح‌و دروست ئەمانەیە:-**

١- قیرائەتەکە موافیقی لوغەی عەرەبی بێ بەجۆرێك لە جۆرەکان، واتە: موافیقی لوغەتی ئەفصەح، یان فەصیح بێ، چونکە قیرائەت سونەتێکی چاولێکراوە، قبوڵکردن‌و پەنا بۆ بردنی بە ئیسناد دەبێ نەك بە رەئی.

٢- دەبێ قیرائەتەکە موافیقی یەکێك لە موصحەفەکانی عوسمانی بن، ئەگەر بە ئیحتیمالیش بێ، چونکە هاوەڵان لە نووسینەوەی موصحەفەکانی سەردەمی ئیمام عوسماندا (رەزای خودای لێ بێ) زۆر وردەکارییان لەشێوە نووسینەکەدا کردووە بەگوێرەی زانیاریو باڵادەستییان لە لوغاتی قیرائەتەکەدا.

بۆ نموونە وشەی (الصراط) لە ئایەتی ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ – الفاتحة/٦﴾ بە (صاد) نووسیوە لەجیاتی (سین) لە نووسینی بە (سین) لایانداوە کە ئەصڵی لوغەکەیە، بۆ ئەوەی قیرائەتی (سین) (السراط) هەرچەندە موخالیفی (رسم الخط)ە لە ڕویەکەوە بەڵام لەسەر بنەمای ئەصڵی زمانەوانی مەعروفو باوە، کەوابوو هەردوو قیرائەتەکە هاوتان ئەمیان موافیقی ئەصڵی لوغەتە، ئەویان موافیقی (رسم الخط)ی عوسمانی‌یە، قیرائەتی (الأشمام) ئیحتیمالی ئەوەی هەیە.

مەبەست بە موافەقەی ئیحتیمالی ئەوەیە لەشێوەی ئەوبێ بگونجێ وەکوو قیرائەتی ﴿مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ – الفاتحة/٤﴾ لە سورەتی فاتیحەدا، بێگومان وشەی (مالك) لەهەموو موصحەفەکاندا بەبێ (ألف) نووسراوە، بە (مَلِك) دەخوێندرێتەوە، ئەمە بە تەحقیقی موافیقی رەسمی موصحەفە، بە (مالك)یش دەخوێندرێتەوە ئەم شێوەیان بە ئیحتیمالی موافیقی رەسمی موصحەفە، هەروا زۆر نموونەی تر.

نموونەی ئەوە موافیقی جوداوازی قیرائەتەکان بێو (رسم الخط)ەکەی لەگەڵ هەموویان بە تەحقیقی بگونجێ وەکوو وشەی (تُعَلِمون) بە تێو یێ (ويغفرلكم) بە یێو نون، هەروەها زۆر نموونەی تر لەو وشانەی کە ڕوتبوونیان لە نوختە، شکڵو شێوەیان بە لابردنی حەرفێك تێیاندا، یان هێشتنەوەی نیشانەی گەورەیی‌و لێزانی هاوەڵانو زانیارییان لە زانستی هیجائو زیرەکی‌و دووربینییانە لە شیکردنەوەی هەموو عیلمێکدا.

مـەرج نیـە لـە قیرائـەتی صـەحیحدا قیرائەتەکـە مـوافیقی هـەموو موصـحەفەکان بـێ، بـەڵکوو مـوافیقی هەنـدێکیان بـێ کیفایەتـە، بـۆ نموونـە قیرائـەتی ئیبنـو عـامیر ﴿وَبـالزُّبُرِ وَبالْكِتَـابِ الْمُـنِيرِ - آل عمـران/١٨٤﴾ بـە چەسـپاندنی (بـێ) لـە هـەردوو وشـەکەدا دەی ئەمـە تـەنها لـە موصـحەفی (الشامی)دا هەیە.

٣- وێڕای خاڵەکانی پێشەوە، دەبێ قیرائەتەکە ئیسنادی صـەحیح بـێ، چونکە قیرائەت سوننەتی چاولێکراوە ئیعتیماد تێیـدا لەسـەر ئەوەیـە نـەقڵ کردنەکـەی سـەلامەت بـێو ڕیوایەتەکـەی صـەحیح بـێ، زۆر وا ڕێ دەکـەوێ شـارەزایانی زمـانی عـەرەبی قیرائـەتێك لـە قیرائەتـەکان ڕەتدەکەنـەوە، پێـی ناڕازین چونکە لەگـەڵ قیـاسو قاعیـدەدا نایەتـەوە، یـان لوغـەتێکی زەعیفـە، کەچی پێـشەواکانی قیرائـات گوێ لـە ئینکاریکردنی ئـەو شـارەزایانە نـاگرنو ئیعتیباری بۆ دانانێن.

ئـەو سـێ خاڵـەی ڕابـردن ضـەوابیطـو یاسـای قیراتـی صـەحیحو قبوڵکراوە، هەرکاتێ ئەم سێ ڕوکنە (- موافیقی لوغەی عـەرەبی – مـوافیقی رسـم المـصحف – سـەنەدو ڕیوایـەتی صـەحیح) دەسـتەبەر بـوون ئـەوە قیرائەتەکە صەحیحە، هەرکاتێ ڕوکنێك، یان زیاتر، خەلەلی تێکەوت ئەوەیان قیرائەتی زەعیفە، یان (شاذ)ە، یـان باطیلـە شـتێکی سـەیرو سەرسوڕهێنەرە: کـە بـڕێ لـە نـەحوییان – دوای ئـەوەی قیرائەتەکـە ضـەوابیطـەکانی تێـدا دەستەبەر بوون – دێن ئـەو قیرائەتـە صـەحیحە بـە هەڵـە لـە قەڵـەم دەدەن، تەنها لەبەر ئەوە موافیقی قاعیدە نەحوییەکەی ئەوان نیە: کە کردویانە بـە تەرازوو پێوەری ڕاستی لوغە، لە کاتێکدا پێویستە ئێمە قیرائـەتی صـەحیحو مەزبوت بکەینە حەکـەمو دادوەر بەسـەر قاعیـدە لوغـەویو نەحوییەکانـەوە نەك بێین ئەم قاعیدە نـەحوییانە بکەینە حەکەمو دادوەر بەسەر قورئانەوە،

چونکە قورئان سەرچاوەی یەکەمو رەسەنو پشت پێ بەستراوە بۆ وەرگرتنی قەواعیدی لوغە.

قورئان ئیعتیمادی لەسەر نەقڵی صەحیحو ڕیوایەتی دروست چەسپاو: کە قاریئەکان پشتیان پێ بەستووە، لەسەر شێوەیەك لەشێوەکانی لوغە، ئیبنولجەزەری لەکاتی تەعلیقدانی لەسەر مەرجی یەکەمی ضەوابیطەکانی قیرائەتی صەحیح دەڵێ: قسەی ئێمە دەربارەی (ضابط): کە دەڵێن: بەشێوەیەك لەشێوەکانی لوغە، مەبەستمان ئەوەیە لەگەڵ یەکێك لە یاساکانی نەحو بگونجێ، جا فەصیح بێ، یان فەصیح تر بێ، (مجمع علیە)ی بێ، یان خیلافی تێدا بێ، بە مەرجێ خیلافەکە وانەبێ زیانی هەبێ.

جا ئەگەر قیرائەتەکە لەوانەبوو مەشهورو بڵاوو باوبوو پێشەوایانی قیرائەت بە ئیسنادی صەحیح وەریان گرتبوو ئەوە تەواوو بێ خەوشە، چونکە ئەوە ئەصڵو بنەمای گەورەو کۆڵەکەی پتەوە، چەند قیرائەت هەن برێ لە نەحوییان، یان زۆرینەیان ئینکاریان کردوونو قبوڵیان نەبوون، بەڵام ئیعتیبار بە ئینکاریکردنەکەیان نەکراوە، بۆ نموونە ساکن کردنی (بارئکم) (یأمرکم) مەکسور کردنی (والأرحام) مەنصوب کردنی (لیجزی قوماً) فەصلو ناوبڕکردنی نێوان موضافو موضاف ئیلەیهی لە ڕستەی ﴿قَتْلَ أَوْلَادِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ﴾داو زۆر شوێنی ترو نموونەی تر.

ئەبو عەمری (الدانی) دەڵێ: پێشەوا قاریئەکان دەربارەی هیچ حەرفێ لە حەرفەکانی قورئان، ئیعتیماد ناکەنە سەر لۆغەتی باوو بەربڵاوو خاوەن قیاسو قاعیدە، بەڵکوو ئیعتیماد دەکەنە سەر شتێك لە ئەثەردا چەسپابێو بە صەحیحی نەقڵ کرابێ، ئەگەر ڕیوایەتەکە چەسپاوو صەحیح بوو لای ئەوان قیاسی عەرەبیو بەرفراوانی لۆغەت رەتی ناکاتەوە چونکە قیرائەت سوننەتێکە دەبێ چاوی لێ بکرێو شوێنی بکەوێ، بێ چەندو چوون

قبوڵی بکەی‌و پابەندی بیٚ، نەك بیخەیە بەر لێکۆڵینەوەو بەراوردکردن بە قاعیدەو قیاسی لۆغەت.

لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ڕیوایەت کراوە گوتوویەتی: «الْقِرَاءَاتِ سُنَّةٌ مُتَّبَعَةٌ».[1] بەیهەقی دەڵێ: مەبەستی زەید ئەوەیە شوێنکەوتنی پێشینانمان دەربارەی قیرائەتەکان سوننەتێکی چاولێکراوە دەبێ پابەندی بین، بەهیچ شێوەیەك موخالەفەی موصحەفی ئیمام نابێ بکرێ، هەروا موخالەفەی قیرائەتە مەشهوورەکانیش نابێ بکرێ، با پێچەوانەکەشیان لە لوغەتدا دروست‌و ڕەوا بێ.

## هەندێ لە زانایان قیرائەتەکانیان لە شەش جۆردا چڕکردۆتەوە

١- موتەواتەر: ئەوەیە کۆمەڵێکی وا نەقڵیان کردبێ کە نەگونجێ لەسەر درۆو شتی ناڕاست یەکڕا بن، ئەوانیش لە کۆمەڵێکی وەك خۆیان وەرگرتبێ، ئەمانیش هەروا تا کۆتایی ڕشتەکە، زۆرینەی قیرائەتەکان بەم شێوەن.

٢- قیرائەتی مەشهور: ئەوەیە ڕشتەکەی صەحیح بێ بەڵام ڕاویەکان نەگەیشتبنە پلەی تەواتور، قیرائەتەکەش موافیقی قاعیدەی عەرەبی‌و (رسم الخط)ی عوسمانی بێ، لای قاریئەکان ناوبانگی دەرکردبێ، بە هەڵەیان لە قەڵەم نەدابێ، بە (شاذ)یان دانەنابێ، زانایان فەرموویانە دەتواندرێ بەم قیرائەتە قورئان بخوێندرێ.

٣- قیرائەتی ئاحاد: ئەوەیە ڕشتەکەی صەحیح بێ، موخالەفەی (رسم المصحف) بێ، یان قاعیدەی عەرەبی، یان ناوبانگی دەرنەکردبێ وەکوو قیرائەتی مەشهور، ئەم قیرائەتی ئاحادە قورئانی پی ناخوێندرێ، نموونەی ئەم قیرائەتە ئەوەیە: کە ئەبوبەکرە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر

---

[1] أخرجه البيهقي في سنن الكبرى/٣٩٩٥.

(دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی (٧٦)ی سورەتی (الرحمن)ی ئاوا خوێندەوە ﴿متكئين على رفارف خضر وعباقری حسان﴾.[1] یان ڕیوایەتی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی (١٢٨)ی سورەتی (التوبة)ی ئاوا خوێندەوە ﴿لقد جاءكم رسول من أنْفَسِكم﴾ بەشێوەی (إسم التفضيل) نەك بە صیغەی کۆ.

٤- قیرائەتی (شاذ) ئەوەیە سەنەدەکەی صەحیحو ڕاست نەبێ وەکوو قیرائەتی ﴿ملك يوم الدين﴾ بەشێوەی فیعلی ماضیو مەنصوب کردنی (یومَ).

٥- قیرائەتی (موضوع) هەڵبەستراوە، ئەوەیە بێ بنەماو ئەساس بێ.

٦- قیرائەتی (مدرج): ئەوەیە شتێ لە قیرائەتەکە زیاد کرابێ لەسەر شێوەی تەفسیر، وەکوو قیرائەتی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ في مواسم الحج فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ – البقرة/١٩٨﴾ ئێستا وتەی (في مواسم الحج) تەفسیرەو خراوەتە نێوان ئایەتەکە.

جگە لە قیرائەتی یەکەمو دووەم ئەوانی تر قورئانیان پێ ناخوێندرێتەوە.

جەماوەری عولەما لەسەر ئەوە کۆکن: کە حەوت قیرائەتەکە هەموویان موتەواتەرنو جگە لە قیرائەتی (متواتر)ی مەشهور دروست نیە قورئانیان پێ بخوێندرێ نە لەنوێژداو نە لەغەیری نوێژدا.

نەوەوی لە کتێبی (المجموع)دا دەڵێ: خوێندنی قورئان بە قیرائەتی (شاذ) لەنوێژدا دروست نیە، چونکە قورئان نیە، قورئان بە تەواتور نەبێ ثابیت نابێ، قیرائەتی (شاذ) موتەواتەر نیە، کەسێك ئەم ڕایەی قبوڵ نەبێ ئەوە هەڵەکارە، یان نەزانە، ئەگەر موخالەفەی کردو بە قیرائەتی شاذ

---

[1] أخرجه الحاكم/٢٩٨٦.

قورئانی خوێند لەنوێژدا، یان لە غەیری نوێـژدا، دەبـێ نـارەزایی بەرامبـەری دەربېڕدرێو ئینكاری بكرێ، فوقەهای بەغدا كۆكن لەسـەر ئـەوە كەسـێك بـە قیرائـەتی شـاذ قورئـانی خوێنـد راپێـچی دادگـا بكـرێو داوای تۆبـەكردنی لێ بكرێ.

ئیبنـو عبدلبـەڕ دەڵـێ: كـۆڕای موسـوڵمانان لەسـەر ئەوەیـە: كـە خوێندنی قورئان بـە قیرائـەتی (شـاذ) دروسـت نیـە، هەركەسێك قورئـان بـە (شاذ) بخوێنێ دروست نیە نوێژی لە پاشەوە بكرێ.

## سودو فائیدەو جوداوازی نێوان قیرائەتە صەحیحەكان

**ئەو ئیختیلافو جوداوازییەی لەنێوان قیرائەتـە صـەحیحەكاندا هەیـە گەلێ سود بەخشن: لەوانە:-**

١- نیشانەو بەڵگەیـە لەسـەر پـارێزراوی قورئـان لـە گۆڕانكـاری تێیـدا، ئـەوەتا وێـڕای ئـەو شـێوە قیرائاتانـەی پێـی دەخوێنـدرێ هـیچ گۆڕانكـاریو تەحریفو تەبدیلێك نابیندرێ تێیدا.

٢- ئاسـانكاری لەسـەر موسـوڵمانانو سـوككردنی ئـەرك لەسـەریان بـۆ بەئاسانی فێربوونیو خوێندنی.

٣- ئیعجازو سەرئاسایی قورئان لە كورتبڕیـدا، ئـەوەتا هـەر قیرائـەتێك لەو قیرائەتە جوداوازانە بەبێ دووبارە كردنەوەی لەفظ دەلالەت دەكا لەسـەر حوكمێكی شەرعی بۆ نموونە قیرائەتی ﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ – المائـدة/٦﴾ وشـەی (أرجلكـم) بـە مەنـصوبیو بـە مـەجروری دەخوێندرێ، لەو قیرائەتەدا: كە بە مەنصوبی دەخوێندرێتەوە حوكمی شتنی قـاچ ڕوون دەكاتـەوە، چـونكە عـەطف كراوەتـەوە بۆسـەر مـەعموولی فیعلی غوسـل ﴿فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ﴾ كـە بـە مـەجروری بخوێندرێتەوە حوكمی مەسحكردنی قاچ لەسـەر (خـوف) ڕوون دەكاتـەوە لـە

کاتی هەبوونی داخوازی مەسحکردندا، ئەوکاتە وشەی (أرجل) بە مەجروری عەطف دەکرێتەوە بۆسەر مەعمووڵی فیعلی (امسحوا) ﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ﴾ ئەوتا لەم دوو قیرائەتە دوو حوکم وەردەگرین بەبێ (تطویل)و تیکراری لەفظ، ئەمەش بەشێکە لەمانای ئیعجازی کورتبڕی قورئان.

٤- ڕونکردنەوەی مانای ڕستەو وشەیەك کە دەگونجێ لە قیرائەتێکی تردا (موجمەل)و مانا نارون بێ، وەکوو قیرائەتی (يَطْهُرْنَ) لە ئایەتی: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ – البقرة/٢٢٢﴾ بە (تەشدیدو تەخفیف) گشتکراوی‌و سوککراوی خوێندراوەتەوە خوێندنەوەی بە (تەشدید) ڕونکەرەوەیە، بۆ مانای قیرائەتی (تەخفیف)ی لەلای جەماوەری زانایان کەوابێ ئافرەتی حەیزدار کە لە خوێنی حەیز پاکبۆوە، جیماعی لەگەڵ دروست نیە تا غوسڵ نەکا، هەروا قیرائەتی ﴿فَامضوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ – الجمعة/٩﴾ ئەوە ڕونکەرەوەی مەبەستی ڕستەی (فاسعوا)ە واتە: مەبەست بەم ڕستەیە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ – الجمعة/٩﴾ ڕۆیشتنی خێرا نیە، بەڵکوو مەبەست چوون بۆ نوێژەکەیە بە ڕۆیشتنێکی عادەتی.

هەروەها قیرائەتی ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْمانها – المائدة/٣٨﴾ کە لە جیاتی (أيديهما) (أيمانما)ی هێناوە.

هەروا قیرائەتی ﴿وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ من أم فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ – النساء/١٢﴾ ئەوەتا ئەم قیرائەتە ئەوە ڕون دەکاتەوە کە مەبەست خوشك‌و برای دایکییە، بۆیە عولەما فەرموویانە بەهۆی جوداوازی قیرائات، جوداوازی لە ئەحکامدا دەردەکەوێ.

ئەبو عوبەید لە کتێبی (فضائل القرآن)دا دەڵێ: مەبەست بە قیرائەتی شاذ، تەفسیرکردنەوەی قیرائەتی مەشهوورە، ڕونکردنەوەی مەعناکەیەتی، وەکوو قیرائەتی خاتو عائیشەو خاتو حەفصە. «وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَصَلاَةِ الْعَصْرِ» هەروەها قیرائەتی ئیبنو مەسعود ﴿فَاقْطَعُواْ أَيْمانهما –

المائدة/٣٨﴾ هەروا قیرائەتی جابیر ﴿فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُـورٌ رَّحِـيمٌ – النـــور/٣٣﴾.

ئەمجار ئەبو عوبەید درێژە بەقسەکەی دەداو دەڵێ: ئـەم قیرائەتانـەو نموونەیان، بێگومان بوون بە شیکەرەوەو تەفیسری قورئان، بێگومـان هـەمان راوبۆچوون لـە چینی دوا هاوەڵانـەوە ڕیوایـەتکراوەو بـە جوانیـان لـە قەڵەم داوە.

دەی ئەتۆ چی دەڵێی: ئەگەر ئەو قیرائەتە شاذە لە هاوەڵێکی ڕێزداری پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسـەر بێ) ڕیوایـەتکرابوو، دوایـی چـووە نـاو خودی قیرائەتەکەوە، بێگومان ئەوە لە تەفسیر بـەهێزترە، کـەمترین شـت کـە لەم جۆرە قیرائەتانەوە وەردەگیرێ زانینو فێربـوونی ئاراسـتەکردنی تەئویلـە بەشێوەیەکی دروست.

ئەو حەوت قاریئە بەناوبانگانەی ئەبو بەکری کوڕی موجاهیـد باسـی کردوونو بە تایبـەتی نـاوی هێنـاون لەبـەر ئـەو صیفاتو تایبەتمەندییانـەی لای ئـــەو پێیـــان مەشـــهوربوون لـــە ضـــەبـــتو ئەمانـــەتو تەمەندرێـــژیو بەسەربردنی تەمەنی پیرۆزیان لە قیرائەتدا.

کۆڕای زانایان لەسەر ئەوانەی قیرائەتیان لێ وەردەگیرێ، ئەمانەن:-

١- ئەبو عەمر بن علاء مامۆسـتاو شـێخی راوییـەکان، نـاوی: زیـان بـن العلاء بن عمـار المـازنی البـصری، هەنـدێ وتوویانـە نـاوی (یحیـی)یـە، هەنـدێ وتوویانە کونیەکەی ناوەکەیەتی، ئەم زاتە ساڵی/١٥٤ی کۆچی لـە شـاری کوفـە لە دونیا دەرچووە، دوو ڕاوی هەبوون (الدوری، السوسی).

الـدوری: ئـەبو عومـەر حفـص بـن عمـر بـن عبـدالعزیز (الـدوری، النحوی)یە (الدور) کە ئـەم زاتـەی بـۆلای نیـسبەتدراوە، شـوێنێکە لـە بەغـدا، ناوبراو ساڵی (٢٤٦)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە.

السوسی: ئەبو شوعەیب: صالح بن زیاد بن عبدالله السوسی ساڵی (٢٦١)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە.

٢- ئیبنو کەثیر: عبدالله بن کثیر المکیـیە لە چینی دوای هاوەڵانەو تابیعیـیە، ساڵی (١٢٠)ی کۆچی لە مەککە ماڵئاوایی لە دونیا کردووە، راویەکانی (البزیو قنبل) بوون.

البزی: أحمد بن محمد بن عبدالله بن أبی بزه المؤذن المکیـیە کونیەی ئەبولحەسەنە، ساڵی/٢٥٠ی کۆچی لە مەککە دونیای جێهێشتووە.

قنبل: محمد بن عبدالرحمن بن محمد بن خالد بن سعید المکی المخزومیـیە کونیەی ئەبو عەمرە نازناوی قەنبەلە، دەگوترێ: ئەوان لە مەککە (أهل البیت)نو بە (قنابله) بەناوبانگن، ساڵی/٢٩١ی کۆچی لە شاری مەککە دونیای جێهێشتووە.

٣- نافع المدنی: ئەبو رووەیم: نافع بن عبدالرحمن بن أبی نعیم اللیثیـیە لە بناغەدا خەڵکی ئیصفەهانە، ساڵی/١٦٩ی کۆچی لە مەدینە لە دونیا دەرچووە. راوییەکانی (قالونو ورش)ن.

قالون: عیسی بن مینا، یان (میناء) المدنیـیە مامۆستای زمانی عەرەبی بووە، کونیەی ئەبو موسا بوو لەقەبی (قالون) بووە، دەگوترێ: نافیع ئەم لەقەبەی پێی داوە چونکە قیرائەتی زۆر باش بووە وشەی (قالون) رۆمیـیە واتە جید، باش، ساڵی/٢٢٠ی کۆچی لە مەدینە کۆچباری ئەو دونیا بووە.

ورش: عثمان بن سعید المصریـیە کونیەی ئەبو سەعید بووە لەقەبی (ورش) بووە، ئەم لەقەبەی دراوەتێ چونکە سپی پێست بووە ساڵی/١٩٧ی کۆچی لە میصر دونیای جێهێشتووە.

٤- ئیبنو عامیری شامی: عبدالله بن عامر الیحصبیـیە لە ڕۆژگاری خەلافەتی وەلیدی کوڕی (عبدالملك)دا قازی دیمەشق بوو، کونیەی ئەبو

عمران بووه یەکێك بووه له (التابعین) ساڵی/١١٨ی کۆچی لـه دیمەشـق کۆچـی دوایی کردووه، دوو ڕاوی هەبوون (هشام، ئیبنو ذەکوان).

هشام: کوڕی عمار بن نصیر القاضی الدمشقی‌یه کونیەی ئەبولوەلیـدە، ساڵی/٢٤٥ی کۆچی له دیمەشق دونیای جێ هێشتووه.

إبن ذەکوان: عبدالله بن أحمد بن بشیر بن ذکوان القرشی الدمـشقی‌یـه کونیەی ئەبو عەمره ساڵی/١٧٣ی کۆچـی هاتۆتـه دونیـاوه، سـاڵی/٢٤٢ی کۆچـی له دیمەشق کۆچبار بووه.

٥- عاصم الکوفی: (عاصم بن أبی النجود)ه پێشی دەڵێن: (إبن بهدلـة) ئـەبو بکـر: یەکێکـه لـه تـابیعین سـاڵی/١٢٨ی کۆچی لـه کوفـه کۆچـی دوایـی کردووه، دوو راوی هەن (شعبة، حفص).

شعبه: ناوی ئەبوبەکر شعبه بن عباس بن سالم الکوفی‌یه سـاڵی/١٩٣ی کۆچی له کوفه دونیای بەجێ هێشتووه.

حفص: ناوی تەواوی حفـص بـن سلیمان بـن المغیرة البـزاز الکوفی‌یـه کونیەی ئەبو عەمره، متمانه پێکراو بووه، ئیبنو معین وتوویەتی: کێ هەیـه له ئەبو بەکر باشتر قورئان بخوێنێ؟ ساڵی/١٨٠ی کۆچی به ڕەحمەت چووه.

٦- حمزة الکوفی: نـاوی حمـزة بـن حبیـب بـن عمـارة الزیـات الفرضـی التیمـی‌یـه کونیـەی (أبـو عمـار)ه سـاڵی/١٥٦ی کۆچـی لـه حـەلوان لـه ڕۆژگـاری خەلافەتی ئەبو جەعفەری المنصوردا دونیای بەجێ هێتشووه، دوو راوی هـەن (خلف، خلاد)ن

خلـف: نــاوی تــەواوی (خلــف بــن هــشام البــزاز)ه کونیــەی ئــەبو موحەممەده ساڵی/٢٢٩ی کۆچی له بەغدا کۆچبار بووه.

خـلاد: نـاوی تـەواوی خـلاد بـن خالـده پێـشی دەڵـێن: (إبـن خلیـد) الصیرفی الکوفی، کونیەی ئەبو عیسایه ساڵی/٢٢٠ی کۆچی لـه کوفـه لـه دونیـا دەرچووه.

٧- الكسائي الكوفي ناوى تەواوى علي بن حمزەيە يەكێكە لە زانا هەرە بەرزو بەناوبانگەكانى زانستى نەحو، كونيەى ئەبولحەسەنە، پێى گوتراوە كيسائى، لەبەر ئەوە لە يەك پۆشاكدا ئيحرامى بەستووە، ساڵى/١٨٩ى كۆچى لە گوندى (رنبوية)ى وڵاتى (الري) دونياى جێ هێشتووە لەو سەفەرەدا بوو كە لەگەڵ هارون الرشيد دەچوو بۆ خۆراسان.، دوو راوى هەبوون (ئەبولحاريث، حفص الدورى).

ئەبولحارث: ناوى تەواوى الليث بن خالد البغداديە ساڵى/٢٤٠ى كۆچى وەفاتى كردووە.

حفص الدورى: ئەو راوى ئەبو عەمر بن العلائە كە لە خاڵى يەكەمدا باسى تێپەڕى.

ئەمجار سێ قاريئى تر هەن تەواوكارى دە قاريئەكانن، ئەوانيش ئەمانەن:

٨- ئەبو جعفر المدنى: ناوى (يزيد بن القعقاع)ە ساڵى/١٢٨ى كۆچى هەندێك دەڵێن: ساڵى/١٣٢ى كۆچى لە دونيا دەرچووە، دوو راويەكانى (إبن وردان، إبن جماز)ن.

إبن وردان: ناوى أبولحارث عيسى بن وردان المدنيە ساڵى/١٦٠ى كۆچى لە مەدينە  بە ڕەحمەت چووە.

إبن جماز: أبو الربيع سليمان بن مسلم إبن جماز المدنى، كەمێك دواى ساڵى/١٧٠ى كۆچى لە دونيا دەرچووە.

٩- يعقوبى البصرى: ناوى أبو محمد يعقوب بن أسحاق بن زيد الحضرميە ساڵى/٢٠٥، يان ١٨٥ى كۆچى لە بەصرە كۆچبار بووە، راويەكانى (رويس، روح)ن.

رويس: ناوى أبو عبدالله محمد بن المتوكل اللؤلؤ البصرى (رويس) نازناويەتى ساڵى/٢٣٨ى كۆچى لە بەصرە كۆچبار بووە.

روح: نـاوی تـەواوی أبوالحسن روح بـن عبـدالمؤمن البـصری النحـوی ساڵی/٢٣٤، یان ٢٣٥ی کۆچی، چووتە بەر ڕەحمەتی خودا.

١٠- خلف نـاوی تـەواوی أبـو محمـد خلـف بـن هـشام بـن ثعلـب البـزار البغدادی هەندێك دەڵێن: سـاڵی/٢٢٩ی کۆچـی کۆچـبار بـووە. دوو راوییـەکانی (ئیسحاق، إدریس)ن.

ئیـسحاق: نـاوی تـەواوی أبـو یعقـوب بـن إبـراهیم بـن عثمـان الـوراق، المزوری، پاشان البغـدادی ساڵی/٢٨٦ی کۆچی لە دونیا دەرچووە.

ئیدریس: نـاوی تـەواوی أبـو الحسن إدریـس بـن عبـدالکریم البغـدادی الحداد، ڕۆژی جەژنی قوربان ساڵی/٢٩٢ی کۆچی کۆچبار بووە.

هەندێ لە زانایانی (علوم القرآن) چـوار قیرائـەتی تـر دەخەنـە سـەر ئەو دە قیرائەتە، ئەوانیش:-

١- قیرائەتی الحسن البصری: ئـازادکراوی ئەنـصارو یەکێکـە لـە گـەورە تابیعینەکانو مەشهور بە زوهدو تەقوایە ساڵی/١١٠ی کۆچی کۆچبار بووە.

٢- قیرائەتی محمد بن عبدالرحمن ناسراو بە إبن محیصن سـاڵی/١٢٣ی کۆچی دونیای جێ هێشتووە ئەم زاتە شـێخی ئەبوعـەمر بـووە: کـە لـە خـاڵی یەکەمدا تێپەڕی.

٣- قیرائەتی یحي بن المبارك الیزیدی النحوی بەغدادیە، ئەم زاتە لـە ئـەبو عـەمرو حـەمزە زانـستی قیرائـەتی وەرگرتـووە، شـێخی (الـدوری)و (السوسی) بووە، ساڵی/٢٠٢ی کۆچی مردووە.

٤- قیرائەتی (أبو الغرج) محمد بن أحمد الـشنبوذی سـاڵی ٣٨٨ی کۆچـی لە دونیا دەرچووە.

## (الوقف والإبتداء) لەسەر وەستان و دەستپێکردن

بێگومـان زانینـی وەقـفو ئیبتیـداء گرنگیـەکی گـەورەی هەیـە لـە چۆنیەتی خوێنـدنی قورئانـدا بـە مەبەستی پارێزگـاری لەسـەر سـەلامەتی ماناکانی قورئـان‌و خـۆ دوورخستنەوە لـە تێکەوتن لـە هەڵەو لێ تێکچوون! ئەمـەش پێویـستی بـە شـارەزایی لـە زانـستی زمانـەوانی عـەرەبی‌و زانـستی قیرائـات‌و تەفسیری قورئـان هەیـە، بـۆ ئـەوەی مانـای ئایەتـەکان بـە شێوەی صەحیح بزاندرێ، ئەمەش نموونەی زۆرو زەبەندن:-

١- پێویستە لەسەر ئایـەتی ﴿وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا – الكهف/١﴾ وەقفـە بکرێ، پاشان دەست بکەی بە خوێندنی ئایەتی دوایـی ﴿قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِـن لَّدُنْـهُ وَيُبَـشِّرَ الْمُـؤْمِنِينَ الَّـذِينَ يَعْمَلُـونَ الـصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُـمْ أَجْـرًا حَـسَنًا – الكهف/٢﴾ بۆ ئەوەی وانەزاندرێ: کە وشەی (قیما) صیفەی وشەی (عوجـاً)ە، چونکە ناگونجێ (قیم) صیفەتی (عوج) بێ دژی یەکن‌و پێکەوە کۆنابنەوە.

هەروا وەقفە پێویستە لەسەر کۆتایی ئەو ئایەتانـەی بـە (هـاء سکت) کۆتاییان دێ وەکوو ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ ، وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيهْ – الحاقة/٢٥ – ٢٦﴾ یان ﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيهْ ، هَلَـكَ عَنِّـي سُلْطَانِيهْ – الحاقة/٢٨ – ٢٩﴾ لـە غـەیری قورئانـدا بـۆ ئـەم جـۆرە (هـا)ئانـە ئەگـەر وەقفـە بکـەی (هـا)ئەکـە، ثابیـت دەکـەی، ئەگـەر لەسـەری نەوەسـتی حەذفی دەکەی، دەی لە قورئاندا (ها)ئەکە نوسـراوە، دەبـێ لەسـەری بوەسـتی بەدواوە نالکێ، چونکە بە یاساو قاعیدەی لوغەی عەرەب (هـا)ئـی لـەو جـۆرە ئەگـەر لەسـەری نەوەسـتی‌و بیلکێنـی بـە دواوەی، دەبـێ حـەذفی بکـەی، ثـابیتکردنی لـە حاڵـەتی وەصڵدا پێـچەوانەی قاعیـدەی زمـانی عـەرەبی‌یـە، حەزفکردنی موخالیفی موصحەفە.

کـەوابوو وەقفـە لەسـەری پابەندبوونـە بـە ڕێنووسـی موصـحەفو قاعیدەی لوغەت بە یەکەوە، لکاندنی وشەیەك کۆتایی بە (ها)ء دروست نیـە مەگەر لەسەر نیەتی وەقف.

هەروەها وەقفە پێویستە لەسەر کۆتایی ئایەتی ﴿وَلاَ یَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ – یونس/٦٥﴾ ئەمجار دوای وەقفەکە دەست بکا بـە خوێنـدنی ﴿إِنَّ الْعِـزَّةَ لِلّـهِ جَمِیعًـا﴾ بـۆ ئـەوەی مـەعنای ئایەتـەکان ڕاسـتو ڕەوان بـڕوا، چـونکە ئەگـەر لەسـەری نەوەسـتیو بیلکێنـێ بـەدواوە واگومـان دەبـرێ ئـەوەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) غەمبار دەکا لە گوفتاری کافرەکان ئەو قسەیانە: کە دەڵێن: (أن العزة الله جمعاً) ولحال وانیـەو ئـەم ڕسـتەیە قـسەی ئـەوان نیـە هیچ گومان لەوەدا نیە: کە زانیـاری لـەبواری وەقـفو ئیبتیـدادا سودی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتن لە مانای قورئانو وردبوونەوە لە ئەحکامەکانی.

لە ئیبنو عومـەرەوە (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـە بـاوکی بـێ) ڕیوایـەت کـراوە دەفـەرموێ: ئێمـە ڕۆژگارێکمـان بەسـەر بـرد، ئێمـەمانان ئیمانمـان پـێ دەدرا پێش ئەوەی قورئان فێر بینو وەری گـرین، ئـەمڕۆ کەسـانێك دەبیـنین قورئانیـان دراوەتـێ پـێش ئیمـان، لەسـەرتاوە بـۆ کۆتـایی قورئـان دەخوێنـێ، نازانێ فەرمانی بەچی پێ دەکاو لەچی نـەهی لێ دەکا، نازانـێ لەسـەر کـوێی قورئان وەقفە بکا، هەموو حەرفێکی بە زمانی حاڵ پێی دەڵێ: من نێـردراوی خودام بۆلای تۆ بۆ ئەوەی کارم پێ بکـەیو بـە ئامۆژگارییـەکانم پەنـد ئـامێز ببێ.[(١)]

زانایان دەربارەی وەقف ڕای جۆراوجۆریان هەیە، هەندێك پێیان وایە وەقف هەشت جۆرە (تەواو، لەتەواوچوو، ناقیص، لەناقیص چوو، حەسـن، لـە حەسەن چوو، قەبیحو ناجوان، لە قەبیح چوو).

---

[(١)] پەراوێزی کتێبی (البرهان) ١/٣٤٢.

هەندێك دەڵێن: وەقف سێ جۆرە (تـەواو، دروسـت، قـەبیح) هەنـدێك پێیان وایە وەقف دوو جـۆرە (تـەواو، قـەبیح)، قـسەی مەشهورو بـاو ئەوەیـە وەقـف چـوار جـۆرە:- (وەقفـی تـەواوو هەڵبـژاردە – وەقفـی کـافی دروسـت - وەقفی جوانو مەفهوم – وەقفی قەبیحو وازلێ هێندراو).

١- وەقفی تەواو: ئەو وەقفەیە هیچ پەیوەندی بە دوا خۆیەوە نـەبێ، بەزۆری ئەم جۆرە وەقفە لە کۆتایی ئایەتەکاندا دەبێ، وەکـوو ﴿أُوْلَـئِكَ عَلَـى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ – البقرة/٥﴾ ئەمجار دەست دەکەیەوە بـە ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ – البقرة/٦﴾.

وادەبێ وەقف پێش سەرەتای ئایەت دەبێ وەکوو ﴿قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً – النمـل/٣٤﴾ کە لێـرەدا قـسەی بـەڵقیس کۆتـایی دێ وەقفـە دەکـەیو کۆتـایی ئایـەتیش نیـە، ئـەمجار خـودا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ ئەمەیان کۆتایی ئایەتەکەیە.

٢- وەقفی کافیو دروست: ئەمەیان وەقفێکە لە لەفظ دابڕاو بێو مانا پەیوەست بێ، نموونەی ئەمە هەموو سەرە ئایەتێك دوای ئەو (لام)ی بە مانـا (كي) بێ، وەکوو ئایەتی ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُـرْآنٌ مُّبِينٌ ، لِيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ – يـس/٦٩ – ٧٠﴾.

٣- وەقفـی (الحـسن) ئـەو وەقفەیـە: کـە راوەسـتان لەسـەری بـەجوان بژمێردرێو لکاندنی بەدواوەی جوان بێ، چـونکە پەیوەنـدی بـە دواوە هەیـە وەکوو ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ – الفاتحة/١ – ٢﴾.

٤- وەقفی قەبیح: ئەوەیە مانای مەبەستی لێ تێنەگەی، وەکـوو وەقفـە لەسەر ئایەتی ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَآلُواْ – المائدة/١٧﴾ ئەمجار دەست بکا بە ﴿إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَـسِيحُ ابْـنُ مَـرْيَمَ – المائـدة/١٧﴾ چـونکە لێـرەدا کـە لەسـەر وشـەی (قالوا) وەقفە بکـەیو ئـەمجار دەسـت بکـەی بـە ڕسـتەی دوای ئـەو، ماناکـەی کوفر دەردەچێ.

نموونەی ئەمە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ: إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ – المائدة/٧٣﴾ دروست نیە لەسەر وشەی (قالوا) وەقفە بکەی.

## تەجویدو ئادابی قورئان خوێندن

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خودای لێ بێ) قورئانخوێنێکی دەنگ خۆش بوو، زۆر باش دەیتوانیو دەیزانی قورئان بخوێنێ، ئاشکراشە قورئانخوێندن بەشێوەی ڕەوانو صەحیح کاریگەری لەسەر خوێنەرو گوێگر هەیە، لەڕوی تێگەیشتن لە مانای قورئانو دەرکردنی نهێنیەکانی ئیعجازی، بەشێوەی خوشوعو ضەراعەتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْرَأَ الْقُرْآنَ غَضًّا كَمَا أُنْزِلَ فَلْيَقْرَأْهُ عَلَى قِرَاءَةِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ».[1] کەسێك پێی خۆش بێو بیەوێ قورئان بخوێنێ وەکوو چۆن نازڵ بووە، با لەسەر شێوە خوێندنی کوڕی ئوممی عەبد بیخوێنێ، مەبەستی بە (إبن أم عبد) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودە، خودا دەنگێکی خۆشو توانای باش خوێندنی قورئانی پێدابوو.

زانایانی ئیسلام لە کۆنو نوێدا گرنگی زۆریان بە باش خوێندنی قورئان داوە، بۆ ئەوەی بە ڕاستیو بە صەحیحی نوتق بە وشەو ڕستەکانی بکرێ، ئەم گرنگی پێدانە بە باش خوێندنی قورئان پێی دەگوترێ: (تەجویدی قورئان) کۆمەڵێك لە عولەمای ئیسلام لەبواری ئەم زانستەدا بە پەخشانو بە هۆنراوە کتێبو نامیلکەی سەربەخۆیان داناون، پێناسەی تەجویدیان ئامادە کردووە، وتوویانە: تەجوید بریتییە لەوە هەموو حەرفێك مافی خۆی بدرێتیو بە تەرتیبی خۆی دەربڕدرێ، هەموو حەرفێك لە

---

[1] أخرجه إبن ماجه/١٣٨ وأحمد/٣٥ من حديث إبن مسعود عن أبى بكر وعمر.

مەخرەج و ئەصڵی خۆیەوە ئاڕاستە بکرێ و بە لەسەرەخۆیی گۆیا بکرێ و کەماڵی هەیئەتی بەبێ زیادو کەم بدرێتێ و بەشێوەی سروشتی بخوێندرێ.

تەجوید هەرچەندە کارێکی هونەری زانستییە، یاساو قاعیدەی خۆی هەیەو پشتیان پێ دەبەسترێ بۆ دەرهێنانی پیتەکان لە مەخرەجی خۆیانەوە، وێڕای لەبەرچاوگرتنی پەیوەندی هەموو حەرفێك بەپێشەوەی خۆی و بەدواوەی لەڕوی چۆنیەتی ئەدا کردنیەوە، وەلێ ئەوەندەی بە مومارەسە دەستەبەر دەبێ بە دیراسەو خوێندن نایەتە دی، بەگوێگرتن و پراوەکردن و لاسایی کردنەوەی ئەوانەی باش قیرائەت دەزانن چاکی دەخوێنن باشترو زۆرتر شارەزای ئەم هونەرە زانستیە دەبین.

ئیبنو لجەزەری دەڵێ: هۆکار ڕێبازێك نابینم بۆ ئەوەی بگەیە پلەیەکی باش لە زانستی تەجویددا بگاتە پراوە پێکردنی زوبان و لاسایی کردنەوەی وشەو وەرگرتنی لە دەم و زوبانی کەسێکی کارامە لەو بوارەدا، قاعیدەکانی هەموویان چڕ دەبنەوە لە چۆنیەتی وەقف و ئیمالەو ئیدغام و یاساکانی هەمزەو تەرقیق و تەفخیم و مەخرەجی پیتەکان.[1]

بێگومان عولەمای ئیسلام خوێندنی قورئانیان بەبێ پەیڕەویکردنی قاعیدەو یاسای تەجوید بە لەحن و زمانخواری داناوە، (لەحن)یش خەلەل و ناڕەوانییەکە دەکەوێتە ناو ئەلفاظەوە، ئەمیش دوو جۆرە:-

لەحنی ئاشکراو جەلی، لەحنی خەفی و سوك، لەحنی ئاشکرا ئەوەیە لەفظەکە بشێوێنێ و وای لێ بکا عولەمای قیرائەت و کەسانی ئاسایی هەستی پێ بکەن، وەکوو ئەوە هەڵەی نەحوی، یان صەرفی تێدا بێ، لەحنی خەفی ئەوەیە تەنها عولەمای قیرائەت و ئیمامەکانی تەجویدو ئەوانەی لە دەمی عولەماوە قورئان فێربوون هەستی پێ دەکەن و بەس.

---

[1] بڕوانە: الإتقان/٢١٣.

زێدەڕەوی لە تەجویددا بگاتە ئەندازەی ئیفراطو تەکەللوف وەکوو لەحن ناپەسەندو خراپە، چونکە موبالەغەو زێدەڕەوی زیادکردنی حەرفە لە غەیری شوێنی خۆی، وەکوو ئەوانەی لە ڕۆژگاری ئێمەدا قورئان بە ئاوازێکی موسیقا ئاسایی غەمناكو دەنگی خۆیان دەلەرێننەوە، دەڵێی سازو سەمتور لێدەدەن، بێگومان زانایان هۆشدارییان داوە دەربارەی ئەو عادەتەی قورئان خوێنەکان دایان هێناوەو پەیڕەوی دەکەن لە دەنگ لەرانەوەدا، یان (ترقیص) یان (تطریب) یان (تحزین) یان (ترديد).

شێخی سیوطی لە کتێبی (الإتقان)دا نارەزامەندی خۆی لەم حالانە دەربڕیوە، رافعی لە کتێبی (إعجاز القرآن)دا دەڵێ: لەو دیاردە بیدعەتو ناپەسەندانەی خەڵکی لە بواری قورئان خوێندندا دایانهێناوە ئەم تەلحینەیە کە تا ئەمڕۆش ماوەتەوەو خەڵکی لە یەکتری وەردەگرنو کاری پێ دەکەن، ئەوانەی ئالودەی ئەم شێوە خوێندنە بوونو پێی موعجەب بوونو هەندێ گوێگریش پێیان سەرسامنو ئەم شێوە خوێندنە گۆرانی ئاسایەیان بەلاوە خۆشە.

## جۆرەکانی خوێندنی گۆرانی ئاسا ئەمانەن

الترعيد: واتە دەنگ لەراندنەوە بەشێوەی کەسێك لەبەر سەرما، یان ئازار دەنگی بلەرێتەوە.

الترقيص: وەکوو ئەوە بیەوێ لەسەر ساکن بوەستێ پاشان دەنگی هەڵبەزێنێتەوە وەك ئەوە باز بدا، یان گورگەلەقە بکا.

التطريب: ئەوەیە لەرەلەر بەدەنگی بکاو خوێندنی قورئان بەشێوەی گۆرانی ئەدا بکا، لەشوێنێك جێگای درێژکردنەوەی ئەو پیتە درێژبکاتەوە، ئەگەر شوێنێکیش جێگای مەددو درێژکردنەوە بوو، زۆری درێژ بکاتەوەو لە ئەندازەی پێویست تێپەڕێ.

التحـزين: ئەوەیـە بەشـێوەی حـوزنو غـەمباری قورئـان بخوێنـێو وا لەخۆی بکا وابزانی خەریکە بگری، یـان خـۆی بگرییێنـێو خـشوعو خـضوعـی هەیە.

الترديـد: رەدکردنــەوەی کۆمــەڵێك گــوێگر بــۆ خوێنەرەکــە دوای خوێندنی ئایـەتێك (بەشـێك) لـە قورئـان بـە یـەك لـەحنو بەشـێوەیەك لـەو شێوە نادروستانە.

لە ڕاستیدا خوێندنی ڕاستو صەحیح بۆ قورئان ئەوەیە بۆ هەموو حەرفێك مافی خۆی بدەیە بەگوێرەی ئەو داخوازییانەی عولەمای تەجویدو قیرائەت بڕیاریان لەسەر داوە، بەشێوەی تەرتیلو لەسـەرەخۆ، یـان بەشـێوەی (حذر) واتە: خوێندنێکی بەپەلەی وا مەرجەکانی قیرائـەتی صـەحیحی تێـدا بەرچاوبگیرێ، یان بەشێوەی (تدوير) لەنێوان تەرتیلو حەدردا.

خوێندنی قورئان سونەتێکە لـە سونەتەکانی ئیـسلام، زۆر خوێنـدنی قورئان موستەحەبو پەسەندە بۆ ئەوەی موسوڵمان دڵی زیندو بێو دەروون ڕوناك بێ بە قورئان خوێندن، لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خودا لـەخۆیو لـە باوکی بێ) ڕیوایەتکراوە وتوویەتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: «لاَ حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهُـوَ يُنْفِقُـهُ آنَـاءَ اللَّيْـلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُـوَ يَقُـومُ بِـهِ آنَـاءَ اللَّيْـلِ وَآنَـاءَ النَّهَـارِ».[1]
حەسـودی دروسـت نیـە مەگـەر لـە دوو شـتدا: پیاوێـك خـودا مـاڵو سـامانی بداتێ، بە شـەوو بـەڕۆژ لێـی ببەخـشێ، پیاوێـك خـودا وای لێکردبـێ قورئـان باش بزانێو بیخوێنێ شەوو ڕۆژ دەوری بکاتەوە.

خوێندنی قورئان لەگەڵ ئیخلاصو دڵسۆزی لەنیەتداو بـە مەبەسـتی ڕەزامەنـدی پـەروەردگار عیبادەتـەو پاداشـی لەسـەرەو موسـوڵمان لـە دونیـاو قیامەتـدا پێـی بەختـەوەر دەبـێ، لـە ئیبنـو مەسـعودەوە ڕیوایـەتکراوە کـە

---

[1] رواه البخاري/٧٥٢٩ ومسلم/١٨٩٤.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا».[١]

لە فەرموودەیەکدا: کە ئەبو ئومامە ڕیوایەتی کردووە هاتووە: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ».

سەلەفی صالّح (ڕەزای خودایان لێ بێ) زۆر پابەندی قورئان خوێندن بوون، هەیانبووە لە شەوو ڕۆژێك خەتمێکیان کردووە، هەیانبووە لە زیاتر لە شەوو ڕۆژێك خەتمیان کردووە.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: «اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ» لە مانگێکدا خەتمێکی قورئان بکە، وتم: من توانام زیاترە، فەرمووی: دەی کەوایە لە (دە) ڕۆژدا خەتمی بکە، وتم من توانام زیاترە، فەرمووی: «فَاقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ» لە حەوت ڕۆژدا خەتمێ بکەو لەوەزیاتر مەکە.[٢]

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هۆشداری داوە لە قورئان لەبیر خۆبردنەوە فەرموویەتی: «تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الإِبِلِ فِي عُقُلِهَا» سەرەوکاری قورئان بکەنو هەمیشە دەوری بکەنەوە، دەسا بەو کەسە: کە گیانی منی بەدەستە قورئان زووتر لەبیر دەچێتەوە، کاتێ دەوری نەکەیتەوە، هەتا وشتر کاتێ لە پەت بەردەبێو بەلەسە دەبێ.

فەرمانکردنی شاریع بە زۆر خوێندنی قورئانو خەتمکردنی بەگوێرەی کەسەکان دەگۆڕێ، بە جوداوازی تواناو کاتو ئیشو کاریان گۆڕانکاری بەسەردا دێ.

---

[١] أخرجه الترمذی/٣١٣٥.

[٢] رواه البخاری/٥٠٥٤ ومسلم/٢٧٣٢.

ئیمامی نـەوەوی لـە کتێبـی (الأذکـار)دا فەرموویـەتی: ڕای هەڵبـژێراو ئەوەیـە دەورکردنـەوەی خوێنـدنی قورئـان بـەگوێرەی کەسـەکان دەگـۆڕێ، کەسێك بە لێ وردبوونەوەو تێفکرین مانای جوانو عەنتیکەی بۆ بەیدەست بـبن، بـا ئەوەنـدەی لێ بخوێنـێ ئـەم مانایانـەی بـۆ دەسـتەبەر بـبن، هـەروەها کەسـێك مەشـغوڵە بـە بڵاوکردنـەوەی عـیلمو زانیـاری، یـان فەرمانبـەرەو ئیشوکـاری خـەڵك رادەپـەڕێنێ، یـان هـەر ئـەکێکی تـری کۆمەڵایـەتی لـە ئەسـتۆیەو بەرژەوەنـدی موسـوڵمانانی پێـوە بەنـدە، بـا ئەوەنـدە قورئـان بخوێنێو کاتی بۆ تەرخان بکا: کە نەبێتە لەمپەڕ لەسەر ئەرکەکانیو بتوانێ ئیشوکارەکانی بـەجوانیو ڕێـكوپێکی ئـەنجام بـدا، خـۆ ئەگـەر کـابرا دەست بەتاڵ بوو، بێ ئیش بوو با زۆر قورئان بخوێنێو چەندێکی بـۆ دەکـرێو بـۆی دەلـوێ بـا خـەریکی خوێنـدنی بـێ، بـە مـەرجێك وانـەکا لێـی وەڕز بـێ، یـان پەلەپەلکردن لە خوێندنەوەیدا کە هیچ لە ماناو ئاماژەکانی وردنەبێتەوە.

## ئادابو ڕەوشتی قورئان خوێندن

**واباشو پەسەندە بۆ ئەوەی قورئان دەخوێنێ:-**

١- دەستنوێژی هەبێ، بەڵکوو ئەگەر خوێندنەکەی لەناو قورئاندا بـوو لەبەر نەیدەخوێنـد پێویسـتە دەسـتنوێژی هـەبێ، چـونکە خوێنـدنی قورئـان گەورەترین ذیکرە، بەڵام ئەگەر لەبەری بوو بەبێ دەستنوێژیش دروستە.

٢- لە شوێنێکی پاك بێو شیاو بێ، موراعـاتی گـەورەیی خوێندنەکە بکا.

٣- بەخشوعو خضوعـەوە بیخوێنـێو بـە ئـەدەبو ویقـارەوە خـەریکی ئەو تاعەتە پیرۆزە بێ.

٤- دەبێ پێش دەستکردن بە خوێندنی قورئان سیواك بکا.

٥- لەسەرتاوە (أعوذ باللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم) بخوێنێ ئاماژە بە ئایەتی ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ – النحل/٩٨﴾ تەنانەت هەندێ لە زانایان فەرموویانە واجبە (أعوذ باللّهِ..............) بکرێ.

٦- لە سەرەتای هەموو سورەتێکدا ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بڵێ، جگە لە سورەتی (براءة) چونکە ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بە گوێرەی قەولی راجیح ئایەتێکە لە قورئان.

٧- خوێندنەوەی بەشێوەی تەرتیل بێ، هەموو حەرفێك مافی بداتێو مەددو ئیدغام بەرچاوبگرێ، پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا – المزمل/٤﴾ لە ئەنەسەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە: کە پرسیار کرا ئاخۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن قورئانی دەخوێند؟ فەرمووی: «كَانَتْ مَدًّا» زۆر باش موراعاتی مەدو شتی وای دەکرد، ئەمجار ﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ی دەخوێند وشەی (الله)ی درێژدەکردەوە، مەددی پێویستی دەدا بە وشەی (الرحمن)و (الرحيم).

لە ئیبنو مەسعودەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: پیاوێك وتی: من سورەتێکی (المفصل) لە ڕکاتێکدا دەخوێنم، منیش پێم گوت: (أهذّاً كهذّ الشعر؟) بۆچی قورئان شیعرە بەشێوەی شیعر بە پەلەپەل بیخوێنینەوە؟.

بێگومان کۆمەڵێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێپەڕ ناکا، وەڵێ ئەگەر قورئان چووە دڵەوە، کاریگەری لەسەر دڵ پەیدا کردو تێیدا جێگیر بوو سود دەبەخشێ.

ئیمامی زەرکەشی لە (البرهان)دا دەڵێ: تەرتیلی تەواو ئەوەیە وشەکان بەتەواوی دەرببڕێ، پیتەکان لێك بکاتەوە، پیت لەپیت نەترنجێنێ، تەنانەت ڕایەك هەیە دەڵێ: ئەمە لای کەمی تەرتیلە، تەرتیلی تەواو ئەوەیە قورئان

وابخوێندرێ تەعبیرەکانی پێوە دیار بن ئەگەر ئایەتەکە هەڕەشە ئامێز بوو وای بخوێنێ ئەو سیمایەی پێوە دیار بێ، ئەگەر تەعظیمو شکۆمەندی خودای دەگەیاند، وای دەربڕێ ئەو ئوسلوبە بگەیەنێ.

٨- لە خوێندنەوەکەیدا بیر لەماناو تەعبیرەکانی بکاتەوە، چونکە ئەوە مەبەستی سەرەکی خوێندنەوەی قورئانە، مەطلەبێکی گرنگیەتی، بەمجۆرە دڵی مەشغوڵ بێ بە بیرکردنەوە لە مانای ئەوەی دەیخوێنێ، بە هەستو شعوری لەگەڵ ئایەتەکاندا جۆش بخواو بزانێ ئەوە دوعاو پاڕانەوەیە، داوای لێخۆشبوونە، طەلەبی ڕەحمەتە، ترسان لە سزاو عەزابە...............هتد.

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ – ص/٢٩﴾ لە حوزەیفەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم کرد دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی (البقرة) هەمووی خوێند، دوایی دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (النساء) هەمووی خوێند، ئەمجار (آل عمران) ئەویشی تەواو کرد، بە لەسەرخۆیی‌و هێدی دەیخوێند کە دەگەیشتە ئایەتێك تەسبیحاتی تێدا بووایە وای دەخوێند سیمای تەسبیحاتی پێوە بێ، کە دەگەیشتە ئایەتێ پرسیار ئامێز بوایە بەشێوەی پرسیار دەیخوێند، کە دەگەیشتە ئایەتێك پەناگرتن بەخودای تێدا بوایە وای دەخوێند مانای خۆپەنادانو خۆخستنە ناو شورای مەحکەمی پەروەردگاری پێوە دیار بوایە.

٩- دەبێ وا قورئان بخوێنێ کاریگەری ماناکەی لەسەر دڵو دەروونو نەبەراتی دەنگی دیار بێ، چ وادەبێ، چ هەڕەشە بێ، لە کاتی خوێندنی ئایاتی هەڕەشە ئامێزدا، حوزنو ترسی پێوە دیار بێو گریان دڵە لەرزەی بگاتێ، پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا – الإسراء/١٠٩﴾.

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێمی فەرموو: قورئانم بەسەردا بخوێنە، عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! قورئان بەسەر تۆدا بخوێنم؟ لە حاڵێکدا قورئان بۆسەر تۆ نازڵ بووەو ئێمە لە جەنابتەوە فێری بووین‌و پێمان گەیشتووە؟ فەرمووی: بەڵێ: من پێم خۆشە گوێم لە قورئان بێ‌و لە کەسانی دیکەوە بیبیستم، منیش سورەتی (النساء)م بۆ خوێند تا گەیشتمە ئایەتی ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا - النساء/٤١﴾ فەرمووی: بەسەو هیچی تر مەخوێنە، کە سەیرم کرد دوو چاوەکانی فرمێسکیان دەباراند.[١]

نەوەوی لە شەرحی (المهذب)دا دەڵێ: ڕێگا چارە بۆ دەستەبەر بوونی خوێندنی قورئان بەو جۆرە کاریگەرییەو گریان پەیدا کردن ئەوەیە زۆر باش وردبیەوە لەوەی دەیخوێنی لە قورئان کە مانای هەڕەشەو ترساندنی تێدایە، یان ئاماژە بە پابەندبوون بە وادەو بەڵێن دەکا، پاشان بیر لە حاڵی خۆت بکەیەوە چەند کەمتەرخەم بووی‌و چەندت لاساری کردووە لە بەرامبەر فەرمانەکانی خودا، جا ئەگەر بەم لێ وردبوونە خەم داینەگرتی‌و گریانت نەهات، ئەوکاتە بۆ ئەوە بگری کە تۆ ئەم هەستە خوداپەرستیەت نیەو ماڵوێرانی‌و بەخۆت نازانی، چونکە نەبوونی ئەوهەستە لەلات بەڵایەکە لە بەڵا گەورەکان.

ئیبنو ماجە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَخْرُجُ قَوْمٌ فِي آخِرِ الزَّمَانِ - أَوْ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ - يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ - أَوْ حُلْقُومَهُمْ سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ إِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ - أَوْ إِذَا لَقِيتُمُوهُمْ - فَاقْتُلُوهُمْ».[٢] لەئاخری

---

[١] أخرجه البخاري/٤٥٨٢ ومسلم/١٨٦٧.

[٢] إبن ماجه/١٧٥ وأخرجه البخاري/٦٩٣٠ ومسلم/٢٤٦٢.

زەمانـدا کۆمـەڵێك پەیـدا دەبـن، یـان لـەم گـەلی موسـوڵمانە کۆمـەڵێك سـەر هەڵدەدەن قورئان دەخوێنن لە قورگیان تێپەڕ ناکا، کە بینیتانن، یان توشیان بوون، بیانکوژن.

١٠- دەبێ بە دەنگی خۆش قورئـان بخوێنـێ چونکە قورئـان زینـەتو رازینەرەوەی دەنگە، دەنگی خۆش پـتر کاریگـەری لەسـەر دڵو دەروون دەبـێ، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: «زَيِّنُـوا الْقُـرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ».[1] بە دەنگی خۆش خوێندنی قورئان بڕازێننەوە.

١١- بەدەنگی بەرز بیخوێنێ لە شوێنێکا دەنگ بەرزکردنەوە باشتر بێ، چونکە پتر دڵ ئاگایی تێدایەو نیشات تـازە دەکاتـەوەو گوێـچکە لێ دەبـڕێ بـۆ بیستنی قیرائەتەکـەو سودیشی بـۆ بیسـەرانی دەبـێ، هـەموو هەسـتەکان چڕ دەبنەوە بۆ بیرکردنەوەو تێڕامانو قوڵبوونەوە لە ماناکانی.

وەلێ ئەگەر ترسـی ریـای هـەبوو، یـان ئەزیـەتی خـەڵکانی دەوروبـەری دەدا، کەسـانێك هـەبوون لـە نزیکیـەوە نوێـژیان دەکـردو کاریگـەری سـەلبی دەبـوو لەسـەر نوێژەکـەیان ئـەوە دەنـگ نزمکردنـەوە باشـترە، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: «ما أذن الله لشيئ، ما أذن لـنبي حـسن الصوت يتغنى بالقرآن يجهر به».[2]

١٢- راجیـایی هەیـە لـەوەدا ئایـا خوێنـدن لـەناو موصحەفدا بـێ، یـان لەبەر بیخوێنی، سێ رای تێدایە:

رای یەکەم: خوێندنی لەناو موصحەفدا باشـترە، چونکە تێـڕوانین لـە قورئانەکەش خێرە، خێری خوێندنو تێڕوانینی دەگاتێ.

رای دووەم: خوێنـدنی لەبـەر خێـری زیـاترە چـونکە پـتر داخـوازی ئەوەیە بیروهۆشی خۆی بداتێ.

---

[1] رواه أبو داود/١٤٦٨.

[2] أخرجه البخاري/٧٥٤٤.

(العز)ی کوڕی عبدالسلام ئەم ڕایەی بەلاوە پەسەندە، دەڵێ گوتراوە: خوێندن لەناو موصحەفدا باشترە چونکە کرداری چاو زوبان کۆدەکاتەوە، ئەجرو پاداشیش بەپێی مەشەقەتە وەڵێ ئەم بۆچوونە پوچە، چونکە مەبەست لەخوێندنی قورئان تێفکرینو لێ وردبوونەوەیە ئامارژە بە ئایەتی ﴿لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ – ص/٢٩﴾ واقیعو عادەتیش شایەتی ئەوەن: کە خوێندن لەناو موصحەفدا بە باشی ئەم مەبەستە بە دەستەوە نادا، کەوابوو ئەو ڕایە پەسەند نیە.

ڕای سێیەم: دەڵێ: ئەم مەبەستە بەگوێرەی حاڵەتەکان دەگۆڕێ، ئەگەر خوێنەرەکە بەخوێندنی لەبەر، تێفکرینو بیکردنەوەو دڵدانە ماناکانی باشتر بۆ دەستەبەر دەبوو لەوەی لە موصحەفدا بیخوێنێ، ئەوە خوێندنی لەبەری باشترە، ئەگەر یەکسان بوو ئەوە لە موصحەفدا بیخوێنێ خێری زۆرترە.

## فێرکردنی قورئانو کرێ وەرگرتن لەسەری

فێرکردنی قورئانو فێربوونی فەرزی کیفایەیە، لەبەرکردنی لەسەر گەلی موسوڵمان بەگشتیو تێکڕایی واجبە بۆ ئەوەی زنجیرەی تەواتوری وەرگرتنی قورئان لەڕوی حیفظەوە قەطع نەکرێو کۆتایی پێ نەیێ، گۆڕانکاریو تەبدیلو تەحریف ڕوی تێنەکا، جا ئەگەر کۆمەڵێك ئەم کارە پیرۆزەیان کرد، فەرزەکە لەسەر ئەوانی تر لادەچێ ئەگینا هەموویان تاوانبار دەبن.

لە حەدیثێکدا: کە ئیمام عوثمان ڕیوایەتی دەکا: هاتووە: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».[1] باشترتان کەسێکە فێری قورئان ببێو خەڵکیش فێر بکا.

---

[1] رواه البخاري/٥٠٢٧.

ڕێگاچارەی فێربوونی قورئان، لەبەرکردنی چەند ئایەتێکە ئەمجار چەند ئایەتێکی تر....هتد. ئەم شێوە ئەمڕۆ لە وەسائیلی فێرکردنو پەروەردەدا باوە، یان خوێنەرەکە بەشێکی کەمی لێ لەبەر دەکا، پاشان بەشێکی تری کەم لەبەر دەکاو دەیخاتە پاڵ ئەوەی پێشوو ئاوا بەو شێوە.

لە ئەبو لعالیەوە هاتووە دەڵێ: پێنج ئایەت پێنج ئایەت فێری قورئان بن، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێنج پێنج لە جوبرائیلی وەرگرتووە.

زانایانی ئیسلام راجیاییان هەیە لەوەدا ئاخۆ دروستە لەپای فێرکردنی قورئان کرێ وەربگیرێ؟ زانا پایە بەرزو موحەقیقەکان فەرموویانە دروستە، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) «أَحَقُّ مَا أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا كِتَابُ اللَّهِ».[1] باشترین شتێك کرێی لەسەر وەرگرن فێرکردنو خوێندنی قورئانە، هەروەها فەرموودەی: «فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ».[2]

هەندێ لە زانایانی ئیسلام فێرکردنی قورئانیان بە شێوەیەکی باش دابەشکردووەو حوکمی هەر حاڵەتێکیان ڕون کردۆتەوە، ئەبو للیثی سەمەرقەندی لە کتێبی (البستان)دا فەرموویەتی: فێرکردنی قورئان سێ جۆرە: جۆرێکیان بە خۆڕاییو بۆ ڕەزامەندی پەروەردگارەو هیچ بارتەقایەك وەرناگرێ، جۆرێکیان ئەوەیە بە کری خەڵکی فێری قورئان بکا، جۆری سێیەمیش ئەوەیە بەبێ مەرج قورئان فێری کەسانی دی بکا، جا ئەگەر فێرخوازەکە شتێکی بەدیاری بۆ برد وەری بگرێ.

جۆری یەکەمیان پاداشی گەورەی هەیە لای پەروەردگارو پیشەی پێغەمبەرانە، جۆری دووەم راجیایی تێدایە هەندێك دەڵێن: وەرگرتنی کرێ

---

[1] رواه البخاري من حديث إبن عباس.

[2] أخرجه البخاري/٥٠٢٩ ومسلم/٣٤٨٨ من حديث سهل بن سعد.

لەسـەر قورئـان فێرکـردن دروسـت نیـە، ئامـاژە بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کـە دەفـەرموێ: «بَلِّغُـوا عَنِّـي وَلَـوْ آيَـةً» قورئـان فێری خەڵکی بکەن تەنانەت ئەگەر ئایەتێکیش بێ.

رایـەك هەیـە دەڵـێ: دروسـتە، وەڵێ واباشـە بـۆ مامۆسـتاکە کرێیەکـە لەسـەر پـێ لەبـەرکردنو فێرکردنـی نووسـین وەربگـرێ نـەك لەسـەر فێرکردنەکـە، خـۆ ئەگـەر لەسـەر فێرکردنەکـە کرێـی وەرگـرت هیـوادارین چ خراپیـەکی تێـدا نـەبێ، چـونکە موسـوڵمانان لـە کۆنـەوە چـین دوای چـین ئـەوەیان کـردووەو بـە خراپیـان نـەزانیوە، پێویـستیان پێـی هـەبووە، جـۆری سێەمیان بەرای هەموو زانایان دروسـتە، چـونکە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) مامۆستای ئادەمیزاد بووە، دیاریشی وەردەگرت.

هـەروەها ئامـاژە بـە چـیرۆکی کـابرای مارگەسـتو کاتێـك هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـورەتی فاتیحـەیان وەکـوو دوعـا بەسەردا خوێندو لە بارتەقای ئەو دوعا خوێندنـە برێکیـان ماڵیـان وەرگـرت، کە بەسەرهاتی خۆیان بۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گێڕایـەوە فەرمووی: «خُذُوا وَاضْرِبُوا لِـي بِـسَهْمٍ مَعَكُـمْ».[1] منـیش بکـەن بـە هاوبەشـی خۆتانو بەشێکم بدەنێ.

## ١١ ئەو قاعیدەو یاسایانەی ڕاڤەکەر پێویستی پێیانە

هەر عیلمێك مرۆڤ خەریکی بێ پێویستە بنـەما گشتییەکانی بزانـێ، مومەییزاتە تایبەتیەکانی بناسێ، بۆ ئەوەی بە بەرچاوڕوونییەوە بچێتە ناوی، چەندێك بتوانێ ئالەتی زانیاری کۆبکاتەوە ئەوەندە دەتوانێ لـەو زانیارییـەدا سەرکەوتن بەدەست بێنێو لە دەرگای خۆیەوە بچێتە ناو باسو فەصڵەکانی، بە کلیلی تایبەتی دەرگاکە بکاتەوە، جا کە قورئانی پیرۆز بە زمـانی عـەرەبی

---

[1] أخرجه البخاري/٥٧٣٦ ومسلم/٥٧٦٤.

ڕون و ڕەوان نازڵ بووە ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ - يوسف/٢﴾ ئاشکرایە ئەو ئالەت و قاعیدەو یاسایانەی موفەسیر پێویستی پێیانە، لە قەواعیدی عەرەبیدا کۆدەبنەوە، تێگەیشتن لە بنەمای تەفسیرو چەشەکردنی ئوسلوبی و دەرککردنی نهێنیەکانی بەبێ قاڵبوون لە قەواعیدی نەحوو صەرف و بەلاغەی عەرەبی دەستەبەر نابن، پەییان پێ نابرێ، ئەم قەواعیدو یاسایانەش خۆیان لە چەند باب و لە فەصل و مەبحەثی لێرەو لەوێدا دەبیننەوە لە چوارچێوەی فروعی عەرەبی و علومی عەرەبیدا دەست دەکەون ئێمە لێرەدا دەتوانین بە کورتی ئاماژە بۆ هەندێ لەو قاعیدەو یاسایانە بکەین کە گرنگن و زانینیان پێویستەو بەبێ هەبوونی ئەو زانیارییانە راڤەکردنی قورئان ئەستەمەو کەسێك نەیبن لە تەفسیرکردنی قورئاندا سەرکەوتوو نابێ.

## ١) (الضمائر) راناو

راناو یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە، زانایانی زمان دەستنیشانیان کردووە، لە قورئان و سەرچاوە عەرەبیە ڕەسەنەکان دەریان هێناون، هەروا لە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و قسەی ئەو عەرەبانەی قسەکانیان دەکرێتە شایەت و بەڵگە لە زماندا، جا شیعر بن، یان پەخشان، ئیبنولئەنباری[1] کتێبێکی دووجلدی لە باسی راناوی قورئان داناوە.

ئەصڵ و بنەمای راناو بۆ کورتکردنەوەی ئەلفاظە، جاری وا هەیە راناوێك لەشوێنی وشەگەلێکی زۆر دادەنرێ و مانا تێکناچێ و دوبارە بوونەوەشی تێناکەوێ، ئەوەتا راناوی (هم) لە ﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ جێگای بیست وشەی گرتۆتەوە، ئەگەر راناو دانەنێین دەبێ ئەو بیست وشانە ذیکر بکەین، وەکوو لە ئایەتی (٣٥)ی سورەتی (الأحزاب)دا

---

[1] ئەبو بەکر محمد بن القاسم الأنباری سالی/٣٢٨ی کۆچی، کۆچبار بووە.

هاتووه دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا – الأحزاب/٣٥﴾.

ئەصڵ وایە: کە پێویستە بۆ راناوی غائیب مەرجەعو موفەسیرێك هەبێ، نەحوی پاساو بۆ ئەم ئەصڵو پێویستیـیە دێننەوە دەڵێن: راناوی گۆیا (متكلم)و قسە لەگەڵ کراو (مخاطب) پێویستیان بە موفەسیر نیـە، چونکە ئەمان موشاهەدەو بەرچاویی، تەفسیریان دەکەنـەوە، بـەڵام راناوی (غائیـب) ئەم حاڵەتەی نیە، کەوابی دەبێ لە پێشیەوە مەرجەعەکەی هەبێ، بۆ ئـەوەی مەبەسـت لـە ضـەمیرەکـە بزانـدرێ پـێش گـوتنی، هەربۆیـە نەحوییـەکان وتوویانە دروست نیە گەڕانەوەی راناو بۆ وشەیەك: کە لە ڕوی لـەفظو پلـەو شوێنەوە لەدوا ڕاناوەکە بێ.

لەم قاعیدەیە چەند مەسەلەیەك چەرت کراوە، راناوەکە لە پێشیەوە موفەسیری بەرچاوی نیـە، بـەڵکوو دەگەڕێتـەوە بـۆ مەرجـەعێك کەبـەهۆی بوونی چەند قەرینەو نیشانەوە ئاتاجی ذیکـر کردنـی نـەبووین، یان بـوونی چەند دیاردەیەك کە دەوران دەوری مەقامی ئاخاوتنەکەیان دابێ.

ئیبنو مالیك لە کتێبی (التسهیل)دا یەژێ: ئەصـڵ ئەوەیـە مەرجـەعو موفەسیری راناوی غائیب لەپێشەوە بێ، بـۆ ئـەوە شـیان بـێ: کە لێـی نزیکە، بـە بەڵگـەو نیـشانەش نـەبێ ناگەڕێندرێتـەوە بـۆ دوورەکـەیان، ئـەمجار ئـەو موفەسـیرە، یـان دەبـێ بـە صـەراحەت مـەلفـوظ بـێ، یـان دەبـێ ئاتـاجی ذیکرکردنی نەبین بەهۆی هەستکردنمان بە مەدلوکەی لەڕوی عیلمـەوە، یـان هەسـتەوە، یـان بـەهۆی ذیکرکردنـی شـتێك کـە جـوزئی راناوەکەیـە، یـان کوللەکەیەتی، یان نەظیرو هاوشانیەتی، یان هاوەڵو هاوزەمانیەتی......

لەسەر ئەم بنەمایە ئەو مەرجەعەی راناوی غائیبی بۆ دەگەڕێتەوە، دەبێ لێی پێش کەوتبێ‌و مەلفوظ بێ‌و موطابیقی بێ لەڕوی تەذکیرو تەئنیث‌و ئیفرادو تەثنیەو جەمعەوە، زۆربەی حاڵەکان بەم شێوە دەبێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ – هود/٤٢﴾ یان ئەوەی پێش راناوەکە کەوتووە مەرجەع‌و موفەسیرەکەی لەخۆ گرتبێ وەکوو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ – المائدة/٨﴾ لێرەدا راناوی (هو) دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (العدل) کە لەفظی (أعدلوا) لەخۆی گرتووەو دەیگەیەنێ.

یان بەشێوەی ئیلتیزام ئاماژەی بۆ بکاو بیگەیەنێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ – البقرة/١٧٨﴾ راناو لە (إليه)ی‌دا دەگەڕێتەوە بۆ (العافی)یەك: کە لە وشەی (عفي) دەستەبەر دەبێ.

جاری واهەیە لەڕوی لەفظەوە – نەك لەڕوی پلەوە – مەرجەعی راناوی غائیب دەکەوێتە دواوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى – طه/٦٨﴾ لێرەدا راناو لە (فی نفسه)ی‌دا دەگەڕێتەوە بۆ (موسی) کە لەڕوی لەفظەوە کەوتۆتە دوا ڕاناوەکە، بەڵام (موسی) فاعیلە، فاعیلیش روتبەو پلەی لەپێشەوەیە.

جاری وایش دەبێ مەرجەعی راناوی غائیب لەڕوی لەفظو روتبەوە دوادەکەوێ، وەکوو راناوی شەئن‌و قیصەو نعم وبئس وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ – الأنبياء/٩٧﴾ هەروا ئایەتی ﴿بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا –

الكهف/٥٠﴾ يـان ﴿سَاء مَثَلاً الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَـانُواْ يَظْلِمُـونَ – الأعراف/١٧٧﴾ يان وشەيەك لەدوا ضەميرەكەوەيـە دەلالـەت دەكـا لەسـەر مەرجەعەكەی وەكوو دەفـەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ – الإخـلاص/١﴾ ﴿فَلَوْلَـا إِذَا بَلَغَـتِ الْحُلْقُـومَ – الواقعـة/٨٣﴾ لێـرەدا رانـاوێكی شـاردراوە لـەدوا وشـەی (بلغت)ەوە هەيە، وشـەی (الحلقـوم) كـە لەدواوەيـەتی دەلالـەت دەكـا لەسـەری، تەقديرو مەزندەكردنەكەی بەم شێوەيە (إذا بلغت الروح الحلقوم).

يان مەرجەعی راناوەكە لـە تێفكـرين لەسـياقی كەلامەكـە دەزانـدرێ، وەكوو دەفـەرموێ: ﴿كُلُّ مَـنْ عَلَيْهَـا فَـانٍ – الـرحمن/٢٦﴾ رانـاو لـە (عليهـا)دا دەگەڕێتەوە بۆ (الأرض) واتە: (كل من على الأرض فان) هـەروا ئايـەتی ﴿إِنَّـا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ – القـدر/١﴾ لەسـياقی كەلامەكـە دەزانـين: كـە رانـاو لـە (أنزلناه)ودا دەگەڕێتەوە بۆ (القرآن) يـان ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى – عبس/١﴾ رانـاوێكی شادراوە لەدوا وشەی (عبس)و (تولى) هەيە كە (هو)يە.

لەسياقی كەلامەكە دەزانين مەرجەكەی (النبيّ)يە، هـەروا ئايـەتی ﴿أَمْ يَقُولُـونَ افْتَـرَاهُ هـود/١٣﴾ لەسـياقی كەلامەكـە دەزانـين (واو)ی (يقولـون) فاعيلـەو مەبەسـت بتپەرسـتەكانە فـاعيلی (افـترى) رانـاوێكی شـاردراوەيەو مەبەسـت لێـی پێغەمبـەر (درووەی خـودای لەسـەر بـێ) رانـاوە ئاشـكراكە لـە (افتراه)دا مەفعولەو مەبەست لێی قورئانە، كـەوابێ ئـاوا مەزەنـدە دەكـرێ (أم يقول المشركون افترى النبيّ القرآن).

جـاری وايـش دەبـێ رانـاو دەگەڕێتـەوە بـۆ خـودی لـەفظ بـەبێ مانـا، وەكوو دەفـەرموێ: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِـنْ عُمُـرِهِ إِلَّـا فِـي كِتَـابٍ – فاطر/١١﴾ مەبەست بە راناوەكە لە (من عمره)ی‌دا (معمر)ێكی ترە، بۆيـە بـە رانـاو ئاراسـتەی كـردووە چـونكە وەكـوو هـی يەكـەم وايـە، ئەگـەر بەئيـسمی ظاهير بيهێنايە دەق ئـاوادەبوو (ولا ينقص من عمر معمـر) كـەوابوو ضـەمـيری

(من عمره) دەگەڕێتەوە بۆ موعەممەرێکی تر غەیری یەکەم وەکوو ئەوە بڵێ: (عندی درهم ونصفه) راناوی (نصفه) دەچێتەوە بۆ دیرهەمێکی تر.

جاری وایش دەبێ (راناو) دەگەڕێتەوە بۆ ماناو بەس وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – النساء/١٧٦﴾ راناو لە (كانتا) هیچ لەفظیکی لەپێشەوە نیە ببێتە مەرجەع بۆ راناوەکە، چونکە وشەی (کلالة) بۆ (تاك‌و بۆ دووان‌و بۆ کۆ) بەکار دێ راناوەکە بەشێوەی (دووانی) دەگەڕێتەوە بۆ (کەلالە) لەم ڕووەوە مانای (دوو) بگەینێ، یان ئایەتی ﴿وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا – النساء/٤﴾ راناو لە (منه)دا دەگەڕێتەوە بۆ سەر مانای (صدقات) چونکە لەمانای (صداق) یان لە مانای (ما أصدق)دایە وەکوو ئەوە فەرموویەتی: (زآتوا النساء صداقهن أو ما أصدقتموهن).

جاری وادەبێ راناو (ضمیر) لەسەرتاوە دادەنرێ پاشان موفەسیرەکەی (مرجع)ەکەی بۆ دەکرێ بە خەبەر وەکوو ئایەتی ﴿وَقَالُواْ إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ – الأنعام/٢٩﴾ جاری وادەبێ (راناو) دوانی (مثنی)یە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە مەرجەعە ذیکرکراوەکان وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ – الرحمن/٢٢﴾ چونکە ئەو لەپێشەوە باسی دەریاری شیرن‌و سوێری کرد، دەی مەرجەعی راناوەکەی کە لوئلوئی لێ دەدرێ دەریا سوێرەکەیەو بەس، دەریای شیرین لوئلوئی لێ دەرنایە، بەلاّم کە لە یەکێکیان دەرهات وەکوو ئەوە وایە لەهەردووکیان دەرهاتبێ (الزّجّاج) ئاوا تەوجیهی کردووە.

جاری واهەیە راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ شتێك: کە مولابیسی خۆیەتی، وەکوو دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا – النازعات/٤٦﴾ واتە (ضحا یومها) چونکە (عشية)، (ضحا)ی نیە.

جاری وادەبێ بۆ مەرجەعێك راناو دەگەڕێندرێتەوە جارێك موراعاتی لەفظەکەی دەکرێ، جارێکی تر موراعاتی مەعنای دەکرێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ – البقرة/٨﴾ ئەوەتا (راناو) لە (يقول)دا شاردراوەیەو تاکەو دەگەڕێتەوە بۆ لەفظی (مَن) کەچی دوایی لە (وما هم)دا راناوەکەی بەکۆ هێناوەو دەگەڕێتەوە بۆ (مَنْ) بە ئیعتیباری ماناکەی.

## تەعریفو تەنکیر

هێنانی ئیسم بەشێوەی نەکیرە چەند جۆرێکی هەیە جاری واهەیە مەبەست تاکێکە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَاء رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ – القصص/٢٠﴾ وشەی (رجل) کە بە نەکیرەیی هێندراوە مەبەست تاکە، جاری وایش هەیە مەبەست جۆرو چۆنیەتییە، وەکوو ئایەتی ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ – البقرة/٩٦﴾ واتە: جۆرێك لە (حياة): کە درێژبوونەوەی ژیانە لە داهاتوودا، یان مەبەست هەردووکیان بێ (تاكو جۆر) پێکەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – النور/٤٥﴾ واتە: پەروەردگار هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی گیانلەبەری لە جۆرێك لە

جۆرەکانی ئاو دروست کردووە، هەموو تاکێك لە تاکەکانی گیانلەبەری لە دلۆپە ئاوێك لە دلۆپەئاوەکانی نوطفە بەدیهێناوە.

وادەبێ هێنانی ئیسم بە نەکیرەیی بۆ تەعظیمو گەورەیی‌یە وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّـهِ – البقرة/٢٧٩﴾ واتە شەڕێکی گەورەو سامناك.

جاری وا هەیە زۆری شت دەگەیەنێ وەکوو ئایەتی ﴿أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا – الشعراء/٤١﴾ واتە ئەجرو پاداشێکی زۆرو زەبەند، یان بۆ هەردووکیان دەبێ، واتە بۆ تەعظیمو تەکثیر، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ – فاطر/٤﴾ وشەی (رسل) تەعظیمو تەکثیر دەگەیەنێ، واتە: پێغەمبەرانی ڕێزدارو زۆرێك لە پێغەمبەرانی پێش تۆ.

وادەبێ هێنانی ئیسم بە نەکیرەیی بۆ تەحقیرو بێ نمودیەتی وەکوو دەفەرموێ: ﴿مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ – عبس/١٨﴾ وشەی (شيئ) بەو شێوە نەکیرەیی‌یە هیچو پوچو بێ نمودی دەگەیەنێ.

جاری واهەیە هێنانی ئیسم بە نەکیرەیی تەقلیلو کەمی دەگەیەنێ وەکوو ئایەتی ﴿وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ – التوبة/٧٢﴾ وشەی (رضوان) جێ باسی ئێمەیەو مەبەست ئەوەیە: کەمێك ڕەزامەندی خودا، ڕەزامەندییەکی کەم لە خوداوە زۆر لەو باخو باغاتانە گەورە ترە، خۆشترە، چونکە ئەو ڕەزاممەندییە کەمە هۆکارو دەستەبەرکەری هەموو بەختەوەرییەکە.

ناوهێنانی ئیسم بەشێوەی تەعریف ئەویش چەند پلەو مەقامێکی هەیە، هەر جۆرێك لە جۆرەکانی تەعریف شوێنی گونجاوی خۆی هەیەو بەگوێرەی مەقام تەعریفەکە دەگۆڕێ.

وادەبـێ بەشـێوەی (ڕانـاو) دەهێنــدرێ، چـونکە مەقامەکـە مـەقامی تەکەللومە، یان خیطابە، یان غائیب.

وادەبـێ بەشێوەی (علـم) نـاو دەهێنـدرێ بـۆ ئـەوەی یەکسەر خـودی شتەکە لە زەینـی موخاطەبـدا جێگیر بـێ، بـەناوی شەخصی خـۆی یەکسەر ئاراسـتەی زەینـی کەسـی بەرامبـەری دەکـەی، یـان بـۆ تـەعظیمو ڕێزلێنانـە وەکوو دەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ – الفتح/٢٩﴾ یان بۆ تـەحقیرو ئیهانـە پێکردنیەتی وەکوو ئایەتی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ – المسد/١﴾.

جارێ بەشـێوەی (إسـم الإشـارة) ئاراسـتەی دەکـەی بـۆ ئـەوەی بـەیانی حاڵو چۆنیەتی بکەی لەبارەی نزیکیەوە وەکوو دەفـەرموێ: ﴿هَذَا خَلْـقُ اللَّـهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ – لقمان/١١﴾ یـان بۆ دیاریکردنی دوورییەتی وەکوو دەفـەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ عَلَـى هُـدًى مِّـن رَّبِّهِـمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ – البقرة/٥﴾ یـان بـە مەبەسـتی تـەحقیرو بەکـەم زانـی بەهۆی نزیکیو بەرچاوی وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا هَذِهِ الْحَيَـاةُ الـدُّنْيَا إِلَّـا لَهْـوٌ وَلَعِــبٌ – العنكبــوت/٦٤﴾ یـان بـە مەبەسـتی گـەورەییو ڕێـزداری شـتەکە بەهۆی دووریو شکۆمەندی بەرزییەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿ذَلِـكَ الْكِتَـابُ لاَ رَيْبَ فِيـهِ – البقـرة/٢﴾ یـان بـۆ تـەنبیهوا ئاگادارکردنـەوەی ئەومیـە: کـە ئـەو ئاماژە بۆکراوە تیلنیشانە: کـە دارای ئـەو وەصفـو ثـەنایەیـە شـیاوی ئەومیـە ئەو بەختەوەریو ڕێزلێنانە هی ئەوبێو بەو ببڕێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ، الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـاهُمْ يُنفِقُـونَ ، والَّـذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ، أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ – البقرة/٢ – ٥﴾.

وادەبـێ ئیـسمەکە بەشـێوەی (موصـول) دەهێنـدرێ، بـۆ داپۆشـینی ناوەکەی چونکە ناوهێنـانی بـەناوی خـۆی ناخۆشـە، یـان لەبـەر هۆیـەکی تـر

وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ – يوسف/٢٣﴾ یان ﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا – الأحقاف/١٧﴾ یان هێنانی بە ئیسمی موصول بۆ ئیرادەی عمومە، دەیەوێ گشتگیر بێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ – العنكبوت/٦٩﴾ یان بە مەبەستی کورتکردنەوەی کەلامە وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا – الأحزاب/٦٩﴾ چونکە ئەگەر ناوی بوختانکەرو قسە هەڵبەستەکانی هەژمار بکردایە باسەکە زۆر درێژ دەبووەوە.

جاری وا هەیە ئیسمەکە بەشێوەی (معرف بأل) دێنێ بۆ ئاماژە کردن بۆ مەعهودێکی ناوهێنراو لەوەپێش، وەکوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ – النور/٣٥﴾ یان بۆ ئاماژە کردن بۆ مەعهودێکی زیهنی وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ – الفتح/١٨﴾ یان بۆ ئەوەی ئاماژە بکا بۆ مەعهودێکی حازرو بەرچاو وەکوو دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ – المائدة/٣﴾ یان بۆ ئەوەی هەموو تاکەکانی ئەو ڕەگەزە داپۆشێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ – العصر/٢﴾ چونکە ئەگەر ﴿الْإِنسَانَ﴾ هەموو تاکی جینسەکە نەگرێتەوە چەرتکردنو (إستثناء)ی لێ ناکرێ، یان بۆ ئەوەی ئاماژە بێ کە تایبەتمەندی هەموو فەردەکانی لەخۆ گرتووە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ – البقرة/٢﴾ واتە ئەو کیتابەی هەموو ڕێو شوێنەکانی هیدایەتی تێدا بەرجەستە بوون، هەرچی صیفاتی کتێبە ئاسمانییەکان هەیە لەخۆی گرتوونو تایبەتمەندییەکانی ئەوانی تێدا چڕ بوونەوە.

یان بۆ ئەوەی پێناسەی ماهییەتو حەقیقەتو ڕەگەزی شتەکە بکا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ - الأنبياء/٣٠﴾ ئەگەر ئیسم دووجار گوترا، چوار حاڵەتی هەیە: چونکە یان هەردووجارەکە بە مەعریفەیی دەهێندرێن، یان بە نەکیرەیی، یان یەکەم مەعریفەو دووەم نەکیرە، یان بە پێچەوانەوە.

١- ئەگەر هەردوو جارەکە بە مەعریفەیی هاتن ئەوە زۆربەی کات دووەم بەدەلەو هەمان مانای یەکەمی هەیە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ - الفاتحة/٦ - ٧﴾.

٢- ئەگەر هەردووکیان نەکیرە بوون، ئەوە دووەم غەیری یەکەمە زۆربەی کات، وەکوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً - الروم/٥٤﴾ ئەوەی مەبەستە بە وشەی ﴿ضَعْفٍ﴾ لە یەکەمجاردا تنوکە تۆماوە، لە دووەمجاردا ساوایی‌و تەمەنی منداڵییە، لە سێیەم جاردا تەمەنی پیری‌و کەنەفتەیی‌یە، لە ئایەتی ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا - الشرح/٥ - ٦﴾ هەردوو شێوەکەی تێدایە، چونکە مەبەست بە ﴿الْعُسْرِ﴾ی دووەم عەینی ﴿الْعُسْرِ﴾ی یەکەمە بە مەعریفەیی هێنایەوە چونکە (یسر)ی دووەم غەیری هی یەکەمە، بە نەکیرەیی دووبارەی کردەوە، بۆیە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) فەرموویەتی: (وَلَنْ يَغْلِبَ عُسْرٌ يُسْرَيْنِ).

٣- ئەگەر یەکەم نەکیرەو دووەم مەعریفە بوو، ئەوە دووەم عەینی یەکەمە، لەم ڕووەوە (آل)ی عەهدی ذیکر بێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَى فِرْعَوْنَ رَسُولًا ، فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ - المزمل/١٥ - ١٦﴾.

٤- ئەگەر یەکەم مەعریفەو دووەم نەکیرە بوو، ئەوە بە قەرینەو شتی وا مەبەست لە دووەم دەزاندرێ چییە، وادەبێ قەرینە جوداوازی

نێوانیان دیاری دەکا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ – الروم/٥٥﴾ جاری وایش دەبێ قەرینە ئەوە دەگەیەنێ: کە دووەم عەینی یەکەمە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ، قُرآنًا عَرَبِيًّا – الزمر/٢٧ – ٢٨﴾.

## ٣) هێنانی ئیسم بە تاك و کۆ

بڕێ ئەلفاظی قورئان کە بەتاك هێنراون مەبەست مەعنایەکی تایبەتییە، کە بە کۆ هێنراون ئاماژەیەکی تایبەتییان تێدایە، یان هێنانی بەکۆ هەڵبژاردەیەو موختارە بەسەر تاکەکەیدا، یان بە پێچەوانەوە، بۆیە ئێمە دەبینین بڕێ وشە لە قورئاندا هەر بەشێوەی (کۆ) هاتوون کاتێکیش پێویست بێ بە تاك بێ وشە تاکەکە ناهێندرێ، بەڵکوو وشەیەکی تر هێنراوە کە مانای ئەو دەگەیەنێ بۆ نموونە وشەی (اللب) هەر بەشێوەی کۆ هاتووە ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُوْلِي الْأَلْبَابِ – الزمر/٢١﴾ لە قورئاندا تاکی ئەم وشەیە نەهاتووە، بەڵکوو لەشوێنی ئەو وشەی (قلب) هاتووە ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ – ق/٣٧﴾ هەروەها وشەی (الکوب) بە تاکی لە قورئاندا نەهاتووە بەڵکوو بە کۆ هاتووە ﴿وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ – الغاشية/١٤﴾.

بەپێچەوانەی ئەمە، هەندێ وشە هەن لەهەموو قورئاندا بە تاك هێنراون، کە ویستراوە بە کۆ ئاماژەیان بۆ بکرێ، بە ئوسلوبێکی سەرەنج ڕاکیش ئاماژە بۆ شێوەی جەمعەکەیان کراوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ – الطلاق/١٢﴾ نەیفەرمووە (وسبع أرضين) چونکە ئەوکاتە کەلامەکە جۆرە زبری ڕەکاکەت و ئوسلوب شێوانێکی تێدا دەبوو.

هەر لەم بابەتە: وشەی (السماء) جارێك بە (کۆ) هێنراوە، دەمێکیش بە (تاك) لەبەر نوکتەو ئیشارەیەکی موناسیب، لە هەر شوێنێکدا مەبەست

ژمارەیان بووبێ، بەشێوەی (کۆ) هاتووە بۆ ئەوەی بەرفراوانیو گەورەیی زۆری بگەیەنێ وەکوو ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ – الحشر/١﴾ لەهەر شوێنێکدا مەبەست جیهەت بێ بەشێوەی تاك هێنراوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ – الملك/١٦﴾.

هەروا وشەی (الریح) بە تاكو کۆ هاتووە، لەسیاقی ڕەحمەتو نیعمەتدا بەکۆ هێنراوە، لەسیاقی عەزابو نیقمەتدا بەتاك هێنراوە، زانایانی بواری تەفسیرو بەلاغەی قورئان حیکمەتی ئەوەیان بۆ ئەوە گەڕاندۆتەوە: کە بای رەحمەت صیفاتو سودو قازانجی زۆرن، هەندێکیان بەرەو ڕووی یەکتر دێنو بۆ ئەوەی بایەکی نەرمی جەستە شێلو گونجاو بۆ گەشەکردنی جەستەی زیندەوەرو ڕوەك بەسود بێ، کەوابوو لە بواری رەحمەتدا چەند جۆرە (با) هەن، وەلێ بای عەزابو غەزەب لە یەك لایەکەوە دێو هیچ جۆرە بایەکی تر بەرەو ڕووی نابێتەوەو هیچ بایەکی تریش پاڵی پێوە نانێ.

ئیبنو ئەبی حاتەمو هی تریش لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: هەموو وشەی (الریاح) لە قورئاندا کە بە (کۆ) هاتووە بە مانا بای ڕەحمەتو نیعمەتە، هەموو وشەی (االریح) کە بەتاك هێنراوە مەبەست لێی بای عەزابە، بۆیە لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: « اللَّهُمَّ جعلها رياحاً ولا تجعلها ريحا».[1]

وایش دەبێ بۆ گەیاندنی مەبەستێكو نوکتەیەکی بەلاغی لەم قاعیدە دەردەچێو وشەی (ریح) بە تاك بۆ بای ڕەحمەتو سودگەیاندن دێ، بۆ نموونە دەفەرموێ: ﴿وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ – یونس/٢٢﴾ ئەوەتا وشەی

---

[1] أخرجه الشافعي في مسنده/٥٣٧ وأبو يعلى/٢٤٥٦ والطبراني في الكبير/١١٥٣٣ حديث إبن عباس.

(ريح) بە موفرەدی بە مانای بای بەسودو خێر ئاوەر هاتووە، ئەمەش لەڕوی لەفظەوە بۆ موقابەلەی ئایەتی ﴿جَاءتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ – یونس/٢٢﴾ لەڕوی ماناشەوە ئاماژە بۆ ئەوەیە تەواوبوونی نعمەت بەوە دێتە دی یەك جۆر با هەبێ، نەك چەند جۆرێك چونكە كەشتی بە یەك جۆر با نەبێو لە یەك لاوە نەبێناڕوێندرێ ئەگەر چەند بایەك هەبن دژبەیەك كەشتییەكە ناڕواو نقوم دەبێ.

هەر لەو جۆرە هێنانی وشەی (النور) بە تاكو (الظلمات) بە كۆ، (سبیل الحق) بە تاكو (سبیل الباطل) بەكۆ، چونكە ڕێگای حەق یەك ڕێگەیەو ڕێگاكانی بەتاڵ زۆرو هەمە جۆرن، هەر بۆیەشە (ولی المؤمنین)ی بەتاك هێناوەو (أولیاء الكافرین)ی بەكۆ هێناوە، ﴿اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ – البقرة/٢٥٧﴾ یان ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ – الأنعام/١٥٣﴾.

هەروا وشەی (المشرق والمغرب) بە تاكو بە موثەناو كۆ هێندراون: كە بە (تاك) هێنراون بە ئیعتیباری جیهەتو ئاماژە بۆلای خۆرهەلاتو خۆرئاوا ﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ – المزمل/٩﴾ (تەثنیە)یان بە ئیعتیباری دوو جۆر شوێنهەلاتنو دوو شوێن ئاوابوون لە وەرزی زستانو لە وەرزی هاویندا، دەفەرموێ: ﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ – الرحمن/١٧﴾ هێنانیان بەشێوەی (كۆ) بە ئیعتیباری شوێنهەلاتنو شوێن ئاوابوونی هەموو ڕۆژێكیانە، یان شوێنهەلاتنو شوێن ئاوابوونیان لە وەرزەكانی ساڵدا ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ – المعارج/٤٠﴾.

## ٤ موقابەلەی کۆبەکۆ، یان تاك

بەرامبـەری کردنـی کۆبـەکۆ جـاری واهەیـە داخـوازی ئەوەیـە هـەر فەردێك لەو ئەفرادانە بەرامبەر بکرێ بەهەر تاکێ لـە تاکـەکانی بەرامبـەری وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُـوا أَصَـابِعَهُمْ فِـي آذَانِهِـمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ - نوح/٧﴾ واتە: هەر یـەکێ لـەوان خـۆی بـە پۆشـاکی خـۆی داپۆشـێ، یـان دەفـەرموێ: ﴿وَالْوَالِـدَاتُ يُرْضِـعْنَ أَوْلاَدَهُـنَّ حَـوْلَيْنِ كَـامِلَيْنِ - البقرة/٢٢٣﴾ واتە هەر دایکێك شیر دەدا بە زارۆکی خۆی، جاری وایش دەبـێ موقابەلەکە داخـوازی ئەوەیـە چەسـپاندنی هـەموو ئـەفرادی یەکـەم بـۆ هـەر فەردێك لە ئەفرادی دووەم وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْـصَنَاتِ ثُـمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً - النـور/٤﴾ واتە: هەریەکێ لەو بوختانکەرانـە هەشـتا داری لێ بـدەن، جـاری وا دەبـێ ئیحتیمـالی لـە هـەردوو جۆرەکەی دەبێ ئەوکاتە پێویستی بە قەرینە هەیە، لایەکیان دیاری بکا.

وەلێ موقابەلـەی جـەمع بـەتاك، زۆربـەی کـات داخـوازی گـشتاندنی مفردەکە نیە، جاری وایش دەبێ داخوازیەتی، وەکوو ﴿وَعَلَـى الَّـذِينَ يُطِيقُونَـهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِـسْكِينٍ - البقـرة/١٨٤﴾ واتـە: واجبـە لەسـەر هەریـەکێ لەوانـەی توانای ڕۆژووگرتنیان نیە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دابین بکا.

## ٥ هەندێ وشە وا گومان دەبرێ (مترادف)ە بۆ وشەیەکی ترو وانیە

بۆ نموونە (الخوف والخشية) (خشية) لە (خـوف) مـەعنای بـەهێزترە، چونکە وشەی (خشية) لە مـەفهومی (شجرة خشية) وەرگـیراوە واتـە: درەختـی وشك: کە هیـوای تەڕبوونـەوەو هەڵدانـەوەی لێ نـەکرێو بـە تـەواوی وشـکەڵ بووبێ، وشـەی (خوف) لـەمانای قسەی عـەرەب وەریگـراوە: کـە دەڵێن: (ناقـة خوفاء)حوشترێکە نەخۆشـە، دەردەدارە، هیـوای چاکبوونەوەی لێ دەکـرێو بـە

تەواوی نەفەوتاوە، لەلایەکی ترەوە (الخشية) لە کێ دەبێ، ئەم جۆرە ترسانە کامڵە لە گەورەیی‌و عەظەمەتی لێ ترساوەکە سەر هەڵدەدا، هەرچەندە ترساوەکەش خۆی بەهێز بێ، کەوابوو (الخشية) بریتییە لە ترسانێك تەعظیم‌و شکۆداری لێ ترساوەکەی تێکەڵ بووبێ، (خوف) لە زەعیفی‌ولاوازی ترساوەکەوە سەر هەڵدەدا، هەرچەندە لێ ترساوەکە شتێکی سادەو ئاسان بێ، لەلایەکی ترەوە (الخاء، الشين، الياء) لە تەصاریفی زمانی عەرەبیدا گەورەیی‌و عەظەمەت دەگەیەنێ، (الشيخ) بە مانا سەییدو پیاو ماقوڵە (الخيش) پۆشاکی ئەستورو رەختەیە بۆیە زۆربەی کات وسەی (الخشية) دەرحەق بە پەروەردگار وارید بووە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء – فاطر/٢٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ – الأحزاب/٣٩﴾ ئایەتی ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ – النحل/٥٠﴾ ئەوە دەربارەی وەصفی فریشتە نازڵ بووە دوای باسکردنی هێزو تواناو چۆنیەتی خیلقەتیان، تەعبیر دانەوە لێیان بە (خوف) بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە: کە ئەوان وێڕای ئەوەی رەق ئەستورو بەهێزو تواناو توندوتیژن لە ئاست پەروەردگار لاوازو بێ نمودن، دوای ئەوە (فوقیەتی) بۆ خودا چەسپاند کە دەلالەت دەکا لەسەر عەظەمەت‌و گەورەیی.

کەوابوو دوو شتی کۆکردنەوە کە وشەی (خشية) دەیانگەیەنێ بەبێ ئەوەی لەهێزو توانای ئەوان کەم بکاتەوە، دوو شتەکەش ترسانیان لە خوداو وێڕای تەعظیم‌و بە گەورەزانینی زاتی پاکی.

هەروا وشەی (الشح والبخل) (شح) لە (بخل) خەسترو بەشیدەت ترە، چونکە وشەی (شح) بەخیلی‌و سوربوون لەسەر پۆخەڵیەکەش دەگەیەنێ، واتە: توندڕەوی تێدایە، بەڵام (بخل) تا ئەندازەیەك شتێکی ئاسایی‌یە.

هەروا وشەی (سبیل و طریق) زوربەی کات وشەی (سبیل) بۆ شتی خێرئاوەر بەکاردێ، بەڵام (طریق) کەم وادەبێ مەبەست پێی خەیرو خۆشی بێ، مەگەر لە تەکیا قەرینەیەك هەبێ وەکوو صیفەت، یان (إضافة) دەلالەت بکا لەسەر خەیر وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُسْتَقِيمٍ – الأحقاف/٣٠﴾

بۆیە راغیبی ئەصفەهانی لە (مفردات)ەکەیدا دەڵێ: (سبیل) رێگایەکە ئاسانکاری‌و بەختەوەری لێ وەدی بێ‌و لە مانای (طریق) تایبەت ترە.

هەروا دوو وشەی (مدّ و أمدّ) زۆربەی کات دووەمیان بۆ شتی ویستراو مەحبوب دێ، وەکوو ﴿وَأَمْدَدْنَاهُم بِفَاكِهَةٍ – الطور/٢٢﴾ بەڵام یەکەمیان واتە (مدّ) بۆ شتی نەویستراو دێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَنَمُدُّ لَهُ مِنَ الْعَذَابِ مَدًّا – مريم/٧٩﴾.

## پرسیارو وەڵام

ئەصڵ‌و بنەما لە وەڵامدا ئەوەیە موطابیقی پرسیار بێ، وەلێ جاری وا دەبێ لەو جوابە لادەدرێ کە پرسیارەکە داخوازیەتی، بە مەبەستی ئاگادار کردنەوە لەوەی کە حەق وایە پرسیارەکە ئاوا بکرێ، بەمەش دەگوترێ ئوسلوبی حەکیم، نموونەش ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ – البقرة/١٨٩﴾ بێگومان کافرەکانی مەککە پرسیاریان لە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کرد دەربارەی مانگ، بۆچی لەسەرەتاوە باریك‌و زەعیفە‌و دوایی وردە وردە زیاد دەکا تا خشت دەبێ‌و ئەمجار سەرلەنوێ کەم دەبێتەوە تا دەچێتە سەر حاڵی لاوازی پێشووی؟ کەچی وەڵامیان بە دیاری کردن‌و ڕونکردنەوەی حیکمەتی ئەو گۆڕانکارییانە درایەوە بە مەبەستی ڕەهنومایی کردنیان بۆ ئەوە کە دەبوایە

پرسیارەکە لە حیکمەتی ئەو گۆڕانکارییە بکەن: کە بەسەر مانگدا دێ نەك بەو شێوە پرسیارەی ئەوان ئاڕاستەیان کرد.

وادەبێ وەڵام لە پرسیار گشتی تر دەبێ لەبەر پێویستییەك وەکوو ئایەتی ﴿قُلِ اللّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ - الأنعام/٦٤﴾ لە وەڵامی ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ - الأنعام/٦٣﴾ وادەبێ وەڵام کەمتر دەبێ لە پرسیار لەبەر داخوازی حاڵو مەقام، وەکوو ئایەتی ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي - يونس/١٥﴾ لە وەڵامی ﴿ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ﴾ چونکە تەبدیلو گۆڕینی قورئان لە داهێنانی ئاسانترە، جا کە گۆڕانی بۆ نەکرێو نەیکا هەڵبەتە داهێنانەکەی هەر نابێو ناکرێ.

پرسیار ئەگەر بۆ داواکردنی زانیاری شتێك بوو تەعەدا دەکا بۆ مەفعولی دووەم، جاری وا هەیە ڕاستەوخۆ جاری وا هەیە بەهۆی (حەرفی جەڕەوە): کە وشەی (عن)ە بەزۆریش وایە، وەکوو ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ - الإسراء/٨٥﴾.

ئەگەر بۆ داواکردنی ماڵو شتی وابوو ئەوە، یان ڕاستەوخۆ تەعەدا دەکا، یان بەهۆی (حەرفی جەڕ)ی (من) بەڵام زۆربەی کات ڕاستەوخۆ تەعەدا دەکا، وەکوو ئایەتی ﴿وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ - الممتحنة/١٠﴾ یان ئایەتی ﴿وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ - النساء/٣٢﴾.

## ٧/ ئاڕاستەکردنی خیطاب بەشێوەی جوملەی ئیسمی، یان جوملەی فیعلی

ئیسم دەلالەت دەکا لەسەر ثبوتو دەوام، فیعل دەلالەت دەکا لەسەر پەیدابوونو تازەبوونەوە، بۆ هەریەکێ لە جوملەی ئیسمیو جوملەی فیعلی شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەو شوێنەی بۆ ئەم گونجاوە، بۆ ئەو ناگونجێ بۆ نموونە لەبواری نەفەقەو بژێودا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء

وَالضَّرَّاء – آل عمران/١٣٤﴾ بـه فيعل هێنـاى نـەيگوت (المنفقـون) بـەڵام لـە بوارى ئيمانو باوەڕدا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُـولِهِ – الحجرات/١٥﴾ بە ئيسم هێناى، چونكە نەفەقەو بـژێو كـارێكى كردەيـىيـەو رەوێتى وايە پەيدا ببىَو تازە ببێتەوە واتە: (تجدد و حدوث) دەگەيـەنىَ، بـە پێـچەوانەى ئيمانـەوە: كـە حەقيقـەتێكى هەيـە داخـوازى ئەوەيـە ثابيـتو بـەردەوام بـىَ، مەبەسـت بـە تەجـەدود لـە زەمـانى رابـردودا پەيـدابوونو تازەبوونەوەى جار دوا جاريەتى، مەبەستيش بە تەجەدودى زەمـانى داهـاتوو ئەوەيە بگونجىَ جار دواى جـار تـازە ببێتـەوە، لـەم بـوارەدا جوملـەى فيعلى ئەگەر فيعلەكەى (مقدر) بىَ، يان ظاهير بىَ وەكوو يـەك وايـە بۆيـە گـوتراوە (سـلام)ى حـەزرەتى ئيـبراهيم لـە (سـلام)ى فريـشتەكان بـەليغ تـرە، كـە لـە ئايەتى (٢٥)ى (الذاريات)دا هاتووە دەفـەرموێ: ﴿إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا – الـذاريات/٢٥﴾ وشـەى (سَلَامًا): كـە مەنـصوبە مەصـدەرەو لەشـوێنى فيعـل دانيشتووە، لە بناخەدا جوملەكە ئاوايـە (نسلم عليك سلاماً) ئـەم دەسـتەواژە: تەنيا ئەوە دەگەيەنىَ: كە سەلام لە فريشتەكانەوە ئاراستەى ئيبراهيم كراوەو بـەس! بـە پێـچەوانەى وەڵامـى سـەلامەكە ﴿قَـالَ سَـلَامٌ﴾ وشـەى (سَـلَامٌ) بـە مەرفوعى هێنا لەسـەر بناغـەى ئـەوە (مبتـدأ) بـىَ بـۆ (خەبـەر)ى حـەزفكراو واتە: (عليكم سلام) واتـە: سـەلامى بـەردەوام، وەك ئـەوە حـەزرەتى ئيـبراهيم مەبەستى بووە بەشـێوەى جـوانتر وەڵامـى سـەلامەكەيان بداتـەوەو ڕێزيـان لىَ بگرىَ.

**٨ عەطف: سىَ جۆر عەطف هەيە:**

أ/ عەطف بۆ سەر لەفظ، ئەمە سەرەكىو ئەصڵيەكەيەتى.

ب/ عەطف بۆ سەر مەحەل، ئيمامى كيسائى ئايەتى ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّـذِينَ هَـادُواْ وَالـصَّابِؤُونَ – المائـدة/٦٩﴾ وشـەى (الـصَّابِؤُونَ)ى عـەطف

کردۆتەوە بۆ سەر مەحەلی ئیسمی (إنَّ): کە مەحەلەکەی رەفعەیە لەسەر (ئیبتداء).

ج/ عەطف بۆ سەر مەعنا وەکوو ئایەتی ﴿لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن – المنافقون/١٠﴾ بە گوێرەی قیرائەتی غەیری ئەبو عەمر، کە وشەی (أَكُن)یان بە مەجزومی خوێندۆتەوە بەو مانایە رستەی (لَوْلَا أَخَّرْتَنِي فَأَصَّدَّقَ) بۆنی شەرتی لێ دێ لەم ڕووەوە جوملەی (لَوْلَا أَخَّرْتَنِي فَأَصَّدَّقَ) دەق مانای جوملەی (أخرني فأصدق) دەگەیەنێ، هەروەك ئەوە وترا بێ (إن أخرتني أصدق وأكن) هەر لەسەر ئەم قاعیدە ئایەتی ﴿إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ – يوسف/٩٠﴾ کە فیعلی (يصبر) مەجزم بێو عەطف بێ بۆ سەر (يتق) لەم ڕووەوە (من)ی موصولە مانای شەرتی لەخۆ گرتووە.

زانایان کەوتوونە راجیاییەوە لەوەدا ئاخۆ دروستە عەطفی خەبەر بکرێتەوە بۆ سەر (ئینشاء) یان بە پێچەوانەوە، زۆربەیان مەنعیان کردووە، هەندێکیشیان وتوویانە دروستە بەڵگەشیان ئایەتی ﴿وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ – الصف/١٣﴾ عەطف کراوەتەوە بۆ سەر (تؤمنون) لە ئایەتی (١١)ی هەمان سورەتدایە ئەوەتا عەطفی جوملەی خەبەری کراوەتەوە بۆ سەر جوملەی ئینشائی، هەندێ لە زانایان فەرموویانە جوملەی (تؤمنون) خەبەرە بەمانا ئینشایە واتە: بە مانا (أمنوا)وە، کەواتە: بۆیە عەطفی جوملەی ئینشائی بۆ سەر کراوەتەوە، وەکوو ئەوە گوترابێ: (آمنوا وجاهدوا يثبتكم الله وينصركم وبشر يارسول الله المؤمنين بذلك) سودی تەعبیر بە خەبەر لەشوێنی ئینشاو، ئاگادارکردنو پێزانانندنیانە بەوەی کە ئەو شتە پێویستەو نابێ پاشگوێ بخرێ، بەجۆرێك پابەندبوون پێیەوە ثابیتو بەرقەرارە، ئەوە دەگەیەنێ ئیمانو جیهادەکە مەوجودن.

راجیایی نەحوییان هەیە لەوەدا ئاخۆ دروستە عەطف بۆ سەر دوو مەعمولی دوو عامیل یان نا، هەندێك گوتوویانە دروستە هەندێك گوتوویانە دروست نیە، ئەوانەی گوتوویانە دروستە بەلگەیان ئەم ئایەتانەی قورئانە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ، وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ، وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – الجاثية/٣ – ٥﴾ دوو عامیلەکە (ان)و (فی)یە (واو)ی عەطف لە جێگایان دانیشتووە، واوەکە عەمەلی جەرەی کردووە لە (اخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ)ی‌دا عەمەلی نەصبەکەی کردووە لە (آيَاتٌ)دا، ئەمە ئەگەر عامیلەکان عەمەلی نەصبە بکەن، بەلاَم ئەگەر عامیلەکان عەمەلی رەفعە بکەن ئەوکاتە عامیلەکان (الإبتداء) و (فی)یە (واو) عەمەلی رەفعە لە ئایات دەکاو عەمەلی جەرەش لە (اخْتِلَافِ)دا.

هەوا نەحوی راجیاییان هەیە لەوەدا ئاخۆ دروستە عەطف بۆ سەر ضەمیری مەجرور بەبێ هێنانەوەی عامیلە مەجرورکەرەکە، ئەوانەی گوتوویانە دروستە بەلگەیان قیرائەتی حەمزەیە، کە ئایەتی یەکەمی سورەتی (النساء)ی ئاوا خوێندۆتەوە ﴿وَاتَّقُواْ اللَّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامِ﴾ وشەی (الأرحامِ)ی بە مەجروری خوێندۆتەوە لەم ڕووەوە عەطف بێ بۆ سەر ضەمیری (بِهِ)کە مەجرورە، هەروا ئەم ئایەتەشیان کردۆتە بەلگە ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ – البقرة/٢١٧﴾ (المسجدِ) بە مەجروری خوێندراوەتەوە لەم ڕووەوە کە عەطف بێ بۆ سەر ضەمیری (بِهِ).

## جوداوازی نێوان دوو وشەی (الإیتاء والأعطاء)

جوداوازی لەنێوان مانای ئەم دوو وشەیەدا هەیە، ئیمامی (الجوینی) دەڵێ: وشەی (الإیتاء) مانای لە وشەی (الأعطاء) بەهێزترە لەڕوی وەرگرتنی مەفعوولەوە چونکە (أعطاء) موطاوعی هەیە، دەگوترێ: (أعطانی فعطوت) بەڵام ناگوترێ: (آتانی فأتیت) بەڵکوو دەگوترێ: (آتانی فأخذت) هەر فیعلێك مطاوعی هەبێ لەبواری وەرگرتنی مەفعولەوە لاوازترە لەو فیعلەی مطاوعی نەبێ، چونکە تۆ دەڵێی (قطعته فأنقطع) ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کاریگەری فیعلەکە مەوقوف بووە لەسەر قبولی مەحەلەکە بۆ تەئثیری ئەو فیعلە، ئەگەر ئەو قبووڵە نەبێ (مفعول به) نابێ، بۆیە دروستە بگوترێ: (قطعته فما أنقطع) دەی ئەم دەستەواژە لە فیعلێکدا ناگوترێ: مطاوعی نەبێ، دروست نیە بگوترێ: (ضربته فانضرب) یان (ماانضرب) یان (قتلته فانقتل) یان (ما انقتل) چونکە ئەم فیعلانە: کە لە فاعیلەوە دەرچوون مەفعولی خۆیان هەیە، فاعیلیش لەو فیعلانەدا کە موطاوعیان نیە سەربەخۆیە، کەوابوو (الإیتاء) لە (الأعطاء) بەهێزترە.

بۆ ئەمە چەند شایەتێك هەن: کە قورئان دەفەرموێ: ﴿يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاء وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا - البقرة/٢٦٩﴾ چونکە حیکمەت لەشوێنی خۆیدا چەسپاوو بەردەوام دەبێ، ڕێزو پلەیەکی گەورەو بڵندەو هەموو کەس پێی ناگا، هەروا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ - الحجر/٨٧﴾ دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ - الكوثر/١﴾ چونکە دوای (الکوثر) پلەو مەقامی زۆر بەرزتر هەیە لەو مەقامەوە دەگوازێتەوە بۆ بەهەشتو نازو نیعمەتی زۆر بەرزتر، یان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ - التوبة/٢٩﴾ چونکە (جیزیە = سەرانە) پێویستی بە قبولکردنی موسوڵمانان هەیە، ئەوانیش بەخۆشی خۆیان نایدەن، بەڵکوو بەزۆر لێیان دەسەندرێ، کەچی بۆ

دەركردنی زەكات: كە موسوڵمان لەماڵی خۆی دەری بكا، (وآتـوا الزكـاة) يـان (وإيتاء الزكاة) بەكار هێناوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە: كە موسـوڵمان پێویـستە بە حەماسەتو ئارەزۆوە بیدەن، نەك وەكوو جیزیە بەزۆر لێیان بسەندرێ.

## وشەی (فعل)

لـەفظـی فیعـل لـە قورئانـدا دێ بـۆ كینايـەو دركـە لـە كـردەوەی جۆراوجۆر، نەك دەلالەتكردن لەسەر یەك فیعلو بەس، كەوابوو هێنانی ئـەو مادەیە بەشێوەی كورت چەند فیعلی جۆراوجـۆر دەگەیـەنێ، وەكوو ئایـەتی ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُـونَ – المائـدة/٧٩﴾ ئـەم وشـەی (یفعلـون) شمولی هـەموو كردەوەیەكی خراپ دەكا: كە ئەوان نەهی لێ نەكەن، یان دەفـەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ – البقـرة/٢٤﴾ واتـە: ئەگـەر نـەتانتوانی سورەتێكی وەكوو قورئان بێنن، ئاشكراشە ناتوانن سورەتێكی بخەنە ڕوو.

وشەی (فعل) لە هەر شوێنێكی قورئاندا بـە ڕەهايیو بـێ قەیـد هـات هەڕەشەی سامناك دەگەیەنێ، وەكوو دەفـەرموێ: ﴿أَلَـمْ تَـرَ كَيْـفَ فَعَـلَ رَبُّـكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ – الفيل/١﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿وَتَبَيَّنَ لَكُـمْ كَيْـفَ فَعَلْنَـا بِهِـمْ – إبراهيم/٤٥﴾.

## وشەی (كان)

وشەی (كان) دەربارەی هەواڵدان لە زاتو صیفاتی خـودا لـە قورئانـدا زۆر هاتووە ئەمجار نەحویو هی تریش كەوتوونە راجیاییەوە لـەوەدا ئـاخۆ (كان) دەلالەت دەكا لەسەر إنقطاعو بڕانەوەی ماناكەی، یان نا.

هەندێك گوتوویانە ئینقیطاعو بڕانـەوە دەگەیـەنێ، چونكە فیعلێكە تازەبوونەوەی تێدایە.

هەندێکی تر گوتوویانە ئینقیطاعو بڕانەوە ناگەیەنێ، بەڵکوو مانای دەوامو ثبوت دەخوازێو مانای بەردەوامی هەیە... (إبن معط) کە خاوەنی ئەلفییەیە لە نەحودا پێش ئیبنو مالیك ئەلفیەی داناوەو ساڵی/٦٢٨ی کۆچی لە دونیا دەرچووە، پێی وایە مانای (کان) بەردەوامەو دەڵێ: (و کـان للماضـی الذی ما انقطعا).

راغیبی ئەصفەهانی دەڵێ: قورئـان کـە دەفـەرموێ: ﴿وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا – الإسراء/٢٧﴾ وشەی (کان) ئاماژەی ئەوەی تێدایـە کـە شـەیتان لەوەتای هەیەو بەردەوام لە ناخیدا کوفری هەبووە.

هەندێکی تر وتوویانە وشەی (کان) دەلالەت دەکا لەسـەر بـوونی شـت لە زەمانی رابردوودا بەشێوەی ئیبهام دەلالەتی ئەوەی تێـدا نیـە پـێش وجـود عەدەمی هەبووبێ، یان دابڕانی لە ناکاوی بەسەردا هاتبێ، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا – الأحزاب/٥٠﴾.

زومەحشەری لە تەفسیری ئایەتی ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ – آل عمران/١١٠﴾ دەڵێ: ئیبنو عەطیە لە تەفسیری سورەتی (الفتح)دا وتوویـەتی وشـەی (کـان) هـەر کاتێك دەربـارەی صیفاتی خـودا هـات، مانـای زەمـانی لێ داڕنـدراوە.

رای پەسەندو راست رای زومەحشەرییەو وشەی (کان) هەر ئەوەنـدە دەگەیـەنێ مانـای ڕسـتەی بـەدویدا دێ بینوسـێنێ بـە زەمـانی رابـردووەوەو بـەس! مانـای ئـەوە ناگەیـەنێ: کـە ئـەو مانایـە کۆتـایی هـاتووە، یـان باقییـە، بـەڵکوو ئەگـەر ئـەو ڕسـتەی (کـان)ەی تێدایـە شـتێکی لـەو جـۆرە مانایانـە دەگەیاند ئەوە بەهۆی بەڵگەیەکی ترەوەیە.

بەزۆری لەسەر ئەم تـەئویلو ئاراسـتەکردنە مامەڵە لەگـەڵ (کـان)دا دەکرێ لەهەر شوێنێکی قورئاندا کە دەربـارەی صـیفاتی خـودا واریـد بووبـێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ اللَّـهُ سَـمِيعًا عَلِيمًـا – النـساء/١٤٨﴾ ﴿وَكَـانَ اللَّـهُ

وَاسِعًا حَكِيمًا – النساء/١٣٠﴾ ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا – الأحزاب/٥٩﴾ ﴿وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ – الأنبياء/٧٨﴾.

لەهەر شوێنکیشدا پەروەردگار بە (کان) هەواڵی لە ڕەوشتی ئادەمیزاد دا، ئەوە مەبەست ئەوەیە ئەو ڕەوشتە تێیاندا سروشتیو چەسپاوەو لە نەفسیاندا خۆی داکوتاوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ عَجُولاً – الإسراء/١١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا – الأحزاب/٧٢﴾.

ئەبو بەکری رازی لێکۆڵینەوەو بەدواداچونێکی لەبارەی بەکارهێنانی وشەی (کان) کردووە لە قورئانداو ئاکامی بەدواداچوونەکەی ئەوەیە (کان) پێنج جۆری هەیە.

١- بە مانا ئەزەلو ئەبەد بێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا – النساء/١٧٠﴾.

٢- بە مانا زەمانی رابردوی کۆتایی هاتوو بێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ – النمل/٤٨﴾ ئەم مانایە مانای ئەصڵو سەرەکی (کان)ەیە دەگوترێ: (کان زید صالحاً، أو فقیراً، أو مریضاً أو.........................).

٣- بە مانا حاڵ دێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ – آل عمران/١١٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا – النساء/١٠٣﴾.

٤- بە مانای موستەقبەل دێ وەکوو ئایەتی ﴿وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا – الإنسان/٧﴾.

٥- بە مانا (صار) دێ واتە: گۆڕانی لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ – البقرة/٣٤﴾ وشەی (کان) ئەگەر مەنفی بوو مەبەست نەفیی صیحەتی خەبەرەکەیە نەك نەفی وقوعی خەبەرەکە

بۆیـه مانـای ﴿ماكـان..........﴾ بـه (ماصـح) و (ماسـتقام) تـەئویل دەكـرێ وەكوو ئایـەتی ﴿مَا كَـانَ لِنَبِـيٍّ أَن يَكُـونَ لَـهُ أَسْـرَى حَتَّـى يُـثْخِنَ فِـي الأَرْضِ – الأنفـال٦٧﴾ یـان ئایـەتی ﴿مَـا كَـانَ لِلْمُـشْرِكِينَ أَن يَعْمُـرُواْ مَـسَاجِدَ الله– التوبـة/١٧﴾ یـان ﴿وَلَوْلَـا إِذْ سَـمِعْتُمُوهُ قُلْـتُم مَّـا يَكُـونُ لَنَـا أَن نَّـتَكَلَّمَ بِهَـذَا – النـور/١٦﴾.

## وشەی (كاد)

**زانایان دەربارەی (كاد) چەند رایەكیان هەیە:-**

**یەكـەم**: مانـاو حـوكمی وەكـوو بـاقی فیعلـەكانی تـر وایـە چ لـەڕوی نەفیەوە، یان لەڕوی ئیثباتـەوە، (إثبـات) بـوو ئیثبـات دەگەیـەنێ، نـەفی بـوو نەفی دەگەیەنێ، چونكە (كاد) مانـای نزیكبوونـەوە دەگەیـەنێ، مانـای (كـاد یفعل) نزیك بوو كارەكە بكا، واتـە: نـەیكرد، مانـای (ماكاد یفعـل) لـە كردنـی كارەكـە نزیـك نـەبووەوە، كـەوابێ خەبـەری (كـاد) هەمیـشە مەنفییـە، وەڵێ نەفییەكـەی لـە ئیثباتـدا لـە ماناكـەی وەردەگـیرێ، چـونكە هەواڵـدان بـە نزیكبوونـــەوەی شـت، بــەگوێرەی عــورفو عــادەت ئــەوە دەگەیــەنێ كــە نزیكبوونـەوەی كردنـی فیعلەكـە مـەنفی بـێو نـەبووبێ عـەقڵ دەخـوازێ فیعلەكە نەهاتبێتە دی، ئەوەی ئەم مانایە دەگەیەنێ ئایـەتی ﴿إِذَا أَخْرَجَ يَـدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا – النـور/٤٠﴾ بۆیە ئەم دەستەواژەیە (لم یكد یراها) لە ڕستەی (لم یرها) بەلیغ ترە، چونكە ڕستەی (لم یكد یراها) ئـەوە نـەفی نزیكبوونـەوەی بیـنین دەكـا بـەڵام رسـتەی دووەم نـەفی بینینـی تێدایـە، كەسێكیش شـتێك نەبینێ وێدەچێ نزیك بێ لە بینینی.

**دووەم**: (كـاد) لـە هـەموو فیعلـەكانی تـر جـوداوازە لـەڕوی ئیثبـاتو نەفیەوە، ئیثباتی نەفیەو نەفی ئیثباتە  بۆیـە گوتراوە (كـاد) ئەگـەر نـەفی لەپێشەوە بوو ئیثبات دەگەیەنێ، ئەگەر موثبەت بوو نەفی دەگەیەنێ، ئەگەر

گوترا (كاد يفعل) مانای‌وايه نه‌يكردووه به به‌لگه‌ی ئايه‌تی ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ – الإسراء/٧٣﴾ چونكه قوره‌يشييه‌كان نه‌يانتوانی زه‌فه‌ری لێ بێنن.

ئه‌گه‌ر گوترا (لم يكد يفعل) مانای وايه كردوويه‌تی به به‌لگه‌ی ئايه‌تی ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ – البقرة/٧١﴾ چونكه به‌نو ئيسرائيلی‌يه‌كان مانگاكه‌يان سه‌ربڕی.

**سێيه‌م:** (كاد) ئه‌گه‌ر مانفی بوو ده‌لالەت ده‌كا: كه كرداره‌كه كراوه به‌لام به زه‌حمه‌تو ناخۆشی، وه‌كوو ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ﴾.

**چواره‌م:** له نه‌فيه‌كه‌يدا جوداوازی هه‌يه له‌نێوان ماضی مه‌نفی‌و موضاريعی مه‌نفی، نه‌فی موضاريعی نه‌فيه، نه‌فی ماضی ئيثباته به‌لگه‌ی ئه‌وه نه‌فيی موضاريعی نه‌فيه ئايه‌تی ﴿لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا – النور/٤٠﴾ ئه‌وه نه‌فی نزيكبوونه‌وه‌ی بينين ده‌كا چ جايی خودی بينينه‌كه، به‌لگه‌ی ئه‌وه نه‌فيی ماضی (كاد) ئيثبات بێ ئايه‌تی ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ﴾ ئه‌وه‌تا به‌نو ئيسرائيلی‌يه‌كان مانگاكه‌يان سه‌ربڕی.

**پێنجه‌م:** (كاد) له نه‌فی‌دا كاتێك ئيثبات ده‌گه‌يه‌نێ: كه دواوه‌ی په‌يوه‌ست بێ به پێشه‌وه‌یی‌و لێك نه‌پچڕابن وه‌كوو ئه‌وه بڵێ: (ماكدت أصل إلى مكة حتى طفت بالبيت الحرام) يان ئايه‌تی ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ﴾..

## وشه‌ی (جَعَلَ) له قورئاندا

**له قورئاندا وشه‌ی (جعل) بۆ چه‌ند مانايه‌ك هاتووه:**

١- به مانا (سمّى) دێ وه‌كوو ده‌فه‌رموێ: ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ – الحجر/٩١﴾ واته: قورئانيان ناو ناوه درۆ، يان ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا – الزخرف/١٩﴾ ئه‌مه به‌پێی رايه‌كو ئايه‌تی ﴿إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ الْمَلَائِكَةَ تَسْمِيَةَ الْأُنثَى – النجم/٢٧﴾.

٢- بە مانا (أوجد) دێو دوو مەفعولی دەوێن، جوداوازی نێوان (جعل و خلق) ئەوەیە خەلق مانای تەقدیرو مەزەندەکردنی لەخۆ گرتووەو لە نەبووە دەهێندرێتە دی، نە مادەو نە سەبەبی هەست پێکراوی لە پێشەوەیە، بەلاّم وشەی (الجعل) کە بە مانا ئیجادو بەدیهێنانە وەکوو دەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ – الأنعام/١﴾ چونکە تاریکی (ظلمة) روناکی (النور)ە لە ئاکامی هەبوونی جیرمەوە دێنە دی، جیرمو قەبارەکان هەبوون روناکی هەیە، ئەوان نەبوون روناکی نیە.

٣- بە مانا گۆڕانو گواستنەوەیە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر و دوو مەفعولی گەرەکن، جا یان مەحسوس وەکوو ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً – البقرة/٢٢﴾ یان غەیری مەحسوس وەکوو ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا – ص/٥﴾.

٤- بە مانا (إعتقاد)و بیروباوەڕ بێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ شُرَكَاء الْجِنَّ – الأنعام/١٠٠﴾.

٥- بە مانا حوکمدانی شتێك بۆ سەر شتێکی تر جا حوکمەکە حەقو ڕاست بێ وەکوو ﴿إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ – القصص/٧﴾ یان بەتاڵ بێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ مِمِّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعَامِ نَصِيبًا – الأنعام/١٣٦﴾.

## وشەی (لعلّ وعسی)

لە ئاخاوتنی ئادەمیزاددا ئەم وشانە بۆ ڕەجاو تەماعو هیوا بەکاردەهێندرێن لەبواری مومکیناتدا، وەلێ بە نیسبەت پەروەردگارەوە حصولو وجوب دەگەیەنن، چونکە نیسبەتدانی کار بۆلای پەروەردگار نیسبەتدانی قەطعیو یەقینییە.

رایەك هەیە دەڵێ: ئەم دوو وشەیە لە کەلامی خوداشدا هەر بەمانا رەجاو هومێندن، وەڵێ رەجاو هومێدەکە بە نیسبەت موخاطەبەکانەوەیە.

رایەکی تر هەیە دەڵێ: (لعل وعسى) لە زۆر جێگادا تەعلیلو بایس دەگەیەنن، وەکوو ئایەتی ﴿عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا – الإسراء/٧٩﴾ یان ﴿قُل لاَّ يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ فَاتَّقُواْ اللّهَ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ – المائدة/١٠٠﴾.

## ١٢ جوداوازی نێوان موحکەمو موتەشابیهی قورئان

پەروەردگار قورئانی ناردووە بۆ بەندەی خۆشەویستی خۆی حەزرەتی موحەممەد (درووددی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی ببێتە ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەی ئادەمیزاد، بیروباوەڕی راستو ساغی بۆ خەڵك دیاریکرد، مەبدەئی بەهێزو پتەوی لە ئایەتەکانی قورئاندا بە ڕونیو ئاشکرا بۆ خەڵك دانا، ئەمە فەضلو گەورەیی ڕەحمەتی خودایە بۆ بەندەکانی: کە بنەماکانی ئایینی بە تۆکمەیی بۆ داڕشتون، بۆ ئەوەی بیروباوەڕیان سالمو بێ غەش بێ، ڕێگای راستیان لەبەرچاو بێو لێیان گوم نەبێ، ئەو ئایەتە قورئانییە پیرۆزانە (أم الكتاب)ن، ئەو ئایەتانەن: کە ئیختیلافو جوداوازی لە تێگەیشتنو مانایان ڕوناداو یەك مانا دەبەخشنو هەمووکەس لێیان حاڵی دەبێ، ئەمەش بۆ سەلامەتی یەکیەتی گەلی موسوڵمانو پاراستنی کیانو کەسایەتی ئوممەتی ئیسلامی ﴿كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ – فصلت/٣﴾.

وادەبێ ئەم بنەما ئاینییانە لەچەند شوێنێکی قورئاندا دوبارە بوونەوە، مانایان یەکە، بەڵام لە لەفظو عیبارەتو ئوسلوبیان جوداوازە، هەندێکیان دەشوبهێنە هەندێکیان لە ماناو مەفهومیان یەك دەگرنەوەو دژایەتی ناکەوێتە نێوانیانەوە، وەڵێ جگە لەم ئایەتانەی ئوصولی دینیان لەخۆ گرتووە،

له ئایەتەکانی تریدا: کە دەربارەی فروعی دین هاتوون، عوموم‌و ئیشتیباهو موطلەق‌و شتی وا زۆرن: کە دەرگا بۆ موجتەهیدین‌و زانایانی ڕۆچو لە عیلم‌دا ئاوەڵا دەکەن لێکۆڵینەوەیان تێدا بکەن‌و پێکیان بگرن‌و ئەحکامیان لێ هەڵێنجن، فەرع‌و لق‌و پۆپ ببەنەوە بۆ سەر ئەصڵ‌و بنەماکان‌و جوزئیات بخەنەوە سەر کوللیات (جا با داخ لەدڵ‌و ئارەزۆپەرستان‌و ئەوانەی کوێرانە دەم لەمانای قورئان وەردەدەن لە ورگی خۆیان بدەن‌و هەربڵێن: ئەم نانە بەو ڕۆنە).

بەڵێ بەو ئەحکامە تۆکمانە لە ئوصول‌و لە عموم‌و لە فروعدا بەم مەنهەجە بێ وێنەی خودا کردیە ڕەحمەت بۆ ئادەمیزاد، ئایینی ئیسلام ئاینێکی مرۆڤایەتی نەمرە، خێرو بەختەوەری دونیاو قیامەتی بۆ مرۆڤ دەستەبەر کردووە، ئاینێکی زیندو گونجاوە بۆ هەموو شوێن‌و سەردەمێك، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگارو تازەبوونەوەی مانگ‌و ساڵ‌و گۆڕانی چەرخ‌و زەمان ئەم دینە کە قورئان مەنهەجیەتی لە جم‌وجوڵدایە‌و وەلا ناخرێ سات دوای سات‌و ڕۆژ دوای ڕۆژ نهێنی ئەحکامەکانی پتر ڕون دەبنەوەو گونجاوی بۆ بەرنامەی ژیان زیاتر دەچەسپێ‌و زیاتر دەچێتە ناو دڵانەوەو گەل‌و نەتەوەکان باوەشی بۆ دەکەنەوە.

## حوکمی گشتی‌و لێکچوونی گشتی (الأحکام العام والتشابه العام)

**المحکم**: لە زمانەوانی‌دا بە مانا مەنع دێ‌و لە (حکمت الدابة وأحکمت) وەرگیراوە، حوکم بریتییە لە جیاکردنەوەی دوو شت لە یەکتری، حاکم: ئەوەیە ستەمکار مەنع دەکا لە ستەمکاری‌و دادوەری نێوان دوو کەس، یان زیاتری بەکێشە هاتوو بکاو حەق‌و بەتاڵ لێك هەڵاوێرێ، ڕاست‌و درۆ لێك جیا بکاتەوە، لە زمانی عەرەبی‌دا دەگوترێ: (حکمت السفیه وأحکمته)

ئەگەر دەستت گرتو نەتهێشت بەویستی خۆی مامەڵە بکا، دەشگوترێ: (حکمت الدابة وأحکمتها) ئەگەر لغاوت کردە دەمی.

وشەی (حیکمة)تیش هەر لەم مانایەوە وەرگیراوە، چونکە ئەمیش خاوەنەکەی مەنع دەکا لەو شتانەی شیاوی ئەو نین، ئەمجار (إحکام الشيئ)یانی قایمکردنی شتو باش جێبەجێ کردنیو چاك دارشتنی (المحکم) واتە: (المتقن) پتەوو چاك دروستکراو.

(إحکام الکلام) کەلامی ڕاستو لە درۆ دوورو بێ غەلو غەشو هەواڵ دروستو جیاکەرەوەی ڕاست لە درۆو هیدایەتو شارەزایی لە گومڕایی سەرلێ شێواوی جیادەکاتەوە، کەلامی موحکەم ئەوەیە ئاوابێ.

بێگومان پەروەردگار وەصفی قورئانی بەوە کردووە: کە ئایەتەکانی موحکەمن ﴿الر کِتَابٌ أُحْکِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَکِيمٍ خَبِيرٍ – هود/١﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿الر تِلْكَ آيَاتُ الْکِتَابِ الْحَکِيمِ – یونس/١﴾ قورئان هەمووی موحکەمە، واتە کەلامێکی تۆکمەو صەحیحو فەصیحو ڕاستوێژو جیاکەرەوەی نێوان حەقو بەتاڵو ڕاستو درۆ، ئەمە بریتییە لە ئیحکامی عام، یان بڵێ حوکمی عام.

متشابه: لە زماندا لە (التشابه) وەرگیراوە: کە بە مانای لێکچون، شتێك لە شتێکی تر بچێ لەو بکا.

الشبهة: ئەوەیە دوو شت، یان زیاتر لەبەر زۆر لێکچونیان لێك جیا نەکرێنەوە، جا شتەکان عەین بن، یان مەعنا، مادە بن، یان غەیر مادە بن، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً – البقرة/٢٥﴾ واتە: هەندێ لەو میوەو خۆراکانە وەکوو یەك دەچن لەڕوی ڕەنگو شێوەوە نەك لەڕوی تامو چێژو حەقیقەتەوە.

تەشابوهو لێکچوونی کەلام ئەوەیە هاوشێوەو شکڵ بنو پێکەوە بگونجێنو هەندێکی پشتگیریو تەصدیقی هەندێکی بکا، پەروەردگار وەصفی

قورئانی بەوە كردووە كە هەمووی موتەشابیهو لێكچووە واتە: بەم مانایە هەمووی پێكەوە گونجاوو لێكچووە هەندێكی تەصدیقی هەندێكی دەكا ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ - الزمر/٢٣﴾ بەم پێیە قورئان هەمووی موتەشابیهە، هەندێكی دەشوبهێتە هەندێكی لە كەمالو جەودەتو چاكیو بەهێزیدا، هەندێكی تەصدیقی هەندێكی دەكا لە ماناو مەفهومدا، موتەماثیلو هاوشێوەن، ئەمە تەشابوهو لێكچونە بە گشتی.

كەواتە هەریەك لە موحكەمو (متشابه) بەم مەعنا موطلەقەی پێشەوە دژایەتییان لەنێواندا نیە، هیچیان مانای ئەویتر هەڵناوەشێنێتەوە، كەوابوو قورئان هەمووی موحكەمو موتقەنو پێكەوە گونجاوە، ماناكانی پشتگیری یەكتر دەكەن هەرچەند لەفظەكانی جوداوازییان هەبێ، هەركاتێ قورئان فەرمانی بە شتێك كرد لەشوێنێكی تردا فەرمان بەپێچەوانەكەی ناكا، بەڵكوو یان فەرمان بە خودی شتەكەیە، یان بە هاوشێوەكەی، هەروەها بەهەمان شێوەشە لە نەهیو هەواڵدانەكانیدا، هیچ دژایەتیو ئیختیلافو جوداوازی نیە لەڕووی ناوەڕۆكەوە ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا - النساء/٨٢﴾.

## حوكمی تایبەتیو لێكچوونی تایبەتی (الأحكام الخاص والمتشابه الخاص)

لە قورئانی پیرۆزدا موحكەمی تایبەتی هەیە، تەشابوهی تایبەتی هەیە، پەروەردگار ئاماژە بۆ هەردووكیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا - آل عمران/٧﴾

دەربارەی مانای موحکەمو (متشابە) بەم شێوە تایبەتیەیان ڕاجیایی کەوتۆتە ناو زانایانەوەو چەند ڕایەك ئاراستە کراوە گرنگەکانیان ئەمانەن:

أ/ گوتویانە موحکەم: ئەوەیە مەبەستەکەی بزاندرێو ئێمە تێی بگەین، موتەشابیه: ئەوەیە خودا بۆخۆی بیزانێ چیەو ئێمە لێی حاڵی نەبین.

ب/ موحکەم ئەوەیە مەعناکەی یەك شێوە هەڵبگرێو ئیحتیمالی مانای تری نەبێ (متشابە): ئەوەیە ئیحتیمالی چەند ماناو مەفهومی جیاجیای هەبێ.

ج/ موحکەم ئەوەیە: ماناکەی سەربەخۆ بێو پێویستی بە بەیانو ڕونکردنەوەو لێکۆڵینەوە نەبێ، (متشابە) ئەوەیە ماناکەی سەربەخۆ نەبێو ڕاستەوخۆ لێی حاڵی نەبین بەڵکوو پێویستی بە بەیانو ڕونکردنەوە هەبێ.

زانایان بۆ موحکەمی قورئان نموونە دەهێننەوە بەو ئایەتانەی ناسیخو کوژێنەوەی ئایەتی ترن، هەروا ئەو ئایەتانەی حەڵاڵو حەرامو تۆڵەو قیصاصو حەدو فەرائیضو وادەو هەرەشەیان تێدا دیاریکراوە.

نموونەی (متشابە)یشیان بە ئایاتی نەسخکراوەو ئەو ئایەتانەی باسی چۆنیەتی زاتو صیفاتی خودا دەکەن وەکوو ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى – طه/٥﴾ ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ – القصص/٨٨﴾ ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ – الفتح/١٠﴾ ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ – الأنعام/١٨﴾ ﴿وَجَاء رَبُّكَ – الفجر/٢٢﴾ ﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ – الفتح/٦﴾ ﴿رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ – البينة/٨﴾ ﴿فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ – آل عمران/٣١﴾ زۆر ئایەتی لەم جۆرەی تریش، هەروا سەرەتای ئەو سورەتانەی کە بە وشەی ﴿الم – ص – الر – ق – كهيعص﴾و لەم نموونانە دەستیان پێکراوە، هەروا چۆنیەتی ڕۆژی قیامەتو زانیاری ڕابوونی.

## راجیایی دەربارەی مانای (متشابە)

هــەروەکوو چــۆن راجیاییــان هەیــە دەربــارەی مانــای موحکــەمو (متشابە)ی تایبەتی راجیایشیان هەیە دەربارەی زانینی مانای موتەشابیهی قورئـان، هـۆی سـەرهەڵدانی ئـەم راجیـاییـە، راجیاییانـە دەربـارەی (وقـف) لەسـەر فەرمایـشتی خـودا: کـە دەفـەرموێ: ﴿وَالرَّاسِـخُونَ فِـي الْعِلْـمِ – آل عمران/٧﴾ ئایا وشەی (الراسخون) موبتەدایەو خەبەرەکەی ﴿يَقُولُونَ آمَنَّا بِـهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا﴾یە، (واو) بۆ ئیستیئناف بێو وەقفە لەسەر ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللّهُ﴾ بکرێ، یان ئەم جوملە مەعطوف بێو (یقولون) حال بێو وەقفە لەسەر ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ بکرێ، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی شارەزا لە بواری تەفسیرو قیرائەتدا پێیان وایە ﴿وَالرَّاسِـخُونَ.....................﴾ جوملـەی موستەئنەفەیە، لەوانە ئوبەی کوڕی کەعب، ئیبنو مەسعودو ئیبنو عـەبباس (رەزای خودایا لێ بێ) هی تریش لە هاوەڵانو تابیعینو چینی دوا ئـەوانیش، بەڵگەشیان ئەو ڕیوایەتەیە: کە (الحاکم) لە (مستدك)دا لە ئیبنو عەبباسـەوە نەقڵی کردووە: کە ئەو ئەم ئایەتەی ئاوا خوێندۆتـەوە ﴿وَمَـا يَعْلَـمُ تَأْوِيلَـهُ إِلاَّ اللّهُ ويقول الرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ آمَنَّا﴾ هەروا بە قیرائەتی ئیبنو مەسعود ﴿ومـا يعلم تأويله إلا الله والراسخون فى العلم يقولون: آمنابـه﴾ هـەروا بەڵگـەی تریـان هێناوەتــەوە بــەوەی ئایەتەکــە دەلالــەت دەکـا لەســەر ذەمکردنــی ئەوانــەی لەبواری (متشابە)دا قوڵ دەبنەوە، وەصفیان دەکا بـەوە کە لـە ڕێگـای راسـت لایانداوەو هەوڵی فیتنەو ئاشوب بەرپاکردن دەدەن.

خـاتو عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿هُوَ الَّـذِيَ أَنـزَلَ عَلَيْـكَ الْكِتَابَ﴾ تا دەگاتـە ﴿أُوْلُواْ الألْبَابِ – آل عمران/٧﴾ فـەرمووی: «فَـإِذَا رَأَيْـتَ

الّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ، فَأُولَئِكَ الّـذِينَ سَـمَّى اللّـهُ ، فَاحْـذَرُوهُمْ».[1] ئەگەر ئەوانـەت بینـی: کـە شـوێن ئایـەتی (متـشابه) دەکـەون ئـەوە ئەوانـەن کـە پـەروەردگار نـاوی هێنـاونو بـە فیتنـەجۆو لادەر لـە ڕێبـازی حـەق وەصفی کردوون، خۆتیان لێ بپارێزەو ئاگات لێ بێ بە هەڵەت نەبەن.

کۆمـەڵێکی تـر لـە زانایـان لـە پێشیانەوە موجاهیـد، بۆ ئـەوە چوون ﴿وَالرَّاسِـخُونَ فِـي الْعِلْـمِ﴾ مـەعطوفـەو ﴿یقولـون﴾ حاڵـە وەقفـە لەسـەر ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ دەکرێ، ئەوەتا ئیمامی موجاهید خۆی، دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: قورئـانم لـە فاتیحـەوە تـا کۆتـایی بەسـەر ئیبنـو عەبباسـدا خوێنـدەوە لەسەر هەموو ئایەتێك دەوەستامو پرسیاری تەفسیرەکەیم لێ دەکرد.

ئیمـامی نـەوەوی ڕای موجاهیـدی پەسـەند کـردووەو لـە شـەرحی موسلیمدا دەڵێ: ئەم ڕایە صەحیحو پەسەندە چونکە زۆر دوورە پـەروەردگار موخـاطـەبـەی بەنـدەکانی خـۆی بکـا بـە ئاخـاوتنو کۆمەڵـە ئایـەتێك: کـە خەڵکەکە تێیان نەگەنو نەزانن مەبەست لێیان چیە.

## تەوفیق لەنێوان ئەو دوو ڕایانەدا لەڕوانگەی مانای تەئویلەوە

کـە دەگەڕێینـەوە بۆسـەر مانـای تـەئویلو شـی دەکەینـەوە بۆمـان دەردەکەوێ: کە هیچ مونافاتو دژایەتی لەنێوان ئەو دوو ڕەئیـەدا نابینـدرێ، چونکە وشەی (تأویل) بۆ سێ مانا هاتووە.

یەکەم: لادانی لەفظ لە ئیحتیمالی مانای ڕاجیح بـۆ ئیحتیمـالی مانـای مەرجوح لەبەر هـەبوونی بەڵگەیـەك لـە گـەڵیدا، ئەمـە زاراوەو ڕاوبۆچوونی زۆربەی زانایانی موتەئەخیرینە.

---

[1] أخرجه البخاري/٤٥٤٧ ومسلم/٦٧٧٥.

دووەم: تـەئویل بـە مانـا تەفـسیرە، کـەوابێ تـەئویل ئـەو کـەلامو ئاخاوتنەیە لەفظی پێ تەفـسیر دەکرێتـەوە بۆ ئـەوەی ماناکـەی دەربکـەوێو کەسانی دی لێی حاڵی بن.

سێیەم: تەئویل ئەو حەقیقەتەیە: کە کەلامەکە بۆلای کێش دەبێو دەبێتە ئاکامو سەرەنجام، کەوابێ تەئویلی ئـەوەی خـودا خەبـەری پـێ لێـداوە دەربـارەی زاتو صـیفاتی خـۆی، بریتییـە لـە حەقیقـەتی زاتـی پـیرۆزو موقەدەسـیو چـۆنیەتی حەقیقـەتی صـیفاتە جوانـەکانی، تـەئویلی ئـەوەی خەبـەری پـێ لێـداوە دەربـارەی ڕۆژی پەسـڵان، خـودی ئـەو ڕوداوانەیـە لـەو ڕۆژەدا ڕوودەدەنو هەن.

لەسـەر ئـەم بنەمایەیـە: کـە خـاتو عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە ڕوکـوعو سـجودی دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي» تـەئویلی قورئـانی دەکردو مەبەسـتی ئایـەتی ﴿فَـسَبِّحْ بِحَمْـدِ رَبِّـكَ وَاسْـتَغْفِرْهُ إِنَّـهُ كَـانَ تَوَّابًـا – النصر/٣﴾.[1]

ئەمجار ئەوانەی کە ڕایان وایە (وەقف) لەسـەر ﴿وَمَـا يَعْلَـمُ تَأْوِيلَـهُ إِلاَّ اللَّـهُ﴾ بکـرێو جوملـەی ﴿وَالرَّاسِـخُونَ فِـي الْعِلْـمِ.............﴾ دەکەنـە موسـتەئنەفە، مەبەسـتیان لـە مانـای تـەئویل مانـای سـێیەمەو لەسـەر ئـەو بنەمایە ئەو ڕایان دەربڕیوە، واتە: ئـەو حەقیقەتـەی کەلامەکەی بـۆلا کێش دەکرێ، کەوابێ حەقیقەتی زاتی خوداو چۆنیەتی ناوە جوانەکانیو صیفاتی، هـەروا حەقیقـەتی زیندوبوونـەوەو ڕوداوەکـانی قیامـەت هـەر خـودا خـۆی دەیانزانێو بەس، کەسی تر پەییان پێ نابا.

ئەوانەی دەڵێن وەقفە لەسـەر ﴿وَالرَّاسِـخُونَ فِـي الْعِلْـمِ.............﴾ دەکرێ (واو) عاطیفەیـە بـۆ ئیـستیئناف نیـە، مەبەسـتیان بـە تـەئویل مانـای

---

[1] أخرجه البخاري/٨١٧ ومسلم/١٠٨٥.

دووەمــە: کــە بــە مانــا تەفــسیرو راڤەکردنــە، موجاهیــد کــە ئــەم رایــەی دەربڕیوەپێشەوایەکی گەورەی تەفسیرە.

ئیمامی ثەوری دەربارەی دەفەرموێ: ئەگەر تەفسیری ئایەتی قورئانت لـە موجاهیـدەوە بـۆ نـەقڵ کـرا ئـەوە بەسـتەو وەری بگـرە، کـە گـوترا فـلان زانیاری دەربارەی (المتشابە) هەیە ئەوە مەبەست پێی ئەوەیە فلانە تەفسیری دەزانـی، بـەم شـیکردنەوەیە دەزانـدرێ: کـە لـە ئاکامـدا موناقـاتو جـوداوازی لەنێوان دوو مەزهەبەکەدا نیە، بـەڵکوو ئیختیلافەکە دەگەڕێتـەوە بـۆ مانـای تەئویل.

لە قورئاندا ئەلفاظی مانا متشابیهو لێك چوو هەنو ئێمە لە دونیـادا ماناکانیان نازانین، وەلێ حەقیقـەتی ئەمـە وەکوو حەقیقـەتی ئـەوە نیـە، بـۆ نموونــە نــاوە جوانــەکانی پــەروەردگارو صــیفاتەکانی هەرچــەندە لــەنێوان ئەوانــەداو نــاوی ئــادەمیزادو صــیفاتەکانیدا لــە لــەفــظو مــەعنای کــوللیدا لێکـچونیان هەیــە، وەلێ حەقیقــەتی خــالیقو صــیفاتەکانی زۆر جــودان لــە حەقیقەتی مەخلوقو صیفاتەکانی.

زانایانی لێهاتوو لێکۆڵەرەوە لـە ماناکانیـان حـاڵی دەبـنو لێکیـان جیـا دەکەنەوە، بەڵام خودی حەقیقەتەکەیان ئەوە دەچێتە بواری ئـەو تەئویلـەی: کە هەر خودا دەیزانێو کەسی تر پەی پێ نابا.

بۆیـە کاتێـك پرسـیار لـە ئیمـام مالیـكو کەسـانی تـریش لـە سـەلەفی صـاڵح کـرا دەربـارەی ئایـەتی ﴿الـرَّحْمَنُ عَلَـى الْعَـرْشِ اسْـتَوَى – طــه/٥﴾ وەڵامەکەیان ئەوەبوو فەرموویان ئیستیواء مەعلومو ئاشکرایە، چۆنیەتەکەی نازاندرێ، واجبە ئیمانیشمان پێی هەبێ، پرسیار لێ کردنو قوڵبوونەوە تێیدا بیدعەیە.

هەر بەم شێوە رەبیعەی کوڕی عەبدوڕحمان: کە شێخی ئیمـام مالیـك بــووە وەڵامــی ئــەم پرسـیارەی داوەتــەوەو فەرموویــەتی: (الإســتواء معلــوم،

والكيف مجهول، ومن الله البيان وعلى الرسول البلاغ، وعلينـا الإيمـان) ئيـستيواء مەعلومە، چۆنیەتی نادیارە، لە خوداوە هاتووەو پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) پێویست بووە بـە ئێمـەی بگەیـەنێو ئێمـەیش واجبـە لەسـەرمان ئیمانمان پێی هەبێ، کەوابێ ئیمام رەبیعە پـێش ئیمـام مالیـك فەرموویـەتی (ئیستیواء) مەعلومەو چۆنیەتەکەی نەزانراوەو نازاندرێ.

هەر بـەم شـێوە هەواڵدانی پـەروەردگار لـە قورئانـدا دەربـارەی ڕۆژی دوایی، لەناو ئەو ئەخبارانەدا چەندەها لەفظ هەن ماناکەیان لێك دەچـن، هەیانە ماناکەی لای ئێمـە ئاشـکرایە وەلێ حەقیقـەت جودایـە لـە حەقیقـەتی چۆنیەتیو صیفاتی ئەوەی لای ئێمە دیارە لەگەڵ ئەوەی لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە لێك جودان، لە قیامەتدا تەرازوو هەیە بەهەشتو دۆزەخ هەیـە، لـە بەهەشتدا ئەم شتانەو شتی تریش هـەن ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ - محمد/١٥﴾ یـان دەفـەرموێ: ﴿فِيهَا سُرُرٌ مَرْفُوعَةٌ ، وَأَكْوَابٌ مَوْضُوعَةٌ ، وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ، وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ - الغاشـية/١٣ - ١٦﴾ ئێمـە ئـەم شـتانە دەزانـینو ئیمانمـان پێیـان هەیـە، دەشـزانین: کـە نادیـار زۆر گـەورەترو سەرسوڕهێنەرترە لـە دیـارو بەرچـاو، ئەمە لە قیامەتدایە زۆر جوداوازە بەڵام حەقیقەتی ئەم جوداوازییە بۆ ئێمە نادیارە لەو جۆرە تەئوویلەیە جگە لە خودا کەس پەی پێ نابا.

## تەئویلی ڕەخنە لێگراو (التأويل المذموم)

تەئویلی مەذمومو ناپەسەندکراو ئەوەیە: لەفظ لە ئیحتیمالی مانای راجیحی بگۆڕیٚ بۆ ئیحتیمالی مانای مەرجوح لەبەر بەلگەیەك کە لەتەکیایە، زۆرینەی زانایانی موتەئەخیرین: کە پەنایان بۆ ئەم جۆرە تەئویلە بردووە، لەڕوی زێدەڕەوی کردنەوە بووە لەبواری تەنزیهو پاك راگرتنی خودا لەوەی بشوبهێتە مەخلوقاتی خۆیو پێیان وابووە ئەم جۆرە تەئویلە تاكو تەنهایی خودا دەچەسپێنیٚ، وەلیٚ ئەم زەعمو بۆچوونە بۆچونێکی پوچو بەتاڵەو ئەوەی خستونیە ئەم هەڵەوە ئەوەیە کە ویستویانە خۆی لیٚ بپارێزن.

ئەوانە کاتێك دێن وشەی (ید) تەئویل دەکەن بە قودرەت ویستویانە خۆ لەوە بپارێزن کە دەست بۆ خودا بڕیار بدەن بە بیانووی ئەوە مەخلوقات دەستیان هەیە، ئیتر بەلایانەوە گران بووە بڵێن خودا دەستی هەیە، هاتوون بە قودرەتو تواناو دەسەلات مانایان کردووە، ئەمەش سەرلێتێکچوونو تەناقوضە لەوانەوە، چونکە لازم دیٚ وێنەی ئەوەی نەفییان کردووە ئیثباتی بکەن چونکە خۆ مەخلوق وەکوو دەستی هەیە قودرەتو دەسەلاتیشی هەس!.

جا ئەگەر ئەوەی پاڵ خودایان داوە لە قودرەتو دەسەلاتو بە حەقیان زانیوەو بە مومکینیان داناوە، ئیثباتی دەستیش بۆ خودا مومکینە، جا ئەگەر بوونی دەست بۆ خودا نەگونجیٚ بە حوجەتی ئەوەی مەخلوقیش دەستی هەیە، ئەوە بوونی قودرەتیش ناگونجیٚ بۆی چونکە مەخلوقیش قودرەتی هەیە، کەوابی دروست نیە بگوتریٚ: ئەم لەفظە تەئویل کراوە بەو مانایە لە ئیحتیمالی مانای راجیحەوە لادراوە بۆ ئیحتیمالی مانای مەرجوح.

ئەوەی لە زانایانی سەلەفو غەیری ئەوانیشەوە نەقڵ کراوە دەربارەی رەخنە لە تەئویلکارانو ذەمکردنیان ئەوە بە نیسبەت ئەوانەوە کە تەئویلی ئەو ئەلفاظو دەقانە دەکەن کە ماناکانیان لیٚ ئیشتیباهو چەواشە

دەبیٚو نازانن تەئویلی راستو دروستیان بۆ بکەن لە کاتێکدا ئەو شتانە لای کەسانی دی مانای صەحیحو شیاویان هەیە.

## (١٣) گشتیو تایبەتی (العام والخاص)

یاسا شەرعییەکانو ئەحکامە دینییەکان مەقاصیدو مەبەستی خۆیان هەیەو بۆیان ئاراستەکراون، وادەبیٚ حوکمێکی تەشریعی (یاسایی) چەند تایبەتمەندییەکی تێدا کۆدەبنەوە وای لێدەکەن گشتگیر بیٚو هەموو تاکەکان بگرێتەوە، یان بەسەر هەموو حاڵەتەکاندا بسەپیٚ، جاری وایش هەیە ئەو یاسایە مەبەستێکی تایبەتیو ئامانجێکی نەوعیو خصوصی تێدا بەرچاو دەگیریٚ، تەعبیردانەوە لێی بەشێوەیەکی گشتیو عام ئاراستە دەکریٚ، پاشان وشەیەك، ڕستەیەك دیٚ بەدوایدا ئەندازەکەی دیاری دەکا، یان سنورو نیطاقی لەسەر شتێك کورت هەڵدێنیٚ، دەقی عەرەبی لە جۆراوجۆرکردنی خیطاب ئاراستەکردندا، لە ڕونکردنەوەی مەقاصیدو غایاتدا دیمەنو مەظهەرێکە لە مەظاهیری هێزی زمانو بەرفراوانی مادەی زمانەکە، جا کە ئەم جۆرە دەقە لە قورئاندا وارید بووە، لەکەلامی سەرئاسایی پەروەردگاردا ئاراستەکرا کاریگەری لە نەفسدا عینوانی ئیعجازی تەشریعییە وێڕای ئیعجازی لوغەوی.

## پێناسەی عامو داڕێژگەی (عموم)

عام: لەفظیکە داگرندەی هەموو فەردێکە کەبۆی بگونجیٚ بەبیٚ سنورو ئەژمار.

هەڵبەتە زانایان کەوتوونە راجیایییەوە دەربارەی مانای عام، لەوەدا ئاخۆ لە لوغەتدا صیغەیەك داڕێژگەیەك هەیە بۆ ئەو مانایە داندرابیٚو تایبەت بیٚ بە ئەوەو دەلالەت بکا لەسەری یان نا؟

زۆربەی زانایان پێیان وایە چەند صیغەو داڕێژگەیەك هەن لە بنەمادا دانراون بۆ ئەوەی دەلالەت بکەن لەسەر حەقیقەتی (عموم)و مانای ئەو بگەیەنن، بەشێوەی مەجازیش لە مەعنای تردا بەکار دەهێندرێن، بەڵگەیان لەسەر ئەم رایەی خۆیان بەچەند بەڵگەیەکی دەق ئاساو کۆڕایو مەعنەوی هێناوەتەوە.

١- بەڵگە (نەصصی) دەق ئاسایی ئایەتی ﴿وَنَادَى نُوحٌ رَّبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ ، قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ – هود/٤٥ – ٤٦﴾ شێوەی دەلالەتی ئەم دەقە لەسەر عموم ئەوەیە حەزرەتی نوح (علیه السلام) ئەم پاڕانەوەو نیدائەی ئاراستەی پەروەردگار کرد بە تێڕامان لەفەرمایشتی خودا کەپێی فەرمووە: ﴿قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ................ هود/٤٠﴾ پەروەردگار ئەم نیدایەی سەلماند ئیقراری بۆ لەسەر کرد بەڵام جوابی دایەوە بەوە کە ئەو کوڕەی بە ئەهلی خۆی دەزانی لە ئەهلی تۆ نیەو تەرەبووە.

جا ئەگەر پاڵدانی وشەی ئەهل لە ﴿وَأَهْلَكَ﴾دا بۆلای نوح عومومی نەگەیاندایە ئەوە چەرتکردنی ﴿إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ دروست نەدەبوو، هەروا ئایەتی ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُو أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ ، قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ – العنكبوت/٣١ – ٣٢﴾ شێوازی دەلالەت کردنی ئەم ئایەتە لەسەر (عوموم) ئەوەیە حەزرەتی ئیبراهیم لەقسەی فریشتەکان ﴿أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ﴾ واتێگەیشتووە کە گشتگیرەو هەموویان دەگرێتەوە بۆیە ناوی لوطی هێناو فەرمووی ئەویشی تێدایە، فریشتەکانیش ئەوەیان بۆ سەلماندو دانیان بەوەدانا بەڵام وەڵامیان دایەوە: کە لوطو خاوخێزانی لەو لەناو بردنە چەرت کراون، ژنەکەشی لە ڕزگاربووەکان چەرت کراوەو ئەو ڕزگاری نابێ، دەی هەموو ئەمانە بە دەق گشتگیری دەگەیەنن.

٢- بەلگەی كۆڕایی (الأدلة الإجماعية) وەكوو ئايـەتی ﴿الزَّانِيَـةُ وَالزَّانِـي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْـدَةٍ – النـــور/٢﴾ هـەروا ئايـەتی ﴿وَالـسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا – المائدة/٣٨﴾ ئايەتی تری لەم جۆرە كۆڕای هاوەڵان لەسەر ئەوە بەستراوە كە هەموو زيناكەرێكو دزێك دەگرێتەوە.

٣- بەلگـەی مەعنـەوی: ئاشـكرايە گـشتگيری (عمـوم) لـە بـەكارهێنانی لەفظەكە فەهم دەكرێو وەردەگيرێ، جا ئەگەر ئەم وشانە بـۆ مانـای گـشتیو عمـوم دانـەنرابن لـەكاتی بەكارهێنانيانـدا زيهنـی ئـادەميزاد ئـەو مانايـەی لێ وەرنەدەگرتن، وەكوو ئەلفاظی شەرتو ئيستيفهامو مەوصول.

ئێمـە بۆخۆمـان بـە عـەقڵ جـوداوازی نێـوان مانـای وشـەی (كـل)و (بعـض) دەكـەين، جـا ئەگـەر وشـەی (كـل) مانـای گـشتیو عمـوم نەگەيـەنێ، جوداوازييەكە دەستەبەر نابێ، ئەگـەر يـەكێك لـە سياقی نـەكيرەی مـەنفیدا بڵـێ: (لارجـل فـی الـدار) دەبـێ بڕوامـان وابـێ ئـەم نەفيـە گـشتگيرەو عمـوم دەگەيەنێ، چونكە ئەگەر پياوێ لە پياوانی تێدابوو ئەم قسەيە درۆ دەبێ.

وەكوو لە قورئاندا هاتووە دەفـەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاء بِهِ مُوسَى – الأنعام/٩١﴾ بۆ بەدرۆ خستنەوەی ئەوەی وتی: ﴿مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ – الأنعام/٩١﴾ ئەمـە نيـشانەی ئەوەيـە نـەكيرە لـەدوای ئـەداتی نەفی بۆ گشتگيریو عمومە، چونكە ئەگەر وانـەبێ وتـەی ئێمـە: كـە دەڵـێين: {لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ} دەبێ بە تەوحيد نەژمێردرێو جگـە لـە خـودا نـەفی هـەموو خودايەك نەكا!!

لەسەر ئەم بنەمايـە گـشتگيری (عمـوم) چـەند صيغەو دارێژگەيـەكی هەن دەلالەت دەكەن لەسەری.

يـەكێ لەوانـە (كـل) وەكوو ئايـەتی ﴿كُـلُّ نَفْـسٍ ذَائِقَـةُ الْمَـوْتِ – آل عمران/١٨٥﴾ ﴿اللّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ – الرعد/١٦﴾ هـەر لـە مانـای (كـل)دايـە وشەی (جميع).

هەروا هەر ئیسمێك موعەرەف بە (آل) بێ‌و (آل)ەكە بۆ عەهد نەبێ، وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَالْعَصْرِ ، إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ – العصر/١ – ٢﴾ بە بەلگەی ئیستیثنای دوایی كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا – العصر/٣﴾ هەروا ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ – البقرة/٢٧٥﴾ ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا – المائدة/٣٨﴾.

یەكێكی تر لە صیغەی (عموم) نەكیرەیە لە سیاقی نەفی، یان نەهی‌دا وەكوو ﴿فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ – البقرة/١٩٧﴾ ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا – الإسراء/٢٣﴾ یان نەكیرە لەدوای ئەداتی (شرط) وەكوو ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ – التوبة/٦﴾ هەروا وشەی (الذی) و (التی)و فەرعەكانیان وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ – الأحقاف/١٧﴾ واتە: كەسێك وتەی ئاوا ئاراستەی باوك‌و دایكی بكا، بەلگەی ئەوە كە (الذی) لێرەدا (عموم) دەگەیەنێ ئایەتی دواوەیەتی كە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ – الأحقاف/١٨﴾ هەروا ئایەتی ﴿وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا – النساء/١٦﴾ هەروا ئایەتی ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا – الطلاق/٤﴾.

**هەروا نیسمە شەرتیەكان وەكوو:**

﴿فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا – البقرة/١٨٥﴾.

بۆ هەموو عاقلێك.

﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللّهُ – البقرة/١٩٧﴾.

بۆ هەموو غەیر عاقڵێك.

﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ – البقرة/١٥٠﴾.

بۆ هەموو شوێنێك.

﴿أَيًّا مَّا تَدْعُواْ فَلَهُ الأَسْمَاء الْحُسْنَى – الإسراء/١١٠﴾.

بۆ هەموو ئیسمێك.

هەر ئیسمی جینسێك ئیضافە بكرێ بۆلای مەعریفە وەكوو ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ – النـور/٦٣﴾ واتـە: هـەموو فـەرمانێكی خـودا، یـان دەفەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ – النساء/١١﴾ واتە: هەموو منـداڵانی ئێوە.

## جۆرەكانی عام

گشتگیر (عام) سێ جۆرە:

یەكەم: ئەوەیە لەسەر گشتگیری خۆی مابێتەوەو تەخصیص ڕوی تێ نەكردبێ، قازی (جلال الدین البلقینی) دەڵێ: نمونەی لەفظی (عام)ی لەو جۆرە زۆر كەمە، ئیمامی زەركەشی لە كتێبی (البرهان)دا دەڵێ: نموونـەی لـە قورئانـدا زۆرە، ﴿وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – النساء/١٧٦﴾ ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا – الكهـف/٤٩﴾ هـەروا هـەموو ئـەو ئیـسمانەی لـە ئایـەتی (٢٣)ی سـورەتی (النساء)دا هەن كە ئیضافەكراون بۆلای مەعریفە وەكوو دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا – النـساء/٢٣﴾ چونكە هیچیان تەخصیص ڕویان تێ ناكا.

**دووەم:** وشـەی عـام مەبەسـت لێـی خـاص بـێ، وەكـوو دەفـەرموێ: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ – آل عمران/١٧٣﴾ مەبەست بە وشەی (الناس)ی یەكەم نـەعیمی كوڕی مەسعودە، مەبەست بـە (الناس)ی دووەم ئەبو سوفیانە، مەبەست پێیان عموم نیە بە بەڵگەی ئـەوەی لـە پاشـان دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَـا ذَلِكُـمُ الـشَّيْطَانُ – آل عمـران/١٧٥﴾ (إسـم الإشارة)ەكەی بە موفرد هێنا ئاماژە بۆ تاكێك دەكا، ئەگەر وشەی (النـاس) لـە ئایەتەكەدا كۆی بگەیاندایە ئیسمولئیشارەكەی بە جەمع دەهێناو دەیفـەرموو (إنما أولئكم الشيطان) هـەروا ئایـەتی ﴿فَنَادَتْـهُ الْمَلآئِكَـةُ وَهُـوَ قَـائِمٌ يُـصَلِّي فِي الْمِحْـرَابِ – آل عمـران/٣٩﴾ وشـەی (الْمَلآئِكَـةُ) عامـەو مەبەسـت لێـی حەزرەتی جوبرائیلە كە فەردێكە لە مەلائیكە، هـەروا ئایـەتی ﴿ثُـمَّ أَفِيـضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّـاسُ – البقـرة/١٩٩﴾ مەبەسـت بـە وشـەی (النـاس) لێـرەدا حەزرەتی ئیبراهیمە، یان مەبەست بەشێ لە عەرەبە واتە جگە لە قوڕیش.

**سێیەم:** (عام)ی تەخـصیص كـراو، نمونـەی ئەمـە لـە قورئانـدا زۆرەو لەوە بەولاوە نمونەكانیان دەخەینە ڕوو، بۆ نموونە ئایەتی ﴿وَكُلُـواْ وَاشْـرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ – البقرة/١٨٧﴾ یان ئایەتی ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً – آل عمران/٩٧﴾.

**جوداوازی نێوان (عام)ێک کـە مەبەست لێـی (خـاص) بـێ، لەگـەڵ (عـام)ێـک تەخـصیص كرابـێ، جـوداوازی نێـوان ئـەم دوو زاراوەیـە لەچـەند ڕویەكەوەیە:**

١- عام: كە مەبەست لێی خصوص بێ هـەر لەسـەرتاوە مەبەسـت لێـی ئـەوە نیـە هـەموو تاكـەكانی بگرێتـەوە، نـە لـە ڕوی لـەفظـەوە نەلـەڕوی حوكمـەوە، بـەڵكوو ئـەم جـۆرە (عامـە) ئـەفرادی زۆرن، بەكارهێنـدراوە لـە فەردێكدا، یان زیاتر لە فەردێك بەڵام هەموویان نـا وەڵێ (عـام)ی تایبـەتكراو

ئەوەیە لەسەرتاوە مەبەست لێی گشتگیرییە بۆ هەموو فەردەکان لەڕوی لەفظەوە نەك لەڕوی حوکمەوە، کەوابێ وشەی (الناس) لە ئایەتی ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ – آل عمران/١٧٣﴾ هەرچەندە عامە وەلێ نە لەڕوی لەفظەوە نە لەڕوی حوکمەوە لە فەردێك زیاتر مەبەست نیە.

بەلاَم وشەی (الناس) لە ئایەتی ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً – آل عمران/٩٧﴾ عامەو مەبەست لێی هەرچی بچێتە ژێر مەفهومی (الناس)وە بیگرێتەوە، هەرچەندە حوکمی واجببوونی حەج تەنها ئەوانەیان دەگرێتەوە: کە توانایان هەیە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن.

بەکارهێنانی وشەی (الناس) لە میثالی یەکەمدا مەجازە، چونکە وشەکە لەمانای بۆ دانراوی ئەصڵی خۆی لادراوەو بەکارهێندراوە لەبڕێ ئەفرادی خۆیدا، بە پێچەوانەی نموونەی دووەم، قەولی ئەصەح ئەوەیە حەقیقەتە.

زۆربەی زۆری شافیعییەکانو زۆرێك لە حەنەفییەکانو هەموو زانایانی حەنبەلی لەسەر ئەو رەئیەن، ئیمامولحەرەمەین ئەم رەئیەی لەهەموو زانایانەوە نەقڵ کردووەو پێی وایە کۆڕایان لەسەری چەسپاوە، ئیمامی عەزالی دەڵێ: ئەوە مەزهەبی شافیعیو هاوەڵانیەتیو ئیمامی سبوکی ئەم بۆچوونەی بە ڕاست داناوە، چونکە (تناول اللفظ للبعض الباقي بعد التخصيص كتناوله له بلا تخصيص) لەخۆگرتنی وشە بۆ بڕێ باقی دوای تایبەتکردنی وەکوو لەخۆ گرتنی وایە بەبێ تایبەتکردن، دەی ئەو لەخۆگرتنە حەقیقی‌یە بە ئیتیفاق، دەی با ئەمیش حەقیقی بێ.

قەرینەی یەکەم ئەغلەب عەقڵییەو لێی نابێتەوە قەرینەی دووەم لەفظییەو وادەبێ لێی دەبێتەوە.

# پێناسەی خاص‌و ڕونکردنەوەی موخەصیص

خاص: بەرامبەر عامە پێچەوانەی یەکترن، کەوابێ خاص ئەوەیە هەموو تاکە گونجاوەکانی بەبێ سنورو ئاژمار نەگرێتەوە (تەخصیص) تایبەتکردن بریتییە لە چەرتکردن‌و دەرهێنانی بڕێ لەو مانایانەی لەفظە گشتگیرییەکە دەیگرێتەوە، ئەمجار ئەوەی مانای عامەکە لەبڕێ ئەفرادیدا قەتیس دەکا، یان موتەصیل‌و لکاوە بە عامەکەوەو دوابەدوای دێ‌و فاصیلە ناکەوێتە نێوانیانەوە، یان مونفەصیلەو لێی جیایە.

موتەصیلەکان پێنجن، یەکێکیان ئیستیثنایە وەکوو ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – النور/٤ – ٥﴾ یان ئایەتی ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ، إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – المائدة/٣٣ – ٣٤﴾.

دووەمیان (صفة)یە وەکوو ئایەتی ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ – النساء/٢٣﴾ ڕستەی ﴿اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ صیفەتی (نسائكم)ە واتە کۆڵەبەسەی ئەو ئافرەتانەی سەرجێیتان کردوون لێتان حەرامە مارەیان بکەن، بەڵام ئەگەر دخولتان بە دایکەکانیان نەکردبێ حەڵاڵە کچەکەی مارە بکەن.

سێیەم شەرت وەکوو دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ – البقرة/١٨٠﴾ ڕستەی ﴿إِنْ تَرَكَ خَيْراً﴾ لە وەصیەتدا مەرجە، هەروا ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا –

النــور/٣٣﴾ ڕستەی ﴿إِنْ عَلِمْـتُمْ فِـيهِمْ خَيْـرًا﴾ واتـە: موكاتەبـەكردن لەگـەڵ كۆیلە بـە مـەرجێ ڕەوایـە: كـە بزانـدرێ كـابرا دەتوانـێ پارەكـە بـدا ئـەمینو كاسبكاربوو دەیتوانی گرێبەستی موكاتەبەكە جێبەجێ بكا.

چوارەم: غایەو سەرەنجام، وەكوو دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْلِقُـواْ رُؤُوسَـكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ – البقرة/١٩٦﴾ یان ئایەتی ﴿وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُـرْنَ – البقرة/٢٢٢﴾.

پێنجەم: بەدەلی بەعض لـە جیـاتی كـول، وەكـوو ئایـەتی ﴿وَلِلّـهِ عَلَـى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً – آل عمران/٩٧﴾ كە بەدەلی (الناس)ە عامـە، حـەجكردنی تایبـەتكردووە بەوانـەی توانایـان هەیـە ئـەو ئەركـە جێبەجێ بكەن.

موخەصیصی مونفەصیل: ئەوەیە لەگەڵ (عام)ەكە نـەهاتبێ بـەڵكوو لەشـوێنێكی تـردا بـە ئایـەتێك، یـان حەدیـسێك، یـان بـە ئیجمـاع، یـان قیـاس حوكمە عامەكە تایبەت كرابێ، نموونەی حوكمێكی گشتگیری قورئـان: كـە بـە قورئان تایبەتكرابێ وەكوو ئایەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ – البقـرة/٢٢٨﴾ ئـەم ئایەتـە حـوكمێكی گـشتی دەگەیـەنێو شـمولی هـەموو تەڵاقـدراوێك دەكـا سـكپڕ بـێ، یـان سـكپڕ نـەبێ، گواسـترابێتەوەو دخـولی پـێ كرابێ، یان نـا، دوای ئـەم حوكمـە گشتگیرییە بـە ئایـەتی ﴿وَأُوْلَـاتُ الْأَحْمَـالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ – الطلاق/٤﴾ تایبەتكراوەو حوكمە عامەكەی نەماوە هەروەها بە ئایەتی ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِـن قَبْـلِ أَن تَمَـسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ – الأحزاب/٤٩﴾ جارێكی تر تایبەتكراوە.

نموونـەی حـوكمێكی گـشتگیری قورئـان: كـە بـە حـەدیثی پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) تایبـەتكراوە، وەكـوو ئایـەتی ﴿وَأَحَـلَّ اللّـهُ الْبَيْـعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا – البقرة/٢٧٥﴾ ئەم حوكمە عامەی ئایەتەكە ئاماژەی پێ دەكا بە

حەدیثی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەخصیص کراوە وەکوو لە بوخاریـدا لـە ئیبنـو عومــەرەوە (ڕەزای خــودا لـەخۆیو لـە بـاوکی بــێ) ڕیوایەتکراوە دەڵێ: «نَهَـى رَسُـولُ اللَّـهِ -صـلى الله عليـه وسـلم- عَـنْ عَـسْبِ الْفَحْـلِ» یـان حـەدیثـی صـەحیحەین کـە لـە ئیبنـو عومـەرەوە (ڕەزای خـودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ – صـلى الله عليه وسلم – نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ» پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نـەهی کـردووە لـەو جۆرە فرۆشـتنەی: کـە دەبەسـترێ بـە زایینـی بەچـکەی ناوسکی حوشتری ئاوسەوە، ئەم جۆرە مامەڵەیە لەسـەردەمی پـێش ئیـسلامدا باوبووە، خەڵك دەیانکرد، بە یەکێ لەم دووشێوەیە:

یەکـەم: پیـاوێ حوشـترێکی دەکـڕێ بـەنرخێکی دیـاریکراو نـەدراوی دواخراو، بەوادەی ئەوەندە: کە ئەو وشترە بـزێو سکەکەشی بزێتـەوە ئەوسا بەهاکەی بدا.

شـێوەی دووەم: بەچکەی ئـەو بەچکەیە کـەوا لـە سـکی ئـەم وشـترە ئاوسەدایە لە تۆم کڕی بە ئەوەندە پارەیە، هەروا زۆر فەرموودەی صـەحیحی تر کە ئەم حوکمە عامەی ئایەتەکەیان تایبەتکردووە.

هـەروەها پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) ڕێگــەیدا لــە مامەڵـەی ریبەویـدا مامەڵـەی (العرایـا) بکـرێو موبـاحی کـرد، لـە ئـەبو هــورەیرەوە ڕیوایــەتکراوە: کــە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فـەرمووی: «رَخَّـصَ فِـى بَيْـعِ الْعَرَايَـا فيمـا دون خَمْـسَةِ أَوْسُـقٍ أَوْ فـى خَمْـسَةِ أَوْسُقٍ».[1]

نموونــەی حـوکمی عـام: کـە بـە ئیجمـاع تەخـصیص کرابـێ، ئایـەتی میراتە کە دەفەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْـلُ حَـظِّ الأُنثَيَـيْنِ –

---

[1] أخرجه البخاري/٢١٩٠ ومسلم/٣٨٩٣.

النـــساء/١١﴾ بـەكۆڕای زانایـان كۆیلـە لـەم حوكمــە چـەرتكراوە، چـونكە كۆیلایەتی مانیعە لە میراتگرتن.

نموونــەی ئـەوەی بـە قیـاس تایبـەتكرابێ ئایـەتی ﴿الزَّانِيَــةُ وَالزَّانِــي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَـةَ جَلْـدَةٍ – النـــور/٢﴾ لـەم حوكمـە عامـە عەبد چەرتكراوە بە قیاس بـۆ سـەر ئەمەتـە: كـە ئـەمیان بـە دەق تەخصیـصەكەی هاتووە: كە دەفەرموێ: ﴿فَعَلَـيْهِنَّ نِـصْفُ مَـا عَلَـى الْمُحْـصَنَاتِ مِـنَ الْعَـذَابِ – النساء/٢٥﴾.

## تەخصیص كردنی سوننەت بە قورئان

وادەبێ قورئان حوكمێكی گشتگیری سـوننەت تایبـەت دەكا بـە گشتی نایهێڵێتەوە، نموونە بۆ ئەوە دەهێنـدرێتەوە بە ڕیوایەتی ئەبو واقیدی اللیثـی (ڕەزای خــودای لێ بــێ) دەڵــێ: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســـەر بــێ) فەرمووی: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ فَهُوَ مَيْتَةٌ».[1] هەرچی لە ئاژەڵ ببڕدێو لێی جیا بكرێتــەوە بــە مردارەوەبــوو دەژمێــردێ، ئــەم حوكمــە گــشتگیرییەی ئــەم فەرموودەیە بە ئایەتی ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَـى حِـينٍ – النحل/٨٠﴾ تەخصیص كراوە.

[1] زانایان لەمەدا كۆك نینو هەندێكیان دەفەرموون قورئـان سـوننەت تەخـصیص ناكـاو هەندێكیان مەرجیان داناوە.

# ئیحتیتاج به عام دوای تەخصیص دروستە دەربارەی ئەوەی لێی ماوەتەوە

زانایانی ئوصول راجیاییان هەیە دەربارەی ئەوەی ئایا ئیحتیجاج بە عـام دوای تەخصیـصکردنی لـە (مـابقي)دا دروسـتە یـان نـا، ئـەوەی لای لێکۆڵـەرەوان پەسـەندو موختـارە ئەوەیـە ئیحتیجـاج بـە عـام دوای تەخصیصکردنی دروستە، بەڵگەیان لەسەر ئەوە بەچەند بەڵگەیەکی ئیجماع ئاسـاو بەڵگـەی عـەقڵی هێناوەتـەوە، بەڵگـەی ئیجماعیـان ئەوەیـە: دەڵـێن: فاطیمـەی کـچی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەربـارەی میراتـی باوکی بەڵگەی لەسەر ئەبو بەکر راست کردەوە بە گشتگیری مەفهومی ئایەتی ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ - النساء/١١﴾ هەرچـەندە ئـەم ئایەتـە تەخـصیص کـراوەو کـافرو بکـوژ ناگرێتـەوە، دەی هـیچ کـام لـە هـاوەڵان ئینکـاری دروسـتی ئیحتیجاجەکـەی فاطیمـەیـان نـەکرد، هەرچـەندە تەخصیصی ئەو ئایەتە زۆر ئاشـکراو عـەیان بـوو لایـان، کـەوابێ ئەمـە خـۆی لەخۆیدا دەبێـتە ئیجمـاعی هـاوەڵان لەسـەر دروسـتی بەڵگـەی خـاتو فاطیمـە، هەربۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ چەسپاندنی مـیرات نـەگرتنی بەڵگـەی تـری هێنایەوە وەکوو حەدیثی «نحن معاشر الأنبياء لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ».[1]

بەڵگەی عەقڵی دەڵێن: (عام) پێش تەخصیص بەکۆڕا هـەموو شـتێکی گونجاو بۆی، دەگرێتەوە، ئەصڵ وایـە ئـەوەی پـێش تەخـصیص گەیاندویـەتی دوای تەخـصیـصیش بیگەیـەنێ، مەگـەر موعـاریض هـەبێ، دەی خـۆ بـەدەر لەوێنەکانی تەخصیص رکابەرێکی تر نیە کەوابێ (عام)ەکە دوای تەخـصیص بەحوجەی دەمێنێتەوە لە (مابقي)دا.

---

[1] أخرجه البخاری/٣٠٩٣ ومسلم/٤٥٨٢ من حديث عائيشه.

# ئەوەی خیطاب شمولی دەکا

زانایان کەوتوونە راجیایییەوە دەربارەی ئەو خیطابانەی تایبەتن بە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ – الأحزاب/١﴾ هەروا ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ – المائدة/٤١﴾ ئایا ئەم جۆرە خیطابانە شمولی ئوممەتەکەی دەکەن، یان تایبەتن بە خۆیەوە؟

١- برێك لە زانایان پێیان وایە شمولی ئوممەتەکەی دەکا بە ئیعتیباری تەشریفی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشەواو قودوەیانە.

٢- برێکی تر لە زانایان بۆ ئەوە چوون: کە ئەو جۆرە خیطابانە شمولی موسوڵمانان ناکا، چونکە صیغەو دارێژگەی خیطابەکە ئەوە دەگەیەنێ تایبەتن بە خۆیەوە.

ئەمجار زانایان ئیختیلافیان تێدا پەیدابووە دەربارەی خیطابی خودا بەشێوەی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ وەکوو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ – النساء/١﴾ ئائەم جۆرە خیطابە شمولی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا یان نا؟ قەولی صەحیح ئەوەیە شمولی دەکا چونکە مەفهومی خیطابەکە گشتییە، هەرچەندە لەسەر زوبانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وارید بووە بۆ ئەوەی بە موسوڵمانانی رابگەیەنێ.

هەندێ لە زانایان تەفصیلیان لەم بابەتەدا کردووەو فەرموویانە: ئەگەر خیطابەکە بە (قل) دەستی پێکرد، شمولی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناکا، چونکە بە ڕواڵەت مەبەست گەیاندنە وەکوو ئایەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا – الأعراف/١٥٨﴾ ئەگەر وشەی (قل)ی تێدا نەبوو شمولی خۆیشی دەکا.

هەروا ئەو خیطابانەی واریـد بوون بەشێوەی ئاراستەکراو بۆلای (الناس) یان موسوڵمانان وەکوو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ - الحجرات/١٣﴾ یان ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - المائدة/٩٠﴾.

رای پەسەند ئەوەیە ئایەتی یەکەم شمولی هەمووکەس دەکا، کافر بێ کۆیلە بێ نێرینە بێ مێینە بێ.

ئایەتی دووەم شمولی کافر ناکا بەڵکوو شمولی کۆیلەو مێنە دەکاو بەس، چونکە تەکلیفەکە بۆ هەمووانە، ئەمجار دەرچوونی کۆیلە لەبڕێ ئەحکام وەکوو بەجێهێنانی حەجو جیهادو شتی وا، ئەوە لەبەر هۆکارێکی ترە: کە هەژاریەتی، یان مەشغوڵ بوونیەتی بە خزمەتکردنی ئاغاکەی.

هەرکاتێ نێرو مێ لە حوکمێکدا کۆبوونەوە نێرینە تەغلیب دەکرێ، زۆربەی خیطابی قورئان بە شێوەی (تەذکیر) ئاراستەکراونو شمولی ئافرەتیش دەکەن، واش دەبێ ناوی ئافرەت بەجیا دەهێندرێ، بۆ زێدە ڕوونکردنەوەی ئەمەش مەنعی ئەوە ناکا بچنە ناو وشەیەکی گشتگیرو گونجاو بۆیان، وەکوو ئایەتی ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى - النساء/١٢٤﴾.

## ١٤) الناسخ والمنسوخ

شەریعەتە ئاسمانییەکان لەلایەن خوداوە ئاراستەی پێغەمبەرانی کراون بۆ ئەوەی هیدایەتی ئادەمیزادەکان بدەنو بیانخەنە سەر ڕێبازی راستو دروست لەبواری عەقیدەو عیباداتو مامەڵەدا، جا چونکە عەقیدە یەك جۆرەو گۆڕانی بەسەردا نایە چونکە لەسەر بنەمای یەکتاپەرستیو خودایەتی (ربوبیەت) دامەزراوە، بۆیە بانگەوازی پێغەمبەران تێکڕا بۆ ئەو

مەبەستە بووەو ئەو بنەمایانەیان چەسپاندووون ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ - الأنبياء/٢٥﴾ بەلام عیباداتو مامەڵەكان لەوەدا یەكدیگرن كە بە شێوەیەكی گشتیو بنەما گشتییەكانیاندا ئامانجیان پاڵفتەكردنی نەفسو پارێزگاری لە سەلامەتی كۆمەڵگاو پێكەوە گونجاندنو بەستنەوەی تاكو كۆمەلانی ئەو كۆمەڵگایە بەرفراوانەیە بە حەبلو ریباطی هاریكاریو برایەتی.

وەڵێ داخوازی هەر گەلو نەتەوەیەك وێدەچێ لەهی نەتەوەیەكی تر جودا بێ، شەریعەتێك بۆ گەلو نەتەوەیەك لە چاخو سەردەمێكدا گونجاوو لەبار بێ، لەوانەیە لەسەردەمێكی تردا بۆیان گونجاو نەبێ، رێبازو پرۆگرامی دەعوەو بانگخوازی لەسەرەتای پەیدابوونو دروستبوونیدا جوداوازە لە پەیرەوو پرۆگرامی هەمان دەعوەو بانگخوازی لە قۆناغی دوا دروستبوونیو جێگیر بوونی.

حیكمەتو سیاسەی شەرعی لەم قۆناغەدا غەیری ئەوەیە لە قۆناغی پێشوودا پەیرەو دەكرێ بەگوێرەی گۆڕانی رۆژگار حوكمەكان دەگۆڕێن، گومانیش لەوەدا نیە كە پەروەردگار خۆی خاوەنی شەرعو یاسایەو زانیاری ئەو، هەموو شتێكی لە لا ڕوونو ئاشكرایەو هەموو شەرعو یاسایەكی لە رووی ڕەحمەتو زانیارییەوەیە، ئەمرو نەهی ملكی ئەونو چۆنی بوێ وا فەرمان دەكاو گۆڕانكاری لە فەرمانو نەهیەكانیدا دەكا ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ - الأنبياء/٢٣﴾ كەوابوو هیچ غەرابەتێك لەوەدا نیە كە لە شوێنی حوكمێك حوكمێكی تر دابەزێنێو بە زانیاری رەهای خۆی ئەو شەریعەتە لابەرێو شەریعەتێكی تر بنێرێ بۆ بەرژەوەندی بەندەكانی.

# پێناسەی نەسخو مەرجەکانی

نەسخ لە زمانەوانیدا ئاراستە دەکرێو بە مانا سڕینەوەو گوژانەوە دێ، دەگوترێ: (نسخت الشمس الظل) خۆرەتاو سێبەرەکەی لابردو سڕییەوە، دەشگوترێ: (نسخت الريح أثر المشي) رەشەباکە شوێنکەی ڕۆیشتنی لەو شوێنە پڕکردەوەو دیاردەکەی نەهێشت.

هەروا نەسخ ئاراستە دەکرێو مەبەست لێی نەقڵ کردنی شتێکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بۆ نموونە دەگوترێ: (نسخت الكتاب) زانیاری ناو کتێبەکەم گواستەوە بۆ ناو دەفتەرو شتی وا، قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ – الجاثية/٢٩﴾ مەبەستی ئایەتەکە گواستنەوەی کرداری ئادەمیزادە بۆ ناو صوحوفو نامەی ئەعمال.

نسخ: لە زاراوەی ئوصولدا هەڵگرتنو سڕینەوەی حوکمێکی شەرعییە بە خیطابێکی شەرعی، کەوابێ هەڵگرتنەوەو لابردنی بەڕائەتی ئەصڵی بە نەسخ ناژمێردرێ، چونکە حوکمی شەرعی نیە، بە قەیدی (بە خیطابێکی شەرعی) لاچوونی حوکم بەهۆی شێتی، یان کۆڕای زانایان، یان قیاسو بەراوردکردن لەم پێناسەوە چووە دەر.

جاری واهەیە نەسخەکە پاڵ خودا دەدرێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – البقرة/١٠٦﴾ وادەبێ بە ئایەتێك دەگوترێ: (ناسخ) نەسخکەرەوە دەگوترێ: ئەم ئایەتە نەسخکەرەوەی فلان ئایەتە وادەبێ دەگوترێ: (حکم) نەسخکەرەوەیە، دەڵێن: ئەم حوکمە فلان حوکمی لابردووە.

مەنسوخ حوکمە سڕاوەکەیە، حوکمە هەڵگیراوەکەیە بۆ نموونە ئایەتی میراتو ئەو حوکمانەی لەخۆی گرتوون ناسیخو لابەری حوکمی ئایەتی وەصییەن بۆ باوكو دایكو خزم وەکوو لەمەودوا دێ.

لەم پێناسەو ڕونکردنەوە ئەوەمان لادەچەسپێ: کە مەرجە لە پرۆسەی نەسخدا ئەم مەرجانە هەبن:

١- دەبێ حوکمە نەسخکراوەکە حوکمێکی شەرعی بێ.

٢- دەبێ بەڵگە لەسەر لاچوون و هەڵگیرانەوەی حوکمەکە خیطابێکی شەرعی بێ و لەدوای خیطابی حوکمە مەنسوخەکە هاتبێ نێوانێکی زەمەنی هەبێ لەنێوانیاندا.

٣- نابێ ئەو خیطابەی حوکمەکەی نەسخ بۆتەوە موقەیەدو بەستراو بێ بە کاتێکی دیاریکراوەوە، ئەگینا حوکمەکە بە کۆتایی کاتەکەی بەسەر دەچێ و بە نەسخ حیساب ناکرێ، بۆیە مەککی کوڕی ئەبو طالیب (القیسی المقرنی) دەڵێ: جەماعەتێك گوتوویانە: هەر خیطابێکی شەرعی ئاراستەبکرێ و موشعیر بێ بە کات و مەبەستەوە موحکەمەو نەسخ نایەتە سەری، وەکوو ئایەتی ﴿فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ - البقرة/١٠٩﴾ حوکمی ئەم ئایەتە موقەیەدە بە ئاکام و مەبەستێکەوە کە ﴿يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ﴾ دەی هەر حوکمێك ئاوا پەیوەست بێ بە ئەجەل و ڕوداوێکەوە، نەسخ روی تێ ناکا.

## ئەو حوکمانەی نەسخیان تێدا بەرجەستە دەبێ

بەسەرەنجدان لەو توێژینەوەی پێشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ و دەزانین: کە نەسخ تەنها لە ئەوامیر و نەهیدا دێتە دی، جا ئەمرەکە صەریح و ڕاستەوخۆ بێ و بەشێوەی طەلەب بێ، یان بەشێوەی خەبەر بێ و مانای ئەمر، یان نەهی بگەیەنێ، بەمەرجێك ئەو ڕستەو خەبەرە پەیوەست نەبێ بە بیروباوەڕی بواری ئەو شتانەی پەیوەندییان هەیە بە زات و صیفاتی پەروەردگارەوە، یان بە نامە ئاسمانییەکان و پێغەمبەرانی و ڕۆژی قیامەتەوە، یان ئاداب و ڕەوشت و بنەماکانی عیبادەت و مامەڵەکانەوە، چونکە شەریعەتە

ئاسمانییەکان هەموویان ئەم بنەمایانەیان لەخۆ گرتووەو شەریعەتێك نیە ئەمانەی تێدا نەبن‌و هەموویان کۆکن‌و جیاوازییان تێدا نیە.

قورئان دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ – الشورى/١٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – البقرة/١٨٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ – الحج/٢٧﴾ دەربارەی تۆڵەو قیصاصیش فەرموویەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ – المائدة/٤٥﴾ لەبواری ئەخلاقیشدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا – لقمان/١٨﴾.

هەروەها نەسخ ڕوناکاتە خەبەری صەریح: کە هیچ مانای ئەمرو نەهی تێدا رەچاو نەکرێ، وەکوو ئەو ئایەتانەی هەڕەشە، یان وادەو بەڵێنیان لەخۆ گرتووە.

## زانین‌و ناسینی نەسخ‌و گرنگی

زانین‌و ناسینی ناسیخ‌و مەنسوخ لەلای زانایان‌و مەفەسیرین‌و شەرعزانان‌و ئوصولیین، گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، بە زانستێکی پێویستی دەزانن بۆ ئەوەی ئەحکامەکان تێکەڵاو نەبن‌و لێمان تێك نەچن.

بۆیە زۆر ئاثارو وتەی هاوەڵان هەیە موسوڵمانانیان هەڵناون بۆ فێربوون‌و زانینی، ئەوتا لە ئیمام عەلیەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێن: ڕۆژێك ڕێی کەوتە لای قازییەك پێی گوت: ئەرێ تۆ قازیت‌و دادوەری دەکەی لەنێوان خەڵکدا ناسیخ‌و مەنسوخ لێك جیا دەکەیتەوە؟

قازی وتی: نەخەیر، ئیمام عەلی پێی گوت: کەوابێ خۆت بەهیلاك بردووەو خەڵکیشت فەوتاندووە.

ئیبنو عەبباس لە ئایەتی ﴿يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاء وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا – البقرة/٢٦٩﴾ وشەی حیکمەتی بە زانینی ناسیخو مەنسوخی قورئانو ناسینی ئایاتی موحکەمو موتەشابیهو پێش خراوو دواخراوو جیاکردنەوەی حەڵاڵو حەرام داناوە.

## بۆ ناسینو زانینی ناسیخو مەنسوخ چەند ڕێبازێك هەیە

١- نەقڵی صەریحو بێ پێچو پەنا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیەوە، یان لە هاوەڵێکیەوە، نموونەی یەکەم «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ إلا فَزُورُوهَا».[1] لەوەپێش من نەهیم لێ کردبوون لە دیدەنی گۆڕستان، ئەوە ئێستا پێتان دەڵێم: دیدەنی گۆڕستان بکەن.

نموونەی دووەم: قسەی ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەربارەی چیرۆکی ئەصحابی بیری مەعونە وەکوو لەمەودواوە دێ دەڵێ: «ونزل فيهم قرآناً قرأناه حتى رفع» ئەصحابی بیری مەعونە: کۆمەڵێك هاوەڵ بوون پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردنی بۆسەر ئەهلی نەجد، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر بیری مەعونە، عامیری کوڕی طوفەیل چەند هۆزێکی لە دژ هاندان لەوانە بەنی سولەیمو روعەلو ذەکوان، دەورەیان دان هەموویان قەتلو عام کردن.[2]

٢- کۆڕای زانایان لەسەر ئەوە بڵێن ئەم ناسیخەو ئەو مەنسوخە.

---

[1] رواه الحاكم من حديث أنس برقم (١٣٩٣) وأخرجه مسلم من حديث بردة رقم (٢٢٦٠).

[2] ئەم ڕیوایەتە بوخاری ڕیوایەتی کردووە (٤٠٩٠) هەروا موسلیم (١٥٤٥).

دوو حوكم دژ بە یەك، بزاندرێ كامەیان پێش كامەیان ئاراستە كراوە، بەهۆی مێژووەكەیەوە دەزانی ئەوەی پێشەوە مەنسوخەو ئەوەی دوایی ناسیخە.

لەبواری نەسخدا پشت بە ئیجتیهاد نابەسترێ، هەروا بە قسەی موفەسیرەكانیش كارناكرێ، دژایەتیو تەعاروضی ظاهیری نێوان دەلیلەكانیش نابێتە نیشانەی نەسخ، هەروەها تەئخیربوونی موسوڵمانبوونی یەكێ لە راوییەكانیش ناكرێتە بەڵگەی نەسخ.

## ڕاوبۆچوون دەربارەی نەسخو بەڵگەی هەبوونی

### تێكرا نادەمیزادەكان دەربارەی نەسخ دەبنە چوار تاقم:

١- جولەكە: ئەمان ئینكاری ئەوە دەكەن لە كەلامی خودادا نەسخ هەبێ چونكە پێیان وایە (البداء)ی لێ وەدی دێ، واتە: ئەو شتە لەپێشدا شاراوەو نەزانراو بووە دوایی ئاشكرابووە بۆی، مەبەستیان ئەوەیە نەسخ، یان هیچ حیكمەتێكی تێدا نیە ئەمە كاری بێهودەیەو محاڵە خودا شتی وا بكا، یان نەسخە لەبەر حیكمەتێك بووە لەوەپێش دیارنەبووەو ئێستا هەستی پێكراوەو زانراوە ئەمەش بۆ خودا نابێ، چونكە نیشانەی ئەوەیە خودا لەپێش‌دا ئەو حیكمەتەی نەزانیوەو دوایی زانیویەتی ئەمە بە زەقی بەدائو سەبقی جەهلە كە بۆ خودا لە (محاڵ) مەحاڵ ترە!.

بەڵگەی جولەكە لەم بارەوە بەڵگەیەكی پوچو بێ بناغەیە چونكە هەریەك لە حیكمەتی ناسیخو حیكمەتی مەنسوخ لە ئەزەلو پێش وەختدا لای خودا عەیانو مەعلومن، ئەوە ناگەیەنێ زانیاری دەربارەی حیكمەتی ناسیخەكە لەدوایی‌دا بۆی دەستەبەر بووبێ، پەروەردگار بەزانیاری رەهایی خۆیو بەویستی خۆی بەندەكان دەگوازێتەوە لە حوكمێكەوە بۆ حوكمێك لەبەر بەرژەوەندییەكی پێش وەخت زانراوی خۆیو بەگوێرەی حیكمەتو

تەصـەروفی ڕەهـای خـۆی لـەو بونـەوەرەداو کـە هـەمووی مـوڵکی ڕەهـای خۆیەتی.

جولەکـە بۆخۆیـان دان بـەوەدا دەنـێن: کـە شـەریعەتی موسـا نەسخکەرەوەی ئـایینی پێشوویەتی، لـە دەقـەکانی تەوراتـدا بـە زەقـی باسـی نەسـخ کـراوە، بـۆ نموونـە حـەرامبوونی گۆشـتی زۆر ئـاژەڵ لەسـەر بـەنو ئیسرائیل کە لەوەپێش بۆیان حەڵاڵ بووە، ئەوەتا پەروەردگار دەربارەی بـەنو ئیسرائیل دەفەرموێ: ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ – آل عمران/٩٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِبَغْيِهِمْ وِإِنَّا لَصَادِقُونَ – الأنعام/١٤٦﴾ هەر لە خودی تەوراتدا هاتووە کە لە شەریعەتی ئادەمـدا خوشـك لـەبرا مـارە کراوە، ئەم یاسایە لە شەریعەتی موسادا حەرام کرا، هەروەها حەزرەتی موسا فەرمانی کرد: کە کەسێك لە بەنو ئیسرائیلی گوێرەکەی پەرستبێ بیکوژن، پاشـان فـەرمانی پـێ کـردن کـە شمـشێریان لەسـەر هـەڵبگیرێو ئـیتر لێیـان نەکوژرێ.

٢- ڕافیضیەکان: ئەمانە لەبواری نەسخدا زیادەڕەوییان کردووە، پێیان وایە دروستە (البداء) زانینـی دوای نـەزانی پـاڵ خـودا بـدرێ، ئەمانـە لەگـەڵ جولەکـەدا سـەد دەر سـەد بۆچـوونەکانیان دژبەیـەکن‌و پێکـەوە نـاگونجێن، ئەمان واتە ڕافضی بەڵگەیان چەند قسەو ئەئەرێکە بـە ناحـەق‌و بـەدرۆ پـاڵ ئیمام عەلییان داون! هـەروا ئایـەتی ﴿يَمْحُو اللّهُ مَا يَشَاء وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ – الرعد/٣٩﴾یان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان‌و وایان تەفسیرکردووە: کە خودا دوایی بۆی دەرکەوێ ئەو حوکمە لابەرێ باشەو ئەو حوکمـە جێگیر بکا، لە تەفسیری ئایەتەکەدا وتوویانە (أنه تعالى يظهر له المحو والإثبات).

هەڵبەتە ئەمە ڕۆچوونە لە گومراییدا، گۆڕینو بە هەڵە تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆزە! چونکە مانای ئایەتەکە بەمجۆرەیە (پەروەردگار ئەو حوکمەی نەسخکردنەوەی باش بێ نەسخی دەکاتەوەو لەشوێنی ئەو حوکمێك دەچەسپێنێ کە بەرژەوەندی بەندەکانی تێدا بێ!!).

دوو زاراوەی (المحو والإثبات) لە زۆر حاڵەتو شووێندا بونیان هەیە، وەکوو مەحوکردنەوەی (سیئات) بە (الحسنات) وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ - هود/١١٤﴾ هەروا مەحوکردنەوەی کوفری تۆبەکارانو تاوانەکانیان بە (تۆبە)و چەسپاندنی ئیمانو طاعەتیان، ئەمەش ئەوەی لێ بەدی نایە بڵێی (ظهور)ی (بعد الخفا)یە بەڵکوو پەروەردگار: کە تاوتوێی ئەم حوکمانە دەکا پێش وەخت زانیاری تەواوی دەربارەیان هەیە.

٣- ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی[1]: ئەم زاتە دەڵێ: بەگوێرەی عەقڵ نەسخ دروستە، بەڵام لەڕوی شەرعەوە مەمنوعە بێتە دی، رایەك هەیە دەڵێ: بە تایبەتی لە قورئاندا نابێ بەڵگەشی ئایەتی ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ - فصلت/٤٢﴾ ئایەتەکە وا مانا دەکا دەڵێ: ئەحکامەکانی قورئان، هەرگیز هەڵناوەشێنەوەو پوچ نابنەوە، هەر ئایەتێکیش بە ڕواڵەت نەسخ بگەیەنێ ئەو حەملی دەکا بۆسەر تەخصیص.

رەددی ئەبو موسلیم دراوەتەوە بەوە مانای ئایەتەکە بەمجۆرەیە (قورئانی پیرۆز کەلامو کتێبێکی لێ پێش نەکەتووە بەتاڵکەرەوە بێ، هەروا کتێبێکیش نایەو نەهاتووە دوا ئەو بەتاڵکەرەوەی بێو نەسخی بکاتەوە).

جەماوەری زانایان پێیان وایە نەسخ لەڕوی عەقڵەوە دروستە، لەڕوی شەرعیشەوە وارید بووەو ڕوی داوە، بە چەند بەڵگەیەك لەوانە:

---

[1] ناوی محمدی کوڕی بەحرە بە ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی بەناوبانگە بە عەقیدە موعتەزیلییەو لە موفەسسیرە گەورەکانی جیهانی ئیسلامییە، گرنگترین کتێبی (جامع التأویل)ە لەبواری تەفسیردا، ساڵی (٣٢٢)ی کۆچی مردووە.

١- گومـان لـەوەدا نیـە کردارەکـانی پـەروەرگار پەیوەسـت نـین بـە ئەعراض‌و مەبەستەوە، بەڵکوو بە ویست‌و ئیرادەی خۆی دەتوانێ فەرمان بـە کردنـی شـتێك بکـا لـە کاتێکـدا حوکمەکـەی بـچەسپێنێ، هـەمان ئـەو شـتەی فەرمانی بە کردنی کردووە لە کـاتێکی تـردا نـەهی لێ بکـاو نەسـخی بکاتـەوە، ئەو خۆی لە هەموو کەس زاناترە بە بەرژەوەندی بەندەکانی.

٢- دەقەکانی قورئان‌و سوننەت ئـەوە دەگەیـەنن کـە نەسـخ دروسـتەو بەواقیعیش ڕویداوە.

أ/ خودا دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ – النحل/١٠١﴾ یـان دەفـەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا – البقرة/١٠٦﴾.

ب/ لـە صـەحیحی بوخـاریدا هـاتووە ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـە بـاوکی بـێ) دەفـەرموێ: ئیمـام عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: «أَقْرَؤُنَا أُبَيٌّ ، وَأَقْضَانَا عَلِيٌّ ، وَإِنَّا لَنَدَعُ مِنْ قَوْلِ أُبَيّ ، وَذَاكَ أَنَّ أُبَيًّا يَقُولُ لاَ أَدَعُ شَيْئًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿مَا نَنْسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نَنْسَأْهَا﴾

## بەشەکانی نەسخ چوار بەشە

## بەشی یەکەم: نەسخی قورئان بە قورئان

ئـەم بەشـە بـەلای ئەوانـەوە کـە دەڵێن: نەسـخ دروسـتەو یەکـدەنگی لەسەرەو کەسیان ناڵێ نابێ، ئەوەتا ئایەتی عیدەگرتن بە ساڵ نەسـخ بۆتـەوە بە ئایەتی عیدەگرتن بەچوارمانگ‌و دە ڕۆژ، وەکـوو لـەوەدوا باسـی دەکـەین‌و نمونەی بۆ تێرینەوە.

## بەشی دووەم: نەسخی قورئان بە سوننەت، ئەمیش دوو جۆری هەیە:

أ/ نەسخی قورئـان بـە حـەدیثـی ئاحـاد، ئەمـەیان جـەماوەری زانایان بەلایانــەوە دروســت نیــە، چــونکە قورئــان (متــواتر)ەو یــەقینو دڵنیــایی دەبەخشێ حەدیثـی ئاحـاد موفیـدی (ظـن)ە، دروسـت نیـە نەسـخی مـەعلومو زانراوو یەقین، بە ظەنن بکرێتەوە.

ب/ نەسخی قورئان بە حەدیثی موتەواتـەر، ئـەم جـۆرە بـەلای ئیمـام مالیـكو ئـەبو حەنیفـەو ئیمـام ئەحمـەد لـە ڕیوایـەتێکیدا دروسـتە، چـونکە هەردووکیان سەرچاوەکەیان وەحیە، خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى - النجم/٣ - ٤﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْـكَ الـذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ - النحل/٤٤﴾ ئاشکراشـە نەسـخ جۆرێکـە لـە بـەیان، بەڵام بەلای شافیعیو عولەمای ظاهیرو ئیمـام ئەحمـەد لـە ڕیوایـەتێکی تـردا ئەم جۆرە نەسخە مەمنوعە چونکە خودا دەفـەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَـةٍ أَوْ نُنسِهَا نَـأْتِ بِخَيْـرٍ مِّنْهَـا أَوْ مِثْلِهَـا - البقـرة/١٠٦﴾ دەی ئاشـکرایە (سـوننە) حەدیث نە لە قورئان باشترە نە هاوتایەتی...!!!

## بەشی سێیەم: نەسخکردنەوەی سوننە بە قورئان

ئەم جۆرەیان جەماوەری زانایان بەلایانەوە دروستە، ئەوەتا ڕوکردنـە قـودس لەنوێـژدا بـە حـەدیث چەسپاوە، لـە قورئانـدا هـیچ ئاماژەیـەکی بـۆ نەکراوە، دەی ئەم حوکمـە چەسـپاوە بـە حـەدیث نەسـخ بۆتـەوە بـە ئایـەتی ﴿فَوَلِّ وَجْهَـكَ شَـطْرَ الْمَـسْجِدِ الْحَـرَامِ - البقـرة/١٤٤﴾ بـەڕۆژوبوونی ڕۆژی عاشـورا بـەواجبی بـە حـەدیث چەسـپاوەو بـە قورئـان نەسـخ بۆتـەوە: کـە دەفەرموێ: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ - البقرة/١٨٥﴾.

ئەم جۆرەیان شافیعی لە یەکێ لە ڕیوایەتەکانیدا مەنعی کردووە، وتوویەتی: (هەرکاتێ نەسخی قورئان بە حەدیث ڕویدا، دەبێ لەگەڵ حەدیثەکە ئایەتی قورئان هەبێ پشتگیری بکا، ئەگەر نەسخی حەدیث بە قورئان بوو دەبێ حەدیثیك هەبێ پاڵپشتی بکا، ئەوە ڕوون بکاتەوە: کە قورئانو سوننەت تەوافوقیان هەیە).

## بەشی چوارەم نەسخکردنەوەی حەدیث بە حەدیث ئەمیش چوار جۆرە:

١- نەسخی حەدیثی موتەواتەر بە حەدیثی موتەواتەر.

٢- نەسخی حەدیثی ئاحاد بە حەدیثی ئاحاد.

٣- نەسخی حەدیثی ئاحاد بە حەدیثی موتەواتەر.

٤- نەسخی حەدیثی موتەواتەر بە حەدیثی ئاحاد.

سێ جۆری یەکەم دروستن، بەلاّم جۆری چوارەم هەمان خیلافو ڕاجیایی دەربارەی نەسخی قورئان بە حەدیثی ئاحاد هەیە لێرەش هەیە، جەماوەری زانایان پێیان وایە دروست نیە.

نەسخکردنەوەی ئیجماعو قیاسو نەسخ پێکردنەوەیان ڕای صەحیحو ڕاست ئەوەیە کە دروست نیە.

## جۆرەکانی نەسخ لە قورئاندا

**نەسخ لە قورئاندا سێ جۆرە:**

**جۆری یەکەم:** نەسخکردنەوەی تیلاوەتو حوکم بە یەکەوە، نمونەکەشی ڕیوایەتی موسلیمو کەسانی تریشە لە خاتو عائیشەوە: کە دەفەرموێ: «كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ. ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ

مِنَ الْقُرْآنِ». [1] كه دەفەرموێ: «وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ» ظاهیرەکەی ئەوە دەگەیەنێ: حوکمەکەیان نەسخ بوبێتەوە تیلاوەتەکەیان مابێتەوە، بەلاّم وانیە چونکە ئەو دەقەی (عَشْرُ رَضَعَاتٍ..........) دەگەیەنێ لە موصحەفی عوسمانیدا بونی نیە، دەگوترێ: مەبەستەکە ئەوەیە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مردنی نزیك بووە ئەو نەصە لە قورئاندا بوو دەخوێندرایەوە.

قسەی راستو وێچوو ئەوەیە تیلاوەتەکەشی نەسخ بۆتەوە بەلاّم ئەم نەسخ بوونەوە بە هەموو کەس نەگەیی تا دوای کۆچی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، هەندێ کەس دەیانخوێندەوە!.

قازی ئەبو بەکر لە کتێبی (الإنتصار)دا دەڵێ: کۆمەڵێك لە زانایان ئینکاری ئەم جۆرە نەسخە دەکەن، چونکە خەبەرەکە ئاحادە، دەی دروست نیە ئێمە حوکم بکەین بە دابەزینی قورئانی لەو جۆرەو نەسخ بوونەوەشی بە خەبەری ئاحادێك کە بەڵگەی قەطعی تێدا نابیندرێ، بەڵکوو (ظنی)یە!.

وەلاّمی ئەمە دراوەتەوە دەڵێن: چەسپانی نەسخ بوونەوەی دەقێك شتێکەو سەلماندنی نازڵبوونی قورئان شتێکی ترە، چەسپاندنی نەسخ بە خەبەری ئاحادەکە موفیدی ظەننە کیفایەتەو پێویستی بە دەلیلی قەطعی نیە، وەلێ نازڵبوونی قورئان پێویستی بە دەلیلی قەطعیو خەبەری موتەواتەرە.

ئەمەی ئێمە باسی لێوە دەکەین چەسپاندنی نەسخە نەك چەسپاندنی قورئان، کەوابێ بۆ چەسپاندنی نەسخ خەبەری ئاحاد کیفایەتە، خۆ ئەگەر بگوترێ: ئەم قیرائەتە بە تەواتور نەچەسپاوە، ئەو ڕاستە.

---

[1] رواه مسلم (٣٥٩٧).

**جۆری دووەم: نەسخ بوونەوەی حوکمو مانەوەی تیلاوەت:**

نموونەی ئەم جۆرە نەسخە، نەسخ بوونەوەی حوکمی ئایەتی (عیدة) بە حەولو مانەوەی تیلاوەتەکەی، ئەم جۆرە نەسخەیە: کە زۆری کتێب تێدا دانراونو دانەرانی کتێب ئایاتی زۆریان کردوونە نموونە، وەلێ لە ڕاستیدا نموونەکان بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی قاضی ئەبە بەکر (إبن العربی).[1] لەم بوارەدا کەمنو ئەو زۆرە نین.

وێدەچێ بگوترێ: حیکمەت لە نەسخکردنەوەی حوکمو مانەوەی تیلاومت چییە؟

بە دوو شێوە وەلاّم دەدرێتەوە، **یەکەمیان** ئەوەیە قورئان چۆن دەخوێندرێتەوە بۆ ئەوەی حوکمەکەی بزاندرێو کاری پێ بکرێ، ئاوایش دەخوێندرێتەوە کە کەلامی خودایە لەسەر خوێندنەوەکەی پاداش وەردەگرێ، خوێندنەوەکەی هێڵدراوەتەوە لەبەر ئەم حیکمەتە.

**دووەمیان** دەگوترێ: ئەغلەب وایە نەسخ بۆ تەخفیفو ئاسانکارییە، تیلاوەتەکەی هێڵدراوەتەوە بۆ بیرخستنەوەو تەذکیر بە نیعمەتی خودا لەوەدا: کە مەشەقەتو نارەحەتی لەسەر کەم کردونەوە.

وەلێ حیکمەتی نەسخکردنەوەی حوکمی ئایەتێك پێش کارپێکردنی وەکوو بەخشینی ماڵ پێش ئەوەی ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بکا، ئەوە پاداش لەسەر ئەوە وەردەگرێتەوە: کە بڕوای پێ هێناوەو نیازی فەرمانبەرداری فەرمانەکەی هەبووە.

**جۆری سێیەم: نەسخی تیلاوەت لەگەڵ مانەوەی حوکمەکەی**

بۆ ئەم جۆرە نموونەی زۆریان هێناوەتەوە یەکێك لەو نموونانە ئایەتی ڕەجمە ﴿الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجعوهما ألبتة نکالا من الله والله

---

[1] ئەم زاتە ناوی (أبو بکر محمد بن عبدالله بن محمد بن عبدالله المعافری)یە یەکێکە لە فوقەهاو عولەما گەورەکانی ئیشبیلیە، ساڵی/٥٤٤ی کۆچی لە دونیا دەرچووە.

عزيز حكيم﴾ هەروا ئەوەی لە صەحیحەیندا هاتووەو لە ئەنەسەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەربارەی چیرۆکی ئەصحابی بیری مەعونە، ئەوانەی لەوێ شەهید کرانو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەیەك لە نوێژدا قنوتی بۆ خوێندنودوعای شەڕی لە بکوژەکانیان کرد، ئەنەس دەڵێ: دەربارەیان ئایەتی قورئان نازڵ بوو دەمانخوێندەوە ﴿أن بلغوا قومنا أنا لقينا ربنا فرضي عنا وأرضانا﴾ دوایی خوێندنەوەکەی نەسخ بۆوە.

هەندی لە زانایان ئەم نەسخەش ڕەتدەکەنەوە، چونکە حەدیثەکە دەربارەی ئاحادە، دروست نیە بڕوا بەوە بکەین بە قەطعی: کە قورئان نازڵ بووەو نەسخیش بۆتەوە سەرچاوەکەشمان خەبەری ئاحاد بێ (إبن الحصار) دەڵێ: لەبواری نەسخدا دەبێ پشت ببەستین بە نەقڵی صەریح لە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) یان لە هاوەڵێکەوە راستەخۆ بڵێ: فلان ئایەت فلان ئایەتی نەسخ کردۆتەوە، ئەمجار دەڵێ: حوکم بەوە دەکرێ لەکاتی بوونی تەعاروض بەشێوەیەکی قەطعی لەگەڵ زانینی مێژووەکەی بۆ ئەوەی بزاندرێ کام لە دەلیلەکان پێشکەوتووەو کامەیان دواکەتووە، لە بواری نەسخدا پشت بە قسەی عەوامەکانی تەفسیر نابەسترێ، بەڵکوو بڕوا بە ئیجتیهادی موجتەهیدەکانیش ناکرێ بەبێ هەبوونی نەقڵی صەریحو موعارەزەیەکی رونو ئاشکرا، چونکە نەسخ لابردنو سڕینەوەی حوکمێكو چەسپاندنی حوکمێکی تره لەشوێنیدا: کە ئەو حوکمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چەسپاوەو کاری پێکراوە، کەوابێ ئەوەی لەم بوارەدا پشتی پێ دەبەسترێ نەقڵو مێژووە نەك رەئیو ئیجتیهاد، ئەمجار دەڵێ: خەڵکی لەم بوارەدا دوو ڕای دژ بە یەكو نەگونجاویان هەیە، هەیە دەڵێ: لەبواری نەسخدا خەبەری ئاحادی عادڵ قبوڵ ناکرێ، هەیشە دەڵێ: قەولی موجتەهید، یان موفەسیرێك بۆ نەسخ

کیفایەتە، لەڕاستیدا هیچ کام لەم دوو رایە حەق‌و صەوابیان نەپێکاوە لە جادەڕێ لایان داوە.[1]

جاری وا هەیە دەگوترێ: ئایەت‌و ئەو حوکمەی لێی وەردەگیرێ (لازم‌و مەلزومی) یەکترن‌و لێك جیانابنەوە، چونکە ئایەتەکە دەلیلی حوکمەکەیە، جا کە ئایەتەکە نەسخ بووەوە حوکمەکەشی لە تەکیا نەسخ دەبێتەوە، ئەگەر وانەبێ خەڵك دەکەوێتە سەر لێتێکچوون‌و لەبسەوە!!

وەڵامی ئەم بۆچوونە دراوەتەوە بەوە: کە دەڵێ ئەو (لازم‌و مەلزومە) سەلمێندراوەو ئەو رەخنە مەقبوولە، بەڵام کاتێك وایە کە (شارع) بەڵگەیەك دانەنێ لەسەر نەسخی تیلاوەت‌و مانەوەی حوکم، جا ئەگەر شاریع بەڵگەی دانا لەسەر نەسخبوونەوەی تیلاوەت‌و مانەوەی حوکمەکەی، ئەوە لازم‌و مەلزومی تێدا نامێنێ‌و ئیلتیباس ڕونادا بەهۆی هەبوونی ئەو دەلیلە شەرعییەی دەلالەت دەکا لەسەر نەسخی تیلاوەت‌و مانەوەی حوکم!

## حیکمەتی نەسخ چەند شتێکن

١- موراعاتی بەژەوەندی بەندەکان

گەشەکردنی تەشریع‌و بەرەو پێشەوەچوونی بۆ پلەی کەمال بەگوێرەی تەطەوری بانگخوازییەکەو پێشکەوتنی حاڵ‌و وەزعی خەڵکەکە.

٣- بە تاقیکردنەوەی موکەلەف‌و دەرخستنی ئەوە ئاخۆ پابەندی حوکمەکەیە، یان سەرپێچی دەکا؟.

٤- دابینکردنی خێرو ئاسانکاری بۆ موسوڵمانان، چونکە نەسخ ئەگەر لە ئاسانەوە بۆ قورس‌و گران بێ ئەوە زێدە پاداش‌و ثەوابی گەورەتر دەستەبەر دەکا، ئەگەر لە گرانەوە بۆ ئاسان بوو ئەوە ئەرکی سەرشانیان سوك‌و ئاسان دەکا.

---

[1] الإتقان ص٤٧٠.

# نەسخ بۆ بەدەل، یان بۆ غەیری بەدەل

جاری وا هەیە حوکمێك نەسخ دەکرێتەوە حوکمێکی تری دەخرێتە شوێن، ئەمە پێی دەگوترێ نەسخ بۆ بەدەل، ئەمجار ئەو حوکمەی دێتە شوێنی حوکمە لابراوەکە، یان سوکترە، یان هاوتاو هاوشێوەیە، یان قورسترە.

١- نمونەی نەسخ بۆ غەیری بەدەل واتە حوکمەکە نەسخ بکرێتەوەو هیچ حوکمێکی تری نەخرێتە شوێن، وەکوو نەسخی صەدەقە پێش ئەوەی (نەجوا) قسەی بە ئەسپایی مەیلەو سرتە لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکرێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ذَلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – المجادلة/١٢﴾ ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿أَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ – المجادلة/١٣﴾ هەندێ لە موعتەزیلەو ظاهیریەکان، ئەم جۆرەی نەسخیان ڕەتکردۆتەوەو وتوویانە نەسخی ئاوا شەرعەن دروست نیە، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – البقرة/١٠٦﴾ ئەوەتا ئەم ئایەتە بە ڕوونی ئەوە دەگەیەنێ: کە ئایەتێك نەسخ کرایەوە، حوکمەکەی هەڵگیرایەوە، دەبێ حوکمێکی تر بهێندرێ بخرێتە شوێنی حوکمە نەسخ کراوەکە، جا حوکمە تازەکە، یان لە حوکمە لابراوەکە باشترە، یان وەکوو ئەو وایە!!

وەڵامی ئەمە دراوەتەوە بەوە: کە پەروەردگار ئەگەر حوکمی ئایەتێکی بەبێ هێنانی بەدەل بۆ شوێنی، هەڵگرت ئەمە بێگومان بەگوێرەی داخوازی حیکمەتی خۆیەتی.

بەرژەوەندی بەندەکانی بەرچاوگرتووە، ئاشکراشە نەهێنانی حوکم باشترەو سودی زیاترە لە هەبوونی حوکمە نەسخکراوەکە بۆ ئادەمیزاد،

کەوابێ صەحیحو ڕەوایە بگوترێ: پەروەردگار نەسخی حوکمی ئایەتی پێشووی کردۆتەوە بەشتێك کە حوکمەکەی پێشوو باشترە، چونکە ئاشکرایە لابردنی حوکم سودی بۆ بەندەکان پترە لەوەی حوکمێکی تر بێنی بیخاتە شوێنی.

٢- نەسخ بۆ بەدەلێك لە حوکمەکەی پێشوو سوکتر بێ، نمونەی ئەم جۆرە نەسخە ئایەتی ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ – البقرة/١٨٧﴾ ئەم ئایەتە نەسخی حوکمی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – البقرة/١٨٣﴾ کردۆتەوە چونکە دەلالەتو مەفهومی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ هەمان حوکمی لەسەر گەلە پێشینەکان چەسپاوە (لە یاساغبوونی خواردنو خواردنەوەو سەرجێی ئافرەت لەدوای نوێژی خەوتنان، یان دوای خەولێکەوتن تا شەوی دوای) لەسەر موسوڵمانەکانیش بووبێ، وەکوو ئاماژەی پێکراوە، ئەوەتا ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – البقرة/١٨٣﴾ نازڵ بوو، لەسەر موسوڵمانان پێویست بوو ئەگەر یەکێکیان نوێژی عیشای بکردایە، یان خەوی لێ بکەوتایە، ئیتر تا شەوی داهاتوو خواردنو خواردنەوەو چوونە لای ئافرەتی لێ یاساغ دەبوو، لەم جۆرە ڕیوایەتە ئەحمەدو حاکم[1] و هی تریش

---

[1] أحمد (٢٢١٢٤) والحاكم (٣٠٨٥).

ڕیوایەتیان هێناون، ئەوەشی تێدا هاتووە ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ - البقرة/١٨٧﴾ی نازڵ کرد.

٣- نەسخ بۆ بەدەلێك هاوتا بێ (مماثل) بێ، وەكوو نەسخبوونەوەی ڕوكردنە بەیتولەقدیس بە ڕووكردنە كەعبە، كە دەفەرموێ: ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ - البقرة/١٤٤﴾.

٤- نەسخ بۆ بەدەلێك قورس تر بێ، واتە حوكمێك نەسخ بكرێتەووە حوكمێكی تری بخرێتە شوێن، حوكمە تازەكە لەهی پێشەوە گرانتر بێ وەكوو نەسخكردنەوەی بەندكردنی ئافرەت لە ماڵدا وەكوو ئایەتی ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً - النساء/١٥﴾ حوكمی ئەم ئایەتە بە جەڵدە لێدان وەكوو دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ - النور/٢﴾ یان ڕەجم وەكوو ﴿الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البيتة﴾.[1]

---

[1] وەكوو لەوەپێش ئاماژەی بۆ كرا، ئەم دەقە لە قورئاندا بووەو خوێندراوەتەوە، پێش وەفاتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تیلاوەتی نەسخ بۆتەوە، هەڵبەتە بڕێك

## شێوه نه‌سخ (شبه النسخ)

نموونـه‌ی ناسـیخو مه‌نـسوخ زۆرو زه‌به‌نـدن، وه‌لێ زانایـان ده‌رباره‌یـان یه‌كده‌نگ نین

١- هه‌یانه زۆر ئایه‌تو حه‌دیث ده‌كاته ناسیخو مه‌نسوخ.

٢- هه‌یانـه خـۆ ده‌گرێتـه‌وه‌و مه‌جاله‌كـه به‌رته‌سـك ده‌كاتـه‌وه، هـه‌ر حوكمێك نه‌قلی صه‌ریحو صه‌حیحی له‌سه‌ر نه‌بێ كه نه‌سخی تێدایه، نه‌سخی بۆ به ڕه‌وا دانانێن، ئه‌م راجیایی‌و ئیشتیباهو راجیایی‌یه ئه‌ومیه:

أ/ هه‌ندێك ته‌خصیص به نه‌سخ داده‌نێن.

ب/ هه‌ندێك به‌یان به نه‌سخ حیساب ده‌كه‌ن.

ج/ هه‌نـدێك مه‌جاله‌كـه‌یان فـراوان كـردووه، هـه‌ر حوكمێـك له‌بـه‌ر هۆكارێك هاتبێ‌و هۆكاره‌كه نـه‌مابێ بـه مه‌نـسوخیان دانـاوه، وه‌كـوو هـه‌ڵنان له‌سـه‌ر صـه‌برو خـۆگری‌و خـۆگرتن له‌به‌رامبـه‌ر ئه‌زیه‌تـدانی كافره‌كانـدا له‌ســه‌ره‌تای بانگـه‌وازی ئیـسلامی، سـه‌رده‌می بـێ هێـزی‌و كـه‌می‌و لاوازی موسـوڵمانان، وتوویانـه ئـه‌م حوكمانـه بـه ئایـه‌تی قیتـال نه‌سـخبوونه‌وه، لـه حه‌قیقه‌تو راستی‌دا حوكمی یه‌كه‌م: كـه (صـه‌برو ته‌حه‌مولـه) هـه‌موو كـاتی زه‌عیفی‌و بێ ده‌سه‌ڵاتی واجبـه‌و نه‌سـخ نابێتـه‌وه، هـه‌ركاتێكیش هێـزو توانـا په‌یـدا بـوو دیفـاعو جیهـاد لـه‌پێناو عه‌قیـده واجبـه‌و ئـه‌ركی سه‌رشـانه، ئه‌مه‌شیان حوكمی دووه‌مه.

---

له زانایان لەم جۆره نەسخەدا ئیعتیزاریان گرتووەو بەلگەیان ئایـەتی ﴿شَـهْرُ رَمَـضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَـاتٍ مِّـنَ الْهُـدَى وَالْفُرْقَـانِ فَمَـن شَـهِدَ مِـنكُمُ الـشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُـسْرَ وَلاَ يُرِيـدُ بِكُـمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَـا هَـدَاكُمْ وَلَعَلَّكُـمْ تَـشْكُرُونَ - البقـرة/١٨٥﴾ هەروا ئایەتی ﴿يُرِيدُ اللّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا - النساء/٢٨﴾.

د/ هەر حوكمێكی سەردەمی پێش ئیسلام پوچ كرابێتەوە شەریعەتەكانی گەلە پێشینەكان كە ئیسلام هەڵیوەشاندبنەوە، ئیعتیباریان كردووە بە نەسخ وەكوو سنووردارکردنی فرە ژنی بە چوار ژن، تەشریعکردنی خوێنو تۆڵە.

لە شەریعەتی بەنو ئیسرائیلیەكاندا تەنها قیصاص هەبوو بۆ بكوژ، خوێن نەبوو، ئیمامی بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لە باوكی بێ) ڕیوایەتی كردووە هەڵبەتە ئەمە بە نەسخ دانانرێ، بەڵكوو هەڵگرتنی بەرائەی ئەصڵییە.

## نموونەكانی نەسخ

شێخی سیوطی لە (الإتقان)دا بیستو یەك ئایەتی دەست نیشان كردوون: كە بە نەسخ دەژمێردرێن هەندێك لەو ئایەتانە باس دەكەینو تەعلیقیان لەسەر دەدەین:

١- ئایەتی ﴿وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ – البقرة/١١٥﴾ نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ – البقرة/١٤٤﴾ گوتراویشە – هەر ئەمەش ڕاستە – ئایەتی یەكەم نەسخ كراوەتەوە، بەڵكوو دەربارەی (نوێژی سوننەت لە سەفەردا لەسەر راحیلە) نازڵ بووە، هەروا لە حاڵەتی ترسو هێرشو كشانەوە لەناو شەڕو هەرادا، كەوابێ حوكمەكەی باقییەو نەسخ نەبۆتەوە، ئایەتی دووەم ناسیخە بۆ ئەو حوكمەی لەسەرەتای ئیسلامدا موسوڵمانان پابەندی بوون: كە بریتی بوو لە ڕووكردنە بەیتولەقدیس لە نوێژە فەرزەكاندا وەكوو لە سوننەتی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ)

چەسپاوە، ئەو حوكمە بە ئایەتی ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ – البقرة/١٤٤﴾ نەسخ بۆوە.

٢- ئایەتی ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ – البقرة/١٨٠﴾ دەگوترێ: ئەم ئایەتە بە ئایەتی ﴿المواريث﴾ نەسخ كراوەتەوە، رایەكیش هەیە دەڵێ: بە حەدیثی «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِى حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ».[1] نەسخ بۆتەوە.

٣- ئایەتی ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – البقرة/١٨٤﴾ نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – البقرة/١٨٥﴾ ئاماژە بەو زانیارییەی لە صەحیحەیندا هاتووە: كە لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەع دەگێڕێتەوە دەڵێ: كاتێك ئایەتی ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – البقرة/١٨٤﴾ نازڵ بوو كەسێك

[1] أخرجه أبو داود/٢٨٧٠ والترمذي/٢٢٥٣ وابن ماجه/٢٧١٣.

بیویستایە ڕۆژووی دەشکاندو فیدیەی دەدا، هەتا ئەو ئایەتەی دواوە نازڵ بوو نەسخی کردەوە.[1]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی و لە باوکی بێ) رای وایە ئایەتەکە موحکەمەو نەسخی بەسەردا نەهاتووە، ئیمامی بوخاری لە (عطاء)ەوە ڕیوایەتی کردووە کە لە ئیبنو عەبباسی بیستووە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ - البقرة/١٨٤﴾ دەڵێ: ئیبنو عەبباس دەیگوت: ئەم ئایەتە نەسخ نەبۆتەوە، بەڵکوو ئەوە حوکمەی بۆ پیرەمێردو پیرەژنە، کە ناتوانن بەڕۆژوو بن، ئەوان لەجیاتی هەر ڕۆژێك کە بەڕۆژوو نابن نانی هەژارێك دەدەن.[2]

کەوابێ مانای (يُطِيقُونَهُ) (يستطعونة) نیە بەڵکوو مانای ئەوەیە زۆر بە نارەحەتی و مەشەقەت ڕۆژوویان بۆ دەگیرێ، هەندێ پێیان وایە لەپێش فیعلە موضاریعەکەوە پیتی (لام) نافییە مەزەندە کراوە، واتە ئاوا تەقدیر دەکرێ: ﴿وعلى الذين لايطيقونه............﴾.

٤- ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ - البقرة/٢١٧﴾ ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ

---

[1] رواه البخاري/٤٥٠٧ ومسلم/٢٦٨٥.

[2] بوخاری/٤٥٠٥.

خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ – التوبة/٣٦﴾ دەگوترێ: ئەم ئایەتەش نەسخی تێدا نیە چونکە عومومی ئەمرەکە بە شەڕکردن وا ئاراستە دەکرێ لە خاریجی مانگەکانی شەڕ تێدا حەرام کراو بێ.

٥- ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – البقرة/٢٤٠﴾ نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ – البقـرة/٢٣٤﴾ دەگوترێ: ئایەتی یەکەم موحکەمەو نەسخ نەبۆتەوە، چونکە لەڕوی وەصیەتکردنەوە بۆ ئافرەت بە مەرجێ لە ماڵەکەدا بمێنێتەوەو نەگوێزرێتەوەو شونەکاتەوە، ئایەتی دووەم بۆ دیاریکردنو رونکردنەوەی عیدەیەو مونافاتیان لەنێواندا نیە.

٦- ئایەتی ﴿لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – البقرة/٢٨٤﴾ نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ – البقرة/٢٨٦﴾.

٧- ئایەتی ﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُواْ الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا – النساء/٨﴾ ئەم ئایەتە بە ئایەتی

(المواريث) نەسخ بۆتەوە رایەك هەیە، – راستیشە – دەڵێ: ئایەتەكە نەسخ نەبۆتەوەو حوكمەكەی باقییە بەشێوەی نەدب.

٨- ئایەتی ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً ، وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا – النساء/١٥ – ١٦﴾ ئەم دوو ئایەتە نەسخ بوونەوە بە ئایەتی ﴿الجلد﴾ دەربارەی كچی شوونەكردوو كوڕ كە ژنی نەهێنابێ، لە سورەتی (النور)دا كە دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ – النور/٢﴾ هەروەها بە حوكمی جەلد بۆ كچو كوڕو بە رەجم بۆ موحصەن (پیاو بێ، یان ئافرەت) كە بە حەدیثی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چەسپاوە «خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ».[1]

٩- ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ يَغْلِبُواْ أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَفْقَهُونَ – الأنفال/٦٥﴾ بە ئایەتی ﴿الآنَ خَفَّفَ اللّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُواْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ – الأنفال/٦٦﴾ نەسخ بۆتەوە.

١٠- ئایەتی ﴿انْفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – التوبة/٤١﴾ بە ئایەتی ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ

---

[1] رواه مسلم/٤٤١٤ من حديث عبادة بن الصامت.

لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – التوبة/٩١﴾ نەسخ بۆتەوە، هەروەها بە ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ – التوبة/١٢٢﴾ رایەك هەیە دەڵێ: ئەمە دەچێتە بواری تەخصیصەوە نەك نەسخ.

## (١٥) ڕەهاو سنووردار (المطلق والمقید)

بڕێ ئەحكامی تەشریعی وا دەبێ بە ڕەهایی لە تاكێكی دیاری نەكراودا ئاراستە دەكرێو بەهیچ صیفەتو مەرجێك سنوردار ناكرێ، جاری وایش دەبێ بۆ تاكێك ئاراستە دەكرێ بەڵام ئەو تاكە دەبێ مەرجو صیفەتی دیاریكراوی تێدا بن، جا ئاراستەكردنی وشەو (لفظ)ێك جارێك بە ڕەهایی‌و جارێك بە مەرجو هەبوونی صیفەتێك تێیدا، جۆرێكە لە تایبەتمەندی زمانی عەرەبی‌و لە قورئانی پیرۆزدا زۆرو زەبەندەیەو پێیان دەگوترێ: (مطلق القرآن ومقیده).

## پێناسەی موطلەق‌و موقەیەد (تعریف المطلق والمقید)

موطلەق ئەوەیە دەلالەت بكا لەسەر حەقیقەتو ماهیەتی شت بە ڕەهایی‌و بێ قەید، ئەم جۆرە وشەیە تاكێك لە ڕەگەزو جۆرەكە دەگەیەنێ بەڵام بە دیاریكراوی نا، زۆربەی شوێنی ئەم جۆرە ئیسمی نەكیرەیە لە سیاقی ئیثباتدا، بۆ نموونە وشەی (رقبة) لە ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾دا شموولی ئازادكردنی كۆیلەیەكی نادیاری كراو دەكا لەجۆری كۆیلە، كافر بێ، یان موسوڵمان بێ، چونكە وشەی (رقبة) نەكیرەیەو لە ڕستەی ئیثباتدا هاتووە.

هەروا نموونەیەكی تر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيّ» رواه الأربعة وأحمد– دەی لێرەدا وشەی (ولی)

ڕەهایە هەموو (وەلی)یەك دەگرێتەوە، ڕەسیدو عاقڵ بێ، یان گێلو کەودەن بێ، بۆیە زانایانی ئوصول پێناسەی موطلەقیان بەوە کردووە نەکیرەیەکە لە سیاقی ئیثباتدا.

کە دەگوترێ: (نکرة) بۆ ئەوەیە هەرچی مەعاریفە نەیەتە ژێر تەعریفەکە، هەروا ئەو ئیسمەی دەلالەت دەکا لەسەر یەك مەدلول، کە دەگوترێ: (فی سیاق الإثبات) بۆ وەلانانی نەکیرەیە لە سیاقی نەفیدا، چونکە ئەم هەرچی هاوڕەگەزی خۆی بێ دەیگرێتەوە.

المقید: بە ئیسمێك دەگوترێ دەلالەت بکا لەسەر حەقیقەتو ماهیەتی شت بەڵام بە ڕەهاریی نا بەڵکوو بە قەیدەوە جا قەیدەکە مەرج بێ، صیفەت بێ....هتد، وەکوو وشەی (رَقَبَة) کە قەیدار کراوە بە ئیمانەوە دەفەرموێ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ – النساء/٩٢﴾ ئەوەتا بەهۆی وشەی (مُّؤْمِنَةٍ)وە (رَقَبَةٍ) بە ڕەهایی نەماوتەوەو بووتە (مقید).

## جۆرەکانی موطلەقو موقەییەدو حوکمی هەریەکێ لەوان

موطلەقو موقەییەد (ڕەهاو سنووردار) عەقڵ زۆر جۆریان بۆ وێنا دەکا، وەلێ ئێمە صورەتە واقیعییەکانیان دەخەینەڕوو.

١- سەبەبو حوکمەکەیان یەك بێ، وەکوو وشەی (صیام) لەبواری کەفارەتی سوێنددا، ئەوەتا لە قیرائەتی موتەواتەردا لە موصحەفی عوسمانیدا بە ڕەهایی هاتووە دەفەرموێ: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – المائدة/٨٩﴾ هەر هەمان وشەی (صیام) لە قیرائەتی ئیبنو مەسعوددا بە موقەییەدی هاتووە، دەفەرموێ: ﴿فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ متتابعات﴾ لێرەدا حەملی

موطلەق دەكرێ بۆسەر موقەییەد، چونكە یەك سەبەب دوو شتی دژ بەیەكی لێ وەدی نایە، بۆیە هەندێ لە فوقەها (ئەبو حەنیفە، الثوری، شافیعیش لە قەولێكیدا) وتوویانە ڕۆژووی كەفارەت دەبێ بەشوێن یەكدا بگیرێن‌و ناوانیان نەكەوێ، بەڵام ئەو فوقەهایانەی پێیان وایە قیرائەتی غەیرە موتەواتەر – هەرچەندە مەشهوریش بێ – نابێتە بەڵگە، كەوابوو لێرەدا موقەییەدێك نیە تا موطەلەقی بۆسەر حەمل بكرێ.

٢- سەبەب یەك بێ‌و حوكم جودا بێ، وەكوو وشەی (الأیدی) لەبواری دەستنوێژو تەیەممومدا، ئەوەتا شتنی دەست لە دەستنوێژدا موقەییەدە بەوە دەبێ (إلى المرافق) بێ، دەبێ ئانیشكیشی لەگەڵدا بشۆرێ، دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ – المائدة/٦﴾.

كەچی لە بواری تەیەممومدا بە ڕەهایی هاتووە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ – المائدة/٦﴾ لێرەدا دەگوترێ: موطلەق حەمل ناكرێ بۆسەر موقەییەد لەبەر ئەوەی حوكمەكەیان جوداوازە.

ئیمامی غەزالی لە زۆربەی فوقەهای شافیعیەوە ئەوەی نەقڵ كردووە كە لێرەدا حەملی موطلەق بۆسەر موقەییەد دەكرێ، چونكە سەبەبەكە یەكە، هەرچەندە حوكمەكە جوداوازە.

٣- سەبەب جوداواز بێ حوكم یەك بێ، ئەمەش دوو جۆرە

أ/ قەیدەكە یەك بێ، وەكوو قەیداركردنی وشەی (رقبة) لە كەفارەتدا، ئەم رایە رەتكراوەتەوە بەوە: كە بە مەرجگرتنی ئیمان بۆ رەقەبە قەیداركردنی بەوەی رەقەبە ئیماندار بێ، ئەوە تایبەتە بە كەفارەتی كوشتنی بە هەڵە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَن يَصَّدَّقُواْ فَإِن كَانَ

مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةً فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللّهِ وَكَانَ اللّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا - النساء/٩٢﴾.

وەلێ لە کەفارەتی (ظیهار)دا وشەی (رقبة) بە ڕەهایی هاتووە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ - المجادلة/٣﴾ لە کەفارەتی سوێندیشدا هەر بە ڕەهایی هێندراوە دەفەرموێ: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ - المائدة/٨٩﴾.

کۆمەڵێك لە شەرعزانان (مالیکیەکانو شافیعیەکان) حەملی موطلەق دەکەن بۆسەر موقەییەد بەبێ هەبوونی بەڵگەش، ئەوان پێیان وایە کۆیلەی کافر (رقبة کافرة) دروست نیەو بە کەڵکی ئەوە نایە بۆ کەفارەتی (ظیهارو سوێند) بەکاربهێندرێ، بەلای حەنەفییەکانەوە بەبێ هەبوونی بەڵگە حەملی موطلەق ناکرێ بۆسەر موقەییەد، کەوابوو دروستە ئازادکردنی کۆیلەی کافر بکرێتە کەفارەتی ظیهارو سوێندیش.

بەڵگەی مالیکیو شافیعییەکان ئەوەیە دەڵێن: کەلامی خودا لە زاتی خۆیدا یەکێکەو تەعەددودی تێدا نیە، ئەگەر لە کەفارەتی کوشتندا بە دەق قەیدی ئیمانی خستە پاڵ ڕەقەبەو فەرمووی: (رقبة مؤمنة) ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە لە کەفارەتی ظیهارو سوێندیشدا دەبێ ڕەقەبەکە ئەو صیفەتەی هەبێ هەر بۆیەشە وشەی (الذاکرات) لە سورەتی (الأحزاب)دا حەمل کراوە بۆسەر سەرەتای ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا - الأحزاب/٣٥﴾ بەبێ ئەوەی دەلیکێکی دەرەکی هەبێ، واتە ﴿والذاكرات الله

كـثيرا﴾ عـەرەبیش لـە سروشـتی زمانەکەیانـدا وایـان پـێ خۆشـە ئاخاوتنیـان بەشـێوەی کـورتبڕی بـێو بـە ڕەهـایی ئاراسـتە بکـرێو ئیکتیفـا بـە هـەبوونی قەید بکرێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَـانِ عَـنِ الْـيَمِينِ وَعَـنِ الـشِّمَالِ قَعِيدٌ – ق/١٧﴾ ئەوەتا بەهۆی هەبوونی قەیدی (قعیـد) لـەپاڵ (الـشمال)ەوە لە پاڵ (الیمین)دا تەرکی کردووە.

بەڵگـەی هـاوەڵانی ئـەبو حەنیفـە ئەوەیـە دەڵـێن: حـەمل کردنـی (والـذاکرات) بۆسـەر ﴿وَالـذَّاكِرِينَ اللَّـهَ كَـثِيرًا﴾ بـە بەڵگەوەیـە، بەڵگەکـەش ئەوەیە: کە (والذاکرات) عەطف کراوەتەوە بۆ سەر ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾و بۆخۆی سەربەخۆ نیەو پێویستە حوکمی (مەعطوف وعلیە) خـۆی بـدەینێو بیکەینە هاوبەش لە حوکمدا.

جا ئەگەر قەیدارکردنی دەقێك بـەبێ هـەبوونی دەلیـل مـەمنوع بـوو نەدەگونجا، پێویستە دەلیل هەبێ، دەی خۆ لـە قورئـانو سوننەتیـشدا دەقێـك نیە دەلالەت بکا لەسەر قەیدارکردن، ئەگەر بشگوترێ قیاسی موطلەق دەکـەم بـۆ سـەر (مقیـد) ئەمـە لێـوەی لازم دێ حـوکمی موطلـەقەکە هـەڵبگیرێ، بـۆ ئـەوەی هەرچـۆنێكو بەهەرشـتێك بـێ کـابرا کەفارەتەکـەی لەسـەر لابـچێو ئەسـتۆپاکی بـۆ دەسـتەبەر ببـێ، دەی ئەمـەش دەبێتـە نەسـخو سـڕینەوە، نەسخی دەقی شەرعیش بە قیاس دەستەبەر نابێو ناگونجێو نادروستە.

خاوەنـانی رای یەکـەم کـە مـالیکیو شـافیعیـیـەکـانن دەڵـێن: ئێمـە نایـسەلمێنین: کـە قیاسـی (مطلق) بـۆ سـەر (مقیـد) دەبێتـە نەسخکردنەوەی حوکمی (مطلق)ەکە، بەڵکوو قەیدارکردنیـەتی بـە بـڕێ لـە (مـسمیات)ی ئـەو دەقە، کـەوابوو قەیـدارکردنی (رقبـة) بـەوەی دەبـێ موسـوڵمان بـێ هـەبوونی ئیمـان لـە کۆیلەکـەدا مەرجـە بـۆ ئـەوەی کـابرا کەفارەتەکـەی لەسـەر لابـچێ، هەروەکوو چۆن مەرجە ئـەو کۆیلـەی دەکـرێ بـە کـەفارەت عەیبـدار نـەبێو

سەلامەت بێ، دەی خۆ ئەم مەرجە نە لە قورئاندا ئاماژەی پێ کراوە نە لە حەدیثدا.

ب/ ئەوەیە قەیدەکە جوداواز بێ، وەکوو کەفارەت بەڕۆژوو، لە کەفارەتی قەتلدا ڕۆژووەکە قەیدارە بەوەی دەبێ بەشوێن یەکدا بن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَن يَصَّدَّقُواْ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مْؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةً فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللّهِ وَكَانَ اللّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا – النساء/٩٢﴾ لە کەفارەتی ظیهاردا دەفەرموێ: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ – المجادلة/٤﴾ کەچی لە کەفارەتی تەمەتتوع لە حەجدا بەڕۆژوو، ڕۆژووەکەی قەیدارکردووە بەوەی بەشوێن یەکدا نەبن، دەفەرموێ: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ – البقرة/١٩٦﴾ پاشان لە حوکمێکی تردا ڕۆژوو بە ڕەهایی هاتووە، نە قەیدی تەتابوعو بەشوێن یەکدا هاتنی هەیە، نە تەفریقو جوداوازی، ئەوەتا لە کەفارەتی سوێندا دەفەرموێ: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ – المائدة/٨٩﴾.

لە قەزاکردنەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزاندا دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ – البقرة/١٨٤﴾ لێرەدا موطلەق حەمل ناکرێ بۆسەر موقەییەد، چونکە قەیدەکە جوداوازە، حەملی موطلەق بۆسەر قەیدارکراوێك تەرجیحی بێ مورەجیحە!!

٤- ئەوەیە سەبەب جوداواز بێو حوکمیش جوداواز بێ، وەکوو وشەی دەست لە دەستنوێژو لە دزیدا، لە دەستنوێژدا قەیداکراوە بەوەی تا ئەنیشك بشۆردرێ، بەڵام لە دزی کردندا بەبێ قەید هاتووە دەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ

وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا - المائدة/٣٨﴾ لێرەدا موطلەق حەمل ناكرێ بۆسەر موقەیید چونكە جوداوازی هەیە لەنێوان سەبەبو حوكمدا، لە ئەمەشا هیچ جۆرە تەعاروضو دژایەتیەك نیە.

زەركەشی لە كتێبی (البرهان)دا دەڵێ: ئەگەر بەڵگە لەسەر قەیداركردنی (مطلق) دەست كەوت پەنای بۆ دەبەینو كاری پێ دەكەین، ئەگینا، موطلەق بەشێوەی رەهایی خۆی دەمێنێتەوەو (مقید) بە حاڵی خۆی دەمێنێتەوە، چونكە پەروەردگار بە زوبانی عەرەبی ئاخاوتنی لەگەڵ ئێمە كردووە، قاعیدەش وایە پەروەردگار ئەگەر لە شتێكدا حوكمی كرد صیفەتێك، یان مەرجێكی پێوە نا، پاشان حوكمێكی تری هێنا بە رەهایی، تێدەفكرین ئەگەر ئەو حوكمە رەهایە جگە لەو حوكمە قەیداركراوە هیچ بنەمایەكی تری نەبوون، ئەوە پێویستە حوكمە رەهایەكە موقەییەد بكەین بەوەوە، خۆئەگەر حوكمە رەهایەكە بۆخۆی بنەمایەكی هەبوو جگە لە موقەییەدەكە ئەوە گێڕانەوەی بۆلای یەكێكیان تەرجیحی بێ مورەجیحەو ئەویان لەمیان لە پێشتر نیە.

## (١٦) المنطوق والمفهوم

مەنطوق: ئەو وشەیەیە: كە دەلالەتكردنی لەسەر مانا لەخودی لەفظەكەو ئەو حەرفانەی لێیان پێك هاتووە، دەستەبەر ببێ، واتە خودی لەفظەكە مەعناكە بگەیەنێ، سێ زاراوەی تریش كە بە عەرەبی پێیان دەگوترێ: (النص، الظاهر، المؤول) دەچنە ژێر كەمپی (المنطوق) لەم بەشە حیساب دەكرێ، كەوابێ:

النص: زاراوەیەكە بەخودی خۆی مانایەكی صەریح دەگەیەنێو ئیحتیمالی مانای تری نیە، وەكوو لە ئایەتی ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ - البقرة/١٩٦﴾ وشەی (كاملة)

صیفەتی (عـشرة)یـە، دەی وصـفدارکردنی (عـشرة) بـە (کاملـة) ڕێگـەی ئەوەمان لێ دەگرێ بڵێین: ئیحتیمالی ئەوە هەیە مەبەست بە وشـەی (عـشرة) بەشێوەی مەجاز کەمتر لە (دە) بگەیەنێ، مەبەستیش لە (النص) ئەوەیە: کە قەطعی ئیحتیمالو مەجاز بکا.

بێگومان لە هەندێ لـە زانایانـەوە نـەقڵ کـراوە وتوویانـە (الـنص) لـە قورئـانو سـوننەتدا زۆر کەمـەو نـادرە، لـە بەرامبـەردا ئیمـام (الحـرمین) زێدەڕەوی کـردووە لـە ڕەتدانەوەیانـداو فەرمووویـەتی: مەبەسـت لـە (نـەص) ئەوەیە سەربەخۆ مەعنا بگەیەنێو تەئویلو ئیحتیمـال نـەهێڵێ، ئـەم جۆرە هەرچەندە بەشێوەی وەضعی صیغەو گێڕانـەوەی بـۆ لوغـە کـەمو نـادر بـێ بەڵام لەگەڵ قەرینەی حاڵو مەقاڵدا زۆرو زەبەندەیە.

الظـاهر: ئەوەیـە لـەکاتی ئاراسـتەکردنیدا بـە ڕەهـایی مەعنایـەك بگەیـەنێ بەشـێوەی ڕاجیحو پەسـەند وێـڕای ئـەوەی ئیحتیمـالی مەعنایـەکی مەرجوحیشی هەبێ، کـەوابێ ئـەمیش وەکوو (نـەص) وایـە لـەوەدا دەلالـەتی لەسەر مانا لەڕێگەی خودی لەفظەکەوەیە بەڵام لەوەدا جوداوازن: کە (نەص) مەعنایەك دەگەیـەنێو ئیحتیمـالی مـەعنای تـر ناهێڵێ (الظاهر) مەعنایـەك دەگەیـەنێو ئیحتیمـالی مەعنایـەکی تریـشی هەیـە: کـە مەرجوحـە، وەکـوو ئایەتی ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ - البقرة/١٧٣﴾ لێرەدا وشەی (بـاغ) بـە مانـا (جاهـل) دێو بـە مانـا (ظـالم)یـش دێ، وەڵێ دابڕینـی بەسـەر (ظـالم)دا وێـچوترو ئاشـکراترە، کـەوابێ دەلالـەتکردنی لەسـەر (جاهـل) مەرجوحـەو لەسەر (ظالم) ڕاجیحە.

یـان ئایـەتی ﴿وَلاَ تَقْرَبُـوهُنَّ حَتَّـىَ يَطْهُـرْنَ - البقـرة/٢٢٢﴾ خـوێن وەسـتانی ئـافرەتی بێنوێـژ پێـی دەگـوترێ: (طهـر) دەسـتنوێژگرتنو غوسـڵ کـردنیش پێیـان دەگوترێ: (طهـر) دەی دەلالـەتکردنی وشـەی (طهـر) لەسـەر مانـای دووەم ئاشـکراترو وێـچوترە کـەوابێ دەلالـەتی (طهـر) لەسـەر غوسـڵ

کردن ظاهیرترەو دەلالەتکردنەکەی راجیحەو دەلالـەتی لەسـەر مانـای یەکـەم مەرجوحە.

المـؤول: ئـەم وشـەیە دوو مانـای هـەن یـەکیان راجـیحو ئـەویتریان مـەرجوح، وەلیٚ لـە مانـا مەرجوحەکـەدا بەکاردەهێنـدریٚ چـونکە بەلگەیـەك هەیە ناهێلیٚ لـە مانـای راجیحیـدا بەکاربێنـدریٚ ئـەم پێچەوانەی (الظاهر)ە چونکە وەکوو زانیمان ئەم لە مانای راجیحدا بەکاردەهێنـدریٚ، چونکە هـیچ بەلگەیـەك نیـە وامـان لیٚ بکـا حـەملی بکـەین بـۆ سـەر مانـای مـەرجوح، هەرچەندە لە مەحەلی (نطق)دا وشەکە دەلالەت لەسەر هەردوو ماناکان دەکا، وەکوو ئایـەتی ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ – الإسـراء/٢٤﴾ ئێستا لێرەدا لەفظی ﴿جَنَاحَ الذُّلِّ﴾ حەمل دەکریٚ بۆ سەر مانای گوێڕادێری سۆزو شـەفەقەتو هەلسوکـەوتی جـوان لەگـەلٚ بـاوكو دایکـدا، هەرچـەندە ئەمـە مانای مەرجوحی لەفظەکەیـە، چـونکە محالـە مـرۆڤ پـەروبالی هـەبن وەکـوو مریشكو شتی وا خۆشەویستی خۆی بخاتە ژێری.

## دلالة الإقتضاء و دلالة الإشارة

وا دەبـیٚ دروسـتی دەلالـەتکردنی لـەفـظ لەسـەر مانـا پێویـستی بـە هەبوونو مەزەندەکردنی وشـەیەكو زیـاتر هەیـە، بـەبیٚ تەقـدیرکردنی ئـەو لـەفظـە مانـا نایـە، بەمـە دەگـوتریٚ: (دلالـة الإقتـضاء) وادەبـیٚ دروسـتی دەلالەتکردنی لەفظ لەسەر مانا پێویستی بە مەزەندەکردنی لەفظی تـر نیـە، بەلکوو لەفظەکە بۆخۆی دەلالەت دەکا لەسەر مانایەك کەلـە ئـەوەل وەهلـەدا بەرچاو نەگیریٚ، بەلاّم لازمی بیٚو لـە دووەم مەرحەلـەدا بیگەیـەنیٚ، ئەمـەش پێی دەگوتریٚ: (دلالة الإشارة).

نمونەی یەکەمیان وەکوو ئایەتی ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَـفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ – البقرة/١٨٤﴾ ئێستا کـە ئێمـە لـە دەقەکـە ورد دەبینـەوە

دەزانین پێش وشەی (فَعِدَّةٌ) دەبێ ڕستەی (فاضطر) مەزنـدە بکـەین، چونکە شوێنەکە داخوازیـەتیو بـەبێ تەقـدیرکردنی ئـەو ڕسـتەیە مانـای ناگونجـێ، چـونکە قەزاکردنـەوەی ڕۆژوو لەسـەر موسـافیر کاتێـك دەبـێ: کـە لـە سەفەرەکەیدا بەڕۆژوو نەبێ، ئەگەر کابرا لە مانگی ڕەمەزاندا سـەفەری بـوو بەڕۆژوو بوو قەزای ناکەوێتە سەر.

لەمـەدا ظـاهیریـەکان ڕای جیاوازیـان هەیـە هـەروا وەکـوو ئایـەتی ﴿حُرِّمَتْ عَلَـيْكُمْ أُمَّهَـاتُكُمْ – النـساء/٢٣﴾ لێرەشـدا دەقەکە پێویـستی بـەوە هەیە لەپێش وشەی (أُمَّهَاتُكُمْ) وشـەیەك مەزمنـدە بکـەین وەکوو (نکاح، یـان وطء) چـونکە تـەحریم پـاڵ شـتی (عـەین) نـادرێ کـەوابێ دەبـێ کردارێـك مەزندە بکـەین تەحریمەکـە ئـالودەی بێو پێوەی بنووسێ، وەکوو (نکاحو وطء) واتە: ئاوای لێ دێ ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ نكـاح أُمَّهَـاتُكُمْ﴾ ئەمـە لـەو قاعیـدە نزیك دەبێتـەوە کـە نـەحوی پـێ دەڵێن: (حـەذفی موضـافو دانـانی موضـافو ئیلەیهی) لەشوێنی، لە بەلاغـەدا پێـی دەگـوترێ: (إیجـاز القـصر) بۆیـە لێـرەدا پێی دەگوترێ: (دلالة الإقتضاء) چونکە کەلامەکـە پێویـستی بـەو وشـە هەیـە تێیدا زیاد بکرێ.

نمونەی دووەمیان واتە (دلالة الإشارة) وەکوو ئایەتی ﴿أُحِلَّ لَكُـمْ لَيْلَـةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِـمَ اللّـهُ أَنَّكُـمْ كُنـتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَـا كَتَـبَ اللّـهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِـنَ الْفَجْـرِ – البقـرة/١٨٧﴾ ئـەم ئایەتـە دەلالـەت دەکـا لەسـەر ئـەوەی کەسێك گزنگـی فـەجری لێ هـەڵبێو لەشـی پیـسس بـێ ڕۆژووەکـەی دروسـتە، لـەم ڕووەوە تـا دەرکەوتنی فەجر ئەو بـۆی هەیـە جیمـاع بکـا، بـەجۆرێك کـە مـاوەی ئـەوەی نـەبێ فریـا خۆشـتن بکـەوێ، دەی ئەمـە لێوەی لازم دێ: کەسێك شـەو لەشـی پـیس بـوو غوسـڵی کەوتـە سـەر بـە لەشپیـسی مایـەوە تـا دونیـا ڕونـاك بـۆوە

ڕۆژووەکەی دروستە، لەم ڕووەوە ئیباحەی سەبەبی شت ئیباحەیە بۆ خودی شتەکە: کە جیماعکردن حەڵاڵ بێ تا دوا ساتی شەو بەجۆرێك ماوەی غوسڵ کردنی لە شەودا بۆ نەمێنێتەوە پێش فەجر، کەوابێ بۆی حەڵاڵە بە لەشپیسی شەو بە ڕۆژ بکاتەوەو بەڕۆژوو بێو دوای فەجر خۆی بشوا.

شایانی باسە ئەم دوو دەلالەتە (الإقتضاء والإشارة) لەبەشی دەلالەتی (مەنطوقن) لەسەر ئەم بنەمایە (المنطوق) دەبێتە پێنج جۆر، یان بڵێین پێنج جۆر دەلالەت لەخۆ دەگرێ: (١- النص، ٢- الظاهر، ٣- المؤول، ٤- الإقتضاء، ٥- الإشارة).

## پێناسەی مەفهومو جۆرەکانی

المفهوم: بە مانایەك دەگوترێ: ڕاستەوخۆ لە مەحەلی نوطق دەلالەت نەکا لەسەری بەڵکوو ناراستەوخۆو بە درك مەعناکە بگەیەنێ، ئەمیش دوو جۆرە (مەفهومی موافقە) (مەفهومی موخالەفە).

١- جۆری یەکەمیان دەلالەتکردنەکەی بە (فحوى الخطابـه) واتە: ئەو مانایەی مەفهومەکە دەیگەیەنێ لە مانای مەنطوقەکەی لەپێشترو گرنگترە، وەکوو حوکمی حەرامی جنێودانو لێدانی باوكو دایك کە لە ئایەتی ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفّ – الإسراء/٢٣﴾ فەهم دەکرێو وەردەگیرێ، ئەوەتا مەنطوقی ئایەتەکە دەلالەت دەکا لەسەر ئەوەی حەرامە مرۆڤ ئاخو ئوف بکا لەبەرامبەر باوكو دایکیدا، کەوابێ مەفهومی موافەقەی ئەم دەقە دەلالەت دەکا لەسەر ئەوەی: کە جنێودانو لێدانی باوكۆ دایك پتر نەهی لێکراوەو تاوانی گەورەترە.

٢- جۆری دووەمیان پێی دەگوترێ: (لحن الخطاب) کە بریتیە لەوەی حوکمی مەفهومیو حوکمی مەنطوقی یەکسان بێ، وەکوو دەلالەتی ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا – النساء/١٠﴾ ئەم ئایەتە وەکوو بە مەنطوقی دەلالەت دەکا لەسەر حەرامی

خـواردنی مـاڵی هـەتیو بەهـەمان شـێوە دەلالـەت دەکـا لەسـەر فەوتانـدنی ماڵەکەشی بە هەر شێوەیەك بێ، چونکە فەوتاندنی ماڵی هەتیو بە خواردنی بێ، یان بە فەوتاندنی بێ یەکسانە.

نـاوزەدکردنی ئـەم دوو جـۆرە (فحـوی الخطـاب و لحـن الخطـاب) بـە (مەفهومی موافقه) لەم ڕووەوەیە کە مانا مەفهومـە (مـسکوت عنـە)وەکـەی لـە حوکمدا موافیقی مانا مەنطوقەکەیەتی هەرچەندە لـە جۆری یەکەمـدا مانـا (مسکوت عنه) وە زیادەی هەیە لـە حوکمەکـەدا، دەلالەتکردنەکـەی لەشـێوەی ئاگادار کردنەوەیـە بـە (أدنـی) لەسـەر (أعلـی) یـان بـە (أعلـی) لەسـەر (أدنـی) جاری وا هەیە هەردوو جۆرەکە کۆدەبنەوە وەکوو ئایەتی ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَـابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لاَّ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلاَّ مَا دُمْـتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا – آل عمران/٧٥﴾ ڕستەی یەکەم ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَـابِ مَـنْ إِن تَأْمَنْـهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ﴾ ئەوە دەگەیـەنێ ئـەو کابرایـە دینـارو کـەمتریش لـە دینـار دەگەڕێنێتـەوە، ڕسـتەی دووەم ﴿وَمِـنْهُم مَّـنْ إِن تَأْمَنْـهُ بِـدِينَارٍ لاَّ يُـؤَدِّهِ إِلَيْـكَ﴾ هۆشـداری ئـەوەمان دەداتـێ کـە بتمانـەی ئـەوەی پـێ نەکـەین (قینطـار مەبلـەغێکی زۆری پـارە) بخەینـە ژێـر دەسـتیو بـە تـەمابین بـە ئاسـانی بیگەڕێنێتەوە بۆمان.

٢- مەفهومی موخالەفە، ئەوەیە مەفهومـە موخالەفەکـەی پێـچەوانەی حوکمە مەنطوقەکەی بێ ئەوەش چەند جۆرێکی هەیە.

أ/ مەفهومی صیفه: مەبەست بە صیفە، صیفەتی مەعنەوییە، وەکوو موشـتەق کـە لـە ئایـەتی ﴿إِن جَـاءكُمْ فَاسِـقٌ بِنَبَـأٍ فَتَبَيَّنُـوا – الحجـرات/٦﴾ مـەفهومی ئـەم تـەعبیرو دەربڕینـە بـە (فاسـق) دەلالـەت دەکـا لەسـەر ئـەوە کەسێك فاسق نەبێ پێویست نیە لێکۆڵینەوە لـە هەواڵەکەیـدا بکـرێ، کـەوابێ واجبە خەبەری تاکی عـادڵ وەربگیرێ، هـەروا وەکوو هـەبوونی دەسـتەواژەی حاڵ لە ڕستەکەدا بۆ نموونە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الـصَّيْدَ وَأَنـتُمْ

حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ - المائدة/٩٥﴾ مەفهومی موخالەفەی حوکمی ئەم ئایەتە ئەوەیە ئەگەر کەسێك بە هەڵە نێچیری کوشت ئەو حوکمەی کە بە کوشتنی ئەنقەست دەکەوێتە ئەستۆی، ناکەوێتە ئەستۆی، چونکە تایبەتمەندکردنی ئەنقەست (عمد) بە واجببوونی جەزا لەسەری، ئەوە دەگەیەنێ کە لە کوشتنی نێچیری بە هەڵەدا ئەو حوکمە نایەتە گەردنی، هەروا وەکوو دەستەواژەی ژمارە لە ئایەتی ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ - البقرة/١٩٧﴾ مەفهومەکەی ئەوەیە ئیحرام بەستن بە حەج لە غەیری مانگەکانی حەجدا دروست نیە، هەروەها ئایەتی ﴿فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً - النور/٤﴾ مەفهومەکەی ئەوەیە: کە لەو ژمارە جەڵدە زیادو کەم ناکرێ نابێ لەوە زیاتری لێ بدرێ، یان کەمتر.

ب/ مەفهومی شەرت وەکوو ئایەتی ﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ - الطلاق/٦﴾ مەفهومی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر ئافرەتەکە حامیلە نەبوو نەفەقەکێشانی واجب نیە.

ج/ مەفهومی غایە وەکوو ئایەتی ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ - البقرة/٢٣٠﴾ مەفهومەکەی ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەم ئافرەتە مارەکردنەوەی بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ دەبێتەوە ئەگەر دوای تەڵاقدانەکە پیاوێکی تر بە مەرجەکانی نیکاح مارەی بکاو دوایی تەڵاقی بداتەوە.

د/ مەفهومی حەصر وەکوو ئایەتی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ - الفاتحة/٥﴾ مەفهومەکەی ئەوە دەگەیەنێ جگە لە خودا کەس ناپەرستینو پشت بە کەسی تر نابەستین، کەوابێ ئایەتەکە دەلالەت دەکا لەسەر تاكو تەنهایی خودا بە عیبادەت بۆکردنو پشت پێ بەستن.

## ڕای جوداواز دەربارەی ئەوە ئاخۆ مەفهوم ئیحتیجاجی پێ دەکرێ؟

زانایان کەوتوونە راجیاییەوە لەوەدا ئاخۆ ئەم مەفهومانە دەکرێنە بەڵگەو ئیحتیجاجیان پێ دەکرێ؟ رای ئەصەحو پەسەند لەوەدا ئەوەیە کە دەکرێنە بەڵگە بەڵام بە چەند مەرجێك:-

أ/ نابێ دەقە مەذکورەکە وابێ مۆرکی ئەغلەبو زۆرینەی تێدا رەچاو کرابێ، وەکوو ئایەتی ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم - النساء/٢٣﴾ لێرەدا قەیدی ﴿فِي حُجُورِكُم﴾ مەفهومی نیە، ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر (ربیبە) کۆڵەبەسەیەك لەژێر چەتری ماڵی پیاوەکەدا نەبوو لە شوێنێکی تر دەژیا بۆ ئەو پیاوەی کە مێردی دایکی کۆڵەبەسەکەیە حەلاڵە مارەی بکا، چونکە ئەم قەیدە ﴿فِي حُجُورِكُم﴾ قەیدێکی غالبییەو زۆرینەی کات وایە کچی کۆڵەبەسە لە ماڵی باوەپیارەیدا دەبێ.

ب/ نابێ دەقە گوتراوەکە بۆ بەیانی واقیع بێ، ئەگەر بۆ بەیانی واقیع بوو مەفهومی نیە وەکوو ئایەتی ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ - المؤمنون/١١٧﴾ چونکە واقیع ئەوەیە جگە لە خودای گەورەو مەزن، هیچ خودایەك نیە بەڵگەی هەبێ لەسەر خودایەتی، کەوابوو رستەی ﴿لَا بُرْهَانَ لَهُ﴾ صیفەتێکی لازمەو بەیانی واقیع دەکاو بۆ تەئکیدو جەختکردنەوە هێندراوەو مەبەست گاڵتەکردنو تەهەککوم پێ کردنی ئەو کەسانەیە کە ئیدیعای ئەوە دەکەن لەگەڵ خودای گەورەدا خودای تر هەن، مەبەست ئەوە نیە کە لەناو خودا درۆزنەکاندا چەند خودایەك هەبن دروست بێ بەڵگە هەبێ لەسەر خودایەتییان، هەروەها ئایەتی ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا - النور/٣٣﴾ رستەی ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ مەفهومی نیە بەم نەوعە بگوترێ: ئەگەر ئافرەتە کۆیلەکە بۆخۆی دەیەویست لەشفرۆشی بکا بۆ ئاغاکەی رەوایە، زەختی لێ بکاو بینێرێ بۆ

لەشفرۆشی بەڵكوو قەیدی ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ بۆیە گوتراوە چونكە ئیكراهو زۆر لێكردن لەگەڵ ئیرادەی (تحصن) نەبێ ناگونجێ.

جابیری كوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی جارییەیەكی هەبوو پێی دەگوت: بڕۆ لەشفرۆشی بكەو شتێك پارەمان بۆ پەیدا بكە، جارییە ئەو كارەی پێ ناخۆش بوو، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – النــور/٣٣﴾.

هەر لە جابیرەوە، دەڵێ جارییەیەكی عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی ناوی (مسيكة) بوو، یەكێ تر هەبوو ناوی (أميمة) بوو، عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی بەزۆر لەشفرۆشی پێ دەكردن، چونە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شكوای حاڵی خۆیان كرد ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – النــور/٣٣﴾ی نازڵ كرد.

بێگومان ئیحتیجاج بە مەفهومی موافەقە ئاسانترە لە مەفهومی موخالەفە، بێگومان زانایان - جگە لە ظاهیریەكان – كۆكن لەسەر ئەوە كە ئیحتیجاج بە مەفهومی موافەقە دەكرێو گونجاوە، دەربارەی مەفهومی موخالەفە تەنها ئیمام مالیكو ئیمام شافیعیو ئیمام ئەحمەد كاری پێ دەكەن، ئەبو حەنیفەو هاوەڵانی نایكەنە بەڵگەو حوكمی پێ ناچەسپێنن.

ئەوانەی دەڵێن: دەكرێنە بەڵگەو حوكمیان پێ دەچەسپێ چەند دەلیلێكی نەقلیو عەقلی دەخەنە ڕوو.

هەندێ لەو دەلیلە نەقلیانە ئەو ڕیوایەتەیە كە دەڵێ: كاتێك ئایەتی ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ – التوبة/٨٠﴾ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «قد خيرني

ربی، فوالله لأزیدنه علی السبعین» کەوابێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا لەم ئایەتە حاڵی بووە: کە زیاد لە حەفتا جودایە لە حەفتا.[1]

بەڵگەیەکی تر: ئەو راو بۆچوونەی ئیبنو عەبباسە (رەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) کە مەنعی کرد خوشك میرات بگرێ کاتێك مردووەکە کچی لەپاش جێما بوو، بەڵگەشی ئایەتی ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ - النساء/١٧٦﴾ ئیبنو عەبباس وا لەم ئایەتە حاڵی بوبوو کە میراتگرتنی خوشك کاتێك دەبێ مردووەکە وەلەدی نەبێ، کەوابێ ئەگەر کچی لە دوا جێمابوو میرات ناگرێ، چونکە کچ بە وەلەد حسێبە، پێی وایە (ولد) شمولی کچو کوڕ دەکا، ئەویش بۆخۆی یەکێکە لە زمانڕەوانەکانی عەرەبو بە (تەرجومانی قورئان) ناوبراوە.

هەروا ڕیوایەتی یەعلای کوڕی ئومەییە کە بە ئیمام عومەری گوت: هۆی چیە ئێستا ئێمە نوێژ کورت دەکەینەوە خۆ ئێستا لە ژیانێکی ئاساییو ئاسایش داین ترسمان نیە، پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ - النساء/١٠١﴾ ئەم هاوەڵە وا لەو ئایەتە حاڵی بووە: کە کورتکردنەوەی نوێژ تایبەتە بە هەبوونی ترس، ترس نەما نوێژ کورت ناکرێتەوە، ئیمامی عومەر لە پرسیارەکەی تووڕە نەبوو، بەڵکوو گوتی: بەڕاستی منیش سسەرم سوڕماوە لەوەی تۆی خستۆتە سەرسوڕمانەوە، پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد دەربارەی ئەوە فەرمووی: «هِيَ صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللّٰهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ».[2] دەی خۆ یەعلای کوڕی ئومەییەو ئیمام عومەر لە زمانڕەوانەکانی عەرەبن وا لە ئایەتەکە حاڵی بوونو پێغەمبەریش بۆچوونەکەیانی پشت ڕاست کردۆتەوە.

---

[1] ئیبنو جەریری طەبەری لە تەفسیرەکەیدا.

[2] أخرجه مسلم/٧٥٥٢ و ٧٥٥٣.

بەڵگـەی عـەقڵیش دەهێننـەوەو دەڵـێن: ئەگـەر حـوکمی (فاسـق)و (غەیرە فاسق) یەکسان بێ لە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا – الحجرات/٦﴾ دەربـارەی لێکۆڵینـەوەو وردبوونـەوە لـە هـەواڵ، هـیچ سـودێك لـە تایبەتمەنـدکردنی (فاسـق) بـەناوهێنانی نابینـدرێ هـەروا بـاقی نمونەکانی تریششش لەم بووارەدا.

## (١٧) سەرئاسایی قورئان (إعجاز القرآن)

ئـەم بوونـەوەرە بەرفراوانـەی پـڕە لـە مـەخلوقاتی خـودا، کێـوە بـەرزەکانیو دەریالوشـە پـانو پۆڕەکـانیو دەشـتە کـاکی بـە کاکییـەکانی لەبـەردەم مـەخلوقێکی زەعیفـی بـێ وەجـی وەکـوو مرۆڤـدا موسـوخەرو فەرمانبەرداره، بەڵکوو هەرچی لە زەویـدا هەیـە بـۆ بەرژەوەنـدی ئـادەمیزاد رامکـراوە، بـۆ؟ چـونکە پـەروەردگار لـەم مەخلوقـە زەعییفـەدا کۆمـەڵێك تایبەتمەنـدی کۆکردۆتـەوە لـە مەخلوقاتـەکانی تـردا نـین، هێزێکـی عـەقڵو فکرو بیرکردنەوەی داوەتێ: کە ڕێگای بـۆ ڕونکردوتـەوەو پێکهاتـەکانی هێـزە کەونیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆی رام بکا، وای لێ بکا لە خزمەتی مرۆڤدا بێ.

هەڵبەتـە خـودای تـاكو تـەنیا نەیوسـتووە مـرۆڤ بـەرەڵڵا بکـاو خـۆی ڕێبازی ژیانی خـۆی بدۆزێتـەوە، ڕوی ڕەحمـەتی تـێ نـەکاو بـەیناو بـەین بـە تیـشکی وەحـی ڕێبـازی ژیـانی بـۆ ڕۆشـن نەکاتـەوە، بـەڵکوو نـاوە نـاوە پێغەمبەرانی ناردوون بۆ سەریانو بانگەوازییان کـردوون بـۆ ئـەوەی ڕێبـازی ژیانیان بۆ ڕون بکەنەوەو شارەزاییان بکەن بۆ ڕێبازی ڕاستی بەختەوەری، بۆ ئـەوەی بـە بەرچـاو ڕۆشـنیو لێزانینـەوە ژیـان بـەڕێ بکـەنو بەختـەوەری هـەردوو جیهانیـان بـۆ دەسـتەبەر ببـێ، وەلێ ئـادەمیزاد بەسروشـت بۆخـۆی سەرکەشەو ئامادە نیە گەردنکەچو شووێنکەوتەی مرۆڤێکی وەکوو خۆی بـێ، مادام ئەو مرۆڤە لافی رابـەریو پەیامبـەری لێ دەدا شـتێك نەخاتـە ڕوو: کـە

ئادەمیزادەکانی تر نەتوانن نیشانی بدەن، بۆ ئەوەی ئیعتیرافی پێ بکەنو شوێنی بکەونو ملکەچ بن بۆ دەسەڵاتو توانایەك: کە زۆر لە ژوور تواناو دەسەڵاتی ئەوانەوەیە، ئەوەبوو خودای گەورە لە ڕوانگەی ڕەحمو بەزەیی خۆیەوە، پێغەمبەرانی یەك بەدوای یەکدا نارد بۆ سەریان، نیگای بۆ نازڵ دەکردن، بەڵگەو نیشانەی بەهێزو سەرسوڕهێنەری لەسەردەستی ئەوان هێنانە دیو ئیقامەی حوجەی لەسەرکردن، ئەوەبوو بڕێك لەو خەڵکە دانیان بە دەسەوەسانی خۆیاندا ناو ئیمانیان هێناو شوێن پێغەمبەران کەوتن، وەلاو ملکەچی خۆیان بۆ خودا ڕاگەیاند!

وەلێ عەقڵی ئادەمیزاد لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا هیچ شتێك سەرەنجی ڕاناکێشیو عەقڵی کەمەند ناکا هێندەی موعجیزاتی کەونی بینراو کەمەندکێشی دەکەن، چونکە عەقڵی لەشتی حیسیدا قەتیس ماوەو تەجاوەز ناکا بۆ عالەمی بەرزیو شکۆداری زانیاری بیرکردنەوە، کەوابی موناسیبو گونجاو بوو: کە پەروەردگار بۆ هەر گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێ لە ڕەگەزو نەتەوەی خۆیان بێ، موعجیزەکەشی لە شتێکدا بێ کە نەتەوەکەی تێیدا کارامەو پێشکەوتوونو پێوەی ڕاهاتوون، بۆ ئەوەی دەستەوەسانیان لە بەرامبەریکردنی ئەو موعجیزەدا ببێتە پاڵنەر بۆ ئیمان پێ هێنانیو قەناعەتیان لەلا دروست بێ: کە ئەو موعجیزە سەرچاوەکەی هێزو دەسەڵاتی ئاسمانییە.

جا کە بە مروری زەمانو تێپەڕبوونی ڕۆژگارێکی دورودرێژ بەسەر کۆمەڵگای ئادەمیزاداو کامڵبوونی عەقڵو هۆشی، پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی بە پەیامێکی گشتیو هەتا هەتایی ڕەوانەی سەر ئادەمیزاد کردو کردی بە پێغەمبەری ئاخر زەمانو موعجیزەی قورئانی پیرۆزی بۆ نارد: کە بە ڕاستی موعجیزەی عەقڵی ئادەمیزادە لە هەرە ئاستی بەرزی ڕۆشنبیریدا، لە کاتێکدا پشتگیریکردنی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی پێشوو

به جۆرێك له ئایاتی كەونی بوو: كە بەچاو دەبینراو خەڵكەكەی سەرسام دەكردو لە ئاستیان جۆش دادەمان، بواری ئەوە نەبوو عەقڵ جەوەلانی تێدا بكاو بەرپەرچی بداتەوە بۆ نموونە موعجیزەی (یەدی بەیضا)، (عەصا)ی موسا، چاككردنەوەی كوێرو بەڵەكو گولو زیندوكردنەوەی مردو لەسەردەستی حەزرەتی عیسا، بەلام موعجیزەی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕۆژگارێكی وادا كە ئادەمیزاد هەنگاو بەرەو ئاسۆی عیلمو زانیاری هەڵدێنا، موعجیزەی عەقڵی بوو، لەگەڵ عەقڵ دەدوا، پەیامی ئاراستەی عەقڵی ئادەمیزادد دەكردو تەحەددای هەموو بەشەرییەتی كرد بۆ هەتاهەتایە، ئەو موعجیزە ناوازە موعجیزەی قورئانی پیرۆز بوو، موعجیزەی ئەو عیلمو زانیارییە بوو كە لەخۆی گرتبوو، موعجیزەی هەواڵە جۆراوجۆرەكانی رابردوو داهاتوو، موعجیزە لە هەموو رەویەكەوە لەڕوی لەفظو مەعناوە لەڕوی تەشریعو ئەحكامەوە لەڕوی ئوسلوبو شێوازەوە، كەوابێ عەقڵی ئادەمیزاد وێڕای ئەو پێشكەوتنانەی بەدەستی هێناوەو بەدەستیان دێنێ، لەبەر ئەوە عاجز نیە لە بەرامبەرییكردنی: كە ئایەتێكی كەونیەو دەرەقەتی نایە، بەڵكوو كە ئادەمیزاد ناتوانێ بەرامبەری بكاو دەسەوەسان لە ئاستیا جۆش داماوە، لەبەر دەستكورتییەكی زاتییەوە لەناخەوە هەست بە ئەو دەستكورتیو بێ توانایییەی خۆی دەكاو هیچ چاری نیە ناچار دان بەوەدا دەنێ كە ئەمە نیگایەو لە خوداوە بۆ پێغەمبەری ناردووە (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی لەژێر ڕۆشنایی ئەو كەلامە سەرسوڕهێنەرەدا ئادەمیزاد لە گومڕایی عەقیدە ڕزگار بكا، ئادەمیزاد واتێبگەیەنێ: كە بۆ ڕاستكردنەوەی خواریو خێچیەكانی پێویستی بە ڕەهنومایی ئەو قورئانە هەیەو بەبێ پەیڕەویكردنی ئەو وەحییە ئاسمانییە بە خەتەوەری ژیانی دونیاو قیامەتی بۆ دەستەبەر نابێ، ئائەم مەفهومو مانایەیە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی ئیشارەی پێ

دەكاو دەفەرموێ: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِى أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ». [1]

بەڵێ ویستو ئیرادەی خودا وەهابوو كە موعجیزەی روداوێكی بینراوی كاتی كەونی نەبێو روبداو نەمێنێ بەڵكوو موعجیزەیەكی بەردەوامو نەمر بێ، بۆ هەموو كاتو شوێنێك بێ، بە كەڵكی هەموو كۆمەڵگایەك بێ، موعجیزەیەكی وابێ تواناو دەسەڵاتی مرۆڤ لە ئاستیدا دەسەوەسان بێو تا عیلمو زانیاری زیاتر پێش بكەوێ پتر لە بەرامبەر ئەو موعجیزەدا دەسەوەسان بێ هەست بە داماوی خۆی بكا.

هەڵبەتە قسەكردن دەربارەی ئیعجازی قورئان بۆخۆی جۆرێكە لە ئیعجاز، توێژەر كە نهێنی لایەنێكی ئیعجازی بۆ دەردەكەوێ دەبینێ چەندین لایەنی تر لەپاش ئەوەوە هەنو رۆژگار لە داهاتوودا لەوانەیە نهێنی ئیعجازی ئەوانە دەربخا! ئەوە وەكوو مصطفى صادق الرافعي دەڵێ: قورئانی پیرۆز لە پێكهاتەی ئیعجازیو ئیعجازی پێكهاتەی دەشوبهێتە وێنەیەكی كەلامی لە یاسای ئەم كەونەی كە زانایان خستویانەتە بەر باسو لێكۆڵینەوە، كەچی پاش ئەم هەموو توێژینەوانە هەست دەكەن لەسەرەتای رێگەدانو زۆریان ماوە بگەنە ئامانجو مەبەستەكانی.

## پێناسەی ئیعجازو سەلماندنی

ئیعجاز واتە: سەلماندنی بێ دەسەڵاتی، وشەی (العجز) ناوە بۆ نەتوانینی كردنی شتێك، دەق بە مانا دژی دەسەڵاتو توانا دێ، جا كە ئیعجاز هەبوو توانای خاوەن ئیعجاز دەردەكەوێ، مەبەست بە ئیعجاز لێرەدا دەرخستنی راستگۆیی حەزرەتی موحەممەدە (دروودی خودای لەسەر بێ) لە

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم من حديث أبي هريره.

دەعوای پێغەمبەرێتی‌دا بەوەی عەرەبەکان هەست بە دەسەوەسانی خۆیان بکەن لەوەدا کە ناتوانن بەربەرەکانی موعجیزەی ئەو بکەن کە قورئانی پیرۆزە، هەر عاجزی‌و داماوی چینەکانی دوا ئەوانیش بە عەربو ناعەرەبەوە بچەسپیٚ‌و بۆ هەتا هەتایە بۆڕبخۆن‌و نەتوانن لە ئاستی‌دا سەر بەرز بکەنەوە.

موعجیزە: بۆخۆی کارێکە لەسەر ئاستی عادەتەوەیەو بۆ تەحەددا ڕادەنوێنریٚ‌و بەربەرەکانی ناکریٚ!!

قورئانی پیرۆز ئەو نامە سەرئاسایەیە: کە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بیٚ) تەحەددای عەرەبی پیٚ کردو بۆڕی دان، وێڕای ئەوەی: کە ئەو عەرەبانە سوارچاکی مەیدانی ڕەوانبێژی‌و زەمانڕەوانی بوون‌و دەستێکی بالآیان لەو بوارەدا هەبوو، کەچی لە بەرامبەر قورئاندا دەسەوەسان بوون‌و بۆڕیان خوارد، هەرشتێکیش ئاوا بەرامبەری نەکریٚ‌و بە تێپەڕبوونی ماوەی دورودرێژ تەحەداکەی باقی بیٚ ئەوە موعجیزەیەو لە دەسەلآتی خودادایە.

بێگومان چەسپاوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بەسیٚ قۆناغ تەحەددای عەرەبی کرد بە قورئان:-

أ/ تەحەددای کردن بەهەموو قورئان بەشێوەیەکی گشتی، ئەوەبوو ئوسلوبێکی گشتگیر کە عەرەبو غەیری عەرەب لە ئادەمیزادو جندۆکە بگرێتەوە تەحەددایان دەکا: کە هەموویان یەك بگرن‌و تواناکانیان یەك بخەن‌و هەوڵ بدەن کەلامێکی لە وێنەی قورئان بخەنە ڕوو، دەفەرمویٚ: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا – الإسراء/٨٨﴾ هەڵبەتە تەحەدداکە هەر بۆ ئادەمیزادەو جندۆکە ناگرێتەوە چونکە ئەوان لە ئەهلی ئەو زمانە عەرەبیە نین: کە قورئانی پیٚ نازڵ بووە، ناوهێنانیان لەگەڵ ئادەمیزاد کە دەفەرمویٚ:

﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ﴾ بۆ گەورەکردنی ئیعجازی قورئانە، واتە ئەگەر لە فەرزێکدا ئادەمیزادو جندۆکە یەك بگرن‌و یارمەتی یەکتر بدەن بۆ خستنەرووی کەلامێك بگاتە ئاستی قورئان، بۆیان ناکرێ‌و ناتوانن، کەوابێ ئەگەر ئادەمیزاد بە تەنها بێ ئەوە هەر هیچ.

ب/ لە قۆناغی دووەمدا تەحەددای کردن بەوە بتوانن (دە) سورەت لەشێوەی سورەتی قورئان بخەنە روو، وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ، فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ وَأَن لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ – هود/١٣ – ١٤﴾.

ج/ قۆناغی سێیەم تەحەددای کردن بەوەی بتوانن یەك سورەت بخەنە روو، وەکوو سورەتی قورئان بێ، دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ – البقرة/٢٣﴾.

هەرکەسێك کەمێ شارەزای مێژووی عەرەب‌و ئەدەبی زمانەکەیان بێ، هەست بەوە دەکا: کە چەند هۆکارێك هەبوون پێش رەوانەکردنی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) زمانی عەرەبی راستەوپاستە کردبوو، زمانەکەیان پاڵفتە کردبوو، باشترین زاراوەکانی ئەو زمانەی لە بازاڕەکانی وەکوو عوکاظو مەربەددا کە تایبەت بوون بە خۆ دەرخستن‌و خۆ هەڵنانەوە بە شیعرو پەخشان کۆکردبووەوە، هەتا وای لێ هات زاراوەکان هەموویان جۆگایەکیان پێك هێنا لە فەصاحەت‌و بەلاغەت‌و قسەزانی‌و هەڵڕژانە ناو دەریای لوغەتی قورەیشەوە: کە سەرەنجام قورئانی پیرۆز بەو زاراوەو لوغەتە نازڵ بووە.

ئەو دەمارگرژی‌و لوتبەرزییەی لەناو عەرەبدا باوبوو کە کابرا لە روانگەی سەررەقی‌و دەمارگیری خۆیەوە بە لوتبەرزی، خۆی بەسەر برای عەرەبی خۆیدا رادەوەشاندو فەخرو شانازی بەسەردا دەکرد بووتە جێگای

سەرنجو پەندو ئەمثال، تەنانەت مێژوو ڕۆژگاری خوێناوی وای لەسەر تۆمار کردوون، شەڕو جەنگی ماڵوێرانکەری وای پاڵداون کە بە سەدان مرۆڤی تێدا هەنجن هەنجن کراوەو لافاوی خوێنی تێدا هەڵساوە، هۆکارەکەی پڕیشکە ئاگرێك بووە لە لوتبەرزی ئەم بەرامبەر ئەوو سەررەقی ئەو بەرامبەر ئەو!!

دەی ئەوانە وێڕای زمانڕەوانیو هێزی دەبڕینی قسەو گوفتاریان، لەگەڵ ئەو هێزی بەیانو قسەزانینەیان کە حەماسەتیان بۆ هۆزو عەشیرەت پاڵنەرو هەڵگیرسێنەریان بوو، حەمییەتی خزم خزمێنەو ئینتیماء بۆ بنەماڵەو هۆز ئاگرەکەی خۆش دەکردو ئاگری بن کایەی دەوروژاندۆ دەگەشاندەوە، ئەگەر بیانتوانیایە بەربەرەکانی قورئان بکەن دەیانکردو نمونەی بەربەرەکانییەکەیان بە ئێمە دەگەیشتو هەواڵەکە بەناو چینە یەك لەدوایەکەکانی ئادەمیزاد بڵاو دەبووەوە.

بێگومان قورەیشییەکان بۆخۆیان ئایەتەکانی قورئانیان بیستو لەناو خۆیان لێکیان دایەوەو خستیاننە بەرباسو لێکۆڵینەوە، بەراوردیان کرد بە شیعرو پەخشانی خۆیانو زۆریان بیر لێ کردەوەو تێی ڕامان، ڕێگاچارەیەکیان نەدۆزییەوە بتوانن لاسایی بکەنەوەو کەلامێکی ئاوابخەنە ڕوو، دەروویەکیان بەدی نەکرد بتوانن بەربەرەکانی بکەن، بۆیە لە بەرامبەریدا لاڵ بوونو دڵەلەرزەیان پێکەوتو هیچکەیان پێ نەکرا جگە لەوە: کە گوتیان (سحر يؤثر، أو شاعر مجنون، أو أساطير الأولين) سیحرێکی کاریگەرە، یان موحەممەد بۆخۆی شاعیرێکی شێتە، یان قورئان چیرۆکە کۆنی پێشینانە.

لە ئاکامی ئەو سەررەقیو لوتبەرزییەیان وێڕای دەسەوەسانیان لە بەرامبەر تەحەددای قورئان، توشی شۆك بوونو بۆڕیان خواردو ئەو کەوتنەی کەوتن هەڵنەستانەوە، بە ناچاری ملیان لە تیغ ناو ژەهری

کوشندەیان نۆش کرد، بەمەش ئیعجازی قورئان سەلماو چەسپاو بوو بە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگر.

بیستنی قورئان بۆخۆی بەڵگەی مولزیمە ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ – التوبة/٦﴾ چونکە هەرکەسێ بە دڵی کراوەوە گوێ بۆ قورئان بگرێ ناچارە بڕوای پێ بکا.

ئەو حەمکە موعجیزانەی قورئان لەخۆی گرتوون لەبوارە جیاجیاکاندا لە هەموو موعجیزە کەونیەکانی رابردو کە لەسەر دەستی پێغەمبەران نیشان دراون بەهێزترن‌و جێی ئەوانیان گرتۆتەوەو زیاتریش ﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِّن رَّبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ، أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ – العنكبوت/٥٠ – ٥١﴾ نەتوانایی عەرەب بۆ بەرەنگاربوونەوەی قورئان وێڕای داخوازی بۆ بەرەنگاربوونەوە نەتوانایی‌و دەستکورتییە بۆ زمانی عەرەبی لە هەڕەتی گەنجی‌و سەردەمی گەشەکردنی‌دا.

دەسەوەسان کردنی قورئان هەر بۆ عەرەب نەبووە بەڵکوو بۆ باقی گەل‌و نەتەوەکانی تریشە لەهەموو کات‌و سەردەم‌و شوێنێکدا، بەڵێ قورئان بەردەوام لە مەوقیفی تەحەددایەو لە لوتکەی بڵندی سەربەزیدا ئەم تەحەددایە بە شانازییەوە بڵاو دەکاتەوەو بەگوێی بوونەوەری دادەداو کەس نەیتوانیوە پەنجەی بەرامبەریکردن هەڵبڕێ‌و بڵێ: من هەم‌و ئامادەم!!

ئەو حەمکە نهێنیانەی بوونەوەر کە پەیتا پەیتا زانیاری تازە دەریان دەخا، لە واقیعدا دیاردەو مەظاهیرن بۆ ئەو حەقیقە بالآیانەی نهێنی ئەم بوونەوەرە لەخۆی گرتوون دەربارەی خالیق‌و بەدیهێنەری تاك‌و تەنها: کە قورئان بە کورتی دەیاندرکێنێ، یان ئیشارەیان بۆ دەکا کەوابوو قورئان بە صیفەتی موعجیزەی مرۆڤایەتییە.

## شێوەکانی سەرئاسایی قورئان (وجوه اعجاز القرآن)

بێگومـان سـەرهەڵدانی زانیـاری کـەلام (علـم الکـلام) لـە کۆمـەڵگای ئیـسلام کاریگەریـەکی هـەبوو راسـترین پێناسـە بـۆی ئەوەیـە بڵێین: قـسەیە دەربـارەی قـسە، ئـەو تروسـکایە زانیاریـەی تێدایـە وا لـەو کەسـە دەکـا کـە توێژینەوەی تێـدا ئـەنجام دەدا سـەرەنجام بگاتـە کۆمـەڵێك قـسەی بـێ مانـای کەڵەکەبووی یەك لەسەر یەك.

١- ئەبو ئیسحاق: (إبراهیم النظام)و ئەوانەی شوێنی کەوتوون، وەکـوو مورتەضا لە شیعەکان پێیان وایە ئیعجازی قورئان بەشێوەی (صرفة)یە واتە: لادانو ڕێگـە لێ گـرتن، بـەم مانایـە خـودای مـەزن عـەرەبی لـەو ڕوتـە لاداون بتـوانن بەرمبـەری قورئـان بکـەن، ئـەگینا عەرەبـەکان لـە واقیعـدا توانـای ئەوەیان هەبووە، کەوابوو ئەم ڕێگە لێ گرتنو لادانە خاریقی عادەت بۆیان.

مانای (صرفة) لە دیدو نیگای (مورتەضاوە) ئەوەیە پـەروەردگار ئـەو زانیارییانـەی پێویـست بـوون بـۆ موعـارەضـەو بەرانبـەری لـە عەرەبـەکانی دارنیو لێی ستاندن بۆیە نەیانتوانی وێنـەی قورئـان بخەنـەڕوو، لـە ڕاستیدا ئەمـە قـسەیەکە دەلالـەت دەکـا لەسـەر نـەزانیو بێدەسـەڵاتی خـاوەن قـسەکە چـونکە لــە واقیعــدا کەسـێك هــەبووونی دەســەڵاتی بەســەر شــتێکدا لێ بـسەندرێتەوە نـاگوترێ شـتەکە بێدەسـەڵاتی کـردووە مـادامێکی بتوانـێ لـە کاتێك لە کاتەکاندا ئەو شتە ئەنجام بـدا، بـەڵکوو مـوعجیزەو دەسەوەسـانکەر قودرەتی خودایە، کەوابێ قورئان نابێتە موعجیزە، قسەی ئێمەیش دەربارەی ئیعجازێکە پاڵ قورئان بدرێو هەموو کاتـێ ئـەو صیفەتەی ئیعجازی هـەبێ، قسەمان لە ئیعجازی خودا نیە.

قـازی ئـەبو بـەکر (البـاقلانی) دەڵـێ: ئـەوەی زاراوەو دەسـتەواژەی (صـرفة) پـوچ دەکاتـەوە خـاوەنی ئـەو رایـەی ئیعجـازی پـاڵ دەدا بـە هەڵـەی دەژمێرێ ئەوەیە: دەڵێین: ئەگـەر موعارەضـە مـومکین بـێو (صـرفة) ناهێڵـێ

بێتــه دی، ئەوکاتــه قورئانەکــه بۆخــۆی مــوعجیزه نــەدەبوو، بــەڵکوو مەنعکردنەکـه مـوعجیزه دەبـوو، کـەوابوو ئەوکاتـه قورئـان چ فـەضـلو گەورەییەکی بەسەر کتێبێکی تردا نەدەبوو!!

پاڵدانی ئیعجاز بۆلای (صیرفة) قسەیەکی بێ بنەمایەو ناکرێ بڕوای پێ بکەین چونکە قورئـان بۆخـۆی ڕەتـی دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا – الإسراء/٨٨﴾ چونکە ئەوەتا ئایەتەکە بە ئاشکرا ئـەوە دەگەیەنێ: کە ئادەمیزادو جین وێڕای مانەوەی قودرەتو دەسەڵاتیان عاجزو دەسەوەسانن‌و ناتوانن وێنەی قورئان بخەنە ڕوو، چونکە ئەوان ئەگەر سەلبی قودرەتیان لێ بکرێ، چ فائیدەو سودێك دەمێنێتەوە لە ئیجتیماعو یەکدیگیر بوونیاندا، وەکوو ئەوە وادەبوو مـردو بخرێتـە پـاڵ مـردوو، دەی خـۆ عـاجزی مردوان لە ئەنجامی کارێك شتێك نیە بەگرنگ لە قەڵەم بدرێو لە مـەقامی ئاوادا بگوترێ.

ب/ برێ لە زانایان پێیـان وایـە قورئـان لـەم ڕووەوە موعجیزەیـە کـە بەلاغەتەکەی گەیشتۆتە ئاستێك نمونەی نەبینراوەو نەبیستراوەو لـەوەپێش کـەس پێـی ئاشـنا نـەبووە، ئەمــه تێـڕوانین‌و بیروبۆچـوونی ئــەو زانــا عەرەبانەیە: کە حەزیان لەوێنـەی مـەعانی زینـدو سـەرنج ڕاکێشی وا هەیـە خرابێتە ناو وشە گەلێك: کە تان‌و پۆی موحکەم‌و بـەیان‌و دەربڕینـی رائیـع‌و بەهێز.

ج/ هەنـدێکی تـر دەڵـێن: لایـەنی ئیعجـازی قورئـان لەوەدایـە: کـە ئوسـلوبێکی بـەدیع‌و نـاوازەی تێـدا رەچـاو کـراوە پێـچەوانەی هـەموو ئـەو شێوازانەیە کە لەوەپێش لە کەلامی عەرەبدا زانراوەو هەستی پێکراوە لەڕوی ناوبڕەکانی‌و کۆپلەکانی (الفواصل والقواطع).

د/ هەندێکی تر دەڵێن: ئیعجازی قورئان لەم ڕووەوەیە کە هەواڵ لە غەیبیاتی داهاتوو دەدا ئەوشتە نهێنیو غەیبیانەی کە لە ڕێگای وەحیو نیگاوە نەبێ نازانرێن، یان ئەو هەواڵانەی رابردوو: کە لە سەرەتای دروستبوونی مەخلوقاتەوە ڕویانداوەو ناگونجێ نەخوێندەوارێکی وەکوو حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) کە پەیوەندی بە ئەهلی کیتابەوە نەبووە، باسیان لێوە بکاو رایانگەیەنێ، بۆ نموونە دەربارەی ئەهلی بەدر فەرمووی: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ – القمر/٤٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ – الفتح/٢٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ – النور/٥٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿الم ، غُلِبَتِ الرُّومُ ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ – الروم/١ – ٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَذَا – هود/٤٩﴾ هەروا باقی چیرۆکەکانی پێشینان.

لە ڕاستیدا ئەم ڕایە قبوڵ ناکرێو رەت دەکرێتەوە چونکە ئەوەی لێ وەدی دێ: کە ئەو ئایەتانەی هەواڵی غەیبی داهاتوو رابردویان تێدا نیە موعجیزە نەبن، ئەمەش بۆچوونێکی بەتاڵو بێ بنەمایە، چونکە خودا لایەنی ئیعجازی خستۆتە هەموو سورەتێکەوە بە تایبەتی.[1]

هـ/ کۆمەڵێکی تر پێیان وایە قورئان موعجیزەیە لەم ڕووەوە زانیاری جوداوازی لەخۆ گرتوون، پەندو حیکمەتی بەلیغو ڕەوانی تێدان، چەند شێوەیەکی تریش بۆ ئیعجاز لەم جەمسەرەدا دەخولێنەوە، هەندێك لە زانایان گەیاندوننە دە شێوەو زیاتریش.

لە حەقیقەتو راستیدا قورئانی پیرۆز موعجیزەیە بە هەموو ئەو مانایانەی لەفظی ئیعجاز لەخۆی گرتوون، بەڵێ: قورئان موعجیزەیە لە

---

[1] البرهان للزركشی ج١/٩٥ – ٩٦.

وشـەكانیداو لەشێوازو ئوسلوبیداو، تەنانـەت پیتێـك لـە قورئـان لەشـوێنی خۆیدا موعجیزەیەو پیتێكی تر ناتوانێ جێگای بگرێتـەوە بـۆ پێكـەوە لكانی وشـە، هـەر كەلیمەیەكیـشی لەشـوێنی خۆیـدا موعجیزەیـەو كەلیمەیـەكی تـر ناتوانـێ جێگـای ئـەو بگرێتـەوە لـە پێكهێنـانی ڕسـتەدا، هـەر ڕستەیەكیـشی موعجیزەیە لەشوێنی خۆیدا بۆ پێكهێنانی ئایـەتو پێكـەوە گونجانی، هـەروا قورئـان موعجیزەیـە لـە بـەیانو نـەظمـیدا، خوێنـەر كـە دیقـەتی دەداتـێ وێنەیەكی زیندوی بۆ ژیانو بوونەوەرو مرۆڤ تێدا دەبینـێ، موعجیزەیـە لـە ماناكـانیدا، ئـەو مانایانـەی پـەردەیان لەسـەر حەقیقـەتی مرۆڤایـەتیو بەرنامەی لە بوندا هەڵدایەوەو ڕێبازی ژیانی بەختەوەری نیشاندا.

موعجیزەیە لەڕوی زانستو زانیارییەوە: كە ئەمڕۆ زانـستی تـازە زۆر لـەو حەقیقەتـە نادیارانـەی قورئـان ئامـاژەی بـۆ كـردوون، ئاشـكرایان دەكـاو دەیانسەلمێنـێ.

موعجیزەیـە لـە تەشـریعو پارێزگـاریكردنی مـافی ئـادەمیزادو پێكهێنانی كۆمەڵگایەكی نمونەیی جیهان لەسەر دەستی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆئەوەی ئادەمیزاد بە ئاسودەیی بژیا.

بە كورتی قورئان ئەو نامە ئاسمانییەیە: كە عەرەبی نـەفامو نـەزانو شوانە مەڕو شـوانە حوشـتری وا پـەروەردەكرد ببنـە سیاسـەتمەداری جیهـانو پێشەواو ڕابەری گەلانی سەرزەوی، بەڕاستی هـەر ئەمـە بۆخـۆی بـە ئیعجـاز دەژمێردرێ.

الخطـابی لـە كتێبـی (بیـان إعجـاز القـرآن)دا دەڵـێ: ئێمـە لـە ئەمـەوە بۆمان دەردەكەوێ: كە ئەوەی قورئانی وا لێ كردووە موعجیزە بێ، ئەوەیە بە ڕەوانترین زمان نازڵی كردووە، لە جوانترین شێوەی تەئلیفـدا ئاراسـتە كـراوە، ڕاسترین مانای لەخۆگرتوون: كە تەوحیدو تەنزیهی زاتو صیفاتی خودایـە، بانگەوازیكردنـە بـۆ خوداپەرسـتی، ڕوونكردنـەوەی ڕێبـازی عیبـادەتو

حەلاڵکردنو حەرامکردنو مەمنوعو حەظرو ئیباحەی تێدا دیاری کراوە، ئامۆژگاریو راستکردنەوەی ڕەوشتو فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەی تێدا راگەیەندراوە مرۆڤایەتی شارەزا دەکا بۆ رەوشتی جوانو خۆپارێزی لە خراپەو ڕەوشتی ناشیرین.

هەموو شتێکی لە شوێنی خۆیدا داناوەو نابیندرێ شوێنێکی باشتر لەوە بۆ ئەو شتە هەبێ، بە عەقڵیش تەصەور ناکرێ شتێك هەبێ قورئان دایناببێو شوێنی لەوە شیاوتری هەبێ، هەواڵی ڕۆژگاری کۆنی لەخۆگرتووە، وێنەی ئەو بەلاو کارەساتانەی کێشاوە کە خودا بەسەر سەرپێچیکارانیدا هێناوەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبوون، لە ڕۆژگاری رابردوودا هەواڵی ڕوداوی داهاتووی راگەیاندووە، بەڵگەو بەڵگە بۆ هێندراوەی کۆکردۆتەوە، دەلیلو مەدلولی خستۆتە پەنایەکەوە، بۆ ئەوەی دەلالەتی لەفظی لەسەر مەعنای پتر ڕوون بێ، بزاندرێ بانگەوازییەکەی بەجۆرێکە مرۆڤ بەرەو پیری بچێو پێویستە پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بێ.

ئاشکراشە کۆکردنەوەو پێکەوە گونجاندنی هەموو ئەم شتانەو ڕێك خستنیانو ئاراستەکردنیان بەو شێوە کارێکە لە توانای ئادەمیزاد بەدەرەو دەسەڵاتی ئەو دەرەقەتی نایە، بۆیە ئادەمیزاد لە ئاستیا دەسەوەسان کەوتنو نەیانتوانی بەربەرەکانی بکەن.

## ئەندازەی ئەوەی لە قورئان دەبێتە موعجیزە

موعتەزیلە پێیان وایە ئیعجازی قورئان پەیوەستە بە هەموویەوە، واتە: هەموو قورئان موعجیزەیە نەك هەندێکی، یان هەموو سورەتێکی سەربەخۆ، هەندێ لە زانایان پێیان وایە ئیعجاز پەیوەستە بە سورەتێکی تەواوەوە هەرچەندە کورتیش بێ، یان بە ئەندازەی سورەتێکی کورت وەکوو ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك.

بێگومـان ئێمـه کـه سـه‌یری قورئـان ده‌کـه‌ین، ته‌حـه‌ددا بـه‌ هـه‌مووی کراوه ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُـرْآنِ لاَ يَـأْتُونَ بِمِثْلِهِ – الإسراء/٨٨﴾ ته‌حه‌ددا به‌ ده‌ سوره‌تی کراوه ﴿فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ – هود/١٣﴾ ته‌حه‌ددا به‌ سوره‌تێکیشی کـراوه ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ – يونس/٣٨﴾ هه‌روا ته‌حه‌ددا کراوه‌ به‌ که‌لام‌و حه‌دیثیـك وه‌کوو کـه‌لام‌و حـه‌دیثی قورئـان وابێ ﴿فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ – الطور/٣٤﴾.

له‌ ڕاستی‌دا ئێمه‌ وانابینین ئیعجاز خۆی له‌ ئه‌ندازه‌یه‌کی دیـاریکراوی قورئانــدا ببینێتــه‌وه‌، چـونکه‌ ئێمــه‌ دیـارده‌ی ئیعجـاز وه‌کـوو لــه‌ ئایــه‌ت‌و سوره‌ته‌کانی‌دا به‌دی ده‌که‌ین له‌ ده‌نـگ‌و پیتـه‌کانی‌و کاریگـه‌ری وشه‌کانیـشی‌دا هه‌ست پێ ده‌که‌ین، که‌وابوو ڕاست ئه‌وه‌یـه‌ بڵـێین: قورئـان کـه‌لامی خودایـه‌و به‌س!

## لایه‌نی ئیعجازی قورئان

یان ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه‌ی ده‌بێته‌ موعجیزه‌ هه‌رچۆنێك بێ‌و هه‌رچـی بـێ، بێگومـان لێکۆڵـه‌ره‌وه‌ی خـاوه‌ن ویـژدان: کـه‌ بـه‌دوا حـه‌ق‌و ڕاسـتی‌دا ده‌گـه‌ڕێ، له‌هـه‌ر ڕویه‌کـه‌وه‌ بیـه‌وێ تێـی بڕوانـێ، لـه‌ڕوی ئوسـلوب‌و شـێوازه‌وه‌، یـان لـه‌ ناحیـه‌ی زانسـت‌و زانیاریـیـه‌وه‌، یـان لـه‌ ڕوی ئـه‌و کاریگه‌رییـه‌ی: کـه‌ له‌سـه‌ر کۆمـه‌ڵگای ئـاده‌میزادی جێـی هێـشت‌و ڕه‌وڕه‌وه‌ی مێـژووی گـۆڕی‌و له‌هـه‌موو بواره‌کانی ژیانـدا گۆڕانکاری به‌رچاوی هێنایه‌ کایه‌وه‌.

ئه‌گه‌ر که‌سێك به‌ وردی له‌و دیاردانـه‌ بڕوانـێ ئیعجـازی بـه‌ زه‌قـی بـۆ ده‌رده‌که‌وێ، که‌وابوو جێی خۆیه‌تی که‌مێك هه‌ڵوێسته‌ بکه‌ین، له‌و سێ لایه‌نه‌ ئیعجازییه‌ی قورئان بدوێین (ئیعجازی لوغـه‌وی، ئیعجـازی زانـستی، ئیعجـازی ته‌شریعی).

# ئیعجازی زمانەوانی (الإعجاز اللغوی)

بێگومـــان عەرەبـــەكان هـــەر لـــە دروســـتبوون و پەیـــدابوونی لوغەتەكەیانــەوە، مومارەســەی هــەموو لایــەنێكی ئــەو لوغەتــەی خۆیــان كردووەو لەگەڵ زمانەكەیان ڕۆژگاریان تێپەڕاندووە، هەتا كامڵ و لوس بـووە، كەوتە تەمەنی هەرەتی لاوەتی و هێزو توانایەوە، پێگەیی و گرێ و گۆڵی تێـدا نەمان، بەو زمانە پێگەیشتووە شیعرو پەخشانیان دەربڕی، حیكمەت و پەندو ئەمثالیان پێ ئاراستە كردوە، زمـانڕەوانی و بەلاغـەت و تـەعبیریان بەشێوازی سەرەنج ڕاكێش و سیحراوی پێ گەیاندووە، دەمێك بە حەقیقەت و كاتێـك بـە مەجازو چەلێك بە كورتبڕی و وەختێكیش بە درێـژی بـە وتـارو ئامۆژگـاری و حـەدیـث و مەقالـە، وەلێ هـەتا لوغەتەكـە پێـشكەوتن و سـەركەوتنی بەدەسـت هێنـا بـێ و لـە بـواری بەلاغـەت و فەصـاحەتدا بـەرزی و ڕازاوەی بـە خۆیـەوە دیبێ، لـە پلـەی بـەردەرگای باڵەخانـەی بەلاغـەت و ئیعجازی قورئانـدا پـەل و پۆی شكاوەو وەستاوەو توانای هەنگاو هـەڵێنانی لێ بـڕاوە، بـە ملكەچی واقـی وڕماوەو لە ئاست ئوسلوبی سەرەنج ڕاكێش و شكۆمەندی قورئـان، بـە تـرس و خۆفـەوە وەسـتاوە، هـیچ سـەردەم و چاخێك نـەبووە لـە مێـژووی عـەرەبی‌دا لوغەكـەی گەشـەی كردبـێ گەیـشتبێتە ئـەوجی سـەركەوتن و ئیزدیهـار ئـیللا زانایـان و مامۆسـتایانی رابـەری زمانەكـە بـە سەرسـامی لەبـەردەم بـەیانی قورئاندا لە ئاست ئیعجازی لوغەوی ئەو كەلامـە نـاوازەدا وەسـتاون و سەرسـام بـوون ڕامـاون و تێمـاون و ناچـار دانیـان بـە بـەرزی ئوسلوبی قورئانـدا نـاوەو دەركیان بە نهێنیەكانی كردووە.

ئەمەش شتێكی سەیر نیـە، چونكە ئـەوە كـەلامی خودایـەو لـە زاتـی خۆیەوە سەرچاوەی گرتووەو شاكاری پەروەردگارە، بە جگـە لـە ملكەچی بـۆ گەورەیی ئەو كەلامەو دانـان بە دەسەوەسانی و دڵنیـابوون لـە عـاجزی خـۆت هـیچ شـتێكی تـر زانیاریـت زیـاد ناكـاو بـەنهێنیـەكانی ئاشـنا نابـێ، بـەڵام

دەستكردی ئادەمیزاد وانیە زانیاری تەواوو كامڵت دەربارەی، ڕێگات بۆ خۆش دەكا لێی زیادكەی، بەرپەرچی بدەیەوە، بۆیە ساحیرەكانی فیرعەون یەكەم پێڕو گرووپ بوون: كە ئیمانیان هێنا بە حەزرەتی موساو هاروون.[1]

ئەوكەسانەی لەخۆ بایی بوون كۆنترۆڵی كردون و هەڵپەو لافی بەخۆ نازینیان تووش بووە، هەوڵیان دا دەستدرێژی بكەنە سەر ئوسلوبی قورئانو بە خەیاڵ پلاوی خۆیان لاسای قورئانیان كردۆتەوە، ئاخاوتنێكیان لێوە صادر بوو پتر دەشوبهایە خەڵەفانو وڕێنەو گاڵتەو گەفۆو هەر حەیای خۆیان بردو بوونە پەندو گاڵتەچی چین لەدوا چینی ئادەمیزادو بەدەستبەتاڵیو چاو شكاوی مل شۆڕی پاشەو پاش كشانەوەو خەسارەتمەند بوون، ئەوانەش نموونەی خۆ بە پێغەمبەر زانەكانو هاو وێنەكانیان لە دەجاڵو فێڵبازو دەستبڕەكانی ڕۆژگارو هەڵخەڵەتاو هەڵخەڵەتێنەرەكان!!

بێگومان مێژوو گەلێك سوار چاكی مەیدانی زمانەوانی عەرەبی بینیونو پێیان ئاشنا بووە، كە هەریەكەیان بەدەوری خۆی چووەتە قوڵایی ئەدەبو ئوسلوبی ئەو زمانەو گۆی مەیدانیان بردۆتەوەو لەو زمانەدا قاڵ بوونو بە پەنجە ئاماژەیان بۆ كراوە، كەچی یەكێك لەوانە نەیتوانی كە ڕێگە بەخۆی بدا بیر لە موعارەضەی قورئان بكاتەوە، خۆ هەر كەسێكیان لەخشتە چووبێو ئەو لافەی لێ دابێ. بە ڕیسوایی و سوكو مەهتوكی گەڕاوەتەوە. بەڵكوو مێژوو ئەم دەسەوەسانیو داماوییەی لەسەر لوغەی عەرەبی تۆماركردوە لەهەرە چاخی سەركەوتنو ئیزدیهاریدا، لەهەرە ڕۆژگاری گەشەكردنو پێشكەوتنیدا.

لەوكاتەدا: كە قورئان نازڵ بوو لوغەی عەرەبی گەیشتبووە حاڵەتی كەماڵو ئەوجی بەهێزیو گەشەكردنی، هۆكارو عونصورەكانی كەماڵو پاڵفتەبوونی لە كۆڕو كۆبوونەوەكانو بازاڕەكانی عوكاظو مەربەدو

---

[1] النبأ العظيم ص٨١.

فیستیفاڵییە شیعرییەکاندا، بۆ دەستەبەر بوبوو، ئالەوکاتەدا قورئان نازڵ بوو تەحەددای ئەو عەرەبە زمانڕەوانانەی کردو بۆڕی دان، تەحەدداکەشی لەشێوەی جیاجیادا ئاراستە کرد، لە گرانەوە بۆ سوكو لە هەموو قورئانەوە بۆ دە سورەتو سورەتێكو نموونەیەکی، بە زەقی ئەم تەحەددایەی ئاراستە کردنو بێ باکانەو بێ منەتانە تەحەدداکەی نەك هەر ئاڕاستەی عەرەب، بەڵکوو ئاڕاستەی هەموو ئادەمیزادو جندۆکەشی کرد، کەس نەیتوانی پەنجە هەڵبڕێو بڵێ: من هەمو بێتە مەیدان!

بەڵێ قورئان تەحەددای عەرەبەکانی کردو کەسیان زاتی ئەوەی نەکرد پەنجەی بەرامبەریکردن هەڵبڕێ لە کاتێکدا ئەوان ئەهلی لوتبەرزیو فەخرو بەخۆزانینو سەرڕەقیو ملنەدانن، ئەگەر دەسەڵاتێکیان هەبوایە بۆ بەرامبەریکردنی، یان ئەغرەو درزو کەلەبەرێکیان تێدا بدۆزیایەوە، ئەو سەر شۆڕیو ملکەچییەیان قبوڵ نەدەکردو پەنایان بۆ شمشێرو رەمب نەدەبرد، بەڵام ئەوەتا مێژوو ئەوەی چەسپاندووە کە ئەوان دوای ئەوەی عاجزبوون لە بەرامبەریکردنی بە تەعبیرو بەیانو قەڵەمیان شکاو کۆڵەوار بوون، پەنایان بردە بەر تیرو شمشێرو راوەدوونانو تەنگ پێ هەڵچنینو زەبرو زەنگ.

لەوەدوا ڕۆژگار هاتنو چوونو بەسەر عەرەبو عەرەبی زاناندا تێپەڕینو ئیعجازی لوغەوی قورئان وەکوو کێوێکی سەرکەش مایەوەو لەبەردەمیدا عەرەبو ناعەرەب ملکەچو داماو وەستانو بیریان لەوە نەکردەوە لە ئاستی ئیعجازی قورئان نزیك ببنەوە چ جایی بەرامبەری بوەستن، چونکە دەسەوەسانیو عیجزەکە هێندە دیارو بەرجەستەیە تەماعی ئەوەی لە دڵ دەرهاویشتوون کە بیر لەوکارە ئەستەمە بکەنەوە!

بۆ هەتا هەتایەو تا دونیا دونیایە ئەو باڵا دەستیەی قورئان لەڕوی ئیعجازی لوغەوییەوە بەردەوام دەبێ!!

کـەس ناتوانــێ بڵــێ: هــیچ پێویــستیــیــەك لــە گــۆڕێ نــەبووە بــۆ موعـارەضـەكردنــی قورئـان، هەرچـەندە مـومكین بـووە، بۆیـە ئاسـەوارێكی موعارەضە ئێستا بەدی ناكرێ، چونكە بێگومان مێژوو شایەتە كە داخـوازیو پێویستی موعارەضە زۆر بە زەقیو ئیلحاحەوە هـەبووە بـۆ بەرپەچدانەوەی قورئان، ئەوەبوو لە دژی پەیامی قورئانو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) هەڵوێـستی ڕەقو رەتكردنـەوەیان نوانـد، لەلایـەكی تـرەوە قورئـان ڕقو كینەیانی وروژاند چڕنوقی توندی لێ گرتنو ڕقی هەڵساندن، تانـەو تەشـەری لێدانو بە بێ عەقڵو كەودەنو نـەفامو جاهیـل نـاوزەدی كـردنو بـە ئاشـكرا تەحـەددای كـردنو پەنجـەی خـستە چـاویانەوە بـە جۆرێـك: كـە ترسـنۆكی لەرزلێهاتووش بێتە جواب، كەچی ئەوان وێڕای ئەو لوتبەرزیو خۆبەزلزانیو كـەشو فـشەی دەیـانكرد، لـەو بـوارەدا كڕكـەوتنو هیـچیان پـێ نـەكرا، بـەڵام ڕێبــازی جۆراوجـۆری تریــان گرتەبــەرو فــرتو فێڵــی ســەیرو ســەمەرەیان بــەكارهێنا بــۆ ئــەوەی پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) واز لــە بانگەوازییەكـەی بێنـێ، تـەماعی مـاڵو سـامانیان خـستە بەردەسـت، بـەڵێنی ئــەوەیان دا ئەگــەر واز لــە بانگەوازییەكـەی بێنــێ بیكەنــە گـەورەو مــەلیكی خۆیـانو لـە قـسەی دەرنەچـن، كـە ئـەم پێـشنیارەیانی رەتكردنـەوە، ئـەمجار كەوتنە ئەزیەتدانو تۆمەت بۆ دروستكردنو دەنـگ لێ دابـڕینو موقـاطـەعـە كردنی خـۆیو هـەموو ئەوانـەی لەگـەڵیدا بـوون ئیمانیـان پـێ هێنـابوو، یـان لەڕوی خزمایەتیو عەصەبەیییەوە پشتیان گرتبوو، موقاطەعەیان كردن لـە هەموو ڕویەكەوە لە شیعبی ئەبو طالیبدا قەتیسیان كردن بۆ ئەوەی لە برسا بمرن.

بەوەشەوە نەوەستان وتیان ساحیرە، شێتە، بـەڵكوو كارگەیـشتە ئـەوە پلانــی كوشـتنیان بـۆ دارِشـت، پـێش ئـەوە ویـستیان حەبـسی بكـەن، یـان لـە مەككە دەری بكەن، بێگومان دەشیانزانی: كـە تاكـە ڕێگـا بـۆ بێـدەنگ كردنــی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەیە کەلامێك بخەنەڕوو وێنەی ئەو قورئانەی ئەو هێناویەتیو تەحەددایان دەکا، دەی باشە ئەگەر تروسکاییەکیان بەدی بکردایەو بیانزانیایە ئەوەیان بۆ دەکرێ ئەو ڕێبازەیان دەگرتە بەرو بێدەنگیان دەکرد!

وەلێ ئەوان هەموو ڕێگایەکیان گرتە بەر جگە لەم ڕێگایە، ئەوان بەند کردنی پێغەمبەرو دەرکردنی لە مەککەو کوشتنیو نانەوەی دوژمنایەتی لەنێوان قوڕەیشدا بەلایانەوە ئاسانتر بوو لەوەی هەوڵ بدەن کەلامێکی وەکوو قورئان، یان تەنانەت سورەتێکیشی بخەنەڕو، دەی ئەگەر ئەمە عاجزی نەبێ چی عیجزو دەسەوسانی‌یە؟ لە کاتێکدا ئەو قورئانەی عەرەب نەیانتوانی موعارەضەی بکەنو لە بەرامبەریدا دەسەوەسان جۆش دامانو هەر بە زمانی ئەوان بوو لەو پیتو وشەو ڕستانە پێکهاتبوو کە ئەوان ئاخاوتنیان پێ دەکردو بەگوێرەی قاعیدەو یاسای زمانی ئەوان ڕستەکانی ڕێکخرابوون، لەشێوەی پێکهاتەی حەرفەکانیو ناسکیو ئاوداری وشەکانیو شیرینی ئوسلوبو شێوازیو جەرەسو موسیقایو موراعاتی موقتەضای حاڵ لە جۆرەکانی دەربڕیندا، بە ڕستەی ئیسمیو ڕستەی فیعلیو نەفیو ئیثباتو ذیکرو حەذفو تەعریفو تەنکیرو تەقدیمو تەئخیرو حەقیقەتو مەجازو ئیجازو ئیطنابو عمومو خصوص ئیطلاقو تەقییدو نەصو فەحواو ئەم جۆرە شتانەدا جوداواز بوو لە ئاخاوتنی ئەوان.

قورئان گەیشتبووە تۆپەڵاکی ئیعجازو دەسەڵاتی عەرەبەکان لە ئاستیدا داماوو دەسەوەسان بوون، لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: (الولید)ی کوڕی (المغیرة) هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بڕێ لە قورئانی بەسەردا خوێند، وەلید ڕوخساری گۆڕاو دەتگوت دڵی نەرم بووە بۆ ئیمان هێنان، ئەم حاڵەتەی بەسەر وەلیددا هات بە ئەبو جەهل گەیشتەوە،

ئەبو جەهل هات بۆلای، وتی: مامی بەڕێزم قەوم و خوێشت دەیانەوێ پیتاکت بۆ کۆبکەنەوە، چونکە بیستوویانە تۆ چویتە لای موحەممەد بۆ ئەوەی شتێکت لێی دەستبکەوێ، وەلید وتی: قوریش دەزانن من لە دەوڵەمەندترین ساماندارانی قوریشم و پێویستم بە ماڵ کۆکردنەوەی ئەوان نیە، وتی: کەوابێ قسەیەك دەربارەی موحەممەد بکە بە جۆرێك نەتەوەکەت بزانن تۆ دژی پەیامی ئەوی و ڕەقت لێیەتی، وتی: چی بڵێم؟؟ سوێندم وابێ، کەس نیە لە قورەیشدا بە ئەندازەی من شارەزای شیعر بێ بە ڕەجەز و قەصیدەو چامەیەوە، تەنانەت بەو شیعرانەش کە پاڵ جندۆکەکان دراون، سوێندم بە خودا ئەوەی موحەممەد دەیخوێنێتەوە لە هیچ کام لەو جۆرە شیعرو ئاخاوتنانە نیە کە من تێیاندا شارەزام! سوێندم بەخودا ئەوەی ئەو دەیڵێ: ئەوەندە شیرین و ڕەوانە، ئەوەندە هەست هەژێن و کاریگەرە، ئەوەندە بەردارو سودبەخشە، ئەوەندە ڕەوان و سازگارە پیاو سەرسام دەکا، بەخوا ئەو کەلامەی ئەو سەر هەموو کەلامێك دەکەوێ و هیچ کەلامێك بەسەریا باڵادەست نابێ، هەموو شتێك دەخاتە ژێر خۆیەوەو تێکی دەشکێنێ و بۆڕی دەدا، ئەبو جەهل وتی: مامەگیان قەومەکەت وازت لێ ناهێنن و ڕازی نابن هەتا دەربارەی ئەو کەلامە قسەیەك نەکەی دژی بێ، وتم: لێم گەڕێ بیری لێ دەکەمەوە، کە ماوەیەك بیری کردەوە، ئەمەی پڕماند وتی: (سحر یؤثر) ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا - المدثر/١١﴾.[1]

بەڵێ مرۆڤ چەندێك لە قورئان بڕوانێ و سەرەنجی بداتێ نهێنی زیاتری بۆ دەردەکەوێ دەربارەی ئیعجازی لوغەوی ئەو کەلامە، ئەم ئیعجازەی لە یاسای دەنگی بەدیعی بە جەرەسی پیتەکانی دەست دەکەوێ، کاتێك گوێی لە بزوێن و سڕکراو مەددەو غونەو ناوبڕو کۆپلەکانی دەبێ، گوێچکە لێی وەڕز نابێ و حەزی لێیە زیاتری لێ ببیستێ.

---

[1] اخرجه الحاكم/٣٨٧٢ والبيهقى فى دلائل النبوة/١٩٨/٢.

ئـەم ئیعجـازەی هەسـت پـێ دەکـا لـە وشـەکانیدا: کـە هەریەکـەیان لەشوێنی شیاوی خۆی دانراوە، وشەیەکی تێدا نیە بگوترێ زێدەیەو پێویست نیـە، خوێنـەرو توێـژەر شـوێنێکی تێـدا بـەدی ناکـا بڵـێ: ئێـرە پێویـستی بـە هەبوونی وشەیەکی تر هەیەو نەقصە.

ئەم ئیعجازە گیر دەکەوێ لە شێوازە جۆراوجۆرەکانی خیطابیدا کـە تێکڕای خەڵکی لێك نزیك دەکاتەوە لەوەی هەرکەسە بەگوێرەی عەقڵی خۆی لێی تـێ دەگـا، هـەموو کـەس بـەپێی عـەقڵ‌و زیرەکـی‌و پێداویـستی خـۆی بـە خاص‌و عامیانەوە بەشی خۆی لێ هەڵدەکرێنێ ﴿وَلَقَـدْ يَـسَّرْنَا الْقُـرْآنَ لِلـذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ – القمر/١١﴾.

ئـەو ئیعجـازەی دەسـت دەکـەوێ لـەوەدا قەناعـەت بـە عـەقڵ دەکـاو خۆشی بە عاطیفە دەگەیەنێ، بەجۆرێك پێویستیاتی نەفسی ئادەمیزاد دابین دەکـا لـەڕوی فکـرو ویژدانـەوە بەشـێوەیەکی هاوتـاو هاوشـان نـەهێزی عـەقڵ هەڵدەچـێ بەسـەر هێـزی ویـژدان‌و نـەهێزی وژدان تـەنگ بـە هێـزی فکـر هەڵدەچنێ.

بەڵێ: هەتا لاپەڕەکانی هەڵبدەیەوەو تێی رامێنی‌و سـەرەنجی بدەیـە بەڵگەی ئیعجازی لوغەوی قورئان‌و تەحەدداکردنەکەی دیارترەو باشتر خـۆی دەنوێنێ‌و بە زەقتر دەبینـدرێ.

قازی ئەبو بەکر (الباقلانی) دەڵێ: ئەوەی عەنتیکەیی نەظمی قورئان لەخۆی گرتووە، ئیعجازی لێ پێـك هـاتووە، چـەند وجوهـو شـێوازێکە، لەوانـە هەنــدێکی پەیوەنــدی بـــە ڕســـتەوە هەیـــە، دەگەڕێتـــەوە بـــۆ پێکهێنـــانی جوملـەکانی، چـونکە نـەظـم‌و ئوسـلوبی قورئـان وێـڕای گـۆڕانی شـێوەکانی ئاخاوتنی، جوداوازی باس‌و چیرۆك‌و ئـەحکامی لـەخۆی گرتـوون، بـەدەر لـە یاسـای هـەموو کـەلام‌و ئاخـاوتنی ئـادەمیزاد، جـوداوازە لـەوەی ئـەوان پێـوەی راهاتوون لە ڕێکخستنی خیطاب‌و گوفت‌و گۆیـان، شـێوازو ئوسـلوبێکی هەیـە

تایبەتە بەخۆیەوە، بەو ئوسلوبە نـاوازەو گۆڕینی لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر، لەشێوازی ئاخاوتنی عـادەتیو بارپێوەگیراوی ئادەمیزاد جیا دەبێتـەوە، چونکە ئەو شێوازو ڕێبازانەی کەلامی بەدیعو مـەنظوم پێوەی پابەنـد بێ، دابـەش دەبـێ بـۆ عروزەکـانی شـیعر بـە هـەموو جۆرەکانیـەوە، پاشـان بـۆ جۆرەکانی کەلامی مەوزونی بێ سەرەواو قافیە، ئەمجار بۆ جۆرەکانی کەلامی ڕێکخراو مەسجوع، دەوایی بۆ کـەلامی ڕێکخـراوی مـەوزونی غـەیر مەسـجوع، ئەمجار بۆ کـەلامێك مورسـەل بـێ، بتـەوێ بـە هۆیـەوە نیـشانە بپێکـیو سود بگەیـەنیو مـەعانی لێـرەو لـەوێ بەشـێوەیەکی بـەدیعو عەنتیکـەو تـەرتیبی جـوان، هەرچـەندە مـەوزونیش نـەبێ، ئەمـەش دەشـوبهێتە کـەلامێك (جەڕەبابە)و تەکەللوفی تێدا نەبێو بە نقەنق دەرنەبڕدرێ.

دەی بێگومان ئێمـە زانیومانـەو دەزانـین ئوسـلوبی قورئـان بـەدەر لـە هـەموو ئـەم جـۆرە کـەلامو شـێوازانەیە لـە هـەمووی جـوداوازە، کـەلامێکی مەسجوع نیە، لەشێوەی شیعر نیـە، ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێ: کـە لـە جۆری کەلامی ئادەمیزاد نەبێو لەگەڵ شێوازەکانی ئەوان نەیەتەوە، دیـارە خـاریجی عادەیـەو مـوعجیزو سورئاسـایە، ئەمـەش تایبەتمەندییەکـە بـۆ هـەموو قورئانەو جوداوازییەکە لە هەمووی‌دا بەرجەستە بووە.

عـەرەب کـەلامێکیان نیـە ئـەم فەصـاحەتو غەرابـەتو تەصـاریفە عەنتیکانـەی لـەخۆ گـرتبن، ئـەم حەمکـە مەعانییـە ناسـكو فەوائیـدە دەوڵەمەندو حیکمەتە زۆرەی تێدا بـن، ئـەو هـەموو موناسـەبە بەلاغییانـەو لێکچونو تەشـبیهاتی ناسـكو سـەرەنج ڕاکێـشی لـەخۆ گـرتبن وێـڕای ئـەوە کـەلامێکی زۆر دورودرێـژەو بـە قـەبارە گەورەیـە، هـەرگیز عـەرەب خـاوەنی کەلامی لەوجۆرە نـەبوون، بـەڵێ چـەند کەلیمەیـەکی کـەمو ئـەژمارکراو پـاڵ حـەمێکی عـەرەب دراوە، چـەند چـامە شـیعرێك پـاڵ شـاعیریان دراوە، ئیختـیلالو ئیختیلافی تێدا دیارە تەکـەللوفو نقـەنقو تەعەسـوفی تێدا

بەرجەستە بووە، کەچی قورئان وێڕای درێژیو زۆری، لە فەصاحەتو بەلاغەتی خۆیدا کەمی نەهێناوەو لە تۆپەڵاکی فەصاحەتو بەلاغەتدا خۆی دەنوێنێو دەق ئەم وەصفەی پەروەردگار کالآیەکە بە باڵای بڕاوە ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاء وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ – الزمر/٢٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا – النساء/٨٢﴾ هەواڵی ئەوەمان دەداتێ کەلامی ئادەمیزاد کە درێژ بۆوە بەرزونزمیو جوداوازیو هەڵەتو پەڵەتی تێدەکەوێ.

بەڵام نەظمە سەرسوڕهێنەرەکەی قورئانو پێکهاتە عەنتیکەیی‌یەکەی بەرزونزمیو دژایەتی تێناکەوێ وێڕای ئەو هەموو باسو خواسانەی لەخۆی گرتوون لەگەڵ ئەو حەمکە شێوازو ئوسلوبەی تێیدا کۆکراونەوە لە ذیکرو چیرۆكو وەعزو ئامۆژگاریو بەڵگە هێنانەوەو حیکمەتو ئەحکامو بیانوو ئاگادارکردنەوە وادەو هەڕەشەو مزگێنیو ترساندنو باسی ڕەوشتی بەرزو صیفەتی جوانو سیيەرو مێژوو گەڵێ شتی ترو لایەنی تر کە لەخۆی گرتوونو ئاراستەیان دەکا تۆزقاڵێك لە ئاستی بەلاغەتو فەصاحەت دانابەزێ، ئێمە دەبینین کەلامێکی بەلیغ تەواو شاعیرێکی زەمانڕەوان، وتاربێژێکی قسە زوڵاڵو بەلیغ جوداوازی لە قسەکانیدا ڕودەدا بەگوێرەی گۆڕانکاری ناوەڕۆکی ئەو دەقەی ئاراستەی دەکا، شاعیری وا هەیە لە مەدحو پێداهەڵدانا سەرکەوتووە، لە ذەمو هەجودا کورت دێنێ، هەیە لە هەجودا باڵا دەستە لە مەدحدا دەستکورتە هەیە لە پێشکەشکردنو تەقریظ کارامەیە لەسەرەخۆشیو دڵدانەوەدا تیشکاوە، هەیانە لە وەصفی حوشترو ئەسپو ڕۆیشتنی شەو سەرکەوتووە، یان لە وەصفی باخو گوڵو گوڵزاردا یان وەصفی شەرابو دڵداریو جێژوانو گریان

لەسەر تەپولکەو شوێنەوارو شتی ئاوا کە شیعر لەخۆی دەگرێ شارەزایەو گۆی مەیدانی بردۆتەوە.

بۆیە نمونە بە (أمرؤ القیس) دێندرێتەوە لە شیعری ئەسپ سواریو، لە سوارچاکیدا دەڵێن: لەو بوارەدا سەرکەوتووە، هەروا دەڵێن: (النابغة) کە ترسا، زوهەیر کە تەماعی بەرنرا، بەهەمان شێوە جوداوازیو بەرزو نزمییان تێدەکەوێ لەبواری خوطبەو نامەو باقی جۆرەکانی کەلامدا.

## سەرئاسایی قورئان لەبواری زانستدا (الإعجاز العلمی)

زۆر لە ئادەمیزاد هەڵە دەکەن: کە سورن لەسەر ئەوە قورئان هەموو تیۆرێکی زانستی لەخۆ گرتبێو ئاماژەی بۆ بکا، هەر لەگەڵ تیۆرێکی زانستی دۆزرایەوەو راگەیاندرا، هەوڵ دەدەن بنەماو مەحمەلێکی لە قورئاندا بۆ بدۆزنەوە، بە تەکەللوفو زۆرەملێ دێن ئایەتێك تەئویل دەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ تیۆرەکەدا بگونجێ!!

مەنشەئو سەرهەڵدانی ئەم جۆرە هەڵانە لەوەوە پەیدا بووە: کە زانستە جیاجیاکان هەر ڕۆژەو تیۆرێکی تازەیان تێدا دەدۆزرێتەوە، هەتا کۆمەڵگا پێش بکەوێو گەشە بکاو زانست پێش بکەوێ تیۆرە زانستییەکان تازە دەبنەوەو تیۆری تازە سەر هەڵدەدەن، تیۆریش خۆی لە خۆیدا لەسەرەتاوە کەموکورتی تێدایە، یان جاری وا هەیە هەڵەی تێدەکەوێ، تیۆرەکە بەم شێوەیە دەخرێتە ژێر ئەزمونو تێڕوانینەوە تا دەگاتە ئاستێك لە راستی نزیك دەبێتەوەو سەرەنجام دەگاتە پلەی یەقین.

هەر تیۆرێك لەو تیۆرانە لە ڕێگای حەدەسو گریمانەوەو تەخمینەوە سەرهەڵدەداو دەخرێتە ژێر ئەزمونو تەجروبەوە، هەتا بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار دەگاتە پلەی یەقینو دەسەلێو دەچەسپێ، یان دەردەکەوێ تیۆرێکی پوچو بێ بناغەو هەڵەیە، بۆیە هەموو تیۆرێك موعەرەضە بۆ گۆڕانکاری

تێیداو هەڵوەشانەوەو رەتکردنەوەی، تەنانەت زۆر لە تیۆرەکان کە بوونە قاعیدەو یاسای زانستیو خەڵك وایان زانیوە: کە موسەلەماتو حەقائیقی عیلمین، لە ناکاوێك بن هەڵۆڵ بوونو هەڵوەشاونەوەو ترێل بوونو ئەرکو ماندبوونی خەڵكو سەرفکردنی دارایی زۆر تێیاندا بەفیڕۆ چووەو سەرلەنوێ لێکۆڵەرەوەو زاناکان دەستیان کردۆتەوە بە ئەزمونو تەجروبەی تر.

لە راستیدا ئەوانەی تەفسیری قورئان بە مەسائیلی عیلمی دەکەنو سورن لەسەر ئەوە هەر مەسئەلەیەکی زانستی لە ئاسۆی ژیانی زانستدا سەرهەڵبدا قورئانی پێ تەفسیر بکەنو لافی ئەوە لێ بدەن کە ئەو تیۆرە زانستییە لە قورئاندا هەیەو ئاماژەی پێ کردووە، بیانەوێو نەیانەوێ خراپە لەگەڵ قورئان دەکەنو پێیان وایە کاری باش دەکەن! چونکە ئەم مەسائیلانەی بە تیۆر ناوزەد دەکرێنو ملکەچی یاسای پێشکەوتنی زانستینو گۆڕانکارییان بەسەردا دێ، جاری وا هەیە هەر لە بناغەوە نەظەرییەکە هەڵدەوەشێتەوەو پوچو بێ نرخ دەبێ، جا کە ئێمە رێگە بە خۆمان بدەین قورئان بەو تیۆرانە راڤەبکەین هەڵوەشانەوەی تیۆرەکە سەردەکێشێ بۆ هەڵوەشانەوەی تەفسیرەکەو دەکەوێنە بەر رەخنەی ئەمو ئەوو کۆمەڵێك تەناقوضاتو شتی دژ بە یەك لەناو تەفسیرەکە کۆدەکەینەوە، دەبێ هەر لەگەڵ تیۆرو قاعیدە زانستییەکە گۆڕا، یان کشوفاتی تازە پەیدا بوونو تیۆرە کۆنەکەی هەڵوەشاندەوە، یەقین هاتو تەخمینو مەزەندەکراوی وەلا نا، دەبێ ئێمەیش ناچار تەفسیری ئایەتەکە بگۆڕینو شوێن تیۆرە تازەکە بکەوین، وێدەچێ پاش ماوەیەکی تر ئەمیش بە دەردی تیۆری پێشوو بچێو هتد.......

لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەتو عەقیدەیە، خیطاب ئاراستەی ویژدان دەکاو هۆکاری گەشەکردنو بەرزبوونەوەی تێدا

دەخولقێنێ، خێرو فەضیلەو مەردایەتی تێدا دەڕوێنێو دەستوری ژیانەو سەرچاوەی ئەحکامو ئەخلاقەو کەتەلۆکی بونەوەرە.

ئیعجازی عیلمی لە قورئاندا مانای ئەوە نیە قورئان هەموو ئەو تیۆرە زانستیانەی بەرهەمی تێکۆشانی ئادەمیزادنو دەخرێنە ڕوو گۆڕانکارییان تێدا دێتە دی بیانگرێتە خۆو کۆیان بکاتەوە، بەڵکوو ئیعجازی عیلمی قورئان لەوەدا چڕ دەبێتەوە: کە هەمیشە ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ بیرکردنەوە لە بوونەوەرو تێڕامان لە دیاردەو گۆڕانکارییەکانیو لێکۆڵینەوە لە هۆکاری ئەو گۆڕانکارییانە، ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ تێڕوانینو بیرکردنەوە هەرگیز جمەوجوڵی عەقڵ پەك ناخاو هەمیشە دەیەوێ لە بیرکردنەوەدا بێ، قەت نابێتە لەمپەڕو کۆسپ لەبەردەم زانستو زانیاریدا، هیچ نامەیەکی تری ئاسمانی پێش قورئان بەو شێوە گرنگی بەو بوارە نەداوە وەکوو قورئان گرنگی پێداوە.

هەر مەسئەلەیەکی زانستیو هەر قاعیدەو یاسایەکی ئەو بوارە بچەسپێو بگاتە پلەی یەقینو راستی بچەسپێ بەبێ شك قورئان پشتگیری دەکاو دژی ناوەستێ، هەر تیۆرێکی لەو جۆرە هاتۆتە دی لەو شتانەیە کە قورئان خەڵکی بۆ هەڵناوەو بەفکرو بیری ساغی ئەژمار کردووە، هەرگیز دژی نەوەستاوەو ناوەستێ، سەیری مێژوو بکەو بڕوانە: لەو دەمەیەوە زانیارییەکان گەشەیان کردوەو زانیاری پێشکەوتو تیۆرەکان زۆر هاتنە کایەوە هیچ کام لە تیۆرە چەسپاوو سەلمێنراوەکان دژی ئایەتێکی قورئان نەوەستان، ئەمەش بۆخۆی موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانو نیشانەی سەرئاسایی قورئانە.

قورئانی پیرۆز بیرکردنەوەی راستو دروستو تێڕامانی زانستیانە لە بوونەوەر بە هۆکارێك لە هۆکارو وەسیلەی ئیمان هەژمار دەکاو بە ڕێبازێکی عیبادەت ئامێزو زیادبوونی ئیمان حسێب دەکا!!.

قورئانی پیرۆز موسوڵمان هەڵدەنێ بۆ بیرکردنەوە لە بوونەوەر، لە مەخلوقاتی خودا لە ئاسمانو زەویدا ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ – آل عمران/١٩٠ – ١٩١﴾ ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ ئەوەی بیر لەخۆی بکاتەوە، لە نەفسی خۆی بڕوانێ، سەیری ئەو زەوییە بکا کە خەریکی ئاوەدانکردنەوەیەتی، بڕوانێ بۆ ئەو سروشتو دیاردانەی دەوروبەریو لێیان وردبێتەوە ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى – الروم/٨﴾ ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ، وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ – الذاريات/٢٠ – ٢١﴾ ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ، وَإِلَى السَّمَاء كَيْفَ رُفِعَتْ ، وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ، وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ – الغاشية/١٧ – ٢٠﴾.

هەستی زانیاری لە ئادەمیزادەکاندا دەوروژێنێ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە، تێبگەنو عەقڵو هۆشی خۆیان بخەنە گەڕ.

﴿كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ – البقرة/٢١٩﴾.

﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ – الحشر/٢١﴾.

﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ – يونس/٢٤﴾.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ – الرعد/٣﴾.

﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ – الأعراف/٣٢﴾.

﴿قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ – الأنعام/٩٧﴾.

﴿انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ – الأنعام/٦٥﴾.

﴿قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ – الأنعام/٩٨﴾.

قورئانی پیرۆز ڕێز لە زانایان دەگرێو پلەوپایەی موسوڵمان بەهۆی عیلمو زانستەوە دەخاتە ئاستی بەرزو دەفەرموێ: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا

مِنكُمْ وَالَّـذِينَ أُوتُـوا الْعِلْـمَ دَرَجَـاتٍ – المجادلـة/١١﴾ يەكسانى ناخاتـە نێوان ئەوانـەی زانـان‌و ئەوانـەی نـەزانن؛ هـەرگیز لـە یـەك ئاسـتدا نـین نێوانیـان عاسمـان‌و ڕێـسمانە ﴿قُـلْ هَـلْ يَـسْتَوِي الَّـذِينَ يَعْلَمُـونَ وَالَّـذِينَ لَـا يَعْلَمُـونَ – الزمر/٩﴾ فەرمان بە موسـوڵمان دەكا: كـە لـە خـودا بپاڕێتـەوە زانیـاری زیـاد بكـاو ڕۆژ بـەڕۆژ ئاسـتی زانیـاری بـەرز ببێتـەوە ﴿وَقُـل رَّبِّ زِدْنِـي عِلْمًـا – طـه/١١٤﴾.

پـەروەردگار دیـاردەی زانـستی فەلـەك‌و ڕووەك‌و چـینەكانی زەوی‌و گیانـداران كۆدەكاتـەوەو رایانـدەنوێنێ‌و دیانكاتـە نیـشانەو دیـاردەی لـەخودا ترسان‌و دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ الـسَّمَاء مَـاء فَأَخْرَجْنَـا بِـهِ ثَمَـرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِـنْ عِبَـادِهِ الْعُلَمَـاء إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ – فاطر/٢٧ – ٢٨﴾ بەڵێ وەكـوو گـوترا: ئیعجازی عیلمـی لــە قورئانــدا بریتییــە لــەوە: كــە موســوڵمانان هەڵــدەنێ بــۆ بیركردنــەوەو تێڕامان‌و دەرگای مەعریفەو زانـستیان بـۆ دەكاتـەوەو بانگەوازییان دەكا بـۆ چوونە ناوی‌و هەوڵدان‌و لێكۆڵینەوەو توێژینەوەو بـەراوردكردن‌و وەرگـرتن‌و قبوڵكردنی هەرچی تـازەو بەرهـەمی زانـستە بـە یـەقینی‌و لـە پلـەی تیـۆری تێپـەڕیوەو وێـڕای ئەمانـە لـە قورئـان‌و ئیـشارات‌و تیلنیـشانی زانـستی هـەن هێنــراون‌و ئاراســتەكراون بــۆ هیدایەتــدان‌و ڕێنمــونی ئــادەمیزاد، وەكــوو سەرمەشق‌و نموونە، بـۆ ئـەوەی هەڵوێـستەی لەسـەر بكـاو لـە دەرگـای عـیلم‌و زانست بداو لە نهێنی بوونەوەر بكۆڵێتەوەو بیر لەم تێكەو لێكانـە بكاتـەوەو ئیمانی پتر دامەزراو بێ.

متوربەكردنی ڕووەك بە دوو شێوە دێتە دی، ڕوەكی واهەیـە متوربـە بوونەكەی ذاتییە، واتـە: گـوڵی خـودی ڕووەكەكـە نێـرو مێـی لـەخۆگرتوون‌و خـۆی متوربـە دەكـاو بـەروبوم دەدا، هـی وایـش هەیـە تـۆمی نێرەكـە

لەخۆی نیەو لە دەرەوە دەهێندریٚو مێیەکەی پێ متوربە دەکرێ، وەکوو درەختی خورما بۆخۆی هەر (عضوی) مێینەی تێدایە، تۆمی نێرینەی لە دەرەوە بەهۆی باوە بۆ دەهێندریٚو متوربە دەبێ، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ - الحجر/٢٢﴾.

ئۆکسجین مادەیە بۆ هەناسە دانی ئادەمیزاد زەروریو پێویستە، ئەم مادەیە لە چینە بەرزەکانی هەوادا کەم دەبێتەوە، هەتا مرۆڤ بەرەو بۆشایی بۆلای ئاسمان سەربکەوێ پتر هەست بە تەنگە نەفەسی دەکاو هەناسەدانی زەحمەت دەبێ، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء - الأنعام/١٢٥﴾ لەوەپێش باوەڕ وابوو کە (ذرە = گەردیلەیەکە) قبوڵی کەرتبوون ناکا، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ - يونس/٦١﴾ دەی کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ﴾ مانای ئەوەیە خودی (ذەڕڕە)ش ورد دەکرێ!

لە بارەی زانستی جیناتدا دەفەرموێ: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ، خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ - الطارق/٥ - ٧﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاء إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا - سورة الحج/٥﴾.

دەربارەی یەکپارچەیی بوونەوەرو پێویستی ژیان بۆ ئاو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ - الأنبياء/٣٠﴾.

ئەم ئیشاراتو تیلنیشانە زانستیانەو نمونەی ئەمانە لە قورئاندا زۆرو جۆراوجۆرن، لە میانەی هیدایەتی خوداییدا هێنراون بۆ ئەوەی

ئادەمیزاد عـەقڵی خـۆی بخاتـە کـارو لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەیان تێدا بکـاو نهێنی بونەوەری بۆ دەربکەوێ، ئیمانی بـە خـالقی دانـاو تـاکو تـەنیا بـەهێز ببێ.

مامۆستا سەید قوتب لە تەفسیری ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيـتُ لِلنَّـاسِ وَالْحَـجِّ – البقـرة/١٨٩﴾دا دەفـەرموێ: وەڵامەکە ڕوی کـردە واقیعـی ژیـانی ئادەمیزادەکـان واقیعـی عەمـەلییان، ڕوی نـەکردە موجـەرەدی زانستە نەظەریەکـەیان، وەزیفـەو سـودی مـانگی بـۆ ڕونکردنـەوە لـە واقیـعو ژیانیانـدا، لـەبارەی سـوڕی فەلـەکو زیـادبوونو کـەمبوونی قـەبارەی مـانگ قسەی بۆ نەکردن، لە کاتێکدا ئەوە لە چوارچێوەی پرسیارەکەیاندا بـوو..... بۆ ئاوا وەڵامی نەدانەوەو پرسیارەکەی ئەوانی ئیهمال کرد؟ بۆ ئـەوەی پێیـان بڵێ: قورئان بۆ کاری گەورەتر لەو باسە جوزئیانە نازڵ کـراوە، قورئـان بۆیـە نـەنێردراوە زانیـاری فەلـەکیات شـی بکاتـەوە، بۆیـە نـازڵ نـەکراوە کتێبێکـی تەندروستی، کیمیایی......... بێ وەکوو هەنـدێ کەسـی موتەحـەمیس هـەوڵ دەدەن ئـەم جۆرە عیلمانـەی تێدابنو بیکەنـە سەرچاوەو مـەرجیع بـۆ ئـەو جۆرە عیلمانـە، یـان وەکـوو هەنـدێ لەوانـەی تانەوتەشـەر لـە قورئـان دەدەن، دیانەوێ قورئان بخەنە بەرەیەکەوە دژی ئەو عیلمانـە بـێ، بێگومـان هـەردوو هەڵوێستەکە بەڵگەی ئەوەن لـە قورئـان حـاڵی نـەبوون، هەسـت بـە سروشـتی قورئانو وەزیفەکەیو پانتاییـیە گشتیەکەی ناکەن.

لە حەقیقەتو ڕاستیدا مەجالی کاریگەری قورئانو ئـەو پانتـاییـیـەی لـەخۆی گرتـووە نەفـسی مـرۆڤو ژیـانی مرۆڤـە بەوپـەڕی بەرفراوانییـەوە، بێگومان وەزیفەی قورئان ئەوەیـە تەصـەورێکی گشتگیر بـۆ وجـود بخاتـەڕوو پەیوەستی بکا بە خالیقو بەدیهێنەریەوە، هەروا تەصـەورێك بکـا بـۆ دانـانی مرۆڤ لەم بوونەوەرەداو پەیوەندی بە خالیقەوە، ئەمجار لەسـەر بنـەمای ئـەم تەصـەورو وێنانـە یاسـایەك دابنـێ بـۆ ژیـان، ڕێگـە بـدا مـرۆڤ تێیـدا هـەموو

هێزەکانی خۆی بەکاربێنێ لەنێوان ئەو هێزانەو هێزە عەقڵییەکانی، کە لەسەر (استقامة)و ڕاستاڵی هاتبنە کایەوەو پەروەردەبوون، ئەمجار ڕێگەیان بۆ بکاتەوە بای باڵی خۆیان بدەنو بکەونە گەڕو لێکۆڵینەوەی زانستی لەو سنورو پانتاییەی بۆ مرۆڤ ئاچوغە بە تەجرەبەو ئەزمونو پرۆڤە، بۆ ئەوەی سەرەنجام بگاتە نەتیجەیەك، یان چەند نەتیجەیەك کە طەبیعەتی نەتیجەی کۆتایی نینو نەتیجەی ڕەهاو بێ سنوریش نین.

بەڕاستی من سەرم سوڕدەمێنێ لە کالفامی کەسانێك خۆ بە لایەنگری قورئان دەزانن و موتەحەمیسن بۆیو هەوڵ دەدەن شتێکی پاڵ بدەن کە هی ئەو نیە، مانایەکی بۆ دیاری بکەن کە ئەو مەبەستی نیە، هەوڵ بدەن جوزئیاتێك لە زانستی (طب)و کیمیاییو فەلەکی لێ دەربێننو ئەم جۆرە شتانە، پێشیان وایە بەم کارەیان ڕێزو گەورەیی دەدەن بە قورئانو بەرز ڕایدەگرن!!

بێگومان حەقیقەتە قورئانییەکان حەقائیقی کۆتاییو ڕەهاو گومانبڕن، هەڵوەشانەوەو بەتاڵبوونەوە هەڵناگرن، وەلێ ئەوەی لێکۆڵینەوەی ئادەمیزاد بە دەستی دێنێ، هەر هۆکارو ئامێرێکی پێشکەوتوو بەکاربێنێ بۆی نەتیجەو ئاکامەکەی ناچێتە خانەی حەقیقەتی کۆتاییو ڕەهاوە، بەڵکوو موقەییەدە بە سنوری تەجرەبەو توێژینەوەکەو بارودۆخی ئەو لێکۆڵینەوەو توێژینەوانەو ئەدەواتو کەرەسەی بەکاری هێناوە، بەڕاستی هەڵەیەکی گەورەو کارێکی نامەنهەجییانەیە – تۆ بێی بە حوکمی مەنهەجی زانستیانەی ئینسانی خۆی، حەقائیقی کۆتایی قورئانی پەیوەست بکەین بە حەقائیقی ناکۆتایی کە بریتییە لەو ئاستەی زانستی ئادەمیزاد پێی دەگاو ئیتر دەوەستێو چیتر ناتوانێ هەنگاو بەرەو پێشەوە بهاوێ!

ئەمە بە نیسبەت قیاسو پێکگرتن بە حەقائیقی عیلمییەوە مەسەلەکە ڕونترو ئاشکراترە لەو تیۆرو گریمانەو فەرەضیاتانەی ناویان

لێناون توێژینەوەو حەقائیقی عیلمی: کە هێشتا لە واقیعدا نەسەلماون‌و نەچەسپاون، هەردەم قابیلی گۆڕان‌و تەعدیل‌و لێ کەمکردن‌و لێ زیادکردنن، بەڵکوو هەریەکێ لەو تیۆرانە قابیلی ئەوەن سەرلەبەر هەڵوەشێتەوەو پوچ بێتەوەو بچێتە خانەی هەڵەکانی ئادەمیزادەوە، ئەمەش لە ئاکامی دەرکەوتنی کەرەسەی کەشفی تازە، یان تەفسیرو راڤەی تازە بۆ کۆمەڵێك تێبینی‌و مولاحەظاتی کۆن!!

بەڵێ هەر موحاوەلەو هەوڵدانێك بۆ پەیوەست کردنی ئیشاراتی قورئان گشتگیر بەو تیۆرو ئاکامەی زانستی مرۆڤ دەیگاتێ، یان تەنانەت بەو حەقائیقە زانستیانەی مرۆڤ: کە نەبوونە حەقیقەتی عیلمی ڕەها ئەوە لە ڕاستی‌دا هەڵەیەکی مەنهەجی بنەڕەتییە، هەروەکوو چۆن سێ ماناى تر، یان سێ نیشانەی تری تێدان:

یەکەمیان: تێشکان‌و هەزیمەی ناخەو لە داخڵدا دەڕوخێن، واتە هەندێ کەس وا خەیاڵ دەکەن عیلم باڵادەست‌و خاوەن ئاڵاو رابەرەو قورئان شوێنکەوتوویەتی، لێرەوە هەوڵ دەدەن ئیثباتی راستی قورئان بە عیلم بکەن، یان بەڵگەی بۆ بهێننەوە لە عیلم‌و زانستەوە، لە کاتێکدا قورئان بۆخۆی لە مەوضوع‌و بواری خۆیدا کتێبێکی کامڵەو پێویستی بە بەڵگە نیە، حەقائیقەکانی کۆتایین‌و چەسپاون، بەڵام عیلم بەردەوام لە بوارو مەوضوعی خۆیدا لە تازەبوونەوەو گۆڕانکاریدایە، ئەوەی دوێنێ چەسپاندویەتی ئەمڕۆ هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەرچی بە دەستیشی دێنێ نە کۆتایی‌و نە ڕەهایە، چونکە ئاکام‌و سەرەنجامی هەوڵی مرۆڤەو پابەندو موقەییەدە بە ناوەندی مرۆڤەوە، دەرهاویشتەی عەقڵ‌و کەرەسەی ئەوە، هەموو ئەمانە تێکڕا لە توانایاندا نیە حەقیقەتێکی کۆتایی رەها بدەن بە دەستەوە.

دووەم: خراپ تێگەیشتن لە طەبیعەتی قورئانو وەزیفەی قورئان: کە بریتییە لە حەقیقەتێکی کۆتاییو رەها، چارەسەری پەروەردەی مرۆڤ دەکا بە ئەندازەی ئەوەی سروشتی مرۆڤەکە رێگەی پێ بدا بە جۆرێك بگونجێ لەگەڵ سروشتی ئەم بوونەو قانوونی خودای بۆی، بۆ ئەوەی مرۆڤ توشی پێکدادانو لێککەوتن نەبێ لەگەڵ بوونەوەرو لەگەڵ دەورووبەری خۆی، بەڵکوو لەگەڵی هەڵبکاو ببێتە دۆستو هاوکاریو بتوانێ بڕێ لە نهێنییەکانی بناسێو بیانزانێ، لەمیانەی خەلافەتیدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی هەندێ قانونو یاسای بوونەوەرو وجود بەکاربێنێ بۆ پێداویستییەکانی ئەو قانونو ناموسانەش بۆی دەستەبەر دەبن لەرێگەی بەحثو لێکۆڵینەوەو تەجرەبەو لە بۆتەدانو تەطبیقات، بەگوێرەی ئەو رێنماییو شارەزایی کردنەی عەقڵی پێ بەخشراوی بۆی بەدی دێنێ بۆ ئەوەی کار بکا، نەك زانیاری لووكو حازری بداتێ.

سێیەم: تەئویل کردنی بەردەوام وێڕای تەکەللوفو بەزۆر سەپاندنی مانا بۆ دەقەکانی قورئان، دەبێ بەردەوام هەڵپەو گردوکۆمان بێ بەدوای فەرەضیاتو تیۆرو گریمانەدا: کە خۆیان چەسپاو سەلماو نینو جێگیرنابن هەر رۆژەو شتێکی تازەی تر سەرهەڵدەداو تیۆرێکی تر دێتە کایەوە، ئەوکاتە دەبێ مانای ئایەتەکەش بەگوێرەی تیۆرە تازەکە بگۆڕینو بەردەوام لەم تیکەو لیکەدا ببنو بێ سودیش.

## ئیعجازی قورئان لەڕووی تەشریعەوە (الإعجاز التشريعي)

پەروەردگار زۆری غەریزە لەناخی ئادەمیزاددا داناوە، کاریگەرییان هەیە لەسەر نەفسو لە بوارەکانی ژیاندا هەڵیدەسوڕێننو بەڕێگای جۆراوجۆریدا دەبەن، جا ئەگەر عەقڵی رەشیدو رەهبەر هەندێ جار خاوەنەکەی لە هەڵەو تاوان بپارێزێ، ئەوە بێگومان حەزو ئارەزووەکانی زۆر

جار بەسەر ئەو عەقڵەدا باڵادەست دەبن و لە گل و گۆی دەخەن و لە بەرامبەریاندا دەسەوەسان دەبێ، ناتوانێ هەموو کاتێ جڵەوی نەفس و حەزەکانی بگرێ و کۆنترۆڵیان بکا، بۆیە پێویستە بۆ ئیستیقامەی مرۆڤ و دوورکەوتنەوە لە هەڵەو تاوان، تەربییەیەکی تایبەتی هەبێ غەریزەکانی نەفس کۆنترۆڵ بکا، بەخێویان بکا، پاڵفتەیان بکاو گەشەیان پێ بکاو جڵەویان بکێشێ بۆ خێرو چاکەو ڕزگاربوون لە خراپەکاری و تاوان.

مرۆڤ بە سروشت شارەستانی یەو گۆشەگیری ناوێ، پێویستی بە یارمەتی خەڵک هەیەو خەڵك ئاتاجی یارمەتی ئەوە، ئینسان بە سروشت کۆمەڵ ویستە حەزی لە ژیانی ناو کۆمەڵە، هاریکاری مرۆڤ لەگەڵ برای مرۆڤی‌دا زەرەورەتێکی کۆمەڵایەتییە، زەوی ئاوەدانکردنەوەو پێکەوە ژیان لەسەری فەرزکردووە کۆمەڵە ویست بێ و لەناو کۆمەڵگادا ژیان بەسەر بەرێ، جا لە ئاکامی پێکەوە ژیان و هەبوونی کۆمەڵگا، وێڕای هەبوونی غەریزەو حەزی باڵادەستی و بەرژەوەندپەرستی، زۆرجار ئەم مرۆڤە ستەم لە برای مرۆڤی خۆی دەکا، مافی پێشێل دەکا حەقی دەخوا، ئەگەر یاسایەك نەبێ دەستی بگرێ، کۆمەڵگاکە دەبێتە کۆمەڵگایەکی ئاژەڵی، ئەگەر کاروباری ئادەمیزادەکان بە یاساو ڕێسا ڕێك نەخرێ، زەبت و ڕەبتێك نەبێ پەیوەندی نێوان ئادەمیزادەکان ڕێك بخاو باری ژیانیان تەنظیم بکاو عەرزو ناموس و مافییان بپارێزێ، کۆمەڵگا دەبێتە فەوزاو کەس لەکەس و هەرچی و پەرچی!

بۆیە پێویستە بۆ هەموو کۆمەڵگایەکی ئادەمیزادیی، نیظام و یاسایەك هەبێ، جڵەوکێش بێ و پەیوەندی نێوانیان ڕێك بخاو عەدالەت لەناویاندا بەرپا بکا!!

لەنێوان تەربیەی تاك و صەلاحی کۆمەڵگادا پەیوەندی توندو تۆڵ هەیەو لێك پچڕان و لێك دابڕانیان نابێ، چونکە کۆمەڵگا لە تاکەکانی پێك

دێ، صەلاحی تاك پەیوەستە بە صەلاحی کۆمەڵو صەلاحی کۆمەڵ بە صەلاحی تاکەکانی دەستەبەر دەبێ.

بێگومان کۆمەڵانی ئادەمیزاد لە چاخەکانی مێژوودا جۆرەها مەزاهیبو تیۆرو یاساو تەشریعاتیان بەسەردا تێپەڕیوەو ئاشنایان بوونو کاریان پێ کردوون، ئامانجی هەموو ئەو یاساو ڕێسایانە دابینکردنی بەختەوەری بووە بۆ تاك لەناو کۆمەڵگایەکی نمونەیی‌و فاضل‌دا، وەلێ هیچ کام لەو یاساو تەشریعاتانە لە هیچ ڕویەکەوە نەگەیشتووەنە تەشریعی قورئان، هیچ یاساو تەشریعێکیان وەکوو تەشریعی قورئان گشتی‌و تۆکمەو عەدالەت پەروەر نین، تەشریعی قورئان چووتە پلەیەکەوە کە لە حەقیقەتدا ئیعجازی تەشریعەو لە توانای بەشەردا نیە یاسای ئاوا دابنێ.

قورئانی پیرۆزو ویژدانی موسوڵمان بەهۆی بیروباوەڕی یەکتاپەرستییەوە لەهەموو خەرافاتو وەهمو خەیاڵی پوچ ڕزگار دەکا، قەیدو کەلەبچەی بەندایەتی‌و هەواو شەهەواتی لەدەست دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە بەندەیەکی ڕاستاڵی خوداپەرست، بەندایەتی هەر بۆ خودای خالیق‌و شیاو بۆ عیبادەت بکا، بەندایەتی خودا بکا خۆی لە غەیری ئەو، بە بەرز بزانێ، موحتاجی ئەو بێ‌و پێویستی بە کەسی تر نەبێ، مەخلوق پێداویستی‌یەکانی لای خالیق دەستەبەر دەبن، خودا کەمالی ڕەهای هەیە هەموو مەخلووقات پێداویستیان لای ئەو جێبەجێ دەبێ.

پەروەردگار خودای تاكو تەنهاو بێ شەریكو بێ نەظیرە، نە سەرەتای بوونی هەیە نە کۆتایی، دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو ئاگاداری هەموو شتێکەو بە زانیاری ڕەهای خۆی ئیحاطەی هەموو شتێکی داوە، بێ وێنەو هاوشانە، عالەم هەموو بەدیهێنراوەو خودا هێناویەتیە وجود، هەمووی بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە، چۆنی بەدیهێناوە ئاواش دەیفەوتێنێ، ئەمە کاملترین بیروباوەڕە لەڕوی عەقڵەوەو لەڕوی ئایینەوە

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ، اللَّهُ الصَّمَدُ ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ، وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ – سورة الإخلاص﴾.

﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – الحديد/٣﴾.

﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ – القصص/٨٨﴾.

﴿ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ – الأنعام/١٠٢﴾.

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا – الأحزاب/٢٧﴾.

﴿وَاللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ – البقرة/٩٦﴾.

﴿أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ – فصلت/٥٤﴾.

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ – الشورى/١١﴾.

﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ – الأنعام/١٠٣﴾.

قورئانی پیرۆز بە بەڵگەی بەهێزو حاشا هەڵنەگر، جەخت لەسەر تاكو تەنهایی خودا دەكاتەوە، بەڵگەی وا دەخاتە ڕوو كە لەسەر بنەمای عەقڵو مەنطیق دامەزراون عەقڵی سەلیم وەریان دەگرێو قبووڵی كێشەو جیدال ناكا ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا – الأنبياء/٢٢﴾ ﴿قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لاَّبْتَغَوْاْ إِلَى ذِي الْعَرْشِ سَبِيلاً – الإسراء/٤٢﴾.

جا ئەگەر موسوڵمان بیروباوەڕی ساغ بوو، پێویستە لەسەری پەیڕەوی شەریعەتو یاسای قورئان بكا لە فەرائیزو لە عیباداتا، هەر عیبادەتێك فەرزبێ مەبەست لێی صەلاحو بەختەوەری فەردە، وێڕای ئەوەش پەیوەستە بە صەلاحو بەختەوەری كۆمەڵ.

نوێژ دەبێتە لەمپەڕو مانیع لە كارو گوفتاری خراپ، نوێژی بە ڕاستی ئەوەیە خاوەنەكەی لە وتەی خراپو كرداری خراپ بگێڕێتەوە، نوێژی بە جەماعەت بە ڕای راجیحو پەسەند واجبە، مەگەر بیانوی هەبێ

نـەتوانیٚ ئامـادەی جەماعـەت بـیٚ، جەماعـەت بـۆ نوێـژی جومعـەو نوێـژی جەژنەکان مەرجە، دەبیٚ بە جەماعەت ئەنجام بدرێن، ئەوکەسەیش نوێژ بـە تـەنیا دەکـا، پەیوەنـدیو عەلاقـەی لێـك نزیکـیو هاوسـۆزی لـەنێوان خـۆیو کۆمـەڵانی موسـوڵمانی سـەر زەوی لـە هەسـتو شـعوریدا بەرجەسـتەیە، دڵـی لەگـەڵ موسـوڵمانانەو واهەسـت دەکـا موسـوڵمانان لـە بـاکورو باشـورو خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا هەموویان براو کەسی ئەونو پێکەوە ڕودەکەنـە یـەك قیبلەو یەك دوعـاو پاڕانـەوە دەکـەنو یـەك خودادەپەرسـتن، با بەجەسـتەو نیشتیمان لێك دووربن.

کیفایەتـە بـۆ موسـوڵمان لـەبواری پـەروەردەبوونیدا: کـە ڕۆژی پێـنج جـار بـە دەسـتی بـە دەسـتنوێژەوە بەپۆشـاکی خـاوێنو جەسـتەی پاکـەوە، لەبـەردەم پـەروەردگاری خۆیـدا بوەسـتیٚو ڕوبکاتـە خـودای تـاكو تـەنها، بـە ملکەچی ئەو نوێژە ئەنجام بدا کە ڕێگری لیٚ دەکا لە خراپـە کـردنو رایـدێنیٚ لەسەر راستاڵیو کردار چاکیو گوفتار باشی ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ - العنکبوت/٤٥﴾.

زەکـاتو صـەدەقە ڕیشەی چـروکیو دەستقوچـاوی لـەبێخ دەردێنـیٚ، مادەپەرسـتیو سـوربوون لەسـەر هەڵپـەو دونیـا ویـستی لـە دڵ دەردەهـاویٚ، ئەمـەش سـودی کۆمـەڵگای تێدایـە، دەوروبـەر لێـی سـودمەند دەبـن، حـەبلی هاریکاری نێوان دەوڵەمەندو هەژار پتـەو دەکـا، نەفسی هەسـت بـە تـەکافولی کۆمەڵایەتی یارمەتیدانی یەکتر دەکا، دیاردەی خۆویستیو بەرژەوەندپەرستی وەلا دەنیٚو قەڵاچۆی دەکاو لەو ئاستەنگو گۆشەگیرییە دەری دێنیٚ.

حـەج: گەشـتوگوزارێکە نەفـسی ئینـسان رام دەکـا لەسـەر خـۆگری بەرامبەر ماندوبوونو مەشەقەت، چاوی دڵی دەکاتەوە کە نهێنیـیەکانی خودا لە مەخلوقاتیدا ببینیٚ، لەهەمان کاتدا موئتەمەرێکی ئیسلامییە موسوڵمانان تێیدا کۆدەبنەوە، لەسەر زەوییەکی پیرۆز: کە ئاخی عەرەفەیەو لەسـەر یـەك

خاكو به یەك پۆشاك كه پۆشاكی ئیحرامەو نمونەیەكه له دەشتی مەحشەر كۆدەبنەوە، یەكتر دەناسنو پرسوڕا دەگۆڕنەوە.

ڕۆژوو: لغاو گرتنەوەی نەفسه، مشتو مالكردنی عەزیمەتو ورەو توانایەتی، مایەی بەهێزكردنی ویستو ئیرادەیە، بەندكردنی شەهەواتو ئارەزۆكانە، دیاردەیەكی كۆمەلایەتییە، موسولمانان مانگێكی سەرلەبەر تێیدا دەژین، یاساو ڕێسایەكی تایبەتی پەیڕەو دەكەن لەبارەی خواردنو خواردنەوە، وەكوو چۆن خێزانێك له مالی خۆیاندا یەك یاسای خواردنو خواردنەوە پەیڕەو دەكەن.

بەجێهێنانی ئەم عیباداته فەرزانه، موسولمانان رادێنیو رامیان دەكا لەسەر هەستكردن بەوەی كه ئەو شوێنكەوتەی مەنهەجێكه: كه قورئان چەسپاندویەتیو هەموو ئەركەكانی تری ئایین پەیوەستن بەوەوەو ئەو سەرچاوەكەیانه، هەموو فەضیلەتێكی ئەخلاقی بە فەضائیلو بەها بەرزەكانی ئەوە ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ – المدثر/٣٨﴾ ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ – الطور/٢١﴾ ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ – البقرة/٢٨٦﴾.

قورئان بەزۆر ئوسلوبی جیاجیا، موسولمانانی هەلناوه بۆ ڕەوشت بەرزیو خۆڕازاندنەوە به بەها نمونەییەكانو ئەو فەضائیله میثالیانەی كه نەفس ڕادێنن لەسەر ڕەوشت بەرزی وەكوو صەبرو ڕاستگۆییو عەدالەتو چاكەكاریو بارقولیو حیلمو لێبوردەیی خۆبەكەم زانیو تەواضوع!

له پەروەردە كردنی تاكەوە ئیسلام دەگوازێتەوە بۆ دروستكردنی خێزان، چونكه ئەم بناغەو پێكهێنەری كۆمەلگایه هەر له ڕوانگەی ئەم تەربیەتەوە یاسای زیواجی تەشریع كردووە بۆ پڕكردنەوەو دابینكردنی غەریزەی جینسیو پارێزگاری له هێشتنەوەی نەوعی ئادەمیزاد لەچوارچێوەی ژنو ژنخوازیو زاوزێیەكی پاكو خاوێندا.

پەیوەنـدی خێـزان لەچوارچـێوەی زیواجـدا لەسـەر خۆشەویـستیو رەحـمو ئـارامگرتنی نەفـسیو پێکـەوە ژیـان بەشـێوەی چـاكو مـەعروفو بەرچـاوگرتنی تایبەتمەنـدی پیـاوو تایبەتمەندییـەتی ئـافرەتو ئـەرکی بـۆ گونجاوی هەریەکێ لە ژنو مێردەکە ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً – الروم/٢١﴾ ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ – النساء/٣٤﴾.

ئـەمجار یاسـای ولآت بـەڕێوەبردنو بـەکارهێنانی دەسـەلآت ڕون دەکاتەوە؛ ئەو یاسایەی لە کۆمەڵگای موسوڵمانانـدا کاری پێ دەکرێ، بێگومـان قورئـان قەواعیـدو یاسـای حکومـەتی ئیـسلامی بـەگونجاوترین شـێوە چەسپاندووەو بە ئوسلوبێکی موعجیزو سەرئاسا رایگەیاندووە.

حکومەتی ئیسلامی حکومەتێکی شوراو راوێـژو یەکسانییەو ناهێڵێ تاکڕەویو دەسەلآتی فەرد بالآ دەست بێو تاکەکانی کۆمـەڵ بچەوسێنێتەوە ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ – آل عمـران/١٥٩﴾ ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ – الشورى/٣٨﴾ ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ – الحجرات/١٠﴾ ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ – آل عمران/٦٤﴾.

حکومەتی ئیسلامی حکومەتێکە لەسەر عەدالەتی رەها دادەمـەزرێو خۆویـستی تێدانیـەو عاتیفـەی خزمایـەتیو هۆکـاری کۆمەڵایـەتی وەکـوو دەوڵەمەندو هەژاری ڕۆڵی تێدا ناگێڕن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقَيرًا فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا – النساء/١٣٥﴾.

هەروەکوو چۆن ئارەزوی تۆڵەکردنەوە لە دوژمن‌و ناحەزان نابێ کاریگەری لەسەر پەیڕەوکردنی ئەم عەدالەتە هەبێ، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى – المائدة/٨﴾.

﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ – النساء/٥٨﴾

شەریعەتدانان لە حکومەتی ئیسلامی‌دا نەخراوەتە ئەستۆی ئادەمیزادەکان خۆیانەوە، بەڵکوو قورئان شەریعەتدانانی بەکوفرو ستەم‌و فیسق داناوە ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ – المائدة/٤٤﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ – المائدة/٤٥﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ – المائدة/٤٧﴾ ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ – المائدة/٥٠﴾.

قورئانی پیرۆز پاراستنی پێنج (کلياته) گرنگ‌و زەرورییەکانی بۆ ژیانی ئادەمیزاد چەسپاندوە پاراستنی (نەفس‌و ئایین‌و ناموس‌و ماڵ‌و عەقڵ)ی بە پیرۆزو موقەدەس داناوەو ڕێگەی نەداوە دەستدرێژی بکرێتە سەریان، سزای دەست لەسەر دانراوی توندی دیاریکردووە بۆ ئەوانەی ڕێگە بە خۆیان دەدەن دەستدرێژی بکەنە سەریان، لە فیقهی ئیسلامی‌دا لە باسی (الجنايات والحدود)دا حوکمی ئەوانە ڕونکراوەتەوە، سەرباری ئەوەی قورئان بە دەق حوکمەکانی دیاریکردوون ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ – البقرة/١٧٩﴾ ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ – النور/٢﴾ ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً – النور/٤﴾ ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا – المائدة/٣٨﴾.

هــەروەها قورئــان چــۆنیەتی پەیوەنــدیو پێکــەوە ژیــانی نێــوان موسـوڵمانو هاوسـێیەکانیان لـەکاتی شـەڕو ئاشـتیدا ڕون کردۆتـەوە، هـەروا چۆنیەتی پێکەوە ژیانو هەڵکردن لەگەڵ پـەیمان لەگەڵ بەسـتراو (معاهد)و داڵدەدراو ڕوونکردۆتەوە، لە ڕاسـتیدا ئـەم یاسای چۆنیەتی پەیوەنـدیکردنو پێکەوە ژیانەی قورئان ڕونـی کردۆتـەوە بـەرزترین یاسایە بـۆ مامەڵـەکردنی موسوڵمان لەگەڵ کەسانی تردا، باشترین یاسایەکە حەضارەتـی ئینـسانی پێـی ئاشنابووبێ لە چاخەکانی مێژوودا.

بە کورتیو پوختی قورئانی پیرۆز دەستورێکی شەرعی کامڵو پتـەوو بێ وێنەیە، ژیانی ئادەمیزاد لەسەر باشـترین شـێوەو بـەرزترین نموونـە ڕێـك دەخاو ڕێکی خستووە، ئەم لایەنە ئیعجازییە شـەریعەتیەی تـا دونیـا دونیایـە بەردەوام دەبێ، شان بەشانی ئیعجازی عیلمـیو ئیعجـازی لوغـەوی ڕۆژگاریـان بەسەردا تێدەپەڕێو ئەوان تازە دەبنەوەو کۆن نـابن، هـیچ کەسـیش ناتوانـێ ئینکاری ئەوە بکا: کە قورئان چ گۆڕانکارییەکی لە جیهاندا بەدیهێناوەو چۆن ڕەوڕەوەی مێژووی گۆڕیو بەردەوام کاریگەری خۆی هەیە!!.

## ١٨ پەندەکانی قورئان (أمثال القرآن)

حەقیقەتــە بــەرزەکان لــە مانــاو ئامــانجدا، وێنــەی جــوانو ســەرەنج ڕاکـێش نیـشان دەدەن، ئەگـەر بخرێنـە نـاو قـاڵبی حیسـسی وا: کـە نزیکیـان بکاتەوە لە فەهمو تێگەیشتنو بەراوردیان بکا بە زانراوی یەقینیو چەسپاو.

تەمثیلو پەند ئاراستەکردن، ئەو قاڵبو قاوغەیـە: کـە مـەعنای شـت لەوێنــەی زینــدوو چەســپاو لــە زەینــدا دەخاتــە ڕوو، لــەم ڕووەوە غائیــب دەچوێنێ بە حاضرو مـەعقوول دەشـوبهێنێ بـە مەحـسوس، قیاسـی هاوشـان لەسەر هاوتای خۆی دەکا، چـەند مـەعنا جوانو سـەرنجڕاکێش بـێ، تـەمثیـل ئەوەندەی تر جوانی پێ دەبەخشێو ڕەوعـەتو عەنتیکـەیی تێـدا زیـاد دەکـا،

بەمەش نەفسی ئادەمیزاد پتر ئامادەباشی قبولکردنی هەیەو عاقڵ قەناعەتی پێ دەکاو کاریگەری لەسەر دڵو دەرون جێ دێڵێ.

ئەمەش جۆرێکە لە شێوازەکانی دەربڕینو تەعبیرو جۆرەکانی ئیعجازی، لەبەر گرنگی ئەم بابەتە هەندێ لە زانایان کتێبی تایبەتیان داناوە بەناوی (الأمثال فی القرآن) هەیانە بابێکی سەربەخۆی لە کتێبێك لە کتێبەکانی خۆی بۆ ئەم باسە تەرخان کردووە، وەکوو ئەبولحەسەنی ئەلماوەردی کردوویەتی، (جلال الدین السیوطی)یش لە کتێبی (الإتقان)دا بابێکی سەربەخۆی بۆ ئەم باسە تەرخان کردووە، ئیبنولقەییمی (الجوزی) لە کتێبی (أعلام الموقعین)دا چلو ئەوەندە مەثەلەی جۆراوجۆری ڕیزکردووە، لێکۆڵینەوەی لە ئەمثالی قورئاندا کردووەو لەسەر هەموو مەثەلێك هەڵوەستەکەی کردووە.

## مەغزاو مەعنای ڕوونکردنەوە

پەروەردگار بۆخۆی لە قورئاندا بەڕوونی ئەوەی ڕاگەیاندووە: کە پەندو ئەمثال ئاراستە دەکاو جۆرێکە لە جۆرەکانی بانگەوازی، دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ - الحشر/٢١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ - العنكبوت/٤٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ - الزمر/٢٧﴾.

ئیمام عەلی دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إن الله أنزل القرآن أمراً وزاجراً وسنة خاليه ومثلا مضروباً».[١] جاوەکوو زانایان گرنگیان داوە بە پەندو مەثەلی قورئان، هەر بەو شێوە گرنگیان داوە بە

---

[١] أخرجه سعيد بن منصور فی سننه/٢/٢٧٢.

پەندو ئەمثالی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەتا ئەبو عیسای تیرمذی لە (جامع)ەکەی خۆیدا بابێکی سەربەخۆی بۆ ئەو باسە تەرخان کردووە، چل فەرموودەی تێدا کۆکردۆتەوە، قازی ئەبو بەکری (إبن العربی) دەڵێ: لەناو عولەمای حەدیثدا کەسم نەبینیوە جگە لە ئەبو عیسا، گرنگی بەم بابەتە دابێ‌و بابی سەربەخۆی بۆ پەندو ئەمثالی فەرموودە تەرخان کردبێ.

خودا پاداشی ئەبو عیسا بداتەوە، بەڕاستی دەرگایەکی باشی کردۆتەوە، باڵەخانەیەك، یان خانوێکی بنتیات ناوە، وەلێ ڕێچکەیەکی بچوکی کێشاوە ئێمە پێی ڕازین.

## پێناسەی پەندو مەثەل

مەثەل: لەبواری ئەدەبدا بریتییە لە قسەیەکی باوو گێڕدراوەی پشتاوپشت‌و چین دواچین وتەکە بڵاو بۆتەوە حاڵ‌و وەزعی ئەوکەسەی قسەکەی دەرحەق دەگوترێ: بشوبهێندرێ بە حاڵ‌و وەزعی ئەوکەسەی کاتی خۆی‌و لە ڕۆژگارێکی کۆندا بە حاڵ‌و وەزعی ئەو کەسەی ئەو قسەیەی دەرحەق گوتراوە، واتە تەشبیهاتی بەکارهێنانی ئێستای دەکا بەهی کاتی یەکەمجاری گوتنەکەی (یشبه مضر به مورده) وەکوو پەندی (رب رمیة من غیررام) واتە: زۆرجار نیشانە دەپێکرێ لەلایەن کەسێکەوە کە تفەنگچی نیەو نیشان ناپێکێ، یەکەم کەسێك: کە ئەم پەندەی گوتووە (الحکم)ی کوڕی یەغوثی (النقری) بووە، ئێستا ئەم پەندە بۆ کەسێك لێ دەدرێتەوە: کە زۆربەی کات ئامانج ناپێکێ جارێك لە جاران بە ڕێکەوت نیشانێك دەپێکێ.

مەثەل بۆ حاڵ‌و بۆ چیرۆکی سەرنج ڕاکێشیش بەکاردەهێندرێ لەسەر ئەم مانایە زۆرجار وشەی (مَثَل) لە قورئاندا بەکارهێندراوە وەکوو

﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ - محمد/١٥﴾ واته: چیرۆكو صیفەتی بەهەشت: كە جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە:

زومەخشەری لە كەششافدا ئاماژەی بۆ ئەو سێ مانایە كردووە دەڵێ: مەثەل لە ئەصڵی كەلامی عەرەبدا بە مانا هاوشێوەو هاوشانە، پاشان كراوە بە ناو بۆ وتەیەك كە بەناو خەڵكدا بڵاوبۆتەوەو خەڵكی لەكاتی ڕودانی ڕوداوێكی لەوشێوەی وتە كۆنەكەی بۆ گوتراوە دەیڵێتەوەو دەیكەنە نموونە.

هەڵبەتە عەرەب هەموو وتەیەكی گوتراویان نەكردووە بە پەند، هەموو وتەیەك بە شیاوی ئەوە نازانن بە كەڵكی ئەوە بێ بكرێتە پەند، مەگەر وتەیەك جێگای سەرنج بێو لەهەندێ ڕووەوە غەرابەتی تێدا بێ، پاشان دەڵێ: بێگومان وشەی (مَثل) ئیستیعارە كراوە، وەرگێراوە بۆ حاڵ، یان صیفەت، یان چیرۆك، ئەگەر غەرابەتی تێدابوو جێگای سەرنج بوون.

مانایەكی چوارەمی هەیە زانایانی زانستی بەلاغە لە پێناسەی (مەثەل)دا هێناویانە، ئەویش مەجازی مورەكەبێكە: كە عەلاقەو پەیوەندییەكەی موشابە هەبێو بەكارهێنانی بەربڵاو بێ، بنەمای ئەم مەجازە مورەكەبە ئیستیعارەی تەمثیلییەیە وەكوو بە كەسێكی ڕاڕا لە كردنی كارێكدا بڵێی: (مالی أراك تقدم رجلاً وتؤخر أخرى) چیە دەتبینم ئەتۆ هەنگاوێك دەڕۆیە پێشەوە هەنگاوێكی تر دێیە دواوە؟؟

لە پێناسەو قاعیدەی (مەثەل)دا گوتراوە: مەثەل: بریتییە لە دەرخستنی مەعنا لە وێنەیەكی هەست پێكراو (حسّی)دا: كە جوانیو ڕازاوەیی پێ دەبەخشێ، مەثەل بەم مانایە مەرج نیە (مەوریدی) هەبێ، واتە: مەرج نیە لە كۆندا گوترابێو بڵاوبووبێتەوە لەلای خەڵكی غەریبو ناوازە بووبێو پەسەندیان كردبێ، هەروەها مەرج نیە مەجازی مورەكەب بێ.

ئەگەر ئێمە سەیری ئەو مەثەلانەی قورئان بکەین: کە کتێب دانەرەکان باسیان کردوون، دەبینین ئەوان ئەو ئایەتانە دێنن: کە تەشبیهو تەمثیلی حاڵی شتێك بە حاڵی شتێکی تریان لەخۆ گرتووە، یەکسانیشە ئەم تەمثیلو تەشبیهەی بەشێوەی ئیستیعارە هێنا بێ، یان بەشێوەی تەشبیهی صەریحو ڕوون، یان ئەو ئایەتانە دێنن: کە دەلالەت دەکەن لەسەر مانایەك سەرنج ڕاکێشو کورتبڕ، یان ئایەتێك: کە صەحیح بێ بەکاری بێنێ لە مانایەکدا بشوبهێتە ئەو مانایەی تێیدا هاتووە، چونکە بێگومان پەرومردگار ئەو مەثەلەی داهێناوە بەبێ ئەوەی لەوەپێش مەوریدی هەبێ.

کەوابێ ئەمثالی قورئان نابێ حەمل بکرێن بۆ سەر ئەصڵی مەعنا لوغەوییەکەیان: کە بریتییە لە هاو وێنەو هاوشان (شبیه ونظیر) هەروا دروست نیە ئەمثالی قورئان حەمل بکرێن بۆ سەر ئەو پێناسەی لە کتێبەکانی زمانەوانیدا باسکراون لەلایەن ئەوانەی دەربارەی ئەمثال کتێبو نامیلکەو فەصڵو بابیان نوسیوون، چونکە ئەمثالی قورئان ئەقوالو وتەیەك نین بەکارهێنرابن لەسەر شێوەی شوبهاندنی دەربڕینیان لە کاتی لێدانەوەو گوتنەوە، یان بە دەربڕینی کاتی گوتنی یەکەمجاریان لەلایەن کابرای قسەزانەوە، بە تەعبیری مەلایانە واتە: (تەشبیهی حاڵی مەضریبیان بە حاڵی مەوریدیان ناکرێ).

هەروەها دروستە حەملی ئەمثالی قورئان بکرێ بۆ سەر ئەو ئەمثالانەی زانایانی بەیان پێناسەیان کردوون چونکە هەندێك ئەمثالی قورئان هەن نە ئیستیعارەنو نە بەکارهێنانیشیان بڵاوبۆتەوە، بۆیە قاعیدەو یاسای راستو پێناسەی دروستو شیاو بۆ ئەمثالی قورئان ئەوەیە: بگوترێ: دەربڕینو دەرخستنی مەعنایە لە وێنەیەکی رائیعو سەرنج ڕاکێشو کورتبڕیدا: کە کاریگەری هەبێ لەسەر نەفس، جا (مثل)ەکە شووبهاندنی تێدا بێ، یان قەولی مورسەل بێ.

ئیبنولقەییم دەربارەی ئەمثالی قورئان دەفەرموێ: (مثل) شوبهاندنی شتێکە بەشتێکی ترەوە لە حوکمەکەیدا، نزیککردنەوەی شتی مەعقولە لە مەحسوس، یان نزیك کردنەوەی مەحسوسێکە لە مەحسوسێکی ترو مەزەندەکردنی ئەمیان بە ئەویان، ئەمجار ئیبنولقەییم چەند نموونەیەك رادەنوێنێ، دەبینین زۆربەیان لەسەر شێوەی تەشبیهی صەریح رانوێنراون، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاء – یونس/٢٤﴾ (مَثَل)ی وا هەیە بەشێوەی تەشبیهی ضیمنی دێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ – الحجرات/١٢﴾ چونکە لێرەدا بە صەراحەتو راستەوخۆ غەیبەتکردن نەشوبهێنراوە بە خواردنی گۆشتی ئادەمیزادی مردوو، بەڵکوو تەشبیهەکەی تێدا دانراوە بەشێوەیەکی نادیار.

(مثل)ی وا هەیە هیچ جۆرە تەشبیهو ئیستیعارەیەکی تێدا نیە، وەکوو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ – الحج/٧٣﴾ ئەوەتا پەروەردگار رستەی ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا﴾ی ناوناوە (مَثَل)، دەی لێی ورد بەرەوە نە تەشبیهی تێدایە نە ئیستیعارە.

## جۆرەکانی ئەمثالی قورئان

**ئەمثال لە قورئاندا سێ جۆرە:**

١- ئەمثالی صەریحو ئاشکرا.

٢- ئەمثالی شاراوەو نادیار.

٣- ئەمثالی مورسەلو ئاراستەکراو.

جۆری یەکەم ئەمثالی صەریح، واتە وشەی (مثل)ی تێدا هاتبێ، یان شتێکی تێدا هاتبێ دەلالەت بکا لەسەر تەشبیه ئەم جۆرە لە قورئانـدا زۆرە، هەندێ نموونەیان باس دەکەین:

أ/ پەروەردگار: کە دەربارەی دووڕووەکان دەفـەرموێ: ﴿مَـثَلُهُمْ كَمَثَـلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَـاتٍ لاَّ يُبْصِرُونَ ، صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ ، أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ الـسَّمَاء فِيـهِ ظُلُمَـاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي آذَانِهِم مِّنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللّـهُ مُحِـيطٌ بِالْكافِرِينَ ، يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَـاء لَهُـم مَّـشَوْاْ فِيـهِ وَإِذَا أَظْلَـمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللَّه عَلَى كُلِّ شَـيْءٍ قَـدِيرٌ - البقرة/١٧ - ٢٠﴾.

ئالەم ئایەتانەدا پەروەردگار دوو پەندی بۆ دووڕووەکان هێناوەتـەوە، یەکێکیان پەندێکی ئاگراوی بە ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً﴾ چونکە ئاگر ڕوناکیـشی هەیـە، پەندەکـەی تریـان پەنـدێکی (ئـاوی)یـە دەفـەرموێ: ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ السَّمَاء﴾ لەم ڕووەوە ئاو مادەی ژیانی تێدایە، بێگومان وەحیی لـە ئاسمانــەوە نــازڵ بــووە ڕوناککردنــەوەی دڵو دەرونو ژیانــەوەیانی لــەخۆ گرتووە، پەروەردگار لە هەردوو حاڵەکەدا بەشی دووڕووەکانی ڕاگەیانـدووە، دەفــەرموێ: ئــەوان وەکــوو کەســێك وان ئاگرێــك بکاتــەوە بــۆ ڕونــاکیو ســودوەرگرتن لێــی، ئــەوان بــە هاتنــە نــاو ئیــسلام لــەڕووی مادییــەوە سودمەندبوون، بەڵام موسوڵمان بوونیـان بـە دووڕوویـی چ کاریگەرییـەکی لـە دڵیاندا نەبوو دڵیان بە نوری ئیمان ڕونـاك نـەبۆوە، خـودا ڕونـاکی ئاگرەکـەی لەپێش چاو هەڵگرتن ﴿ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ﴾ تەنها لایەنی سوتانی ئاگرەکـەیان بۆ مایەوە، ئەمەیان پەندە ئاگراوییەکەیە: کە بۆیان لێدراوە.

پـەروەردگار باسـی (مثـل)ە ئاوییەکـەیانی کـردووەو تەشـبیهی حـاڵو وەزعیانی کردووە بە حاڵو وەزعی کەسێك بارانی لێ بداو بکەوێتە ناو شەوە

زەنگێکی تاریكو هەنگوستەوە چاوو هەورەبروسکەو گرمەگرمی هەورو شریخو شاخ، ئیتر لەناو ئەم دیمەنە سامناکەدا هێزی ئەژنۆی بشکێو ورەی بڕوخێ، هەردوو قامکی بخاتە کونە گوێچکەکانیو چاوەکانی بقونجێنێو ترسی ئەوەی هەبێ بروسکە لێی بداو بیکاتە خەڵوز، چونکە قورئان نازڵ بووتە سەریان بە زەواجیرو فەرمانی بە نەهیو خیطابو ئامۆژگارییەکانی، نازڵ بووەتە سەریان وەکوو نازڵبوونی هەورە بروسکە بۆسەریان.

ب/ پەروەردگار دوو (مثل)ی (ئاویو ئاگری) لە سورەتی (الرعد)دا بۆ حەقو بەتاڵ ئاراستەکردنو فەرمووی: ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ – الرعد/١٧﴾ لەم ئایەتەدا پەروەردگار ئەو نیگایەی لە ئاسمانەوە نازڵی کردووە بۆ ژیانەوەی دڵەکانو مانەوەیان بە زیندویی، تەشبیهی کردووە بەو بارانەی لە ئاسمانەوە باراندویەتیو دەیبارێنێ بۆ ژیانەوەو زیندوکردنەوەی زەوی بە ڕوەكو گژوگیا، دڵەکانیشی شوبهاندووە بەشیوو دۆڵەکانی ناو زەوی، لافاو: کە بەناو شیووو دۆڵدا دەڕوا کەفو زەبڵو پوشو پەڵاش هەڵدەگرێو رایدەدا، ناو شیوەکە پاك دەکاتەوە، زانیاریو هیدایەتیش ئەگەر بکەوێتە ناو دڵو دەروونەوە، شەهەواتو نەخۆشییەکانی تری ناو دڵ وەکوو نیفاقو رژدیو خۆویستی گەسك ماڵ دەکاو ڕایاندەداو دڵەکان پاك دەکاتەوە، ئەمە نمونەو (مثل)ە ئاوییەکەیە، کە دەفەرموێ: ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء﴾ ئاواو بەو جۆرە پەروەردگار (مثل)ی حەقو بەتاڵ ئاراستە دەکا.

(مثل)ی ئاگرئاسایی هێنایەوە فەرمووی: ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ﴾ کانەکانی زێڕو زیو مسو ئاسنو ئەو جۆرە شتانە، لە کاتی تواندنەوەو کردنیان بە قاڵب بەهۆی ئاگرەکەوە هەرچی چڵكو ژەنگو

پیسایی هەیە لێیان جیادەبێتەوە، مادە ئەصڵییەکە پاڵفتە دەبێو سودی لێ دەبیندرێو خشتو خاڵەکەش دەڕوا، شەهەواتو نەخۆشییە دەروونییەکان بەوجۆرە بەهۆی هیدایەتو ئیمانەوە چڵکو نەخۆشییەکان قەلاچۆ دەکرێنو دڵەکانیان پاك دەکرێتەوە، وەکوو چۆن لافاوو ئاگر کەفو خشت خاڵو پیسایی لادەبەن.

جۆری دووەم: لە (ئەمثال) پەندی شاراوەو نادیارن، ئەو پەندانەن کە وشەی (تەمثیل)و شتی وایان تێدا بەکار نەهاتووە، وەلێ دەلالەت دەکا لەسەر مانای رائیعو هەست هەژێن بەشێوازێکی کورتو کورتبڕ، کاریگەری بەهێزی دەبێ، هەرکاتێ نەقڵ بکرێ بۆ شتێك پێوەی بشوبهێ، بۆ ئەم جۆرە (مثل)انە چەند نموونەیەکیان هێناوەتەوە.

١- پەندی شاراوە لە مانای (خير الأمور الوسط)دا بێ.

أ/ وەکوو دەفەرموێ: ﴿لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ – البقرة/٦٨﴾.

ب/ لە بواری نەفەقەو بژێودا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا – الفرقان/٦٧﴾.

ج/ لەبواری نوێژدا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً – الإسراء/١١٠﴾.

د/ لە بواری ماڵبەخشین دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ – الإسراء/٢٩﴾.

٢- پەندی شاراوە بە مانا (ليس الخبر كالمعانية) فارس دەڵێ: (شنيدن كى بود مانند ديده) فەرمایشتی باریتەعالا دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي – البقرة/٢٦٠﴾.

٣- پەندێك لە مانای (كما تدين تدان) بێ وەکوو ئایەتی ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ – النساء/١٢٣﴾.

٤- پەند لە ماناى (لا يلدغ المؤمن فى جحر واحد مرتين) وەكوو ئەوە پەروەردگار لەسەر زەمانى حەزرەتى يەعقوب دەفەرموێ: ﴿هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلاَّ كَمَا أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ مِن قَبْلُ - يوسف/٦٤﴾.

جۆرى سێيەم ئەمثالى ئاراستەكراون: كە بريتين لە چەند ڕستەيەكى ئاراستەكراو بەبێ ئەوەى وشەى تەشبيهو شتى وايان لەخۆگرتبێ، ئەمانە چەند ئايەتێكن وەكوو ئەمثال مامەڵەيان لەگەڵ كراوە، لە نموونەى ئەم ئەمثالانە:

١- ﴿الآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ - يوسف/٥١﴾.

٢- ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ - النجم/٥٨﴾.

٣- ﴿قُضِيَ الأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ - يوسف/٤١﴾.

٤- ﴿أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ - هود/٨١﴾.

٥- ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ - الأنعام/٦٧﴾.

٦- ﴿وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ - فاطر/٤٣﴾.

٧- ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ - الإسراء/٨٤﴾.

٨- ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ - البقرة/٢١٦﴾.

٩- ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ - المدثر/٣٨﴾.

١٠- ﴿هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ - الرحمن/٦٠﴾.

١١- ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ - المؤمنون/٥٣﴾.

١٢- ﴿ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ - الحج/٧٣﴾.

١٣- ﴿لِمِثْلِ هَذَا فَلْيَعْمَلْ الْعَامِلُونَ - الصافات/٦١﴾.

١٤- ﴿قُل لاَّ يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ - المائدة/١٠٠﴾.

١٥- ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ - البقرة/٢٤٩﴾.

١٦- ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى - الحشر/١٤﴾.

زانایان راجیاییان تێدا پەیدابووە دەربارەی ئەم ئایەتانەی: کە ناویان لێ نراوە (إرسال المثل) ئاڕاستەکردنی پەند لەوەدا ئاخۆ بەکارهێنانی ئەم ئایەتانە بەشێوەی بەکارهێنانی ئەمثال دروستە یان نا؟

هەندێك لە ئەهلی عیلم پێیان وایە بەکارهێنانیان بەو شێوە دەرچوونە لە ئەدەبی قورئان، ئیمامی رازی لە تەفسیرەکەیدا لەسەر ئایەتی ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ – الكافرون/٦﴾ فەرموویەتی: خەڵکی وا خویان پێوە گرتووە: کە لە کاتی دابڕانو دەنگ لێك وەرگرتندا ئەم ئایەتە بە مەثەل بێننەوە، ئەمەش دروست نیە، چونکە پەروەردگار قورئانی بۆیە نازڵ نەکردووە بیکەنە پەندو ئەمثال، بەڵکوو بۆیە نازڵی کردووە تێی بفکرنو پاشان کار بە ناوەڕۆکی بکەن.

هەندێکی تر لە زانایان فەرموویانە چ خراپیەکی تێدا نابینرێ: کە مرۆڤ لە مەقامی جیدیو سوربووندا ئایەتێکی قورئان وەکوو پەند ئاراستە بکا، وەکوو نارەحەتی بێ ئەندازەی خۆی بەرامبەر کارەساتێکی گەورە دەربڕێ: کە ئەو ڕوداوە سامناکە کۆڵەی خەڵکی بڕیبێو تەنگی پێ هەڵچنیبنو بڵێ ﴿لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ – النجم/٥٨﴾ یان قسە لەگەڵ خاوەن باوەڕو مەزهەبێکی فاسید وا بکا: کە دەیەوێ کێشی بکا بۆلای مەزهەبی بەتاڵی خۆی، پێی بڵێ: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ – الكافرون/٦﴾ گوناهو تاوان ئەوەیە پیاوەکە لافی زانایيو ئەدیبی خۆی لێ بداو بۆ گاڵتەو سوبحەتیش پەنا بۆ ئایەتی قورئان بەرێو وەکوو پەند ئاراستەی بکا.

# فائیدەو سودی ئەمثال

١- ئەمثال (پەندەکان) شتی مەعقول‌و نامادی لە وێنەی مەحسوس‌و هەست پێکراودا رادەنوێنێ، بەجۆرێك عەقڵ وەری بگرێ، چونکە مەعانی مەعقول‌و نامادی لە زەیندا جێگیر نابن، مەگەر لەوێنەی هەست پێکراوو نزیك لە فەهمدا وێنا بکرێن، وەکوو ئەوە پەروەردگار پەندی هێناوەتەوە بۆ حاڵ‌و وەزعی کەسێك: کە بۆ روپامایی‌و ڕیبا ماڵ دەبەخشێ لەم ڕووەوە هیچ پاداشی دەست ناکەوێ‌و مایە پووچە دەفەرموێ: ﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْداً لا يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِمَّا كَسَبُوا – البقرة/٢٦٤﴾.

٢- پەند حەقیقەت دەردەخاو شتی غائیب‌و نادیار لە نمایشگای حازرو بەرچاودا نیشان دەدا وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ – البقرة/٢٧٥﴾.

٣- پەند مەعنای عەنتیکەو سەرنج ڕاکێش کۆ دەکاتەوە بە عیبارەتێکی کورت‌و پڕ مەعنا ڕای دەنوێنێ وەکوو ئەو ئەمثالە شاردراوانەی لەناو دەقە کورتبڕەکاندا ئاراستە کراون، هەروا ئەمثالە مورسەلانەی لە ئایەتەکانی ڕابردوودا ئاماژەیان بۆ کرا.

٤- جاری وا دەبێ پەند لێدەدرێ بۆ تەرغیب‌و خۆشەویست کردنی پەند بۆ هێنراوەکە لە نەفسی ئادەمیزاددا وەکوو ئەو پەندەی پەروەردگار هێناویەتەوە بۆ حاڵی کەسێك ماڵ‌و سامانی خۆی لە ڕێگەی خودادا دەبەخشێ: کە بەخشینەکەی قازانجێکی زۆرو چەند چەندانە دەکا بۆی، دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ – البقرة/٢٦١﴾.

٥- جاری وا هەیە پەند لێ دەدرێ بۆ قیز لێ بوونەوەو خۆ دوورخستنەوە لە پەند بۆ هێنراوەکە ئەگەر ئەو پەند بۆ هێنراوە نەفسی ئادەمیزاد قیزی لێ کردەوە وەکوو دەربارەی نەهی کردن لە غەیبەت‌و باسکردنی کەسانی دی لە پاشملەو بە خراپە، دەفەرموێ: ﴿وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ – الحجرات/١٢﴾.

٦- وا دەبێ (مثل) لێ دەدرێ بۆ مەدح‌و پەسنی پەند بۆ هێنراوەکە وەکوو پەروەردگار دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ – الفتح/٢٩﴾ حاڵ‌و وەزعی هاوەڵان بەو جۆرە بوو، ئەوان لە سەرەتادا کەم‌و بێ هێز بوون، پاشان وردە وردە گەشەیان کردو هەتا بوونە جێگای سەرنج‌و گرنگی پێدانی خەڵکانی ترو هەموو عالەم بە گەورەیی‌و بەهێزییان سەرسام بوون.

٧- مەثەل دەهێندرێتەوە کاتێك پەند بۆ لێدراوەکە صیفەتێکی ناشیرینی هەبێ‌و خەڵکی قیزیان لێ بێتەوە، وەکوو پەروەردگار پەند لێ دەدا بۆ حاڵی کەسێك خودا نامەی هیدایەتی پێ دابێ بەڵام هیدایەت ئامێز نەبێ‌و لەرێگەی حەق لابداو لە زەلکاوی تاوان‌و خوێڕییەتی‌دا ڕۆبچێ‌و نقوم ببێ، وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنْ الْغَاوِينَ ، وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ ذَلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَاقْصُصْ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ – الأعراف/١٧٥ – ١٧٦﴾.

٨- ئەمثال هێنانەوەو پەند لێدان زۆر کاریگەرترە لە نەفسدا، بۆ ئامۆژگاری بەلیغ ترە، بۆ گێڕانەوە بەهێزترە، بۆ ئیقناع بەپێزترە، بێگومان

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا زۆری پەندو مەثەل هێناونەوە بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان پەند ئامێزبن‌و عیبرەت وەرگرن ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ – الزمر/٢٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلاَّ الْعَالِمُونَ – العنكبوت/٤٣﴾ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە فەرموودەکانیدا زۆری پەند لێ داون‌و مەثەلی زۆری هێناونەوە، بانگخوازانی ڕێبازی خودا پەنایان بۆ پەندو مەثەل بردووە لە هەموو چاخ‌و زەمانێکدا بەکاریان هێناون بۆ سەرخستنی حەق‌و بەلگە ڕاستکردنەوە، سەرپەرشتیارانی پەروەردە پەنایان بۆ بردون‌و کردویانن بە هۆکاری ڕونکردنەوەو خۆشەویستکردنی پرۆگرامی خۆیان لە دڵی قوتابی‌و شاگردانی زانست‌و زانیاریدا کردویانن بە هۆکاری تەرغیب‌و تەرهیب لە مەدح‌و ذەمدا.

## پەند هێنانەوە بەقورئان

دابو نەریتی ئەدیب‌و ئەدەبدۆستان واهاتووە کە پەندو مەثەل بهێننەوە لەهەر شوێنێك بشوبهێتە ئەو حاڵ‌و وەزعەی کاتی خۆی پەندەکەی تێدا هاتووەو مەثەلەکەی تێدا گوتراوە، جا ئەگەر ئەمە دەربارەی ئەو گوفتارانەی ئادەمیزاد کە وەکوو پەندیان لێ هاتووە خەڵکی لەشوێنی پێویستدا سەرلەنوێ دەیانڵێنەوەو لێیان دەدەنەوە صەحیح‌و دروست بن، ئەوە زانایانی ئیسلام بە پەسەندی نازانن لە ناوەندی ئاخاوتنی ئاسایی خۆیاندا پەندو مەثەل بە قورئان لێ بدەنەوە، بە ڕەوای نابینن مرۆڤ ئایەتێك لەو ئایەتانە پەند ئاسایانەی قورئان بخوێننەوە لە کاتێکدا کە شتێکی دونیاییان دێتە پێش، ئەمە بە ڕەوا نازانن بۆ ئەوەی پارێزگاری بکرێ لە رەوعەت‌و بەلاغەتی قورئان‌و لە پاڵ هەموو قسەیەکی بێ ماناو

پوچدا بەکار نەهێندرێ، بۆ ئەوەی پلەوپایەی ئەو کەلامە پیرۆزە لە دڵو دەروونی موسوڵمانەندا بە بەرزیو شکۆداری بمێننەوە.

ئەبو عوبەیدە دەڵێ: هەر بەو جۆرە ئادەمیزاد دەیەوێ بگا بە هاوەڵەکەی، یان هەست دەکا پێویستی پێیەتی، لە ناکاوێك دەبینێ ئەو کەسەی دێ بۆلای بەبێ ئەوە داوای هاتنی لێ کردبێ، بە گاڵتەوە پێی دەڵێ: ﴿جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى – طه/٤٠﴾ ئەم جۆرە بەکارهێنانەی قورئان جۆرێکە لە گاڵتەکردن بە قورئان.

هەر لەم بوارەدایە کە ئیبنو شەهابی الزهری دەڵێ: موناظەرە بە قورئانو بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناکرێ، ئەبو عوبەید دەڵێ: هاوتا بۆ قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دامەنێ نە بە گوفتار نە بە کردار.

## (١٩) سوێند خواردنو شێوەی سوێند لە قورئاندا

ئامادەباشی نەفسی مرۆڤ بۆ وەرگرتنی حەقو ملکەچ بوون بۆی، لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ، نەفسی پاكو بێ گەرد: کە بە تاوان پیس نەبووبێ، بە پیر هیدایەتو بانگەوازی حەقەوە دەچێو دڵی خۆی بۆ تیشکەکانی دەکاتەوەو پرتەوێك، ئامـاژەو ئیشارەتێکی بەسەو حەق وەردەگرێو پابەندی دەبێ، وەلێ نەفسێك کە هەوری نەزانی بەسەرەوە بێو تاریکایی بەتاڵو ستەم دایپۆشیبێ، دڵی ئەو نەفسە بە چەکوچی زەجرو صیغەو دارێژگەی جەخت لەسەر کراو نەبێ داناچڵەکێو نالەرزێ، سوێند لە بواری خیطابو ئاخاوتندا شێوازێکە لە شێوازەکانی تەئکیدو بەڵگەی بۆڕدەر لەگەڵ خۆی ئاراستە دەکا، بەرامبەرو خەصم ئیستدراج دەکا بۆ ئەوەی ئیعتیراف بەو شتە بکا کە ئینکاری کردووە.

## پێناسەی سوێندوداڕێژگەی (تعريف القسم وصيغته)

(قسَمَ) کە کۆیەکەی (أقسام)ە بە مانـا سـوێند دێ داڕێژگـەی سـەرەکی بۆ سوێندو سوێندخۆری ئەوەیە کابرا فیعلی (أقسم) یان (أحلف) بڵێ ئـەمجار ناوی سوێند پێخوراو بێنێ پاشان سوێند لەسەر خوراو بڵێ کە ئەمـەیان پێـی دەگـوترێ (جـواب القـسم) وەڵامـی سـوێند، وەکـوو پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لا يَبْعَثُ اللَّهُ مَنْ يَمُوتُ – النحـل/٣٨﴾ پێکهاتـەی سوێند سێ شتە:

١- فیعلی ﴿وَأَقْسَمُوا﴾.

٢- سوێند پێخوراو ﴿بِاللَّهِ﴾.

٣- سوێند لەسەر خوراو ﴿لا يَبْعَثُ اللَّهُ مَنْ يَمُوتُ﴾.

جا چونکە سوێند لە ئاخاوتندا زۆر بەکاردەهێندرێ صیغەکەی کورت کراوەتـەوە، فیيعلەکـەی حـەزف دەکـرێو بـە حـەرفی (ب) کیفایـەت دەکـرێ، پاشـان پیتــی (واو)یــان لــە جیــاتی (ب) بــەکارهێناوە لــە کاتێکـدا ســوێند پێخوراوەکە ئیسمی ظاهیر بێ، وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى – الليل/١﴾ یان پیتی (ت) بەکاردەهێندرێ وەکوو قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَتَاللَّـهِ لأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ بَعْدَ أَنْ تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ – الأنبياء/٥٧﴾ شایانی باسە لـە سـوێندا (ت) کەم بەکاردەهێندرێو بە زۆری (واو) بەکاردەهێندرێ.

لە زمانی عەرەبیدا وشەی (القسم) و (اليمين) یەك مانـا دەبەخـشنو بە مانا سوێندن، سوێندیش وا پێناسە دەکرێ: کە بریتییـە لـە پابەنـدکردنی نــەفس بــە وازهێنــان لــە شــتێکدا، یــان قەصـدکردنیو هەوڵدان بـۆ کردنــی، ســوێندەکە بخـوا بــە شــتێك کــە لــە بــاوەڕی ســوێندخۆردا ڕێـزدارو پـیرۆزو موقەدەس بێ لـە حەقیقـەتو واقیعدا، یـان هـەر بـە بـڕوای سوێندخۆر، لـە عەرەبیدا وشەی (حلف) بۆ سوێند بەکاردێ، چونکە عـەرەب دابو نـەریتیان

وابوو، یەکێکیان قۆڵی ڕاستی ئەوی تریانی دەگرت لەکاتی سوێند بۆ یەکتر خواردن.

## سودو قازانجی سوێند لە قورئاندا

لوغەی عەرەبی تایبەتمەندی تایبەتی خۆی هەیە، بەوەی تەعبیری وردی هەیەو بۆ تەعبیردانەوە لە شتێك چەند شێوازی جیاجیا بەکار دێنێ، بەگوێرەی مەبەستەکان، شێوازی تەعبیردانەوە دەگۆڕدرێ....

ئەو کەسەی خیطابی ئاراستە دەکرێ سێ حاڵی جیاجیای هەن، کە لە عیلمی بەلاغە (زانستی بەیان)دا پێی دەگوترێ جۆرەکانی خەبەر (إبتدائی – طلبی - إنکاری) وا دەبێ موخاطەب زەینی خاڵییە لە بارەی حوکمەکەوە، ئیتر خیطابی ئاراستە دەکرێ بەبێ ئەوەی خیطابەکە تەئکیدو جەختکردنەوەی تێدا بێ، بەمە دەگوترێ خەبەری (إبتدائی)و سەرەتایی.

وا دەبێ موخاطەب ڕاڕایە لە چەسپانی حوکمەکەیدا دڵنیا نیە چۆنو چۆن نیە، ئەم جۆرە موخاطەبە واباشە: کە خیطابی ئاراستە دەکرێ بە تەئکیدەوە بێ، بۆ ئەوەی ڕاڕایی لە دڵدا نەمێنێ، بەم جۆرە خیطابە دەگوترێ: خەبەری طەلەبی.

وا دەبێ موخاطەب ئینکاری خەبەر دەکا، لێرەدا پێویستە بەگوێرەی ئینکارییەکەی تەئکیدی بۆ دەکرێ، چەندێك ئینکارییەکەی بەهێز بێ تەئکیدەکەی بۆ زیاد دەکرێ، بەم جۆرە خەبەرە دەگوترێ: خەبەری ئینکاری.

سوێند بۆخۆی جۆرێکە لەو جەختکردنەوە مەشهورانەی شت لە دڵو دەروونندا جێگیر دەکاو بەهێزی دەکا.

بێگومان قورئان بۆ هەموو کەس نازڵ بووەو ئاراستەی سەرجەم ئادەمیزاد کراوە، خەڵکی لە بەرامبەریدا هەڵوێستی جیاجیان وەرگرتووە، هەیانبووە ڕاڕابووەو شكو گومانی هەبووە، هەیانبووە مونکیرو بێ باوەڕ،

هەیانبووە تا سەر ئێسقان دژو سەرڕەقو بێ باوەڕ بوون، سوێند لە قورئانی پیرۆزدا شكو گومان دەڕەوێنێتەوە گومانگەلەكان دەپوكێنێتەوە، بەڵگە ڕاست دەكاتــەوە، تەئكیــدی خەبــەرەكان دەكــا، حوكمەكــە لــە كــامڵترین شــێوەدا دەچەسپێنێ.

## سوێندپێخوراو لە قورئاندا

پەروەردگار لە قورئاندا بە زاتی پیرۆزی خۆی سوێند دەخوا، هــەروا سوێند بە صیفاتی خۆی دەخوا، یان بەو ئایاتو نیشانانەی تایبەتن بــە زاتو صــیفاتی خــۆی، ســوێند خــواردنی پــەروەردگار بــە هەنــدێ لــە مــەخلوقاتی بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی ئــەو شــتە بەشــێكە لــە ئایــاتو نیــشانە گــەورەكانی، بێگومان پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا لە حــەوت شــوێن ســوێندی بــە زاتــی خۆی خواردووە

١- ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ لَنْ يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ – التغابن/٧﴾.

٢- ﴿وَقَالَ الَّـذِينَ كَفَـرُوا لا تَأْتِينَـا الـسَّاعَةُ قُـلْ بَلَـى وَرَبِّـي لَتَـأْتِيَنَّكُمْ – سبأ/٣﴾.

٣- ﴿وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ – يونس/٥٣﴾ وەكــوو دیارە پەروەردگار لەم سێ جێگایەدا فەرمانی بە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەسەر بێ) كردووە: كە سوێندی پێ بخوا.

٤- ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ – مريم/٦٨﴾.

٥- ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ – الحجر/٩٢﴾.

٦- ﴿فَـلا وَرَبِّــكَ لا يُؤْمِنُــونَ حَتَّــى يُحَكِّمُــوكَ فِيمَــا شَــجَرَ بَيْــنَهُمْ – النساء/٦٥﴾.

٧- ﴿فَلا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ – المعارج/٤٠﴾.

هــەروا بــاقی ســوێندخواردنەكانی تــر: كــە پــەروەردگار لــە قورئانــدا ســوێندی بــە دروســتكراوانی خــۆی خــواردووە وەكــوو دەفــەرموێ: ﴿وَالـشَّمْسِ

وَضُحَاهَا ، وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا – الشمس/١ – ٢﴾ هەروا كە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى ، وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى ، وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى – الليل/١ – ٣﴾ يان دەفەرموێ: ﴿وَالْفَجْرِ ، وَلَيَالٍ عَشْرٍ – الفجر/١ – ٢﴾ يان دەفەرموێ: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ – التكوير/١٥﴾ يان دەفەرموێ: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ، وَطُورِ سِينِينَ – التين/١ – ٢﴾.

ئەم جۆرە سوێندخواردنەی پەروەردگار بە دروستكراوانی خۆی زۆرو زەبەندن، بۆ خودا ڕەوایە سوێند بخوا بە هەرشتێك بیەوێ وەلێ سوێندخواردنی بەندەكانی بە غەیری زاتی خوداو صیفەتەكانی دروست نیە، زانایان پێیان وایە سوێندخواردن بە غەیری خوداو صیفەتەكانی، جۆرێكە لە شیركو هاوەڵدانان بۆ خودا!.

لە عومەری كوڕی خەتابەوە ڕیوایەتكراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ» كەسێك بە غەیری خودا سوێند بخوا بێگومان كافر بووە، یان هاوەڵی بۆ خودا داناوە، پەروەردگار كە سوێندی بە مەخلوقاتی خۆی دەخوا، چونكە ئەوانە نیشانەی بوونو قودرەتو دەستڕەنگینی دروستكەرەكەیانە: كە زاتی پەروەردگارە، هەروا ئاماژە بۆ گەورەییو سودبەخشی ئەو شتانە بۆ ژیانی مرۆڤ بۆ ئەوەی پەندیان لێ وەرگرنو بیانكەنە نیشانەی گەورەیی خودا.

حەسەن دەفەرموێ: خودا ئارەزوی خۆیەتی سوێند دەخوا بە هەر شتێك بیەوێ لە دروستكراوانی خۆی، بەڵام بۆ كەس دروست نیە سوێند بە غەیری خوداو صیفەتەكانی بخوا.

# جۆرەکانی سوێند

سوێند یان ظاهیرو بە ڕووەوەیە، یان موقەدەرو مەزندە کراوە.

١- سوێندی ظاهیر: ئەوەیە کرداره سوێند ئاساکەی تێدا ظاهیر بێو گوترابێ، سوێندپێخوراوەکەشی دیار بێ، وایش دەبێ فیعلی سوێندەکە حەزف دەکرێو بە (ب) یان (واو) یان (تا) کە حەرفی جەڕنو مانای سوێند دەگەیەنن ئیکتیفا دەکرێ.

لە بڕێ شوێندا (لا)ی نافیە دەخرێتە سەر فیعلی سوێندەکە: وەکوو دەفەرموێ: ﴿لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ – القيامة/ ١ – ٢﴾ دەگوترێ: پیتی (لا) لە هەردوو شوێنەکەدا نەفی شتێکی موناسیبو گونجاو دەکا بۆ ئەو مەقامو جێگەیە واتە: ﴿لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ وا مەزەندە دەکەن (لا صحة لما تزعمون أنه لأحساب ولا عقاب) ئەمجار ڕستەکە دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَبِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾ ئێوە ڕۆژێ قیامەت زیندو دەکرێنەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکرێو سزای بێدینیو تاوانەکانتان وەردەگرنەوە.

ڕایەك هەیە دەڵێ: پیتی (لا) بۆ نەفی سوێندەکەیە: بەم مانایە دەفەرموێ: ئەمن سوێندت بۆ ناخۆم بە ڕۆژی قیامەتو بە نەفسی لۆمەکەر، وەڵێ من پرسیارت لێ دەکەم بەبێ سوێند خواردن، ئایا تۆ دەزانی ئێمە ئێسقانی ڕزیوو پۆڵکاوت بەهۆی مردنتەوە، کۆناکەینەوەو لێکیان نادەینەوەو زیندوت ناکەینەوە؟ نانا وا مەزانە، بێگومان کارەکە ئەوەندە ئاشکرایە پێویست بە سوێند ناکا!!.

ڕایەکی تر هەیە دەڵێ: وشەی (لا) زێدەیە، وەڵامی سوێندەکە لە ئایەتەکەدا حەزف کراوەو ڕستەی ﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ﴾ کە لە دواوە دێ دەلالەت دەکا لەسەر (حذف) کراوەکە، مەزندە کردنەکەی بەمجۆرە دەبێ (لتبعثن ولتحاسبن).

٢- سـوێندی موقـەدەرو مەزنـدەكراو ئەوەیـە فیعلـی قەسـەم دیـار نـەبێو نـەگوترێ، سـوێندپێخوراویش ذیكـر نـەكرابێ، وەكـوو دەفـەرموێ: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ – آل عمران/١٨٦﴾ (أی والله لتبلونّ) واتـە: سـوێند بـە خودا، ئێوە دەربارەی ماڵو سامانتان بەتاقی دەكرێنەوە.

## سوێند لەسەرخوراو

١- سـوێند لەسـەرخوراو مەبەسـت بـە سـوێند جەختكردنـەوەو چەسپاندنی سـوێند لەسـەرخوراوە، كـەوابێ پێویستە بـە جۆرێـك بـێ: كـە سـوێند لەسـەر خـواردنی بـۆ بـە جـوانو مـەقبول دابنـدرێ، وەكـوو كـارێكی لەبەرچاو نەبوو نادیار سوێند لەسەر هەبوونی بخوا.

٢- وەڵامی سوێند (جواب القسم) زۆربـەی كـات ذیكـر دەكـرێ، جـاری وایش دەبێ حـەذف دەكرێ، وەكوو چۆن زۆرجـار وەڵامـی وشـەی (لـو) حـەذف دەكرێ وەكوو قورئان دەفەرموێ: ﴿كَلاَّ لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْـمَ الْـيَقِينِ – التكـاثر/٥﴾ ئەم جۆرە حەذفكردنە بە جوانترین شێواز دەژمێردرێ، چونكە ئەوە دەلالەت دەكا لەسەر تـەفخیمو تـەعظیمو گرنگی پێدانو بـە گـەورە زانـین، كـەوابی مەزندەكردنەكـە ئامـای لێ دێ (لـو تعلمـون مـابین أیـدیكم علـم الأمـر الیقین لفعلتم مالا یوصف من الخیر) وەڵامی سوێندەكە حـەذفكـراوە، وەكـوو قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَالْفَجْرِ ، وَلَيَالٍ عَشْرٍ ، وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ، وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ، هَلْ فِـي ذَلِـكَ قَـسَمٌ لِـذِي حِجْـرٍ – الفجـر/١ – ٥﴾ مەبەسـت لـەم سـوێند خواردنـە ئەوەیە: دەفەرموێ: كاتو زەمانێك: كـە ئـەم كردەوانـەی تێـدا ڕودەدا شـیاوی ئەوەن: كە خودای مەزن سوێندیان پێ بخواو پێویـست بـە (جـواب)ی قەسـەم نیە.

رایـەك هەیـە دەڵێ: وەڵامەكـە حـەذفكـراوە، مەزندەكەی بەمجۆرەیـە (لتعذبن یاكفار مكة).

ڕایەکی تر هەیە دەڵێ: وەڵامی سوێندەکە ئایەتی ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ – الفجر/١٤﴾ بەڵام قسەی صەحیحو گونجاو ئەوەیە، ئەم جۆرە سوێندە پێویستی بە جواب نیە، وادەبێ جەواب حەذف دەکرێ، بەهۆی ئەوەی لە کەلامەکەدا هەیە دەیگەیەنێ، وەکوو ئەوە خودا دەفەرموێ: ﴿لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ – القيامة/١ – ٢﴾ جەوابی قەسەم حەذفکراوە، ئەوەی دەلالەت دەکا لەسەر حەذفکراوەکە ئەو ڕستەی دواوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ – القيامة/٣﴾ مەزندەکە بەم جۆرە دەبێ (لَتُبْعَثُنّ ولتحاسبنّ).

٣- فیعلی ماضی موتەصەرڕەف، ئەگەر مەعمولی لەپێشەوە نەبێ، ئەگەر ببێتە جەوابی قەسەم، پێویستە پیتی (لام) و (قد)ی لەگەڵدا بێ، نابێ یەکێکیان هەبێو ئەوی تریان نەبێ، مەگەر دەقەکە درێژ بێ، وەکوو دەقی ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ، وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا ، وَالنَّهَارِ إِذَا جَلاَّهَا ، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ، وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ، وَالأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ، وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا – الشمس/١ – ٩﴾ جەوابی سوێندەکە ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾ (لام)ی لەسەر نیە حەزف کراوە لەبەر درێژی دەقەکە.

بۆیە دەربارەی ئایەتەکانی ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ، وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ ، وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ، قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ – البروج/١ – ٤﴾ گوتراوە: وا جوانو پەسەندە ئەم سوێندە وەڵامی نەبێو پێویستی بە وەڵام نیە، چونکە مەبەستەکە ئاگادارکردنەوەی ئادەمیزادە لەسەر گەورەیی سوێند پێخوراوەکەو ئاماژەی ئەوەیە: کە ئەو سوێندپێخوراوانە لە ئایاتو نیشانە گەورەکانی پەروەردگارن.

ڕایەك هەیە دەڵێ: وەڵامی سوێندەکە حەذفکراوەو ڕستەی ﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ﴾ دەلالەت دەکا لەسەری، واتە ئەوانە – مەبەست کافرەکانی

مەککەیە – نـەفرین لێکراون وەکوو چۆن ئەصحابولئوخدود نـەفرینیان لێ کراوە.

رایەکی تر هەیە دەڵێ: پێشەوەی سوێندەکە حەذفکراوە مەزندەکەی بەمجۆرەیە (لقد قتل............) چونکە فیعلی ماضی ئەگەر بوو بە جەوابی قەسەم دەبێ (لام) و (قد)ی لەپێشەوە بێ، دروست نیـە یـەکێکیان دابنـدرێو ئەویتریان لابدرێ، مەگەر کەلامەکـە درێـژ بـێ وەکوو لـەوەپێش تێپـەڕی لـە باسـی ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ، وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا ، وَالنَّهَـارِ إِذَا جَلاَّهَـا ، وَاللَّيْـلِ إِذَا يَغْشَاهَا ، وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ، وَالأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ، وَنَفْسٍ وَمَا سَـوَّاهَا ، فَأَلْهَمَهَـا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا – الشمس/١ – ٩﴾.

٤- پـەروەردگار سـوێند دەخـوا لەسـەر ئـەو بنەمایانـەی ئیمـان: کـە پێویـستە بەنـدەکان بیـانزانن، وادەبـێ سـوێند دەخـوا لەسـەر تـاكو تـەنهایی خۆی، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفّاً ، فَالزَّاجِرَاتِ زَجْراً ، فَالتَّالِيَاتِ ذِكْـراً ، إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ – الصافات/١ – ٤﴾.

جـاری وا هەیـە سـوێند دەخـوا لەسـەر ئـەوە: کـە قورئـان کـەلامێکی حەقو ڕاستە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُـومِ ، وَإِنَّـهُ لَقَـسَمٌ لَـوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ، إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ – الواقعة/٧٥ – ٧٧﴾.

جاری وا هەیە سوێند لەسەر حەقو ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دەخـوا وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿يـس ، وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ ، إِنَّكَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ – يس/١ – ٣﴾.

وادەبـێ سـوێند دەخـوا لەسـەر (وعـد وعیـد) وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْواً ، فَالْحَامِلاتِ وِقْراً ، فَالْجَارِيَاتِ يُسْراً ، فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْراً ، إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ، وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ – الذاريات/١ – ٦﴾.

جاری واهەیە سوێند لەسـەر حـاڵی مـرۆڤ دەخـوا وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى ، وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى ، وَمَـا خَلَـقَ الـذَّكَرَ وَالأُنْثَـى ، إِنَّ سَـعْيَكُمْ

لَشَتَّى – الليل/١ – ٤﴾ كەسێك لە سوێندەكانی قورئان ورد بێتەوە زۆر فنون دەردێنێ.

٥- سوێند لە قورئانـدا وادەبێ دەكەوێتە سەر جوملەی خەبەریو زۆربەی كاتیش وایە، وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ – الـذاريات/٢٣﴾ یان دەكەوێتە سەر جوملەیەكی وا لە مانادا طەلەبی بێ وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ – الحجر/٩٢ – ٩٣﴾ چونكە مەبەست لەم دەقە هەڕەشەو ترساندنە.

## سوێندو مەرج

سوێندو مەرج پێكەوە كۆدەبنەوە، ئەمیان دەچێتە سەر ئەویانو بەپێچەوانەشەوە، هەردوكیشیان وەڵامیان دەوێ، هەر وەڵامێكیش بەیدەست دەبێ، ئەمجار كامیان لە سوێندو مەرج لە پێشەوە بوو وەڵامەكە بۆ ئەوەو وەڵامی ئەویتریان چاوپۆشی لێ دەكرێ.

جا ئەگەر سوێند پێش كەوت لە شەرت، وەڵامەكە دەبێتە هی سوێندو وەڵامی شەرتمان ناوێ پێویستمان نیە وەكوو دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ لَمْ تَنتَهِ لأَرْجُمَنَّكَ – مريم/٤٦﴾ مەزندەكە بەمجۆرە دەبێ (والله لئن لم تنته) ئەو پیتی لامەی چووتە سەر (أن)ی شەرتییە لامی جوابی قەسەم نیە وەكوو ئایەتی ﴿وَتَاللَّهِ لأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ – الأنبياء/٥٧﴾ لامی جوابی قەسەمە، بەڵكوو لەوەی پێشوودا لامەكە چووەتە سەر (أن)ی شەرتییە بۆ ئەوەی ئاماژە بێ ئەو جوابەی دوایی دێ جوابی قەسەمێكە لەپێشیەوەیە، نەك جوابی شەرت بێ، بەم پیتی (لام)ە دەگوترێ: (لام المؤذنه) یان (اللام الموطئه للقسم) چونكە ڕێخۆشكەرەی كردووە بۆ قەسەمەكە، وەكوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الأَدْبَارَ ثُمَّ لا يُنْصَرُونَ – الحشر/١٢﴾ زۆربەی كات (لامی ڕێخۆشكەرە بۆ

سوێند) دەچێتە سەر (أن) شەرتییە، کەمجاریش دەچێتە سەر شتی تر، ناشگونجێ بگوترێ ڕستەی شەرتییەکە جوابی قەسەمە مەزندەکراوەکەیە، چونکە جوملەی شەرتی ناگونجێ ببێتە جواب، چونکە مەرجە جواب دەبێ جوملەی خەبەری بێ، جوملەی شەرتی ئینشائییەو بە کەڵکی ئەوە نایە ببێتە جوابی قەسەم، لەسەر ئەم بنەمایە فەرموودەی خودا لە نموونەی یەکەمدا: کە دەفەرموێ: ﴿لأَرْجُمَنَّكَ﴾ دەبێتە جوابی قەسەمە مەزندەکراوەکە: ئیتر بێ ئاتاجی کردوون لەجوابی شەرتەکە.

داخڵبوونی (لام)ی ڕێخۆشکەرە بۆ قەسەم واجب نیە بچێتە سەر ڕستەی شەرتییە، چونکە هەندێ جار ئایەتی قورئان: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ لَمْ يَنتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – المائدة،٧٣﴾ ئەوەی لێرەدا دەلالەت دەکا لەسەر ئەوە جوابەکە بۆ قەسەمە، بۆ شەرتەکە نیە، داخڵبوونی (لام)ە بۆ سەر جوابی قەسەمو فیعلە موضاریعەکە مەجزوم نیە بە بەڵگەی ئایەتی ﴿قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ – الإسراء/٨٨﴾ ئەگەر جوملەی ﴿لا يَأْتُونَ﴾ وەڵامی شەرتەکە بوایە دەبوایە فیعلە موضاریعەکە (يأتون) مەجزوم بوایە.

وەلێ ئایەتی ﴿وَلَئِنْ مُتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لإِلَى اللَّهِ تُحْشَرُونَ – آل عمران/١٥٨﴾ (لام)ی داخڵبوو بۆ سەر (أن) شەرتییە (لام) ڕێخۆشکەرەیە بۆ قەسەم (لام) (لإِلَى اللَّهِ) (لام)ی جوابی قەسەمە، واتە: لە جوابی قەسەمدا واقیع بووە، نوونی تەوکیدیش نەچۆتە سەر فیعلەکە، چونکە فەصڵو ناوەند هەیە لەنێوان (لام)ی جوابی قەسەمو فیعلەکە بە (جارو مەجرور) ئەصڵی جوملەکە ئاوایە (لئن متم أو قتلتم لتحشرُن إلى الله) لەم ڕووەوە جوابی قەسەم ئەگەر فیعلەکە موثبەتو موستەقبەل بوو دەبێ نوونی تەوکیدی پێوە بلکێ بەمەرجێ لەنێوان (لام)ی جوابی قەسەمو فیعلەکەدا فاصل نەبێ.

## بەکارهێنانی هەندێ فیعل لەشوێنی قەسەم

ئەگەر سوێندەکە بۆ جەختکردنەوە بوو لەسەر سوێند لەسەر خوراوەکە، لەم حاڵەدا هەندێ فیعل وەکوو قەسەم مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ، بەمەرجێ سییاقی کەلامەکە لە مانای سوێنددا بێ، وەکوو ئایەتی ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ – آل عمران/١٨٧﴾ (لام)ی ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ﴾ (لام)ی جوابی قەسەمە، جوملەکەی دوای جوابی قەسەمە، چونکە ئەخذی میثاقو وەرگرتنی عەهدو بەڵێن بە مانای سوێند دانو شتی وادێ.

راڤەکەرانی قورئان ئەم ئایەتانەی دواییان حەمل کردووە بۆ سەر ئەم قاعیدەیەی پێشوو، واتە: بۆ ئایەتی ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لا تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ – البقرة/٨٣﴾ هەروا ئایەتی ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لا تَسْفِكُونَ دِمَاءَكُمْ – البقرة/٨٤﴾ هەروا ئایەتی ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ – النور/٥٥﴾ هەمان تەوجیهو ئیعرابیان کردووە: کە بۆ ئایەتی ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ– – آل عمران/١٨٧﴾ کردووە.

## ٥٠) بەڵگە هێنانەوەو جەدەلی قورئان

ئاشکرایە: کە حەقیقەتە دیارو بەرچاوەکان، مرۆڤ هەستیان پێ دەکاو دەیانبینێو پێیان ئاشنایە، بەڵگە کەونییەکانیش بە زمانی حاڵ دەیاندرکێننو بەگوێی ئادەمیزادیاندا دەدەن، بۆ چەسپاندنو سەلماندنیان پێویست بە بەڵگەو بورهان ناکا، حەوێجەی بە دەلیل هێنانەوە نیە بۆ دڵنیابوون لە راستیو دروستیان، وەلی سەر رەقیو موکابەرە زۆرجار خاوەنەکانیان هەڵدەنێن شكو گومان بەرپا بکەنو حەقیقەتەکان روکەش بکەن بە گومانگەلێكو پۆشاکی حەقیان بە بەردا بکەنو لەپێش ئاوێنەی عەقڵدا بیان رازێننەوە، ئالێرەدا ئەو نەفسە سەرکەشو مرۆڤە لەخۆبایی

بوو دڵڕەقانە، پێویستیان بەوە هەیە بە بەڵگەی بەهێز بۆڕ بدرێن‌و سەریان بکوترێتەوە، کێش بکرێن‌و پاڵیان پێوە بنرێ بۆ دان پیانان‌و ئیعتیراف، جا ئیمان بێنن، یان لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان بمێننەوە.

قورئانی پیرۆز – کە بریتییە لە بانگەوازی خودا بۆ مرۆڤایەتی بە تێکڕایی‌و بەگشتی – ڕووبەڕوی زۆر بیروباوەڕی جیاجیا بۆتەوە، بەهەموو هێزو پێزیانەوە هەوڵیان داوە ئینکاری حەقیقەتەکانی بکەن‌و کێشەو جیدال ئاراستەی بنەماکانی بکەن، ئەوەبوو قورئان نەیارەکانی خۆی بۆڕدان‌و بۆڕی دان‌و قوڕی بە دەمدا دان، بە بەڵگەی حیسسی‌و بەرچاو ڕووبەڕویان بووەوە، بە شێوازێکی قەناعەتئامێز بەرامبەریان وەستا، بەڵگەی کەمەر شکێن‌و بۆڕدەری ئاراستەکردن‌و جیدالی پڕوپوچ‌و مەحکەمی لەگەڵدا کردن.

## پێناسەی جەدەل

جەدەل‌و جیدال: واتە: دان‌وسان‌و موفاوەضە بە مەبەستی دەمەدەمێ‌و بۆڕدانی بەرامبەر، بنەمای جەدەل لە ڕستەی (جدلت الحبل) وەرگیراوە واتە: حەبلەکەم باداو بەهێزم کرد، وەکوو ئەوە هەریەك لەو جەدەلبازو دژبەیەکانە هەوڵ دەدا هێزی بەڵگەی ئەویتر خاو بکاتەوەو شی بکاتەوەو هێزی تێدا نەهێڵێ.

بێگومان پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەوەی ڕاگەیاندووە: کە خصومەت‌و کێشەو جەدەل بەشێکە لە سروشتی ئادەمیزادو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً – الكهف/٥٤﴾ فەرمانکراوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوەی بە ئوسلوب‌و شێوازی نەرم‌و جوان موجادەلە لەگەڵ موشریکەکان بکا، بەو موجادەلە نەرم‌و نیانە، سەرڕەقی‌و لوتبەرزی‌و سەرکەشییان خاو بکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ – النحل/١٢٥﴾

پەروەردگار دەمەدەمێ و موناظەرەی لەگەڵ خاوەن نامەکاندا بەو شێوەو ڕێبازە نەرمییە حەڵاڵ کردووە دەفەرموێ: ﴿وَلا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ – العنكبوت/ ٤٦﴾.

موناظەرەو بەڵگە هێنانەوە بەو شێوازە نەرم‌و جوانە جەدەل‌و موناظەرەیەکە مەبەست لێی دەرخستنی حەق‌و ڕاستییە، ڕاستکردنەوەی ئەو حەقەو چەسپاندنی ئەم طەریقەو ڕێبازەیە: کە قورئان لە بواری جەدەل‌و موناظەرەدا بۆ هیدایەتی کافرەکان پەیڕەوی کردووەو هەوڵی داوە بەم شێوەیە دژو بەرامبەرەکانی بێنێتە ژێر ڕەدایەو لەگەڵ بەرنامەکەی بیانگونجێنێ، بە پێچەوانەی ئەهلی ئەهواو لوتبەرزو سەرڕەق: کە هەمیشە نیزاع‌و کێشەکانیان لەناو بەتاڵدا دەسوڕێتەوەو بۆ چەسپاندنی بەتاڵە، دەفەرموێ: ﴿وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ – الكهف/٥٦﴾.

## ڕێ‌و ڕەسمی قورئان لە بواری موناظەرەدا

قورئانی پیرۆز زۆر بەڵگەو بورهان دەهێنێتەوە: کە ڕوبەڕوی ناحەزەکانی بۆتەوەو ئەو بەڵگەو دەلیلانەی ئاراستەکردوون بەشێوەیەکی جوان‌و ئاشکرا بەجۆرێك خوێندەوارو نەخوێندەوار، عام‌و خاص، تێی دەگا، هەموو گومانگەلێکی فاسیدو گەندەڵی پوچ کردۆتەوە، بەشێوەی موعارەضەو مەنع بەڵگەو دەلیلی ئەوانی هەڵوەشاندۆتەوە ئوسلوبی ئاکام ڕون‌و ڕستەی بێ گرێ‌و گوڵ‌و مەعنا ئاشکرای بەکارهێناوە، بۆ تێگەیشتن لێیان پێویست بە ماندوکردنی عەقڵ‌و لێکۆڵینەوەی زۆر ناکا.

قورئانی پیرۆز لە جەدەل‌و ڕوبەڕوبوونەوەی بێ بڕوایاندا ڕێبازی (متکلمین)ی بەکار نەهێناوە، بەڵگە ئیسطیلاحییە پێکهاتووەکانی ئەوانی بەکارنەهێناوە: کە پێك هاتووە لە موقەدیمات‌و ئاکام، نەهاتووە (قیاس الشمول) بەکاربێنێ بەمجۆرە بەڵگە بە مەفهومە کوللیەکان بێنێتەوە بۆ

چەسپاندنی مەفهومە جوزئییەکان، یان (قیاس التمثیل) بەکاربێنێ بەمجۆرە مەفهومە جوزئییەکان بکاتە بەڵگە بەسەر مەفهومە کولییەکانەوە، چونکە قورئان بە زمانی عەرەبی نازڵ بووەو بەشێوەیەك خیطابی ئاڕاستەکردوون لێی حاڵی بن.

هەروەها چونکە پشت بەستن لە بەڵگە هێنانەوەدا بەو شتانەی نەفسی مرۆڤ لەسەری دروست بووەو پێیان ئاشنابووەو بڕوای پێیان هەیەو دەیانبینێو هەستیان پێ دەکا، بەبێ پێویستی بە فکری قوڵو بیرکردنەوەی زۆرو تاقەت پڕوکێن، کاریگەری زۆرتری هەیەو باشترو زوتر بەرامبەر بۆڕ دەداو مەبەست دەپێکێ، لەلایەکی ترەوە وەلانانی کەلامی ئاشکراو ڕونو پەنابردن بۆ قەسەو بەڵگەی وردو فەلسەفە ئامێزو خەفیو مانا شاراوە، جۆرێکە لە مەتەڵو غموضو تەمومژ کەسانێکی تایبەت نەبێ لێی حاڵی نابن.

لەسەرێکی ترەوە جەدەلو موناقەشە لەسەر ڕێبازی مەنطیقیەکان لەهەموو ڕویەکەوە گونجاوو سەلیم نیە، چونکە بەڵگەکانی یەکتاپەرستیو زیندوبوونەوەو ڕوداوەکانی قیامەت: کە قورئان باسی کردوونو چەسپاندونی، جۆرێکن لەو دەلالەتو بەڵگانەی خودی خۆیان ماناکان دەگەیەننو هیچ پێویست بەوە ناکا بخرێنە ژێر قەضییەیەکی کوللیەوە.

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە (خودای لێ ڕازی بێ) لە کتێبێکیدا: کە ناوی ناوە (الرد على المنطقيين) دەفەرموێ: ئەوەی عەقڵکارەکان؛ مەنطیقییەکان رایاننواندوە لەو بەڵگە قیاسییانەی ناویان ناون (براهین)و بەڵگە لەسەر هەبوونی خودای بەدیهێنەر، دەلالەت لەسەر شتێکی تایبەتی ناکەن بە عەینی خۆی، بەڵکوو دەلالەت دەکەن لەسەر ئەمرێکی کوللی ڕەها: کە تەصەورکردنی ئەو کوللیە ڕەهایە تەوحیدی لەخۆ نەگرتووەو مەنعی شەراکەتو هاوبەشی تێدا نیە.

بۆ نموونه ئەگەر ئێمه لەسەر ڕێبازی مەنطیقییەکان بڵێین: (هذا مُحْدَث، وكل مُحْدَثٍ فلابد له من مُحْدِث) ئەمە تازە پەیدا بووە، هەموو تازە پەیدابوویێك پێویستە دەبێ پەیداکەرێکی هەبێ.

یان (هذا ممکن والممکن لابد له من واجب) ئەم دوو قیاسەو نموونەیان، تەنها دەلالەت دەکەن لەسەر (محدث)ێکی موطلەق، یان (واجب)ێکی موطلەق، تەصەورکردنی موحدیثی موطلەقو (واجب)ی موطلەق مەنعی شەراکەتو هاوبەشی ناکا تێیاندا.

ئەمجار ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ: بورهانو بەڵگەی مەنطیقییەکان بەو شێوەو شێوازە، دەلالەت ناکا لەسەر زاتێکی موعەیەنو مەخصوص، نە دەلالەت دەکا لەسەر (واجب الوجود) نە دەلالەت دەکا لەسەر غەیری ئەو، بەڵکوو دەلالەت دەکا لەسەر ئەمرێکی کوللی، بە ڕواڵەت (کوللی) مەفهومێکە تەصەورکردنی مەنعی ئەوە ناکا شەراکەتی تێدا بێ، (واجب الوجود) ناسینو زانیاری پێی مەنعی بوونی شەراکەت دەکا، کەسێك تەصەوری (واجب الوجود) بکا بەجۆرێك: کە مەنعی شەراکەت نەکا ئەوە دیارە خودای نەناسیوە......) ئەمجار دەڵێ: ئەمە بە پێچەوانەی ئەومیە: کە خودا لە قورئاندا رایدەگەیەنێ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنْ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – البقرة/١٦٤﴾. هەروا ئایەتی ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – الرعد/٤﴾ هەروا ﴿لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ – يونس/٢٤﴾. چەند ئایەتی تر دەلالەت دەکەن لەسەر هەبوونی خودایەکی تاكو تەنها وەکوو چۆن خۆر دەلالەت دەکا لەسەر روناکیو رۆژ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ –

الإسراء/١٢﴾. ئایەتەکان دەلالەت دەکەن لەسەر بوونی خودی بەدیهێنەر، لەسەر بوونی خودایەکی خاوەن دەسەڵاتو بەتوانا، وەکوو بەڵگەو قیاسە مەنطیقییەکان دەلالەت ناکەن لەسەر قەدەرێکی هاوبەش و مەفهومێکی کوللی رەها: کە رێگری ناکا لەبوونی هاوبەش لەنێوان خوداو غەیری خودادا. چونکە بەپێی بەڵگە قورئانییەکان، هەرچی بوونەوەرە ئاتاجی خودایە، پێویستە لە ئاکامی بوونی بوونەوەر، دان بەبوونی خودا خۆی دابنێین بەبێ سێو دوو بەڵگەکانی خودای مەزن لەسەر تاك و تەنهایی خۆیو ئەو هەوالانەی رایگەیاندون دەربارەی رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە، ئەو بەڵگانەی راینواندون لەسەر راستی پێغەمبەرەکانو دروستی پەیامەکانیان، بەجۆرێکن: کە هیچ پێویستیان بە قیاسی (شمولی یان تەمثیلی) نیە، بەڵکوو بەڵگەکان بۆخۆیان بەروونی مانا دەبەخشنو زانیاریش دەربارەیان لێوەی لازم دێ، زانیاری بە مەدلولو موسەمماکانیان، واتە: ئینتیقالو گواستنەوەی ذیهن لەخودی بەڵگەکانەوە بۆ مەدلولو ماناکان رونو ئاشکرایەو هیچ تەمو مژی تێدانیە. وەکوو ئینتیقالی ذیهن لە بینینی تیشکی خۆرەوە بۆ زانیاریو هەست کردن بەهەلاتنی. ئەم جۆرە بەڵگەو دەلیلانە ئەوەندە ئاشکراو سەلمێنراون هەموو عەقڵەکان یەکسانن لەدەرك کردنیاندا.

زەرکەشی فەرموویەتی: بزانن: کە قورئانی پیرۆز هەموو جۆرە بەڵگەو بورهانو دەلیلێکی لەخۆ گرتووە، بەڵگەیەك، دەلالەتێك، تەقسیمو تەحدیدێك نیە لە تێکڕای مەعلووماتە عەقڵیو سەمعییەکاندا ئیللا کەهەیە، قورئان دەری بڕیوەو نوتقی پێ کردوە، وەلێ پەروەردگار ئەو بەڵگە جۆراو جۆرانەی بەشێوازی دابو نەرێتی عەرەب دەربڕیوە، نەك لەسەر شێوازی وردەکاریو فەلسەفەکاری موتەکەلیمینو مەنطیقییەکان ئەمەش لەبەر دوو هۆکار:

١- هۆی ئەوەیە پەروەردگار بۆ هەر گەل‌و نەتەوەیەك پێغەمبەری ناردبێ بە زوبانی خۆیان پێغەمبەری بۆ ناردون. وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ – ابراهيم/٤﴾.

٢- ئەوەی ئارەزۆی لە مەسائیلی وردەكاری بێ‌و هەوڵی بەڵگە هێنانەوەی فەلسەفە ئامێزو مەنطیقیانە بدا، ئەوە خۆی لەخۆیدا ناتوانێ بەڵگەی ئاشكراو رون بێنێتەوەو خەڵكی ئیقناع بكا، بۆیە پەنا بۆ ئەو بوارە تەم‌و مژاوییە دەبا. بێگومان كەسێك بتوانێ بە بەڵگەی ئاشكراو روون خەڵكی تێبگەیەنێ‌و زۆرینەی خەڵك قەناعەت پێ بكا، پەنا ناباتە بەڵگەی فەلسەفە ئاسای غامیض‌و تەم‌و مژاوی شێوە مەتەڵ كە كەمینەی خەڵك لێی حاڵی دەبن، بۆیە پەروەردگار خیطابەكانی خۆی دەربارەی بەڵگە هێنانەوەو قەناعەت پێكردنی خەڵك لە جوانترین شێوازو ساكارترین شێوەی بەڵگە هێنانەوەدا ئاراستە كردون، بۆئەوەی زۆرینەی خەڵك لە بەڵگە ئاشكراكان حاڵی ببن‌و حوجەیان بەسەردا بسەپێ، كەمینە تایبەتیەكەشیان لە ئەثنای ئەو بەڵگانەوە تێگەیشتنی وردترو قوڵتریان بۆ دەستەبەر ببێ‌و زیاتر بچنە بنج‌و بناوانی ئەو بەڵگانە. كەوابێ دەبێ فەرموودەی ریوایەتكراوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): (إِنَّ لكل آية ظهراً وبطنا، ولكل حرف حداً ومطلعا).[1] بەمجۆرە مانا بكرێ، نەك بەو شێوەی (باطنیە)كان مەعنایان كردوە، لەسەر ئەم بنەمایە هەركەسێ زاناتربێ‌و لە زانستەكاندا پتر شارەزابێ، بەش‌و باری لەزانستی قورئاندا زۆرترو قوڵترو وردترە، بۆیە دەبینین پەروەردگار: كە بەڵگەیەك لەسەر خودایەتی خۆی‌و تاك‌و تەنهایی خۆی دەهێنێتەوە بەشوێن بەڵگەكەدا ئەوانە دیاری دەكا كە عیبرەتی لێ وەردەگرن‌و لێی سودمەند دەبن، جارێك ئەو سودمەندانە پاڵ عاقڵمەندەكان دەدا، وادەبێ پاڵ گوێگرو سامعینی دەدا، دەمێكیش بۆ (متذكرين)و

---

[1] يروى عن الحسن موقوفا أو مرسلاً كما في مجموع الفتاوى إبن تيمية ج٣٣٢/١٣.

بیریارەکان، بەمەش پەروەردگار ئەوەمان بیردەخاتەوەو تێمان دەگەیەنێ: کە مرۆڤ بەهەریەکێ لەم هێزە عەقڵیو هەستیانەی هەیەتی دەتوانێ دەرکی حەقیقەت بکاو راستی بدۆزێتەوەو نیشانەو ئامانج بپێکێ! وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – الرعد/٤﴾و چەند ئایەتی تری لەم جۆرە.

پێویستە ئەوە بزاندرێ: کە جاری واهەیە: بەهۆی فیکری وردو شارەزا لە زانستدا مرۆڤ دەتوانێ لەسەر شێوەی موتەکەلیمین بەلگەو بورهانی عەقڵی لە ئایەتەکان دەربهێنێ، وەکوو بەلگە هێنانەوە لەسەرئەوە: کە خالیقو بەدیهێنەری بوونەوەر خودای تاكو تەنهایە، بەمجۆرە لە ئایەتی ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا – الأنبياء/٢٢﴾ بورهانی تەمانوع (برهان التمانع) ئاڕاستەبکا، چونکە ئەگەر بوونەوەر دوو خوداو زیاتری ببوونایە، ئەکید بەڕێوەبردنەکانیان رێكو پێك نەدەبوو، بەوشێوە سەرسوڕهێنەرو تۆکمەیە بوونەوەر (ئەرزو ئاسمانەکانو ئەوەی تێیاندایە) بەڕێوە نەدەچوو، تێکدەچوونو پایەدار نەدەبوون، ئەگەر دوو خودایان هەبوونایە، بێدەسەڵاتیو عیجز هەردوکیانی دەگرتەوە، یان یەکێکیان دەست رۆییشتوو دەبوو ئەویتریان بێ دەسەڵات، بۆنموونە ئەگەر یەکێکیان بیویستایە جیسمێك زیندوو بکاو ژیانی پێ ببەخشێ، ئەویتریان بیویستایە بیمرێنێ، لەم حاڵەدا یان ویستی هەردوکیان دەهاتەدیو تەناقوض رووی دەدا، چونکە کۆبوونەوەی دوو شتی (متناقض) مەحاڵەو ناگونجێن... ئەمە ئەگەر وا فەرز بکەین (اتفاق)یان هەبێ، چونکە مەحاڵە کردارەکەیان قبوڵی بەشکردن بکا. خۆ ئەگەر (اتفاق)یان نەبێ، ئەوکاتە دەبێتە کۆبوونەوەی دوو شتی دژ بەیەكو (ضد). ئەمەیش مەحاڵە. ئەوکاتە یان ویستی هیچیان نایەتەدیو هەردووکیان عاجز دەبن، یان یەکێکیان ویستەکەی جێبەجێ نابێ عاجز

دەبێ. ئاشكراشە خودا نابێ عیجز روی تێ بكا، دەبێ هەرچی ویستی بێتە دی، بێتەدی.

## چەند شێوازێك لە موناظەرەی قورئان و بەڵگەكانی

یەكەم: ئەو ئایەتە كەونییانەی رایاندەنوێنێ لەگەڵ هەڵنانی ئادەمیزاد بۆ وردبوونەوە لێیان و تێفكرینیان، بۆئەوەی بیانكاتە بەڵگەو دەلیل لەسەر بنەماكانی عەقائید وەكوو تاك و تەنهایی لە زات و لە صیفاتیدا لە خودایەتی و خاوەندارێتی بونەوەریدا، بۆ ئیمان هێنان بە فریشتەكانی و بە پێغەمبەرانی و بە رۆژی قیامەت و رووداوەكانی.

هەڵبەتە ئەم جۆرە دەلیلانە لە قورئاندا زۆر و دوبارە كراوەن. یەكێك لەو ئایەتانە ئەم دەقەیە كە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنْ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ فَلا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ – البقرة/٢١-٢٢﴾. هەروا ئایەتی ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ، إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنْ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – البقرة/١٦٣-١٦٤﴾.

دووەم: ئەو ئایەتانەی بەشێوەی رەتدانەوەی دژو بێ باوەڕەكان ئاڕاستەیان دەكاو ئیلزامی ئەهلی عەنادو سەر رەق و دڵ داخراوەكان دەداو دەنەیان دەدا بۆ بەخۆدا چوونەوەو بیركردنەوە، ئەمەش بەچەند شێوەو شێواز ئاڕاستەكراون.

أ/ تەقریركردنی موخاطەب ئاڕاستەكردنی خیطاب بۆی بەشێوەی پرسیار لێكردنی لەوشتانەی كە بەرامبەر تەسلیمیان دەبێ و عەقڵی وەریان

دەگرێ، بۆئەوەی دان بنێ بەوشتانەی ئینکاری کردونو رەتی کردونەوە. وەکوو بەلگە هێنانەوە بە مەخلووقات لەسەر وجودی خالق وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ، أَمْ خَلَقُوا السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بَل لا يُوقِنُونَ، أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُسَيْطِرُونَ، أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ، أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ، أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ، أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ، أَمْ يُرِيدُونَ كَيْداً فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ، أَمْ لَهُمْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ – الطور/٣٥-٤٣﴾.

ب/ بەلگە هێنانەوە بەسەرەتای دروستبوون لەسەر زیندوبوونەوە جارێکی تر. وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ – ق/١٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى، فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى، أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى – القيامة/٣٦-٤٠﴾. هەروا کە دەفەرموێ: ﴿فَلْيَنظُرْ الإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ، إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ – الطارق/٥-٨﴾. هەروەکوو چۆن بەلگە بەزیندوبوونەوەی زەوی بە سەرلەنوێ سەوزبوونەوەی روەكو درەخت دەهێنێتەوە دوای وشك بوونو گەلاڕێزان جارێکی تر لەوەرزی بەهارو ژیانەوەدا سەرلەنوێ گژوگیای وشکبووی پەریوو گەلای هەلوەریو سەر هەلدەدەنەوەو دەکەونەوە گەشەو نەشە. ئەم دیاردەو سەرهەلدانەوانە دەگاتە بەلگە لەسەر زیندوبوونەوەی ئادەمیزاد دوای مردنیان زیندو دەکرێنەوە بۆ حیسابو لێکۆلینەوەو وەرگرتنی سزاو پاداش. دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – فصلت/٣٩﴾.

ج- پوچکردنەوەی دەعوای بەرامبەر بە چەسپاندنی پێچەوانەکەی وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدًى لِلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً وَعُلِّمْتُمْ مَا لَمْ تَعْلَمُوا أَنْتُمْ وَلا آبَاؤُكُمْ قُلْ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ – الأنعام/٩١﴾. بەمەش رەدی جولەکەکانی دایەوە کە پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَرٍ مِنْ شَيْءٍ – الأنعام/٩١﴾.

د/ یاسای سیبرو تەقسیم: بە هەژمارکردنی صیفەتەکانو رانواندنو لێکۆڵینەوە تێیاندا، ئەمجار پوچکردنەوەی ئەوە: کە یەکێکیان بە کەڵکی ئەوەبێ ببێتە عیلەتو بایسی حوکم. وەکوو دەفەرموێ: ﴿ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ مِنْ الضَّأْنِ اثْنَيْنِ وَمِنْ الْمَعْزِ اثْنَيْنِ قُلْ أَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمْ الأُنثَيَيْنِ أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الأُنثَيَيْنِ نَبِّئُونِي بِعِلْمٍ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ، وَمِنْ الإِبِلِ اثْنَيْنِ وَمِنْ الْبَقَرِ اثْنَيْنِ قُلْ أَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمْ الأُنثَيَيْنِ أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الأُنثَيَيْنِ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ وَصَّاكُمْ اللَّهُ بِهَذَا فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً لِيُضِلَّ النَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ – الأنعام/١٤٣-١٤٤﴾.

ھ/ بۆردانو سەرکوتکردنی خەصمو بەرامبەر بەوەی ئیلزام بدرێ: کە ئەوەی ئەو دەیڵێ: کەس دانی پیانانێ، وەکوو ئایەتی: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ، بَدِيعُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – الأنعام/١٠٠-١٠١﴾. لێرەدا پەروەردگار ئەوە رەتدەکاتەوە منداڵی هەبێ، چونکە منداڵ لەنێوان دوو رەگەزدا نەبێ بەوەلەد نابێ دەی پەروەردگار خێزانو هاوسەری نیەو نەبووە، زیاد لەوە پەروەردگار بۆ خۆی بەدیهێنەرو خالقی هەموو شتێکە، بەدیهێنانو خالیقیەتی بۆ هەموو شتێك دژو نەقیضی ئەومیە منداڵی لێ بەوەلەد بێ. پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەهەموو شتێك، عیلمو زانیاری بەهەموو شتێك

نیشانەی ئەوەیە کردارەکانی بە ویستو ئیرادەی خۆیەتی، هەرچی نەیەوێ بێتەدی نایێتەدی، هەرچی بیەوێ ببێ ببێ دەبێ ببێ. بێگومان عەقڵو شعور جوداوازی دەخاتە نێوان (فاعل بالإرادة) (والفاعل بالطبع) مەمنوعو نەگونجاوە وێڕای ئەوەی عالەمو زانایە بەهەموو شتێك وەکوو شتە سروشتییەکان وابێ کە بەبێ شعور شتیان لێ وەدی دێ. وەکوو گەرمیو ساردی، کەوابێ بەهیچ کلۆجێ نابێو ناگونجێ: کە مندالی پاڵ بدرێ.[1]

چەند شێوەیەکی تریش لە جەدەلو حیوار هەن، وەکوو موناظەرەی پێغەمبەران لەگەڵ نەتەوەکانیان، یان حیوارو موجادەلەی کۆمەڵێك لە موسوڵمانان لەگەڵ دووڕووەکانو نمونەی لەوشێوە.

## ٢١) چیرۆکەکانی قورئان

روداوی پەیوەست بەهۆکارو ئاکامەکانی، مرۆڤ گوێی بۆ هەڵدەخاو ئارەزۆی بیستنی هەیەو دەیەوێ بزانێ چۆن رویداوەو هۆکاری چی بووەو سەرەنجامی چۆن بووە؟ ئەگەر ناو بەناو چیرۆکی پێشیناناو رابوردوانی بۆ عیبرەتو پەند لێ وەرگرتن تێکەڵ بوو، ئارەزۆی بیستنیان پتر دەبێو هەوڵدان بۆ ئاگاداربوون بەسەریاندا زیاتر خۆی دەنوێنێ، بەهێزترین هۆکاردەبێ بۆئەوەی عیبرەت لێ وەرگرتنیان لەدڵو دەرووندا بچەسپێ، شتێکی ئاشکراو نمایانە ئامۆژگاری کردنی شێوە خیطابی، مرۆڤ کە دەیبیستێ بەناو گوێچکەیدا راگوزەر دەبێو عەقڵ بۆی ناکرێ سەروبنی ئامۆژگارییەکە پێك بگرێو هەرچی گوێی لێیە هەزمی بکاو تێی بگا، وەلێ هەمان وەعزو ئامۆژگاری لە کاتێك لەشێوەیەکدا وێنە دەکرێ کە لە واقیعی ژیانو روداوەکانی هەڵقوڵێو روداوێکی رابردو بگێڕێتەوە، ئامانجەکانی دەپێکێو هەدەفەکان رون دەبنەوەو مرۆڤ بە بیستنیان مورتاحو دڵکراوە دەبێ، بە

---

[1] ئەم باسە لەکتێبی (ألرد علی المنطقیین)ی ئیبنو تەیمیە وەرگیراوە.

حەزو ئارەزۆوە گوێچکەی بۆ کلۆر دەکاو بە پەندو ئامۆژگارییەکانی ناوی، عیبرەت وەردەگریٚو کاریگەری لەسەر دڵو دەروونی جێ دێڵن.

بێگومان ئەدەبی چیرۆك ئەمڕۆ بووەتە فەننێکی تایبەتیو کاریگەری لەناو فەننە جۆراوجۆرەکانی لوغەو ئەدەبی زمانەکانداو چیرۆكو سەرگورشتەی ڕاستەقینەو ڕاستگۆدا، زۆر ڕونو ئاشکرایە ئەوەی ئەم ڕۆڵە کاریگەرە گرنگە دەگێڕیو لە شێوازەکانی ئەدەبی عەرەبیدا بە جوانترین شێوەو بە ئەوپەڕی هێزو پێزەوە، لە جوانترین شێوەدا وێنای دەکا چیرۆکەکانی قورئانن.

## پێناسەی چیرۆك (معنى القصص)

القصٚ: بە ئیدغام کراوی بە مانا شوێن پێ هەلگرتنە، دەگوترێ: (قصصت أثره) شوێن پێی ئەوم هەلگرت، (القصص) چاوگە، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصاً – الكهف/٦٤﴾ واتە موساو هاوڕێیەکەی بەشوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە، هەروا لەسەر زمانی دایکی موسا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتْ لأُخْتِهِ قُصِّيهِ – القصص/١١﴾ واتە: بڕۆ شوێنی هەلگرەو بزانە کێ موسای برات وەری دەگریٚو بەخێوکردنی لەئەستۆ دەگرێ، وشەی (القصص) هەروا بە مانا هەواڵی بەشوێن یەکدا هاتوش دێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ – آل عمران/٦٢﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لأُوْلِي الأَلْبَابِ – يوسف/١١١﴾.

هەروەها (ألقصة) بەمانا (الأمر) ، (ألخبر) ، (ألشأن) ، (ألحال) دێ.

چیرۆکەکانی قورئان بریتین لەو هەواڵو سەرگورشتانەی بەسەر گەلو نەتەوە پێشینەکاندا هاتووە، بەسەرهاتی پێغەمبەران لەگەڵ نەتەوەکانیانو ڕوداوە واقیعییەکان رادەنوێنێ، بێگومان قورئانی پیرۆز زۆری لە چیرۆکی پێشینانو حاڵو وەزعی گەلو نەتەوەکانو مێژووی ئەقوامو

باسـی وڵاتو نیـشتمانی زۆرێـك لەوانـەی كـردووەو لێكۆڵینـەوەی ئـاثـارو پاشماوەیـانی ڕوونكردۆتـەوە، وەكـوو وێنەیـەكی گۆیـا مێـژووو بەسـەرهاتیان دەگێڕێتەوە.

## چیرۆكەكانی قورئان دەكرێنە سێ (جۆر) بەش

١- جـۆری یەكـەم: چـیرۆكی پێغەمبـەران، ئـەم چـیرۆكانە چـۆنیەتی بانگەوازی پێغەمبەرانی لەخۆ گرتووە، ئەو موعجیزەو ڕوداوە سەرئاسایانەی لەسـەر دەسـتی پێغەمبـەرەكان هاتوونـە دیو خـودا پـشتیوانی لێ كـردوون، هەڵوێستی ئەوانـەی دژیـان وەسـتاونو بەرامبـەریان سـەرڕەقییان نوانـدووەو قۆناخەكانی بانگـەوازی یەكە بەیەكـەیانو گەشـەكردنو سـەرەنجامی خـاوەن بـاوەڕانو شـوێنكەوتوانیانو هـەروا ئاكـامی بـێ بـاوەڕو بـەدرۆ خـەرەوەكانی لەخۆ گرتووەو بەگوێرەی حـاڵو مـەقام هەنـدێكی چـیرۆكەكە، یـان هـەمووی هێناوەو هەیانە زیاد لە جارێك دووبارە كراوەتەوەو مەبەستی تایبەتی خۆی پێكاوە، وەكوو چیرۆكی حـەزرەتی نـوحو ئیـبراهیمو موسـاو هـارونو عیسیو موحەممەدو هی تریش لە پێغەمبەران (صەلاتو سەلامی خودایان لێ بێ)

٢- جـۆری دووەم: چـیرۆكەكانی قورئـان: كـە پەیوەنـدن بـە ڕوداوە رابردووەكانـەوە، هـەروا بـە كەسـانێك: كـە پێغەمبەرایـەتییان نەچەسـپاوە، وەكـوو چیرۆكی ئەوانـەی چـەند هـەزارێك بـوون لـە ترسـی مـردنو كـوژران، مـاڵو نیـشتمانی خۆیـان جێهێـشت (وهـم ألـوف حـذرالموت) هـەروا چـیرۆكی طـالوتو جـالوتو دوو كوڕەكـەی ئـادەم (قابیـلو هابیـل)و ئەصـحابولكەهفو زیلقەرنەینو قارونو (ئەصحاب السبت)و مریـم، أصحاب الأخـدودو ئەصـحاب الفیلو ئەوجۆرە كەسانە.

٣- جۆری سێیەم: چەند چیرۆكێك: كە پەیوەنـدییان بـەو ڕوداوانـەوە هەیە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕویان داوە، وەكوو

غەزای بەدو غەزای ئوحود کە لە سورەتی (آل عمران)دا ئاماژەیان پێکراوە، چیرۆکی غەزای حونەینو تەبوك: کە لە سورەتی (التوبة)داو غەزای الأحزاب لە سورەتی (الأحزاب)دا هەروا چیرۆکی ئیسرائو ئەو جۆرە شتانە.

## سودەکانی چیرۆکەکانی قورئان

**سودی چیرۆکە قورئانییەکان زۆرو هەمە جۆرن، گرنگەکەیان ئەمانەن:**

١- روونکردنەوەی بنەماکانی دەعوەو بانگخوازی بۆ سەر رێبازی ئیسلامو خوداپەرستیو شیکردنەوەی بنەماکانی شەریعەتی خودا: کە هەموو پێغەمبەرێك بەو پەیامە نێردراوە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ – ألأنبياء/٢٥﴾.

٢- چەسپاندنی دڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەروا راگیرکردنی دڵی موسوڵمانان لەسەر پابەندبوون بە ئایینی خوداوەو بەهێزکردنی متمانەی موسوڵمانان بە یارمەتیدانی بۆیانو یارمەتیدانی حەقو راستیو هەڵگرانی ئەو پەیامەو ریسواکردنی بەتاڵو بەتاڵخوازان، دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ – هود/١٢٠﴾.

٣- تەصدیقکردنی پێغەمبەرانی پێشوو بەزیندو راگرتنی یادو یادەوەرییانو بە نەمری هێشتنەوەی ئاسارو ئاکاریان.

٤- دەرخستنو چەسپاندنی راستگۆیی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) لە بانگەوازییەکەیدا بەوەی هەواڵی پێداوە دەربارەی حاڵو وەزعی رابوردوان بەدرێژایی رەوڕەوەی مێژوو چین دوا چینو چاخ دوا چاخ.

٥- سەركوتانەوەو بۆڕدانی خاوەن نامەكان (جولەكەو مەسیحی) بە بەڵگەی بەهێز دەربارەی ئەوەی ژێر لێویان داوە لە بەڵگەو نیشانەی هێدایەتئاساو شاردانەوەی هەموو ئەو ڕاستییانەی ئاگایان لێیە دەربارەی پەیامی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) تەحەددا كردنیان بەو ڕاستیانەی لە كتێبەكانی خۆیاندا چەسپاوە پێش ئەوەی گۆڕانكارییان تێدا بكەن، وەكوو دەفەرموێ: ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ — آل عمران/٩٣﴾.

٦- چیرۆك خۆی لەخۆیدا جۆرێكە لە جۆرەكانی ئەدەبو شێوازێكی كاریگەرە، گوێچكەی بۆ هەڵدەخرێ، بە حەزەوە گوێی بۆ دەگیرێ، پەندو عیبرەتەكانی لە دڵو دەرووندا دەچەسپێ ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لأُولِي الأَلْبَابِ — یوسف/١١١﴾.

## دووبارەكردنەوەی چیرۆكەكانو حیكمەتەكەی!

قورئانی پیرۆز زۆر چیرۆكی لەخۆ گرتوونو زۆربەی ئەو چیرۆكانە لەپتر لەجێگەیەك دوبارە كراونەوە، چیرۆكێك بەڵێ تاقە چیرۆكێك چەندجار لەقورئاندا دووبارە كراوەتەوەو بەشێوازی جیا جیا لەڕوی كورتیو درێژیو پاشو پێش پێكردنو ئەو جۆرە ئوسلوبانە حیكمەتی ئەم دووبارە كردنەوەی چیرۆكانە لەچەند خاڵێكدا دەست نیشان دەكەین:

١- روونكردنەوەی بەلاغەتی قورئان لەبەرزترین ئاستیدا، ئاشكراشە بەشێك لە تایبەتمەندی بەلاغە دەربڕینی مەعنایەكە بەشێوازی جیاجیا، ئاراستەكردنی یەك مانایە لە بەرگو پۆشاكی جۆراوجۆردا، چیرۆكێكی دووبارەوە بوو، لەهەر شوێنێكدا بەشێوازێك ڕانوێنراوە جوداوازە لە شێوازەكەی تر، لە قاڵبێكدا داڕێژراوە لە قاڵبەكەی تر ناچێ، ئەم چیرۆكانە

بەشێوەیەك دووبارەكراونـەوە مـرۆڤ لـە دووبارەبوونەوەكـەیان جـاڕز نابـێ، لێیان وەڕز نابێ، بەڵكوو جار دوای جار ئەو مانایانە لە دڵو دەروونـیدا تـازە دەبنەوە، ئەو چەژەی لـەم جۆرەی دەكا جودایـە لـەو چـەژەی لـە جۆرەكـەی تریدایە، كاریگەری چیرۆكەكە لەم شوێنەدا بەجۆرێكە بـە خوێندنـەوەی لـە شوێنێكی تری قورئاندا دەستەبەر نابێ.

٢- بـەهێزو پێـزی ئیعجـاز: هێنـانی مانایـەك لەشێوازی جیاجیـادا، دامـاوی عەرەبـەكان لـەوەی بتـوانن نمونـەی وێنـەو شـێوەیەك لـەو وێنانـە بخەنەڕوو تەحەدداكردنەكە كاریگەرتر دەبێو پتر كەمەرشكێن دەبێ.

٣- گرنگیـدان بـە شـەئنو حـاڵی چـیرۆك بـۆ چەەسـپاندنی پەنـدو عیبرەتـــی ئـــەو چـــیرۆكانە لـــە دڵو دەروونـــی ئـــادەمیزاددا بێگومـــان دووبارەكردنـەوە بەگـشتی جۆرێكـە لـە جەختكردنـەوەو نیـشانەی گرنگـی پێدانی ئـەو مانایەیـە كـە دەقەكـە لـەخۆی گرتـووە، وەكـوو ئـەو دیـاردە لـە چیرۆكی حەزرەتی موسا لەگەڵ فیرعەوندا، چونكە لـە ڕاستـیدا ئـەو چـیرۆكە لە باشـترین شێوەدا تـەمثیلی كێبڕكێو صـیراعی نێـوان حـەقو بـەتاڵ دەكـا، هەرچـەندە وێـڕای دووبارەبوونـەوەی ئـەم چـیرۆكە بـەزۆریو بەشـێوەی جیاجیا، وەلێ لە سورەتێكدا دووبارە نەكراوەتەوە.

٤- جـوداوازی ئـەو مەبەسـتانەی چـیرۆكەكەی بـۆ ڕانوانـدراوە لـە سـورەتێكدا بـڕی مانـای پێویـست بـۆ ئـەو حـاڵو مەقامـە ذیكـر دەكـرێو مەبەسـتەكە دەپێكـێ، ماناكـانی تـری ئـەو چیرۆكە لـە حـاڵو مـەقامی تـردا دێنێو بەگوێرەی موقتەضای حاڵ ئاراستە دەكرێنو مەبەست دەپێكن.

# چیرۆکی قورئان رووداوی حەقیقینو خەیاڵ نین

شایانی باسو ئاماژەپێکردنە قوتابییەکی زانکۆ لەخوێندنی باڵا لە وڵاتی میصر دکتۆرانامەیەکی پێشکەش بە زانکۆ کرد بۆ ئەوەی بڕوانامەی دکتۆرای لەسەر وەربگرێ، مەوضوعی سەرەکی باسەکە بریتی بوو لە (الفن القصصی فی االقرآن).[1] ئەم نامە دکتۆرایە بووە جێگای مشتومڕی خەلکێکی زۆر ساڵی (١٣٦٧)ی کۆچی، کێشەیەکی گەورەی نایەوە، یەکێك لە ئەندامانی موناقەشەی نامەکە مامۆستا ئەحمەد أمین بوو، ڕاپۆرتێکی لەسەر نووسیو ناردی بۆ راگری کۆلێجی ئادابو لە گۆڤاری (الرسالة)شدا بڵاوی کردەوە، بێگومان راپۆرتەکە رەخنەیەکی توندو تیژ بوو بەرامبەر نووسینەکەی ئەو قوتابییە ئەکادیمیە، هەرچەندە مامۆستای سەرپەرشتیاری داکۆکی لێ کردو ویستی هێرشەکەی ئەحمەد ئەمینو هەموو ئەوانەی دژی نووسینەکە بوون ڕەتبکاتەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

مامۆستا ئەحمەد ئەمین راپۆرتەکەی بەم عیبارەتە دەست پێکردبوو (لە راستیدا من ئەم نامەی دکتۆرایەم خوێندەوە، پێم وایە نامەیەکی ئاسایی نیە، بەڵکوو نامەیەکی خەتەرناكو سەرنج ڕاکێشە، بنەماو مەبەستی ئەوەیە پێمان بڵێ: چیرۆکەکانی قورئان عەمەلێکی فەنین، دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو یاساو ڕێسایەی کاری فەننی ئاسایی گەردنکەچی دەبن، چیرۆکەکانی قورئان وەکوو هەموو چیرۆکێکی تر لایەنی خەلقو داهێنانیان لەخۆ گرتووە، بەبێ ئەوەی ئیلتیزامیان بە راستی مێژوویییەوە هەبێ، کەوابێ دەتوانین بەبێ پەروا بڵێین: موحەممەد لەم ڕووەوە فەننانو داهێنەرێکی گەورەو هەستیارە) پاشان دەڵێ: بەداخەوە قوتابی ناوبراو لەسەر ئەم بنەما خەتەرە لەسەرتاوە بۆ کۆتایی نامەی دکتۆراکەی دارشتووە) وە من بە پێویستی

---

[1] قوتابییەکە ناوی (دکتۆر موحەممەد ئەحمەد خلف الله) بوو.

دەزانم بـڕێ نموونـە رابنـوێنم مەبەسـتی نووسـەری ئـەم نامـە دكتۆرایـەو چۆنیەتی دڕشتنەكەیو بیروبۆچوونە ترسناكەكانی بخەمە ڕوو.

پاشـان مامۆسـتا ئەحمـەد ئـەمین چـەنك كۆپلـەو ڕسـتەیەكی لـەناو ڕیسالەكە دەرهێناوەو كردونی بە بەڵگە لەسـەر نووسـینەكەی كە بـە كورتی ئاماژەی بۆ كردووە.[1]

وەكوو ئـەوە نوسـەری دكتۆرانامەكـە ئیـدیعای ئـەوە دەكا چیرۆك لـە قورئـاندا مولتـەزیمی راسـتگۆیی مێـژوویی نیـە، پـشت بـە خـەیاڵو سـۆز دەبەستێو تەوەجوهاتی وەكوو تەوەجوهاتی هەستیارێك وایـە: كـە ڕوداوەكـە دەخاتە ناو قاڵبێكی ئەدەبیو لە وێنەیـەكی فـەننیدا رایـدەنوێنێو بەهـەموو قەناعـەتی خـۆی پێـی وایـە قورئـان هەنـدێ چیرۆكی هەڵبەسـتوونو ڕوداوی مێژوویی نین، هەروا بڕوای وایـە پێـشینان بەهەڵـە چـوون: كـە چیرۆكەكانی قورئانیـان بـە روداوی مێـژوویی هـەژماركردوونو لـەو بـوارەدا پـشتیان پـێ بەستوون!!

موسـوڵمان بەڕاسـتی ئەوكەسـەیە بـڕوای وایـە: كـە قورئـان كـەلامی خودایە، هەتا بڵێیو خەیاڵ بڕ بكا ڕەوانو بەلیغو ڕەوایە، پاكو مونـەززەهو بەرییە لەو وێنە فـەننیـەی: كـە چیرۆكەكانی روداوی مێـژوویی نـەبنو لـە واقیعدا رویان نـەدابێ، دەبێ موسوڵمان بڕوای وابێ: كـە چیرۆكەكانی قورئـان لـەو حەقائیقـە مێـژووییـانـەن: كـە وێنـا كـراون لـەناو وشـە گـەلێكی هەڵبژێردراوو بەشێوازێكی رائیعو سەرنجڕاكێش نمایشكراون.

وێدەچـێ كـاكی نووسـەر، لێكۆڵینـەوەی لـەبواری هونـەری چـیرۆكدا كردبـێو هەسـتی كردبـێ: كـە پێكهاتـە سـەرەكییەكانی بـریتین لـە خـەیاڵو عاطیفە كە پشت بە تەصەورو وێناكردن دەبەستن.

---

[1] بڕوانـە كتێبـی (الفـن القصـصی فـی القـرآن) دانـراوی مامۆسـتا محمـد الخضر حـسین، بلاغة القرآن/ص٩٤.

ئاشكراشه هەتا خەياڵ هەواپەرواز ببێ، جڵەوی بۆ بەرەڵا بكرێو لە واقیـع دوور بكەوێتــەوە حــەزو ئـارەزوو بـۆی زۆرتــر دەبـێو لـەلای نــەفس خۆشەویـستر دەبـێو زیـاتر لـەززەتو خۆشـی لێ دەبینـێو بـە خوێندنـەوەیو گوێ بۆگرتنی كەیفی ساز دەبێو دەمارەكانی هێور دەبنـەوە، ئـەمجار هـاتووە بـەلای نـاخێری قیاسـی چیرۆكە قورئانییـەكانی كـردووە بۆسـەر ئـەو جـۆرە چیرۆكە فەننیـیە خەیاڵبازییە!!

بـێ ئاگـا لـەوەی چـیرۆكەكانی قورئـان لـەو جـۆرە نــینو نێوانیـان عاسمانو ڕێسمانە، چونكە گومـان لـەوەدا نیـە قورئـان لەلایـەن خـودای زانـاو حەكیمەوە نازڵ كراوە، هیچ هەواڵو ڕووداوێكی نیە ئیللا: كە هەیە موافیقی واقیعـەو ڕەنگدانـەوەی ڕوداوی حـەقیقیـیـە، جـا ئەگـەر مرۆڤـە عاقڵمەنـدو خاوەن كەسایەتیەكان خۆیان دەپارێزن لـەوەی درۆیـەك بكـەن قـسەیەكی بـێ بنـەما هەڵبەسـتنو پێیـان وایـە درۆو بوختـان ناشـیرینترین گاڵتەكردنـە بـە مرۆڤایـەتی، ئـیتر نـازانم چـۆن مرۆڤـی عـاقڵ ڕێگـە بـەخۆی دەدا: كـە درۆو بوختـان بـە كـەلامی خـودای خـاوەن عیـززەت جەلالـەوە بلكێنـێ؟! بەڕاسـتی دەبێ لێكۆڵینەوەی دكتۆراو ڕیـسالەی ئـەكادیمی ئـاوا زانـستیانە بـێ؟! خـودای تاكو تەنیا خودایەكی حەقەو حەقیقەتـە ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّـهَ هُـوَ الْحَـقُّ وَأَنَّ مَـا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ – الحج/٦٢﴾.

خودای حەق بەتوانا پێغەمبەرانی بە حەق ناردوون:

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيراً وَنَذِيراً – فاطر/٢٤﴾.

﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنْ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ – فاطر/٣١﴾.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمْ الرَّسُولُ بِالْحَقِّ مِنْ رَبِّكُمْ – النساء/١٧٠﴾.

﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ – المئدة/٤٨﴾.

﴿وَالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ – الرعد/١﴾.

ئـەوەی خـودا لـە قورئـان بەشـێوازی چـیرۆك بۆمـان دەگێڕێتـەوە هەمووی روداوی مێژوویو حەقو واقیعین.

﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ – الكهف/١٣﴾.

﴿نَتْلُو عَلَيْكَ مِنْ نَبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ – القصص/٣﴾.

## کاریگەری چیرۆکە قورئانییەکان لەبواری تەربییەو پاڵفتەکردندا

شـتێکی ئاشـکراو بەڵگـە نەویـستە: کـە چـیرۆکی بـەهێزو پێـزو موحکـەمو روداو داڕێـژراو، بـە حـەزو ئـارەزۆوە دەچـێتە نـاو گوێـچکەوەو پێشوازی لێ دەکا، بە ئاسانیو زوو دەبێتە میوانی نەفسی ئادەمیزادو جێگیر دەبیو دەبێتـە خـاوەن مـاڵ، هەسـتو شعور پێـی ئاشـنا دەبـنو پێـی تێرئـاو دەبن، لێی وەڕزنابنو پێی ماندو نـابن، عـەقڵ بـەناو باغـچەو پێکهاتـەکانیدا دەگەڕیو گوڵەوەچنیو میوەڕنی دەکا.

وانـەی شـێوە تـەلقینیو دەرس پێگـوتن، مانـدوبوونو وەڕزبـوونی لێ دەکەوێتـەوە، شـاگردو قوتـابی ناتوانـێ بـەردەوام بـێ لـە گـوێ بـۆ گـرتنو هەزمکردنی پێکهاتەی دەرسەکە مەگەر بـە زەحمـەتو مانـدوبوونی زۆرو بـۆ ماوەیەکی کەمیش!!

بۆیە شێوازی چیرۆك لە بواری پەروەردەو تەهزیبدا سودبەخش تـرو کاریگەرترەو زوتر ئامانج دەدا بە دەستەوە.

ئـەوەی بـاوو زانـراوە – تەنانـەت لـە قۆنـاغی منـداڵیشدا – ئەوەیـە: منداڵ بە سروشت مەیلی بیستنی چیرۆکی هەیەو بە تامەزرۆیییەوە گوێ بۆ گێڕانەوەی چیرۆك دەگریو بیرەوەرییەکانی هـەڵ دەگـرێ دوایـی دەتوانـێ بـۆ کەسانی دی بگێڕێتەوە.

ئـەم دیـاردە سروشـتییە نەفـسییە بـە جۆرێـك خـۆی دەنوێنـێو نوانـدووە، پێویـستی کـردووە لەسـەر مامۆسـتاو سەرپەرشـتیارانی بـواری

تەربیەو تەعلیم: کە پەنای بۆ بەرنو لە زۆر بواری فێرکزدندا سوودی لێ وەرگرن، بەتایبەتی لەڕوی تەهزیبی ئاینییەوە: کە کامڵەو پوختەی فێرکردنو فێرخوازییە، راگرو شارەزاییکەرو هەوێنی سەرەکییە.

لە چیرۆکەکانی قورئاندا زەوی پێگەیەکی بە پیتو بەرەکەتی هەیەو یارمەتی سەرپەرشتیارانی پەروەردەو فێرکردن دەدا بۆ سەرخستنی پرۆژەکانیانو تێشوی تەهزیبیو پەروەردەییو ئاینی بەکەڵکیان پێشکەش دەکا: کە هەڵقوڵاوە لە سیرەی پێغەمبەرانو هەواڵی ڕوداوەکانی رابردوو، تێفکرین لە سوننەتی خودا دەربارەی ژیانو بەسەرهاتی کۆمەڵگاکانو حاڵو وەزعی گەلو نەتەوەکان، هەڵبەتە قورئان لە هەموو ئەم بوارانەدا بە حەقو ڕاستی دەدوێ بە زەرەو مثقاڵ لە واقیع لانادا.

سەرپەرشتیارو مامۆستای قوتابی دەتوانێ چیرۆکی قورئان لە قاڵبێکدا داڕێژێتەوەو بە شێوازێك نمایشی بکا لەگەڵ ئاستی بیروهزری فێرخوازو شاگردانی تەربیە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندنو فێرخوازیدا بگونجێ.

بێگومان کۆمەڵە چیرۆکێکی ئاینی مامۆستایان (سید قوتبو سەحار) سەرکەوتوبوون لەوەدا بژێویکی گیانی کەم وێنەو بەسودیان دەرخواردی منداڵە تازە پێگەیشتووەکان دا.

هەروەکوو چۆن مامۆستا (الجارم) چیرۆکەکانی قورئانی بە ئوسلوبو شێوازێکی ئەدەبیو ڕەوانو بەلیغو سەرنجڕاکێش خستەڕو، قوڵبوونەوەو شیکردنەوەیەکی جوانی تێدا کردبوو، خۆزگە کەسانی دی چاویان لێ بکردایەو ئەم پەیڕەو پرۆگرامە پەروەردەییەی ئەویان پەیڕەو بکردایە.

## ٢٢) تەرجەمەو ماناکردنی قورئان

بێگومان سەرکەوتنی دەعوەو بانگخوازی ئیسلامی تا ئەندازەیەکی زۆر پێویستی بە لێك نزیکی نێوان بانگخوازو نەتەوەکەی هەیە، بانگخوازێك خۆ ولاتی بێو کوڕی ئەو کۆمەڵگایە بێ: کە بانگەوازی تێدا دەکاو لە ڕەگەزو هاوجنسیان بێ، چاکتر دەزانێ سەرچاوەی گومڕایو نەزانی ئەو خەڵکە لە کوێوە هەڵبەستراوە، کونو کەلەبەری جەهلو نەزانییان لەکوێوەیەو چ نەخۆشییەکە ئەوانی لە دەستو دوو خستووەو وەکوو مۆتەکە سواری شانیان بووە، ئەو لە کەسانی درەکی باشتر دەزانێ دڵو دەرونیان چی تێدایەو دەرمانی دەردی نەزانییان چیەو چۆن چارەسەریان بکاو ئاخاوتن لەگەڵ دڵیان بکاو بچێتە ناخیانەوەو دڵی مردویان زیندو بکاتەوە بۆ ئەوەی شەتڵی ئیمانو باوەڕی راستو دروستیان تێدا بڕوێنێو هیدایەتئامێز بنو ڕێگای راست بگرنەوە بەرو بەختەوەری دونیاو قیامەت بن!

هەڵبەتە ئاخاوتن لەنێوان بانگخوازو بانگکراواندا بە یەك زمان ڕەمزو نیشانەی هاوڕەگەزی کۆمەڵایەتییە لە هەموو شێوەیەکیدا، بۆیە پەروەردگار هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ بۆ سەر گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەرەکە بە زمانی ئەو گەلە بانگەوازی کردوونو هاوڕەگەزی نەتەوەکە بووە، خودا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ – إبراهيم/٤﴾.

بێگومان پەروەردگار قورئانی پیرۆزی نازڵ کردووە بۆسەر پێغەمبەری ئیسلامو بە ڕەگەز عەرەب بە زوبانی عەرەبی ڕونو ئاشکرا، هەڵبەتە ئەم دیاردە واتە: ناردنی پێغەمبەر بە زوبانی نەتەوەکەی، زەرورەتێکی کۆمەڵایەتی بووە بۆ سەرخستنی پەیامی ئیسلام هەر لەو کاتەوەی قورئان نازڵ بووە زمانی عەرەبی بۆتە بەشێك لە کیانی ئیسلامو بنەمایەکی سەرەکی بۆ ئاخاوتن لە گەیاندنی بانگەوازی ئیسلامی.

ناردنی پێغەمبەری ئێمە (دروودی خودای لەسەر بێ) تایبەت نەبووە بە نەتەوەی عەرەب، بەڵکوو نێردراوە بۆسەر هەموو مرۆڤایەتی لە هەر ڕەگەزو چینو توێژێك بن، قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتدا ئەم ڕاستییەی ڕاگەیاندووەو جەختی لەسەر کردۆتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً – الأعراف/١٥٨﴾ هەروا ئایەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً – سبأ/٢٨﴾.

بێگومان بناغەی دەوڵەتی ئیسلامی لە نیوە دورگەی عەرەبدا دامەزرا، ئاشکراشە زمان – هەر زمانێك بێ – بە زیندو مانەوەی نەتەوەکەی زیندووەو بە نەمانی نەتەوەکەشی زمانەکە نامێنێ، کەوابێ دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی بەم شێوە ژیانەوەو پێشکەوتن بوو بۆ لوغەتی عەرەب، قورئان نیگای ئاسمانیيەو بەرنامەی ئیسلامە، دەستوری ئیسلامە، ئیسلام ئایینی خودایەو کە بەسەر بەندەکاندا فەرزکرراوە پابەندی بن، ئاشکراشە تێگەیشتن لە بنەماکانی ئیسلام بەبێ تێگەیشتن لە مانای قورئان دەستەبەر نابێ، لەلایەکی ترەوە فتوحاتی ئیسلامی بەرەو وڵاتانی دەوروبەر کشاو زۆر وڵاتو هەرێمو دەفەری زمان ناعەرەبی کۆنترۆڵ کردو خەڵکێکی زۆری عەجەم لەو وڵاتو هەرێمانە مووسوڵمان بوونو زۆر پێویست بوو لە مانای قورئان: کە مەنهەجی ئیسلامە حاڵی ببن، پێویست بوو لەسەر هەرکەسێك ئەم ئایینە تازەی قبوڵ دەکرد، داخوازییەکانی بۆ تێگەیشتن لە قورئانی بۆ دابین بکرێ، فێری زمانی قورئانەکەی ببێ، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەرکی سەرشانی ئایینی خۆی جێبەجێ بکا، جا کە کابرا فێری زمانی عەرەبی ببێ هیچ پێویست نیە قورئانی بۆ تەرجەمە بکرێ، مادام ئەو خۆی فێری زمانی عەرەبی بووەو سەرودەری لێ دەکا.

# ماناى تەرجەمەو وەرگێڕان

تەرجەمــە دوو جــۆرى هەيــە، يــان بــۆ دوو مانــا بــەكار دەهێنــدرێ، يەكەميان تەرجەمەى حەرفى، واتە: وەرگێڕانى وشـەكان لـە لۆغەتێكـەوە بـۆ وشــەى بەرامبــەريان لــە لوغــەتێكى تــردا، بــەجۆرێك ڕێكخســتنو تــەرتيبى وشەكان لە لوغەتە وەرگيراوەكەدا موافيقى لوغەتە لێوەرگيراوەكە بن.

دووەميان تەرجەمەى شێوە شيكردنەوەو ڕونكردنەوەى مەعنايە: كـە بريتييە لـە ڕونكردنـەوەى مانـاى كەلامەكە بـە لوغـەتێكى تـر بـەبێ ئـەوەى پابەند بێ بە ڕيزبەنـدى وشـەى زمانـە ئەصڵەكەو بەرچاوگرتنى جەرەسو نـەظمى.

بێگومان ئەوانەى شارەزاى زمانەكانن دەزانن كە تەرجەمـەى حـەرفى بەو شێوەى ئاماژەمان پێكرد، مومكين نيە بێتە جێ لەگەڵ پاراستنى سياقە ئەصــڵەكەو گەيانــدنى هــەموو ماناكــانىو چــونكە هــەموو لوغــەتێك تايبەتمەنـدى خـۆى هەيـەو هـەر لوغەتـە بـەجۆرێك ڕسـتەكانى ڕێـك دەخـاو جوداوازە لە ڕێكخستنى لوغەتێكى تر بۆ ڕستەكانى.

جوملـەى فيعلـى لـە زمـانى عـەرەبىدا بـەوە دەبـێ فيعـل بكەوێتـە سەرەتاى ڕستەكەوە، ئەمجار فاعل بـێ، ئەگـەر فيعلەكـە (متعـدى) بـوو، پـاش (فاعل) (مفعول بە) بـێ، هـەروەها قاعيـدەى لوغـەى عـەرەبى وايـە (مـضاف) پـێش (مـضاف إليـه) بكـەوێ مەوصـوف بكەوێتـە پـێش صـيفەتەوە، مەگـەر كاتێـك مەبەسـت بـە (إضـافة)كـە تەشـبيهو لێكچواندن بـێ صـيفەت ئيـضافە كرابێ بۆلاى مەعمولەكەى، دەى ئەم دابو نەريتـە لـە لوغـەتى تـردا پـەيڕەو ناكرێ!!

تەعبيرو دەربڕينى عـەرەبى لـەخۆىدا هەنـدێ نهێنـىو تايبەتمەنـدى ئەو لوغەتەى لەخۆ گرتوون: كە مومكين نيە، تەعبيرو دەربڕينى لوغـەتێكى

تر جێگای ئەو بگرێتەوە، چونکە وشە لە تەرجەمەو دەربڕیندا ڕێناکەوێ لە هەموو ڕویەکەوە یەکسان بن چ جای ڕستەو پەرەگرافو کۆپلە.

قورئانی پیرۆز لە تروپکی هەرەبەرزی زمانی عەرەبیدایە لەڕوی ڕەوانبێژیو ڕەوانییەوە، تایبەتمەندی تەرکیبو لێکدانی وشەکانی، نهێنیو ئەسراری شێوازەکانی، مانای وردو ناسکی لەخۆی گرتوونو باقی لایەنە ئیعجازییەکانی تری کە تا لێی ورد بینەوە زیاد دەکەنو جۆراوجۆر دەبن، بە جۆرێکە هیچ زەمانێکی تر ناتوانێ ئەو وەظیفە ببینێو ئەو ئەرکە جێبەجێ بکا.

## حوکمی تەرجەمەو وەرگێڕانی حەرفی

هیچ شكو گومان لەوەدا نیە: کە تەرجەمەی قورئان بە تەرجەمەیەکی حەرفی دروست نیە، قورئانی پیرۆز کەلامی نێردراوی خودایە بۆ پێغەمبەری خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ): کە بە ماناو ئەلفاظی موعجیزەو سەرئاسایە، خوێندنەوەی بە عیبادەت دەژمێردرێ، هیچ کەسێکیش نالێ وشەیەکی قورئان کە تەرجەمە کرا ئەمە کەلامی خودایە، چونکە خودای مەزن ئاخاوتنی ئەنجام نەداوە ئیللا بەو کەلامەی ئێمە بە زوبانی عەرەبی دەیخوێنینەوە لەنێوان دووتوێی موصحەفدا، ئیعجازی قورئان لە تەرجەمەکە دەستەبەر نابێ، چونکە ئیعجازەکەی تایبەتە بەو شێوە دەقەی: کە خودا بە زمانی عەرەبی نازڵی کردووە، خوێندنەوەی بە عیبادەت دەژمێردرێ، ئەوەیش ئەو قورئانە عەرەبییە ئاشکراو ڕونەیە: کە بە ئەلفاظو حروفو تەرتیبی وشەکانیو لێکدانی ڕستەکانیو جەرەسو موسیقای تایبەتی لە ترۆپکی بەلاغەتو فەصاحەتدا خۆی دەنوێنێ.

کەوابێ تەرجەمەی قورئان بە تەرجەمەی حەرفی، هەرچەندە وەرگێڕەکە شارەزای زمانەکانو شێوازی لێکدانو داڕشتن بێ، قورئان لەوە

دەردەکا قورئان بێ، هیچ کەس زاتی ئەوە ناکا بە وەرگێڕاوەکە بڵێ: ئەمە کەلامی خودایە.

## تەرجەمەی مەعنەوی

قورئانی پیرۆز، هەروەها هەموو کەلامێکی عەرەبی بەلیغ، مەعنای ئەصڵیو مەعنای ثانەوی هەیە، مەبەست بە مەعنا ئەصڵییەکان ئەو مانایانەن: کە هەموو کەسێك چونیەکن لە تێگەیشتنی مانای ئەلفاظە موفرەدەکان، بەئیجمالی شێوازی لێکدانو پێکهێنانی ڕستەکان دەزانێ.

مەبەستیش بە مانا ثانەوییەکان ئەو تایبەتمەندیو ئەسرارە بەلاغیانەیە: کە دەقەکە لەخۆی گرتوونو بەهاو شکۆمەندی کەلامەکەی پێ بەرز دەبێتەوەو دەچێتە ئاستی سەرئاساو ئیعجازو بەو هۆیەوە قورئان بووەتە موعجیزەو کەلامێکی ناوازە.

مانای ئەصڵی بۆ بڕێ ئایاتی قورئان لەوانەیە لەگەڵ پەخشانی ئاسایی عەرەب، یان هۆنراوەی ئەو زمانە ڕێك بکەوێ، وەڵێ ئەو ڕێکهاتنەوەو موافەقەیە چ زیانێك بە ئیعجازی قورئان ناگەیەنێ، چونکە ئیعجازی قورئان بە بەدیعی نەظمو ڕەوعەو ناوازەیی بەیانو تەعبیرەکەیەتی، واتە: بە مانا ثانەوییەکەی ئیعجازەکەی هاتۆتە دی، زومەحشەریش ئەم مانا ثانەوییەی مەبەستە: کە دەڵێ: لە ئاخاوتنی عەرەب – بە تایبەتی لە قورئاندا – مانای وا وردو ناسك هەن بەهیچ زمانێکی تر دەرنابڕێن.

# حوكمی تەرجەمەی مەعنەوی

تەرجەمەکردنی مەعنا ثانەوییەکانی قورئان، کارێکی ئاسان نیەو هەر نایەتە دی، چونکە هیچ زمانێك نیە موافیقی لوغەی عەرەبی بێ لە دەلالەتکردنی‌دا لەسەر ئەم مانایانەی زانایانی زانستی بەلاغە پێیان دەڵێن: (خواص التراکیب) تایبەتمەندییەکانی ڕستەو وشە لێکدراوەکان، چونکە تەرجەمەکردنی مانا ثانەوییەکانی، کارێکە ئاسان نیە بۆ کەس ئیدیعای ئەوە بکا تواناى ئەنجامدانی هەیە، هەر ئەمەشە: کە زومەحشەری دەڵێ: (ان فی کلام العرب – خصوصاً القرآن – من لطائف المعانی مالا یستقل بأدائه لسان).

بێگومان جۆرەکانی بەلاغە، شێوازە بەلاغیەکانی قورئان لە وشەو ڕستەی‌دا، لە لەفظو تەرکیبی‌دا، هێنانی (مسند ومسند إلیه) بە ئەسالیبی جیا، جارێك بە مەعریفەو چەلێك بە نەکیرە، دەمێك بە پێش خراوی‌و کاتێك بە دواخراوی، لێرە حەذف کراوە، لەوێ ذیکر کراوە، لەم ڕستەدا ئاوا هێنراوەو لەو ڕستەدا ئاوا پێك هاتووە، گەلێ ئەسرارو نهێنی تەعبیر: کە بەرچاو گیراون، بە جۆرێك کە بە هۆیانەوە لوغەتی قورئان بەرزبۆتەوەو گەیشتۆتە ترۆپکی بەلاغەو سەرئاسایی لە تەعبیرو دەربڕیندا، بە جۆرێك کاریگەری لەسەر دڵو دەروون ئەوەندە بەهێز بوو عەرەبەکان لە ئاستیا بۆڕیان خواردو توشی شۆکی کردن.

ئەم ئەسالیبو شێوازانەی بەلاغەتی قورئان تایبەتی لوغەتی عەرەبی‌یەو بەهیچ زمانێکی تر وەرگێڕ ناتوانێ ئەو مانا ثانەوییانە دەربڕێو ئەو مافەیان بداتێ، چونکە هیچ لوغەتێکی تر ئەو تایبەتمەندییە بەلاغیانەی لەخۆ نەگرتوون، بەڵام مانا ئەصڵیەکان (مانا ئەوەڵییەکان) ئەوانە دەکرێ وەربگێڕدێن بۆ سەر زمانێکی تر.

ئیمامی (الشاطبی) لە کتێبی (الموافقات)دا دەڵێ: قورئان دوو مانای لەخۆ گرتوون (مانای ئەصڵی‌و مانای ثانەوی) پاشان دەڵێ: بە نیسبەت مانای

ئەصڵییەكانیەوە تەرجەمە كردنیان مومكینە، لەم ڕووەوە تەفسیركردنی قورئانو ڕاڤەكردنو ڕونكردنەوەی ماناكانی بۆ عامەی خەڵكو ئەوانەی توانای ئەوەیان نیە بەبێ تەفسیر لە ماناكانی حاڵی بن كارێكی پەسەندو دروستە، بە كۆڕای ئەهلی ئیسلام كارێكی پێویستو دروستە، ئەم یەكدەنگیو هەبوونی كۆڕایە بەڵگەیەكی بەهێزە لەسەر دروستی تەرجەمەی مانا ئەصڵییەكانی قورئانو ڕونكردنەوەی مەبەستەكانی!

وەلێ لەگەڵ ئەمەشدا تەرجەمەی مانا ئەصڵییەكانی بێ خەوشو فەساد نیە، چونكە وشەیەكی قورئان وادەبێ دوو مانا یان زیاتری هەبێ، وەرگێڕ دێ بە زمانەكەی خۆی وشەیەك لە بەرامبەریدا دادەنێ، یەك مانایان دەگەیەنێو لەفظیكی دەست ناكەوێ هاوتای وشە عەرەبییەكە هەموو ماناكان هەڵبگرێ.

وادەبێ قورئان وشەیەكی لە مانای مەجازیدا بەكارهێناوە وەرگێڕ دێ وشەكە بە لەفظیكی بەرامبەر تەرجەمە دەكاو لە مانا حەقیقیەكەیدا بەكاری دێنێ، بۆیە زۆر هەڵە ڕوویانداوە لەو تەرجەمانەی بۆ مەعناكانی قورئان كراون.

كەوابێ ئەوەی شاطیبی بۆی چووەو كردوویەتی بە بەڵگە لەسەر ڕاستیو دروستی تەرجەمەی مانا ئەصڵییەكانی قورئان بۆ سەر زمانێكی تر، بە ڕەهایی نیەو سنوردارە، چونكە بڕێ لە زانایان ئەمەیان تایبەت كردووە بە ئەندازەی پێویستیو زەرورەت بۆ گەیاندنی بانگەوازی یەكتاپەرستیو ڕوكنەكانی عیبادەتو لەمە تێپەڕ ناكا، كەسێكیش بیەوێ زیاتر لە مانای قورئان حاڵی ببێ پێویستە لەسەری زمانی عەرەبی فێر ببێو شارەزای شێوازی تەعبیرو دەربڕینەكانی ببێ.

## تەرجەمەی شێوە تەفسیر

بــە دڵنیــایی‌یــەوە دەڵــێین زانایــانی ئیــسلام: کــە تەفــسیری قورئــانی پیرۆزیـان کـردووە، ویـستویانەو هـەوڵیان داوە مانـای نزیـكو ئاسـانو راجـیح بدۆزنەوە بۆ ئایەتەکان، ئەمجار بە ئەمانەتو لێهاتویی‌یەوە تەرجەمـەی ئـەم تەفـسیرەیان کـردووە، بەمـە دەگـوترێ: (تەرجەمـەی تەفـسیری قورئـان) یـان (تەرجەمەی شێوە تەفسیر) بەم مانایە راڤەی کەلامەکە دەکاو ماناکانی بـە زمانێکی تر ڕون دەکاتەوە، ئەمەش هیچ خراپیەکی تێدا نیە، چونکە گومـان لـەوەدا نیــە: خـودای تـاكو تـەنیا حـەزرەتی موحەممـەدی (درוودی خـودای لەسەر بێ) کردووە بە پێغەمبەرو بە پەیامی ئیسلامەوە ڕەوانەی کردووە بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد، وێڕای جوداوازی زمـانو نەتـەوەو رەنـگو رەگـەزیان، پێغەمبــەر (درוودی خـودای لەسـەر بـێ) بۆخـۆی دەفەرموێ: «وَكَـانَ النَّبِـيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً ، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً».[1] لەوەپێش هەر پێغەمبەرێك بۆلای نەتەوەی خۆی نێردراوەو پەیامەکەی تایبـەت بـووە بەوانـەوە، ئـەمن نێــردراوم بۆســەر هــەموو ئــادەمیزاد بــە گــشتی، پەیامەکــەم بــۆ هــەموو مرۆڤایەتییە.

مـەرجی پابەنـدبوون بـە پـەیام گەیانـدن، پێگەیانـدنو تێگەیاندنـە، قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی نازڵ بووە، گەیانـدنی بـۆ نەتـەوەی عـەرەب مولزەم بووە بۆیانو بووەتە ئەرکو چووەتە ئەستۆیان، بەڵام نەتەوەکانی تر ئەوانەی: کە زمانی عەرەبی نازانن‌و شارەزای قاعیـدەو یاسـاو ئوسـلوبی نـین، بــە نیــسبەت ئەوانــەوە گەیانــدنی پــەیامی قورئــان پێیــان پەیوەســتە بــە تەرجەمەو تەفسیرکردنی بە زمانی خۆیان، لەوەپێش ئەوەمان ڕونکردەوە کە تەرجەمــەی حــەرفی حەرامــەو کــاری کــردن نیــە، تەرجەمــەی مانــا

---

[1] بەشێکە لە حەدیثی «أُعْطِيـتُ خَمْـسًا لَـمْ يُعْطَهُـنَّ أَحَـدٌ قَبْلِـي» أخرجه البخاري (٣٣٥) ومسلم (١١٦٣).

ئانەوەییەکانی قورئان محاڵەو لە توانای هیچ نوسەرو زاناو ئەدیبێکدا نیە بتوانێ ئەوکارە بکا، هەروەها ئاماژەشمان بۆ ئەوە کرد: کە تەنانەت تەرجەمەی مانا ئەصڵییەکانیش مەشەقەتو نارەحەتی تێدایە، زۆری ئەخطار لەخۆ گرتوون، کەوابێ ئەوەی بۆ ئێمە ماوەتەوەو دەتواندرێ بکرێو پێویستە ئەنجام بدرێ تەرجەمەی تەفسیری قورئانە، تەفسیرێك بنەماکانی دەعوەو بانگەوازی لەخۆ بگرێ بەشێوەیەك گونجاو بێ لەگەڵ دەقەکانی قورئان بەو شێوەی لەوەپێش ئاماژەمان بۆ کردو دروستە ناوی لێ بنێین تەرجەمەی شێوە تەفسیر، ئەمەش جوداوازە لە تەرجەمەی مەعنەوی، هەرچەندە لێکۆڵەرەوەو توێژەرەوەکان لێکیان جیاناکەنەوە، بێگومان تەرجەمەی مەعنەوی وا دەچێتە وەهمی مرۆڤەوە: کە بریتی بێ لەوەی وەرگێڕ مەعانی قورئان وەربگرێو وەری گێڕێتە سەر لوغەتی بێگانە، وەکوو ئەم حاڵەتە لە وەرگێڕانی شتی تردا بەرچاو دەگیرێو تەرجەمەی حەرفی (طبق الأصل) دەکرێ.

راڤەکەری قورئان ئەوکەسەی تەفسیری قورئان دەکا بە زمانو لەهجەو شێوە زاراوەیەك ئاخاوتن دەکا: کە بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆی مەعنای ڕستەو ئایەتەکانی ڕون بکاتەوە، وەکوو ئەوە بە خەڵك بڵێ: خەڵکینە! من ئاوا لەم ئایەتە تێدەگەمو پێم وایە پەروەردگار ئەمەی مەبەستە!!.

وەلێ وەرگێڕ بە زاراوەو لەهجەی کەسێك قسە دەکا: کە لە مانای کەلامەکە تێگەیشتبێ ئەمجار ئەو مانایە لە قاڵبو بەرگو پۆشاکێکی تردا رانوێنێ، جوداوازی نێوان ئەو راڤەو تەفسیرە لەگەڵ ئەم جۆرە وەرگێڕانە زۆرو بەرفراوانە، موفەسیر لە راڤەی ئایەتەکەدا دەڵێ: من وادەزانم ئەو مانایە مەبەستەو ئەمە بۆچونی منە دەربارەی مانای ئەم ئایەتە، بەڵام

وەرگێڕ دەڵێ: ئەمەی من نوسیومە دەیڵێم: عەینی مەعنای ئایەتەکەیەو دەقاو دەقە، لەوەپێشیش ئاماژەمان بۆ ئەم جۆرە کرد.

پێویستە لە تەرجەمەی شێوە تەفسیریدا جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە: کە ئەو جۆرە تەفسیرە تەرجەمەو شیکردنەوەی تێگەیشتنی تایبەتی کەسەکە خۆیەتی‌و جۆرەکانی تەئویل: کە گونجاو بن بۆ مەعناکانی قورئان لەخۆ ناگرێ، بەڵکوو ئەوەی لەخۆی دەگرێ بریتییە لە تێگەیشتنی تەفسیرکەرەکە خۆی، هەر بەم شێوەش تەرجەمەی بیروباوەڕی ئیسلامی‌و بنەماکانی شەریعەت وەکوو لە قورئان وەردەگیرێ ئەنجام دراوە.

جا ئەگەر گەیاندنی دەعوەی ئیسلامی، ئەرکی هەرە سەرەکی‌و پێویستی سەرشانی موسوڵمان بێ، بێگومان ئەوەی ئەم گەیاندنەی پێوە پەیوەستەو بەبێ ئەو گەیاندنی دەعوەکە ناکرێ، دیراسەو توێژینەوەی زمانەکانەو وەرگێڕانی بنەماکانی ئیسلامە بۆ سەر ئەو زمانانە، کەوابێ ئەمەش دەچێتە جوغزی واجبەکانەوە، لەلایەکی ترەوە زانیاریمان دەربارەی زمانەکان بە ئەندازەی پێویست یارمەتیدەرمان دەبێ بۆ دیراسەو لێکۆڵینەوە لەو کتێبانەدا: کە بەو زمانانە دانراون بۆ ڕەتددانەوەی موبەشیرو ڕۆژهەڵاتناسەکان، ئەوانەی هەمیشە لە هەوڵێ ئەوەدان لە نزیك‌و لە دوورەوە تانە لە ئیسلام بدەن‌و نەهێڵن بکەوێتە سەر قاچی خۆی‌و گەشە بکاتەوە، ئەم راستییە ئەوەیە: کە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە کە لە کتێبەکەیدا بەناوی (العقل والنقل) ئاماژەی پێ دەکا: کە دەفەرموێ: ئاخاوتن لەگەڵ هەر خاوەن لوغەت‌و زاراوەیەك بە لوغەت‌و زاراوەی خۆیان لە کاتی پێویستدا هیچ کەراهەت‌و عەیبێکی تێدا نیە، بە مەرجێ ماناکە صەحیح بێ‌و وەرگێڕانەکە راست‌و دروست بێ، وەکوو ئاخاوتن لەگەڵ خەڵکی ناعەرەب لە ڕۆم‌و فارس‌و تورك‌و ........هتد بەشێوە زمان‌و ئاخاوتنیان، ئەمە کارێکی دروست‌و پەسەندە بۆ پێویستی، ئەوەی: کە دەگوترێ: زانایان بە

ناپەسەندی دەزانن، ئەوە بۆ حاڵەتێکە: کە پێویست نەبێ، ئەمجار شێخی ئیسلام دەفەرموێ: لەسەر ئەم بنەماو یاساو ڕێسایە قورئان‌و حەدیث تەرجەمە دەکرێن بۆ کەسێك پێویستی پێ بێ بە تەرجەمە لە مەعناکانیان حاڵی ببێ، هەروەها پەسەندە موسوڵمان ئەوەی پێویستی پێ هەیە کتێبی دانراو بە زمانی نەتەوە جیاجیاکان فێر ببێ‌و بیانخوێنێتەوەو لە کاتی پێویستدا وەریان بگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، یان هەر زمانێکی تر، وەکوو چۆن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە زەیدی کوڕی ثابیت کرد: کە فێری زمانی جولەکەکان ببێ‌و بۆی بخوێنێتەوەو بۆی بنووسێ، چونکە لە جوولەکەکان ئەمین نەبوو کە بە ئەمانەتەوە دەقەکانی تەورات‌و نوسراوەکانی نوسراو بەو زمانەی بۆ شی بکەنەوە.

جا ئەگەر تەرجەمە بە مەعنا حەقیقەتەکەی – تەنانەت بۆ مانا ئەصڵییەکانیشی – بۆ هەموو ئایەتەکانی قورئان دەستەبەر نابێ، بەڵکوو ئەوەی دەستەبەر دەبێ تەرجەمەیە بە مانا تەفسیرییەکەی، جا کە حاڵ وابێ زۆر پێویستە خوێنەر لەو واقیعە ئاگادار بکرێتەوە یەکێکیش لە وەسائیلی ئەو ئاگادارکردنەوە ئەوەیە لە پەراوێزی لاپەڕەکاندا چەند ڕستەیەك بنووسرێ ئەوەی تێدا ڕون بکرێتەوە: کە ئەو مەعنایە یەکێکە لە بۆچون‌و وجوهەکانی مانای ئایەتەکە، یان راجیحترین مانایەکە: کە دەقەکە دەیگەیەنێ، خۆ ئەگەر کۆمەڵێکی نیازپاك‌و عاقڵ‌و بیرمەند سەروکاری تەفسیرکردنی قورئانیان بکردایەو وەریانبگێڕایە سەر زمانی غەیری عەرەبی (واتە: هەر زمانێکی تر عەرەبی نەبێ) بەمەرجێك ئەو کۆمەڵە ئەوەندە زاناو شارەزا بن، لە مەبەست‌و مەقاصیدی ئایەتەکان حاڵی بونایەو لەهەمان کاتدا لەو زمانە ئەجنەبییانەدا شارەزایی تەواویان هەبوایە ڕۆبچونایە ناو ئەو زمانانەوەو خۆیان بپارستایە لەو وجوهو تەعبیراتانەی خزاونە ناو ئەو تەرجەمەو تەفسیرانەی ئەمڕۆ لە ئەوروپادا باوە، بێگومان دەرگایەکی

داخـراو لـەڕوی دەعـوەی حەقـدا دەكرایـەوەو ئـایینی پـاكی ئیـسلام لـە زۆر وڵاتی كوفرو زوڵمو ستەمدا بڵاو دەبووەوە.[1]

## خوێندنی قورئان بە غەیری زمانی عەرەبی لە نوێژدا

زانایـان دەربـارەی خوێنـدنی قورئـان لـە نوێـژدا بـە غـەیری زمـانی عەرەبی دوو ڕایان هەیە:

١- رایەك دەڵێ: بـە ڕەهـایی دروسـتە خوێنـدنی نـاو نوێـژ بـە غـەیری زمانی عەرەبی بێ، یان لە كاتێكدا كابرا نەتوانێ بە عەرەبی بیخوێنێ.

٢- رای دووەم دەڵـێ: دروسـت نیـەو نابـێ، نوێـژ بـە غـەیری زمـانی عـەرەبی بخوێنـدرێ، هەركەسـێك بـە عـەرەبی نوێـژ نـەخوێنێ نوێژەكـەی بەتاڵو نادروسـتە، مەزهـەبی یەكـەم مەزهـەبی حەنەفییەكانـە، بێگومـان لـە ئەبو حەنیفەوە نەقڵ كراوە: كە پێی وابووە دروستە نوێژ بـە زمـانی فارسـی بخوێنـدرێ، لەسـەر ئـەم فتوایـەی ئیمـام ئـەبو حەنیفـە هەنـدێ لـە فـەقێو هـاوەڵانی فتوایـان داوە نوێـژ بـە زمـانی تـوركی، هینـدیو زمـانی تـریش بخوێندرێ.

هەڵبەتە ئەبو حەنیفەو هاوەڵانی: كە ئەم ڕەئیەیان داوە دەبێ پێیـان وابـێ قورئـان نـاوە بـۆ ئـەو مەعنایانـەی بـە وشـەگەلی عـەرەبی دەربـڕاون، مەعانیش بە جوداوازی ئەو لوغەتو زمانانەی پێی دەردەبڕدرێن گۆڕانكـاری بەسەردا نایە، بەهەر لەفظو لوغەتێك مەعنا دەربڕێ مەعناكە ناگۆڕێ.

ئـەبو یوسـفو محمـدی كـوڕی الحـسن الـشیبانی: كـە دوو قوتـابی مەشهوری ئەبو حەنیفـەنو كۆڵەكەی پتـەوی مەزهەبەكـەینی، دروسـتبوونی خوێنـدنی نوێـژیان بـە غـەیری عـەرەبی موقەییـەد كـردووە بـە حاڵـەتی ناچاریو زەرورەتو فەموویانە: كاتێ ئەمە دروستە كابرا نەتوانێ بـە زمـانی

---

[1] بلاغة القرآن ص٢١.

عەرەبی نوێژەکەی بخوێنێ، بەڵام کەسێك بتوانێ بە عـەرەبی بیخوێنـێ بـۆی دروست نیە بە غەیری زمانی عەرەبی نوێژ بخوێنێ.

خـاوەنی (معـراج الدرایـة) دەڵـێ: ئێمـەی حەنـەفی: کـە دەڵـێین: خوێندنی نوێژ بە غەیری عەرەبی دروستە، بۆ کەسێك وایـە نـەتوانێ فێـری زمانی عەرەبی بێو قسەی پێ بکا، هەروەها تەرجەمەکەش مانا نەشێوێنێ، چونکە (مانا) لە ڕویەکەوە بە قورئان دەژمێردرێ، چونکە قورئـان (لـەفظو مـەعنا) دەگرێتـەوە، جا کەسێك نـەتوانێ بـە لـەفظـە عەرەبیەکـە بیڵـێ، دەربڕینـی مەعناکـەی بـە زمـانێکی غـەیری عـەرەبی گـوتنی باشـترە لـە تەرککردنی، چونکە تەکلیف بە گوێرەی توانایـە، هـەروەها ڕیوایـەتکراوە: کـە ئـەبو حەنیفـە خۆیـشی لـەو فتوایـە بـە ڕەهایی پەشیمان بۆتـەوە، هـەر بـۆ کەسێك ڕێگای داوە عاجز بێو نەتوانێ بە عەرەبی بیخوێنێ.

مەزهـەبی دووەم: ڕای جـەماوەری زانایانـە: بێگومـان مالیکیـەکانو شافیعیـیەکانو حەنبەلییـەکان خوێنـدنی قورئانیـان لـە نوێـژدا بـە غـەیری زمانی عەرەبی مەنع کردووە، جا کابرا زمـانی عـەرەبی بزانـێ، یـان نـەتوانێ فێری ببێ، چونکە تەرجەمەی قورئان، بە قورئان حسێب ناکرێ، لەم ڕووەوە قورئـان بریتییـە لـەو نـەظمو پێکهاتـەی بریتییـە لـە کـەلامی خـوداو خـودا بۆخـۆی بـەوە وەصـفی کـردووە: کـە قورئـانێکی عەرەبییـە، تەرجەمـەکردنی وشەو ڕستەو ئایەتەکانی ئیعجازیان لێ دەشۆرێو بەلاغـەتو فەصاحەتەکەی لەدەست دەدا، تەرجەمەکە بە کەلامی خودا داناندرێ.

قازی ئەبوبەکری (بن العربـی): کـە یەکێکـە لـە فوقـەهای مـالیکی لـە تەفسیری ئایـەتی ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآناً أَعْجَمِيّاً لَقَالُوا لَـوْلا فُـصِّلَتْ آيَاتُـهُ أَأَعْجَمِـيٌّ وَعَرَبِـيٌّ – فـصلت/٤٤﴾ دەڵـێ: زانایـانی مەزهـەبی ئێمـە فەرموویانـە: ئـەم ئایەتـە ڕایەکـەی ئیمـام ئـەبو حەنیفـە پـوچ دەکاتـەوە: کـە دەڵـێ: دروسـتە لـەجیاتی لوغـەی عـەرەبی بـە زمـانی فارسـی نوێـژ بخوێنـدرێ، چـونکە

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآناً أَعْجَمِيّاً لَقَالُوا لَوْلا فُصِّلَتْ﴾ ئەوەتا بە ڕونی نەفی ئەوەی کردووە: کە لەم بوارەدا زمانی فارسی هیچ ڕۆڵێکی هەبێ، دەی کەوابێ چۆن ئێمە ڕێگەبدەین لەخوێندنی نوێژدا ئەو زمانە بەکاربهێندرێ؟ پاشان دەڵێ: فەصاحەتو بەلاغەتو ئیعجازی قورئان لەوەدایە: کە بە لوغەی عەرەبی بێ، ئەگەر بە زمانێکی تری ناعەرەب ئەدا بکرێ، نە بە قورئان حسێب دەکرێو نە بەیانو فەصاحەتەو نە بە بەلاغەو ئیعجازی تێدا دەمێنێ.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە فەتحولباریدا دەڵێ: ئەگەر نوێژخوێن دەیتوانی قورئان بە زمانی عەرەبی بخوێنێ، ئەوە بۆی دروست نیە بێجگە لە زمانی عەرەبی بە زمانی تر بیخوێنێ، تەنانەت ئەگەر عاجزیش بێ لە فێربوونی عەرەبیو بە زمانی عەجەمی نوێژی خوێند نوێژەکەی بەتاڵە، پاشان دەفەرموێ: بێگومان شاریع بۆ کەسێك عاجز بێ لە فێربوونی عەرەبی ڕێگەی داوە لە جیاتی خوێندنی قورئان، ذیکرو دوعا بکا بەو زمانەی بۆی دەکرێ.

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە: کە یەکێکە لە فوقەهای حەنبەلی — هەرچەندە بۆخۆشی خاوەنی بڕێ ئیجتیهاداتە — دەفەرموێ: ئەدا کردنی قورئان بە وشەو ڕستەگەلێك بەلاغەتو فەصاحەتی وەکوو ئەوەبێ: کە بە زوبانی عەرەبی ئەدا کراوە شتێکی محاڵەو لە جوغزی ئیمکان بەدەرە.

بۆیە زانایانی ئایین پێیان وایە خوێندنی نوێژ بە غەیری قورئان دروست نیە، جا توانای عەرەبی هەبێ، یان عاجز بێ، چونکە تەرجەمەکردنەکە قورئان لەوە دەباتەدەر: کە قورئانی نازڵ کراو بێ.[1]

هەر ئیبنو تەیمییە لە کتێبی (اقتضاء الصراط المستقیم)دا دەربارەی راجیایی فوقەها لەوەدا ئاخۆ ئەذکارەکانی ناونوێژ بە عەرەبی بخوێندرێن،

---

[1] بلاغة القرآن ص/١٥.

یان دروستە بە زمانی عەجەمیش بخوێندرێن؟ دەفەرموێ: وەڵێ قورئان نابێ بە غەیری زمانی عەرەبی بخوێندرێ، کابرا توانای عەرەبی هەبێ، یان عاجز بێ، ئەمە ڕای جەماوەری فوقەهای ئیسلامەو هەر ئەمەش ڕای حەقو صەوابەو شكو گومانی تێدا نیە، بەڵكوو زیاد لە فەقیهێك فەرموویانە: بێگومان تەرجەمەكردنی سورەتێك، یان ئەو ئەندازەی ئیعجازی پێ دەستەبەر دەبێ، تەرجەمەكردنی مەمنووعەو نابێ، شێخی ئیسلام یەك سورەت، یان ئەندازەی ئەوەی ئیعجازی پێ دەستەبەر دەبێ دیاری كرد تا ئاماژە بێ بۆ كەمترین ئەندازەی: كە تەحەددای پێ دێتە جێ.

ئایین پێویستی كردووە لەسەر ئەوانەی پابەندینی: كە فێری زمانی عەرەبی بن، چونكە لوغەتی قورئانەو كلیلی دەرگای تێگەیشتنیەتی، ئیبنو تەیمییە (رەزای خودای لێ بێ) لە كتێبی (الإقتضاء)دا هەمان رای دەربڕیوە، لەلایەكی ترەوە خودی لوغەی عەرەبی بەشێكە لە ئایینو زانینی فەرزو پێویستە، چونكە گومان لەوەدا نیە تێگەیشتن لە قورئانو لە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرزە، دەی بەبێ زانینی لوغەی عەرەبی ناتوانی لەو دوو سەرچاوەی ئایینە حاڵی ببێ، یاسایەكی ئوصوڵییە (هەر شتێك بەبێ ئەو واجب تەواو نەبێ ئەو شتە خۆی واجبە).

بەڵام ئیختیلافی حەنەفییەكان لەوەدا: كە دروستە بە تەرجەمەی قورئان نوێژ بخوێنی، ئەوانەی پێیان وایە ڕێگە دراوە لە كاتی عاجزیدا بە غەیری زمانی عەرەبی نوێژ بخوێندرێو بە ڕوخصەتیان داناوە، هەموویان یەكدەنگن لەوەدا: كە تەرجەمەكە قورئان نیە بە قورئان ناژمێردرێ، تەنها ئەوەیە نوێژەكەی پێ دروستەو بەس! نموونەكەی دەق وەكوو خوێندنی ذیكرەكان وایە لای غەیری حەنەفییەكان.

خوێندنی ذیكرەكان لەنوێژدا راجیایی تێدایە، جا ذیكرەكە واجب بێ وەكوو (ألله أكبر)ی نوێژدابەستن، یان واجب نەبێ، بێگومان ئیمام مالیكو

ئیسحاق‌و ئەحمەد لە صەحیح ترین ڕیوایەتی‌دا تەرجەمەی ذیکرە واجبەکانیان لە نوێژدا مەنع کردووە، ئەبو یوسف‌و موحەممەدو ئیمام شافیعی بەلایانەوە موباحەو دروستە، باقی ذیکرەکانی تر بەلای مالیك‌و ئیسحاق‌و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی شافیعی تەرجەمەکردنیان لە نوێژدا نابێ بکرێ، هەرکاتێ لە ناوەندی نوێژەکەی‌دا بە غەیری زمانی عەرەبی ذیکرەکانی خوێند، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

نەصصی مەذهەبی شافیعی ئەوەیە: کە مەکروهو ناپەسەندە، ئیمام ئەحمەدیش ئەم رایەی هەیە بۆ کەسێك عەرەبی نەزانێ.

هێزو توانای ئوممەتی ئیسلام هۆکارو ڕێبازە بۆ سەرکەوتنی ئیسلام‌و باڵادەستی زمانی عەرەبی، کۆتایی ئەم باسە لەوەدا چڕ دەکەینەوە: کە نابێ‌و دروست نیە قورئان تەرجەمەی حەرفی بکرێ، تەرجەمەی مەعنا ئەصڵییەکانی هەرچەند بۆ هەندێ ئایاتی مانا ڕون لەوانەیە دەستەبەر ببێ بەڵام ئەوەش لە فەساد پارێزراو نیە، ئاشکراشە وەکوو لەوەپێش ئاماژەی پێکرا تەرجەمەی مانا ثانەوی‌و نهێنی‌یە بەلاغیەکانی محاڵ‌و نەگونجاوە چونکە وجوهە بەلاغییەکانی قورئان بە غەیری ئەلفاظی لوغەی عەرەبی دەستەبەر نابن.

ماوەتەوە قورئان تەفسیر بکرێ‌و تەفسیرەکەی تەرجەمە بکرێ بۆ زمانەکانی غەیری عەرەبی، قەففال: کە یەکێکە لە فوقەها گەورەکانی مەذهەبی شافیعی دەفەرموێ: من پێم وایە کەس ناتوانێ بە زمانی فارسی مانای قورئان ئەدا بکا! پێی گوترا: کەوابێ کەس ناتوانێ قورئان تەفسیر بکا! لە وەڵامدا فەرمووی: ئاوا بە ڕەهایی حوکم نادرێ، چونکە دەشێ ئەو کەسەی تەفسیری قورئان دەکا هەندێ مەبەست‌و موڕادی خودا ڕون بکاتەوەو لە هەندێکیان عاجز بێ، وەلێ ئەگەر بیەوێ قورئان بە فارسی بخوێنێتەوە ئەوە

بە دڵنیاییەوە مومکین نیە بتوانێ هەموو مەبەستەکانی خودا: کە بە عەرەبی لە قورئاندا گەیەندراون بیانگەیەنێ.

تەرجەمەی تەفسیر بە ئەندازەی پێویست پێویستە چەندێك پێویست بێ بۆ گەیاندنی بانگەوازی ئیسلامیو بڵاوکردنەوەی بەناو نەتەوەو کۆمەڵگا جیاجیاکانی نائیسلامیدا پێویستە تەرجەمەی تەفسیری قورئان بکرێ، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە فەتحولباریدا دەڵێ: کەسێك موسوڵمان بوو، یان ویستی موسوڵمان بێ قورئانی بەسەردا خوێندرایەوە تێی نەگەیشت، چ خراپیەکی تێدا نیە ماناکەی بەو زمانەی لێی حاڵی دەبێ بۆ شی بکرێتەوەو لە ئەحکامەکانی حاڵێ ببێ، یان بۆ ئەوەی دڵی نەرم بێو موسوڵمان بێ.

بێگومان موسوڵمانان لە ڕۆژگاری رابردودا، لەپێناو سەروەری ئیسلامدا بەرەنگاری هەموو چورتمو نارەحەتیەك بوونەوە، هەموو ڕێگایەکی خەتەرناكو ناخۆشیان پەیرەو کردووە، ماندو نەناسانە بەرەوڕووی کێشەو تەنگژەکان بوونەوە، ملی ڕێگای خەتەرو ترسناکیان گرتووە بۆ بەدەستهێنانی سەروەری بۆ ئیسلام، پۆشاکی عەدالەتو گیانبازیو ئەخلاق بەرزییان پۆشیوە، بەجۆرێك چاوی ناحەزانیان پڕبووە لە شکۆمەندیو مەردایەتی ئەوان، بۆ هەر شوێنێ کشابنو ڕویان لە هەر دەڤەرو وڵاتێك کردبێ، لوغەی عەرەبی بە دوایاندا خۆی خزاندۆتە ئەو وڵاتانەو تێیدا بڵاوبۆتەوە، لە هەر شیوو دۆڵێك قاچی موسوڵمانانی لێ بووبێ، زمانی عەرەبی بە ئاسایی بۆی کشاوەو جێی خۆی کردۆتەوە، موسوڵمانەکان ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئەثنای بانگەوازی بۆ ئیسلامو بڵاوکردنەوەی ئیسلام هەستیان بەوە نەکردووە: کە پێویستیان بەوە هەبێ مەعنای قورئان وەربگێڕنە سەر زمانی ناعەرەبی پێدەچێ وەرگێڕانی مانای قورئان بۆ سەر زمانە بێگانەکان لەلایەن موسوڵمانانەوە – لە کاتێکدا: کە

لەوپەڕی عیززەتو دەسەڵاتدا بوون – هۆکارێك بێ لەو هۆکارانەی نەتەوە ناعەرەبەکان ملیان نایە فێربوونی زمانی عەرەبی هەتا وای لێ هات وڵاتە عەجەمییەکان بەشێوەیەکی گشتی دەیانتوانی ئاخاوتن بە زمانی عەرەبی بکەن.[١]

ئەم دیاردەیەی ئەمڕۆ ئێمە دەیبینین: کە فێربوونی زمانە بێگانەکان بۆ عەرەبەکان زەرورو پێویستە، بۆ ئەوەی بتوانن ڕۆڵەکانیان بنێرن بۆ زانکۆکانی وڵاتانی ترو پرۆسەی تواناسازی تەواو بکەن، یان لێکۆڵینەوە لە سەرچاوە زانیارییەکانی زانستە کەونییەکاندا بکەن لە زانکۆکانیاندا: کە بە زمانی بێگانە نوسراون، ئەم دیاردانە پێویستیو زەرورەت بۆ فێربوونی زانستو ڕۆشنبیری پاڵی بە قوتابییە عەرەبی زمانەکانەوە ناوە پەیڕەوی بکەن، ئێمە دەبینین ئەم دیاردە هەموو دانیشتوانی ئەو وڵاتانەی گرتۆتەوە: کە پێویستیان بە زانستو زانیاری نەتەوەکانی تر هەیەو زمانەکانیان فێرنەبن ناتوانن زانستەکانیان فێرببن! ئەم دیاردە بەتەواوی بیرو تێڕوانینی زۆرێك لە موسوڵمانانی داگیر کردووە نەخشە ڕێگای ژیانیانی دیاری کردووەو گەیشتۆتە ئەوپەڕی داخوازیو حەزو ئاواتیان لە ناخیاندا جێگیر بووەو هەوڵی بەرفراوانیو قوڵبوونەوەی تێدا دەدەنو پەل دەهاون بۆ زانستەکانیان بە لقو پۆپەکانیانەوە، بێگومان ئەم دیاردە کاریگەری زۆری کردۆتە سەر ئەخلاقو دابونەریتی موسوڵمانان، بەجۆرێك بەگشتی ژیانی ئێمەی لە زۆر بوارەکانی ژیاندا گۆڕیوەو لە سکەو ڕێڕەوی ئیسلام دەرچوینو زۆر ئەخلاقی ڕەسەنو دابونەریتی ئیسلامیمان لەدەست داوە.

بە پێچەوانەوە نەتەوەکانی تر پێویستیان بەوە نیە کتێبەکانیان وەربگێڕنە سەر زمانی عەرەبی لەڕوی ئەوەوە: کە مەکانەتی عیلمیان هەیە، بەڵێ چونکە ئەمڕۆ زمانی عەرەبی ئەوەی لەدەست داوە کە زمانی عیلمو

---

[١] بلاغة القرآن ص٨١.

زانست بێ، مامۆستاو قوتابی زانسته عیلمییەکان پێویستیان بەوە نیـه فێـری زمانی عەرەبی ببن.

خۆ ئەگەر دەوڵەتی ئیسلام وەکوو چاخە زێڕینـەکانی بمایـەو لـەڕوی زانیارییــەوە بــەرەوپێش بــچوبایەو گەشــەی بکردایــەو لــەڕوی ڕۆشــنبیری‌و سیاسەت‌و هێزو دەسـەڵات‌و شکۆمەندیـەوە پێشکەوتنی بەدەست بهێنایـە، هـەموو جیهـان چاویان لێ دەکـردو هـەوڵیان دەدا لاسایی بکەنـەوەو خۆیـانی لەگەڵ بچارێنن، چاکی دامێنیـان لێ هەڵدەکردو ملیـان لـە فێربـوونی زمـانی عـەرەبی دەنـاو تێیـدا قـوڵ دەبوونـەوەو دەسـتیان دەکـرد بـە لێکۆڵینـەوەو توێژینەوە بۆ ئەوەی لە سەرچاوەی بەروبومی فیکری ئیسلامی بەشی خۆیان هەڵێنجن‌و تینوایەتی بە زانستەکانی بـشکێنن‌و خۆیـان بخەنـە ژێـر سێبەری دەسەڵاتیەوەو لەژێر سیادەو حیمایەیدا ژیان بەسـەر بـەرن، ئـەو پێویـستی‌و ئاتاجەی ئەمڕۆ ئێمە لەخۆمانیدا دەبینین بۆ فێربوونی زمانـە زانـستیەکانی وەکوو ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و ئەڵمانی.......هتد ئەوان لەخۆیاندا دەبینی بـۆ فێربوونی زمانی عەرەبی.

کـەوابێ قـسە لـەبارەی تـەرجەمـەی قورئانـەوە بـۆ سـەر زمـانێکی تـر دیاردەیەکە لە ئاکامی لاوازبوونی دەوڵەتی ئیسلامییەوە سەری هەڵداوە!

زۆر پێویستەو ئەرکی سەرشانی ئێمـەی موسوڵمانە کـە بـە خۆمانـدا بـچینەوەو هـەوڵ‌و کۆشـشی خۆمـان چـڕ بکەینــەوە بــۆ دروســتکردنەوەی دەوڵەتی قورئان؛ دەوڵەتی عەدالەت‌و یەکسانی‌و پێکـەوە ژیـان، هـەوڵ بـدەین بنەماکانی دەوڵەتداری ئیسلامی بچەسپێنین، زەمینە سازی بۆ بکەین لەسـەر ئەساسـی ئیمـان‌و زانـست‌و زانیـاری بیکەینـە ئامـانج‌و هـەوڵی بەدەسـتهێنانی بدەین، هەر ئەمـە دەبێتـە زامـن‌و کـەفیلی باڵادەسـتی روحـی‌و مەعنـەویمان بەسەر نەتەوەکانی جیهانداو فێربوونی زمانی عەرەبی‌و بڵاوکردنـەوەی ئـەو زمانە لەناویاندا، جا ئەگەر ئایینی ئیسلام ئـاینی هـەموو ئـادەمیزاد بـێ بـە

گشتی، ئەم گشتگیرییە بۆ زمانەکەشی بەرچاو دەگیرێ، دەبێ چۆن هەوڵ دەدەین بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین ئاوایش هەوڵ بدەین لوغەتی عەرەبی: کە لوغەتی ئایینەکەیە، بڵاوی بکەینەوە، لە کاتێکدا ئێمەی موسوڵمان هەوڵی بەدەستهێنانو چەسپاندنی ئەو عیززەتو شکۆمەندییە دەدەین: کە خودا داوامان لێ دەکا هەمان بێ.

## ٣) تەفسیرو تەئویل

قورئانی پیرۆز سەرچاوەی یەکەمی تەشریعە، لەسەر ئەساسی تێگەیشتن لە ماناکانیو زانینو شارەزابوون بەسەر نهێنییەکانیداو کارکردن بە ئەحکامو ئامۆژگارییەکانی: کە بەختەوەریو کامەرانی دوونیاو قیامەتی پێوە بەندە، شتێکی ئاشکراشە ئادەمیزاد هەموویان لە یەك ئاستدا نین بۆ تێگەیشتن لە وشەو ڕستەو دەقەکانی، هەرچەندە ماناکانی ڕونو ئایەتەکانی شیکردنەوەو تەمو مژو ڕکاکەتی تێدا نیە، بەڵام جوداوازی تێگەیشتن لەناو مرۆڤەکاندا شتێکی بەڵگە نەویستەو گومانی تێدا نیە.

کابرایەکی نەخوێندەوار، یان نیمچە خوێندەوار، ڕووکەشی ماناکان تێدەگاو کەم تا کورتێك لە ئایەتەکان حاڵی دەبێ، وەلێ مرۆڤی خوێندەوارو زیرەك، لە ئایەتەکان مەعنای رائیعو عەنتیکە دەردێنێ، لەنێوان ئەمو ئەودا زۆر مەرتەبەو پلەی تێگەیشتن هەن، کەوابێ سەیر نیە کە لەلایەن موسوڵمانانەوە ئەو هەموو گرنگییەی پێ دراوەو لەڕوی لێکۆڵینەوەو تەفسیری غەریبو تەئویل کردنی ڕستەو تەرکیبەکانی.

# مانای تەفسیرو تەئویل

تەفسیر چاوگەو لە وشەی (فسر) وەرگیراوە، بە مانا ڕونکردنەوەو دەرخستنو دیاریکردنی مانای گونجاوو مەعقوولە، فیعلە موجەڕەدەکەی وەکوو (ضرب، نصر) وایە دەگوترێ: (فسر یفسر) (فسَر یفسُر) دەشگوترێ: (فسّره) واتە: ڕونی کردەوە، شی کردەوە، وشەی (الفَسْر) بە مانا شیکردنەوەو ڕونکردنەوەیە، پەردە هەڵدانەوەو دەرخستنی شتە (التفسیر) دەرخستنی مەبەستو مورادە لە لەفظە موشکیلەکە، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلاَّ جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيراً – الفرقان/٣٣﴾ وشەی (تفسیر) لێرەدا بە مانا ڕونکردنەوەو شیکردنەوەیە، زۆربەی کاتیش هەردوو فیعلی: کە (تەفسیرو تەئویل) چاوگی ئەوانن بەشێوە موجەڕەد بەکارنایەن بەڵکوو بەشێوە مەزیدو لە بابی (تفعیل) بەکاردێن، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) لە شیکردنەوەی ﴿وَأَحْسَنَ تَفْسِيراً﴾ فەرموویەتی (أی تفصیلا).

هەندێ فەرموویانە وشەی (تفسیر) لە (سَفَر)ەوە وەرگیراوە هەمدیسان بە مانا دەرخستن دێ، دەگوترێ: (سفرت المرأة سفوراً) ئەگەر چارشێوی لەسەر ڕوخساری خۆی لابدا، (وهی سافرة) هەروا دەگوترێ: (أسفر الصبح) واتە روناکی بەیانی دەرکەوت، ئاسۆی ئاسمان ڕون بۆوە، وەلێ صیغەکەیان لەسەر شێوەی (تفعیل) هێناوە بۆ ئەوەی دەلالەت بکا لەسەر زۆریو تەکثیر، وەکوو لە ئایەتی ﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ – البقرة/٤٩﴾ هەروا ئایەتی ﴿وَغَلَّقَتْ الأَبْوَابَ – یوسف/٢٣﴾.

کەوابێ وشەی تەفسیر: کە بۆ تەکثیرە ئەوە دەگەیەنێ شیکردنەوەکە بەجۆرێکە هەموو ئایەتەکانو سورەتەکان یەك بەدوا یەکدا دەگرێتەوەو لە هەموو ڕویەکەوە توێژینەوەیان تێدا دەکرێ.

راغیبی ئەصفەهانی دەڵێ: (الفَسر والسَفر) ماناکانیان لێك نزیكن وەكوو نزیكی لەفظەكانیان لە یەكتر، بەڵام وشەی (سفر) بۆ دەرخستنی مەعنای مەعقول‌و نامادی بەكاردەهێندرێ، وشەی (فسر)یش بۆ دەرخستنی شتی مادی‌و بینراو بەكار دێ، دەگوترێ: (سفرت المرأة عن وجهها) یان دەگوترێ: (أسفر الصبح).

(التفسیر) لە زاراوەدا، ئەبو حەییان دەڵێ: بریتییە لە زانستێك باس لەوە دەكا چۆن وشەكانی قورئان دەرببڕین، دەلالەت لەچی دەكەن‌و حوكمەكانیان بە تەنیاو لەناو ڕستەدا چۆنن؟ لەكاتێكدا دەخرێنە ناو ڕستەوە چ مانایەك دەبەخشن؟ چەند شتێكی تری پەیوەست بە ئەم شتانەوە، دەقەكە بە عەرەبی ئاوایە (علم یبحث عن كیفیة النطق بألفاظ القرآن، ومد لولاتها، وأحكامها الأفرادیة والتركیبیة، ومعانیها التی تحمل علیها حالة التركیب، وتتمات ذلك).

ئەمجار ئەبو حەییان دێ پێناسەكە شی دەكاتەوە دەڵێ: كە دەڵێین: (علم) ئەوە جینسەو شمولی هەموو عیلمێك دەكا: كە دەڵێین: (یبحث فیە عن كیفیة النطق بألفاظ القرآن) ئەوە عیلمی قیرائات دەگرێتەوە، كە دەڵێین: (ومد لولاتها) مەبەستمان مەدلولاتی ئەو ئەلفاظانەیە كە قورئان لەخۆی گرتوون، ئەمەش عیلمی لوغەت دەگرێتەوە: كە لەم بوارەدا زۆر پێویستەو تەفسیركردن بەبێ زانیاری لەم عیلمەدا دەستەبەر نابێ، كە دەڵێن: (وأحكامها الأفرادیە والتركیبیة) بە ئەمەش زانستی صەرف‌و ئیعراب‌و عیلمی بەیان‌و عیلمی بەدیع دێنە ژێر جوغزی تەفسیرەوە، كە دەڵێن: (ومعانیها التی تحمل علیها حالة التركیب) دەلالەتكردنی لەفظەكان لەسەر مانا بەشێوەی حەقیقەت‌و مەجاز دەگرێتەوە، چونكە وادەبێ ڕستەو تەركیب بە ڕواڵەت‌و ظاهیر، مەعنایەك دەگەیەنێ، بەڵام مانیعێك هەیە ناهێڵێ ئەو مەعنایە وەربگرین، بۆیە پێویستە دەقەكە حەمل بكەین بۆ سەر مانای غەیرە

ظاهيرو حەقیقەت، مانای مەجازی لیّ وەربگرین، کە دەڵێن: (وتتمات ذلك) بەم ڕستەیەش زانیاری نەسخو ئەسبابی نزولو ڕونکردنەوەی بڕێ لەو مانایانەی لە قورئاندا هەنو تێگەیشتن لێیان خستنیە ژێر پیناسەکەوە.

ئیمامی زەرکەشی دەڵێ: (التفسير) بریتییە لە عیلمو زانیارییەك: کە بەهۆیەوە نامەی خودا: کە نازڵکراوە بۆ سەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەزاندرێو لە ماناکانی حاڵی دەبینو شارەزای حوکمەکانیو حیکمەتەکانی دەبین

تەئویل لە لوغەتدا لە (الأول) وەرگیراوە: کە بە مانا گەڕانەوەیە بۆ ئەصڵو بنەما، دەگوترێ: (آل أليه أولاً ومآلاً) واتە: بۆی گەڕایەوە، دەشگوترێ: (أوّل الكلام تأويلاً وتأوّله) لە قسەکە ورد بۆوە، مەزەندەی کردو شیکردەوە، لەسەر ئەم بنەمایە (تأويل الكلام) دوو مانای ئیصطیلاحی هەیە:-

١- تەئویلی کەلام: بەو مانایەی موتەکەلیمو گۆیا، کەلامەکە بۆ ئەو مانایەی دەباتەوە، یان کەلامەکە بۆ ئەو مانایە دەگەڕێتەوە، ئاشکراشە کەلام بۆ حەقیقەتی خۆی دەگەڕێتەوە: کە خودی مەبەستەکەیە ئەمیش دوو جۆرە (ئینشاء، ئیخبار) بەشێکیش لە (ئینشاء) صیغەی ئەمرە.

تەئویلی ئەمر: بریتییە لە بەجێهێنانی کردارە فەرمان پێکراوەکە، (الفعل المأمور به) لە نمونەی ئەمە ڕیوایەتی خاتو عائیشە: کە دەفەرموێ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ « سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي» يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ، کە دەفەرموێ: «يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ» واتە: تەنفیزی فەرمانی خودای دەکرد: کە دەفەرموێ: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً – النصر/٣﴾.

تەئویلی ئیخبار: بریتییە لە خودی خەبەر لێدراوەکە کە هاتە دی، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَاهُمْ بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَى عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ، هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ تَأْوِيلَهُ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِنْ قَبْلُ قَدْ

جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَلْ لَنَا مِنْ شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُوا لَنَا أَوْ نُـرَدُّ فَنَعْمَـلَ غَيْـرَ الَّـذِي كُنَّا نَعْمَلُ قَدْ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَـا كَـانُوا يَفْتَـرُونَ – الأعـراف/٥٢ – ٥٣﴾.

لـەم ئايـەتانـەدا پـەروەردگار هـەواڵی ئـەوەی داوە: کـە نامـەی پـیرۆزی خۆی ڕونکردۆتەوە، ئەوانـە تـەنها چاوەڕوانی تەئویلەکـەی دەکـەن: کـە واتـە ڕودانی ئەو ڕوداوانـەی قورئـان هـەواڵی لێ داونو ڕایگەیانـدووە کـە دێنـە دی، لەوانە ڕابونی قیامەتو نیشانەو ڕوداوەکانی ئـەو ڕوداوانـەی تێیـدا دێنـە دی وەکـوو بـڵاو کردنـەوەی نامـەی ئـەعمالو تـەرازوی عەدالـەتو دابەشـکردنی مەخلوقات بە دوو بەش، بەشێکیان بۆ  بەهەشتو بەشێکیان بۆ دۆزەخو زۆر ڕوداوی تر: کە خودا خۆی دەیانزانێ، جا ئەوکاتە تاوانبارو کافرەکـان دەڵێن: ﴿قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَلْ لَنَا مِنْ شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُوا لَنَـا أَوْ نُـرَدُّ فَنَعْمَـلَ غَيْـرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾.

٢- تەئویلی کەلام: واتە: تەفـسیرو ڕونـکردنـەوەی ماناکـەی. ئەمـە دەق ئەو مانایەیە: کە ئیبنو جەریری طەبەری لە تەفسیرەکەیدا دەڵـێ: (القـول في تأويل قوله تعالى كذا وكذا) یان دەڵێ: (أختلف اهل التأويل في هذه الآية) دیارە طەبـەری لێـرەدا مەبەسـتی بـە (أهـل التأويـل) ئـەهلی تەفـسیرە. لـە ڕاسـتیدا لـەلای سـەلەفی صـالح مـەعنای تـەئویل ئەوەیـە: کـە طـەبـەری ئامـاژەی بـۆ کردووە.

تەئویل لە عورفو ئیـصطیلاحی عولـەمای موتەئەخیرینـدا بریتییـە لەلادانی لەفظ لەمانای ڕاجیحو پەسند بـۆ مانـای مـەرجوح لەبـەر هـەبوونی بەڵگەیەك لەتەکیا. دەی ئەم ئیـصطیلاحـە لەگـەڵ ئـەو مەعنایـەی عولـەمای سـەلەف مەبەسـتیانە لـە لـەفظـی تـەئویل لـە قورئانـدا یەکناگرێتـەوەو جوداوازیی نێوانیان عاسمانو ڕێسمانە.

شایانی باسە هەندێ عولەما جوداوازی دەخەنە نێوان مەعناو تەفسیرو تەئویلەوە، چونکە جوداوازی هەیە لەنێوانیاندا، هەرچەندە لێك نزیکن، بەڵام ناکرێ بە ئەلفاظی موتەرادیف حیساب بکرێن‌و بڵێن ئەمانە دەلالەتیان هەیە. ئیمامی زەرکەشی لەکتێبی (ألبرهان)دا ئاماژەی بۆئەمە کردوە.

ئیبنو فارس دەڵێ: مەعناکانی ئەو عیبارەتانەی تەعبیریان پێ لێ دەدرێتەوە لەشتەکان، لەسێ زاراوەو دەستەواژە تێناپەڕن، ئەوانەش بریتین لە (المعنی، والتفسیر، والتأویل) ئەم موصطەلەحانە، هەرچەند لەواقیعدا لێك جوداوازن بەڵام ئەو مەبەست‌و ئاکامەی لێیان وەردەگیرێ لێك نزیکن.

زاراوەی (ألمعنی) بریتییە لە قەصدو مەبەست، دەگوترێ: (عنیت بهذ الکلام کذا) واتە: مەبەستم بەو کەلامە ئەوەیەو مەقصودم ئەو شتەیە. ئەوەم نیازە. ئەمەش لەوە وەرگیراوە: کە (معنی) بەمانا دەرخستن‌و ئیظهارکردن بێ، دەگوترێ: (عنت القربة) گۆزەکە ئاوەکەی لەخۆیدا نەهێشتەوە بەڵکوو دەری هاویشت‌و لێی تکا. هەر لەم بوارەدایە: کە دەگوترێ (عنوان الکتاب) واتە ئەوەی کتێبەکە لەخۆی گرتووەو دەیگەیەنێ‌و شی دەکاتەوە.

بەڵام تەفسیر لە لۆعەتدا ئەویش سەرەنجام دەگەڕێتەوە بۆ مانای ئیظهارو پەردە لادان‌و شیکردنەوەو دەرخستن. ئیبنولئەنباری دەڵێ: عەرەب: دەڵێن: (فسرت الدابة وفسرتها) کاتێك هەلینگی بدەی‌و رایپەڕێنی‌و جڵەوی شل بکەی بۆئەوە بکەوێتە غاردان. ئەم مانایەش دەگەڕێتەوە بۆ کەشف‌و دەرخستن، کەوابێ تەفسیر کردنەوەی شتی داخراوەو دیاریکردنی مەعنای مەبەستە لە لەفظەکەو بەرەڵلاکردنی پەنگ خواردویەکە لەتێگەییشتن.

تەئویل: بنەمای ئەم لەفظە لە لۆغەتدا لە وشەی (الأول) وەرگیراوە، مانای رستەی (ما تأویل هذا الکلام؟) بۆچی دەگەڕێتەوەو ئەم کەلامە چی

دەگەیەنێو مەبەست لێی چیە؟ وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ – الأعــــراف/٥٣﴾ واتــە: ئــەو رۆژەی ئاکــامو ســەرەنجامی رون دەبێتـــەوە دەردەکەوێ. دەگوترێ (آل الأمر الى كذا) سەرەنجامی ئیشەکە ئەوەبوو، قورئان دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً – الكهف/٨٢﴾. ئەم وشـەیە بنەماکەی (المآل)ە: کە بەمانا سەرەنجامو ئاکامە، دەگوترێ: (أوّلأته فآل) واتـە: لامدا بۆ ئەو لایـەو رووم پـێ لـەوێ کـرد ئـەویش قبـووڵی ئـەو لادانـەی کـرد. کـەوابێ وشـەی (التأویـل) لـە ئایەتەکـەدا ئاڕاسـتەکردنی ئایەتەکەیـە بـۆ ئـەو مانایـەی هـەڵی دەگـرێ: کـە لەسـەر صـیغەی (تفعیـل) هێنـراوە بـۆ ئەوەیـە دەلالەت بکا لەسەر تەکثیرو زۆری.

## جوداوازی نێوان تەفسیرو تەئویل

زانایـانی ئیـسلام بۆچـوونی جوداوازیـان هەیـە لـەنێوان تەفـسیرو تەئویلدا. جا لەبـەر رۆشـنایی رونکردنـەوەی مانـای تەفـسیرو تـەئویلدا: کە لـەوەپێش ئاماژەمـان بـۆکرد، دەتـوانین پوختـەی ئـاراو بۆچـوونی زانایـان لەچەند خاڵێکدا بخەینەڕو.

١- ئەگەر بڵێین: تەئویل بریتییە لە تەفسیری کەلامو رونکردنـەوەی ماناکەی. لەسەر ئـەم بنەمایـە تـەئویلو تەفسیر لێـك نـزیکن، یـان ئـەلفاظی موتەرادیفەن. واریـدبوونی ئـەم دوو لـەفظە لـە دوعـاکردنی پێغەمبـەردا بـۆ ئیبنو عەبباس: کە دەفـەرموێ: «اللّٰهُـمَّ فَقِّهْـهُ فِـی الـدِّینِ وَعَلِّمْـهُ التَّأْوِیـلَ».[1] بەوشێوە مەعنا دەکرێن.

٢- ئەگـەر بڵـێین: تـەئویل بریتییـە لـەخودی ئـەو مەبەسـتەی لـە کەلامەکەدایە، واتە: تەئویلی طەلەب خودی فیعلە مەطلووبەکەیـە، تـەئویلی

---

[1] اخرجه البخاری/١٤٣ ومسلم مختصراً واحمد/٣١٠٢ بلفظه، من حديث ابن عباس.

خەبەر خودی ئەوشتەیە خەبەرەکەی لێ دەدەی، لەسەر ئەم بنەمایە، جوداوازی نێوان (تەفسیرو تەئویل) زۆرو بەرفراوانە. چونکە تەفسیر راڤەکردنو رونکردنەوەی کەلامە، بوونی لە ذیهندا بەوەیە تەصەوری بکەی، بوونی لە زوبان بەو عیبارەتەیە: کە دەلالەت دەکا لەسەری. بەلاّم تەئویل بریتییە لەخودی ئەو شتانەی لە خاریجو واقیعدا بوونیان هەیە. ئەگەر بگوترێ: (طلعت الشمس) تەئویلی ئەم دەستەواژەیە خودی دەرکەوتنی خۆرەکەیە. وشەی تەئویل لە قورئاندا بەزۆری بەم مانایە هاتووە وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنْ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ، بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ – يونس/٣٨-٣٩﴾ دەی لێرەدا مەبەست بە تەئویل رودانو هاتنەدی خەبەر لێ دراوەکەیە.

٣- رایەك هەیە دەڵێ: تەفسیر بریتییە لەو وشەو رستانەی دەبنە رونکەرەوە لەقورئاندا مەبەستی ئایەتەکە دیاری دەکاو شی دەکاتەوە، یان لە حەدیثی صەحیحدا دەست نیشان بکرێ. چونکە مەعنای تەفسیر دەرخستنو رونکردنەوەیە. بەلاّم تەئویل بریتییە لەو مەعنایەی زانایان هەوڵ دەدەن دەری بێنن. بۆیە هەندێ لە عولەمایان وتوویانە: تەفسیر پەیوەندی بە ریوایەتەوە هەیە، تەئویل پەیوەستە بە دیرایەتەوە.

٤- رایەکی تر هەیە دەڵێ: تەفسیر بەزۆری بۆ ئەلفاظو موفرەدات بەکاردەهێندرێ، تەئویل بەزۆریو غالب وایە لە مەعانیو رستەدا بەکاردەهێندرێ. شایانی باسە لەم بوارەدا راوبۆچوونی تریش هەن.

## ڕێزو شكۆمەندی تەفسیر

گومان لەوەدا نیە تەفسیر پیرۆزترین عیلم‌و زانیارییە، ڕێزی زانیاری تەفسیر لە ترۆپكی ڕێزدایە ئەو باسەی تەفسیر لێی دەدوێ شەریفترین شتەو پیرۆزترین غەرەض‌و پێویستی مرۆڤی موسوڵمانە. چونكە ئەوەی تەفسیر لێی دەدوێ كەلامی خودایە، ئاشكراشە قورئان سەرچاوەی هەموو حیكمەتێكە، كان‌و ماكی هەموو فەضیلەو بەها پیرۆزەكانە، هەروەها چونكە غەرەض لە تەفسیری قورئان پابەندبوونە بەناوەرۆكیەوە، دەستگرتنە بە (العروة الوثقی) قوڵفەو حەبلی پتەوی ڕزگاربوون، گەیشتن بە بەختەوەری حەقیقی‌و حەسانەوەی هەتا هەتایی. پێویستی موسوڵمانانیش بۆ تەفسیر لەم ڕووەوەیە كە هەموو بەدیهاتنی هەموو كاروبارێكی ئایینی‌و دونیایی كاتێك بەتەواو دادەنرێ‌و بەختەوەری لێ وەدی دێ: كە موافیقی شەرع بێ، ڕاستهاتنەوەی ئەو كارانەش لەگەڵ شەریعەتدا كاتێك دەستەبەر دەبێ: كە لەماناو مەبەستی قورئان حاڵی بین، ئەمەش بەهۆی تەفسیرەوە دەزاندرێ.

## ئەو ئاداب‌و مەرجانەی پێویستە لە موفەسسیردا هەبن

بەحث‌و لێكۆڵینەوەی زانستیانەی پاك‌و بێ خەوش ئەساس‌و بنەمای زانین‌و تێگەیشتنی حەق‌و بەسوودەو خوێنەرو قوتابی لێی بەهرەمەند دەبن، بەروبومەكەی بەتامترین‌و بەسودترین بژیوی فیكرو گیانە، باشترین هۆكارە بۆ گەشەكردنی عەقڵ‌و ئاوەزو بەرفراوانی ئاسۆی! بۆیە دەستەبەركردنی هۆكارەكانی بۆ هەموو لێكۆڵەرەوەو توێژەرێكی زانستخواز كارێكە ڕۆڵی خۆی لە پێگەیاندنی بەروبووم‌و چنینی‌دا هەیە، هەڵبەتە لێكۆڵینەوە لەزانستە شەرعییەكاندا بەگشتی‌و لەبواری تەفسیردا بەتایبەتی لە گرنگترین ئەو كارانەیە: كە پێویستە چاكی دامێنی بۆ هەڵبكرێ‌و قۆڵی بۆ هەڵماڵرێ‌و شارەزای مەرج‌و ئادابەكانی بی، بۆئەوەی بەباشی لەكەلامی خودا

تێبگەین‌و پارێزگاری ڕەوعەت‌و جوانی نیگای ئاسمانی بکەین‌و لەو سەرچاوە پیرۆزو خاوێنە بەهرەمەند ببین.

## مەرجەکانی ڕاڤەکەری قورئان

بێگومـان زانایـان چـەند مـەرجێکیان دانـاوە بـۆ کەسـێك خـەریکی تەفسیر بێ، لەچەند خاڵێکدا چڕیان دەکەینەوە:

١- بیروباوەڕی ڕاست: بێگومان بیرو باوەڕ کاریگەری بەهێزی هەیە لـە دڵ‌و دەروونی خاوەنەکەی‌دا، زۆرجار وادەبێ بـیرو بـاوەڕی هەڵـەو نادروست خاوەنەکەی هەڵدەنێ بـۆ گۆڕانکـاری‌و تـەحریف لەدەقەکانـداو خیانـەتکردن لەگێڕانەوەی ئەخبارو ریوایەتی حەدیثدا، ئەگەر یەکێك لەخاوەنی ئەو بیرو باوەڕانـەدا کتێبێـك بنووسـێ لـە تەفسیردا، ئـەو ئایەتانـە تـەئویل دەکـا: کـە پێـچەوانەی بیروبـاوەڕە بەتاڵەکەیـەتی. وایـان دەسـازێنێ لەگـەڵ بـیرو باوەڕەکەیـدا ڕێـك بکـەون. هـەموو هـەوڵێکی دەخاتـە گـەڕ بۆئـەوەی نـەهێڵێ خەڵکی شوێن مەذهەب‌و مەنهەجی سەلەفی صاڵح بکـەون، ڕێگرییـان لێ دەکـا لەوەی ڕێگای هیدایەت بگرنەبەر!

٢- خـۆ دوورخـستنەوە لەهـەواو ئـارەزو، بێگومـان هـەواو ئـارەزۆ، خاوەنەکانیان هەڵدەنێن بۆئەوەی بەچاك‌و خراپ‌و حـەق‌و ناحـەق پـشتگیری لــە مــەذهەبەکــەی خۆیــان بکــەن، بەقــسەی خــۆش‌و چـاووڕاو خــەڵکی لەخشتەبەرن، وەکوو ئەو هەموو هەوڵ‌و تەقەلایەی قـەدەری‌و رافیزیـەکان‌و موعتـەزیلەکان داویانـەو مـەذهەبـە تونـدڕەوەکان هەمیـشە ئـاڵا هـەڵگری ئـەو چەواشـەکارییە بـوون تـا ئێـستاش بەداخـەوە ئـەو دیـاردەو لادانـە لـەڕێگای سەلەفی صـاڵح بەهـەموو جۆرێـك‌و لـەژێر شـیعاری جیاجیـادا لەپەرەسـەندن دایە.

٣- پێویسته موفەسسیر سەرەتا بۆ تەفسیری قورئان پەنا بۆ قورئان خۆی بەرێ، واته: هەوڵ بدا تەفسیری قورئان بەقورئان بکا، چونکه زۆرجار قورئان لەشوێنێکدا بەشێوەی کورتو موجمەل شتەکە دەهێنێو لەشوێنێکی تردا شی کردۆتەوەو تەفصیلی پێداوە، ئەوەی لەجێگایەك بەکورتی ئاماژەی پێ کردوە لەشوێنێکی تر بەدرێژی هێناویەتی!

٤- هەوڵ بدا بە حەدیثی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەفسیر بکا چونکه ئاشکرایه سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راڤەکەرو رونکەرەوەی قورئانە، قورئان بەدەق ئاماژەی بۆ ئەم راستییە کردوەو ئەوەی چەسپاندوە: کە ئەحکامەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە لێوەی صادر دەبن بەنیگای خودایی دێنەدیو لەخۆیەوە قسەناکا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ – النساء/١٠٥﴾. هەروەها پەروەردگار ئەوەی راگەیاندووە: کە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رونکەرەوەی قورئانە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ – النحل/٤٤﴾. بۆیه پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ».[1] ئەمن قورئانم بەخەلات پێدراوە، بە ئەندازەی قورئانیش لەگەڵیدا خەلاتی ترم پێدراوە. مەبەستی سوننەته پیرۆزەکانی خۆیەتی. ئیمام شافیعی فەرموویەتی: هەر حوکمو بڕیارێك لە پێغەمبەرەوە دەرچووبێ ئەوە لەتێگەییشتنی خۆی بۆ قورئان سەرچاوەیان گرتووە. نموونەی ئەمەش زۆرو زەبەندەیە. خاوەنی کتێبی (الاتقان) ئەم نموونانەی ریزبەند کردونو لەکۆتا فەصلی کتێبەکەیدا چەسپاندونی، بۆ نموونه تەفسیری (السبیل) له ئایەتی (من استطاع السبیلا) بە تیشوو ئامێری

---

[1] اخرجه أبو داود/٤٦٠٤ وأحمد/١٧١٧٤ من حديث المقدام بن معدى كرب.

سواری، تەفسیری (الظلم) بە شیرك‌و هاوبەش دانان بۆخودا، تەفسیری (الحساب الیسیر) لەئایەتی (فسوف یحاسب حساباً یسیراً) بە عەرض‌و رانواندنی کردەوەکانی.

٥- ئەگەر موفەسیر لە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکی وای دەست نەکەوت بۆ تەفسیر پەنا دەباتە بەر ئەقوالی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چونکە ئەوان لەهەموو کەس زیاتر شارەزای تەفسیرن، لەم رووەوە خۆیان ئاگاداری رووداوەکان بوون‌و حاڵات‌و قەرائینەکانیان بەچاوی خۆیان دیوە، هەروا تێگەیشتنی تەواوو صەحیحیان لە قورئان بۆ دەستەبەر بووە، زانیاری راست‌و بێ خەوشیان بۆ قورئان هەبووەو موخلیص‌و کردار باش بوون.

٦- ئەگەر تەفسیری لە قورئان‌و سوننەت‌و ئەقوالی هاوەڵاندا دەستگیر نەبوو ئەوە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ئەقوالی عولەمای تابیعین. بێگومان زۆر لە ئیمامەکانی تەفسیر کاتێ لەقورئان‌و حەدیث‌و قەولی هاوەڵان، تەفسیری ئایەتێکی قورئانیان دەست نەکەوتووە گەڕاونەوە بۆ ئەقوالی گەورە پیاوانی تابیعین لەنموونەی موجاهیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمە (مەولای ئیبنو عەبباس)و عەطائی کوڕی ئەبی رەباح‌و حەسەنی بەصری‌و مەسروقی کوڕی (الأجدع)و سەعیدی کوڕی (ألمسیب) و (ألربیع)ی کوڕی ئەنەس‌و قەتادەو (الضحاك)ی کوڕی موزاحیم‌و زۆر کەسی تر لەزانا گەورەکانی تابیعین.

زانای تابیعی وا هەبووە هەموو تەفسیری قورئانی لەلای هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندوە. جاری وایش هەیە ئەو زانا تابیعیانە برێ تەفسیریان لەرێگەی ئیستینباط‌و ئیستیدلالەوە ئەنجام داوە ئەوەی لە تەفسیردا موعتەمەدو پشت پێ بەستراوە بریتییە لە نەقلی صەحیح، بۆیە ئیمام ئەحمەد فەرموویەتی سێ کتێب بێ ئەصڵ‌و بنەمان‌و

پشتیان پێ نابەسترێ (ألغازی والملاحم والتفسیر) مەبەستی بە تەفسیر لێرەدا تەفسیرێکە پشت بە ریوایاتو نەقلی صەحیح نەبەستێ.

٧- مەرجە ئەوکەسەی لەبواری تەفسیردا کاردەکا شارەزای لۆغەی عەرەبیو فروعەکانی بێ. بێگومان قورئان بەزمانی عەرەبی نازڵ بووە، تێگەییشتن لە مەعناکانی بەندە بە شەرحو راڤەی موفرەداتی ئەلفاظەکانو دەلالەت کردنیان بەگوێرەی وەضع. موجاهید دەڵێ: بۆکەسێك ئیمانی بەخوداو رۆژی دوایی هەبێ بۆی رەوانییە قسە دەربارەی کەلامی خودا (قورئان) بکا ئەگەر شارەزایی باشی لەزاراوەکانی عەرەبدا نەبێ، کەسێك لە لۆغاتی عەرەب شارەزا نەبێ نابێ دەم لە تەفسیری قورئانەوە بدا.

مەعانی کەلیمات بەپێی گۆڕانی ئیعراب دەگۆڕێ. لێرەوە هەست دەکرێ زانیاری نەحوو چەند پێویستە، زانیاری تەصریف بەهەمان ئاست پێویستە، چونکە بەهۆی ئەوەوە هەیکەلی وشە دەزانین چۆنە، کەلیمەی موبهەم بەهۆی موشتەقاتو مەصدەرەکەیەوە مەعنای رون دەبێتەوە، هەتا مەصدەرو موشتەقاتی کەلیمە نەزانی، ناتوانی تایبەتمەندی پێکهاتەی کەلام لەڕوی مەعناوە بزانی.

لەڕوی دەلالەتی کەلام لەسەر مەعناو جوداوازی تێیدا لەبارەی دەلالەتکردنی بەروونی، یان بەخەفاو تەمو مژاوی، پاشان لەروی جوانی کەلامو فەصاحەتو بەلاغەتیەوەو چۆنیەتی ئاڕاستەکردنی کەلامەکە بۆ بەرامبەر، دەزانین چەند پێویستە بۆ کەسێك دەم لە تەفسیرەوە بدا شارەزایی لەهەرسێ بەشی عیلمی بەلاغەدا هەبێ، واتە: عیلمی (مەعانو بەیانو بەدیع) چونکە زانینی ئەم سێ جۆرە زانیارییە لەهەرە کەرەستە گرنگەکانی موفەسیرن. لەم روەوە پێویستە لەسەری موراعاتی ئەوشتانە بکا کە داخوازی ئیعجازن بەبێ شارەزایی لەزانستەکانی بەلاغەدا ناتوانی وەکوو

پێویست دەرکی ئیعجاز بکەی. بەزانستە بەلاغییەکان ئاستی ئیعجازی قورئان پلەکانی ئیعجاز دەزاندرێ.

٨- شارەزایی لەبنەماو ئوصولی ئەو عیلمانەی پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە؛ وەکوو عیلمی قیرائات، چونکە لەڕێی ئەم زانستەوە چۆنیەتی نوطق بەقورئان دەزاندرێ، هەندێ شێوە خوێندنەوە بەسەر هەندێکی تریدا هەڵدەبژێرێ، هەروا دەبێ شارەزای عیلمی یەکتا پەرستی بێ، بۆئەوەی ئەو ئایەتە قورئانییانەی دەربارەی زاتو صیفاتی خودا دەدوێن بەهەڵە تەئویلیان نەکاو لەراستە مەعنای خۆیان لایان نەدا. هەروا شارەزای لەعیلمی ئوصولو ئوصولی تەفسیردا هەبێ بەتایبەتی، وێڕای قوڵبوونەوە لە فەصلو بابەکانی دا: کە بەبێ ئەو جۆرە تەعەمموقو قوڵبوونەوەیە ناتوانێ مەعناکە روون بکاتەوەو مەبەستو مەرامەکە بخاتەڕو، وەکوو زانینی ئەسبابی نزولو ناسیخو مەنسوخو ئەو جۆرە شتانە.

٩- تێگەیشتنی وردو ئامانج پێك: کە رێگا بۆ موفەسسیر خۆش بکا بتوانی پاساوی مەعنایەك بەسەر مەعنایەکی تردا بدا، یان بتوانێ مانایەك دەربێنێ کە لەگەڵ دەقەکانی شەریعەتدا گونجاوبێ.

## ئادابی تەفسیر

١- نیازپاکیو مەقصەدی صەحیح.

چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ» کردەوە بە گوێرەی نیازو نیەتی خاوەنەکەی پاداشی هەیە، دەی زانستە شەرعییەکان لە هەموو شتێکی تر شیاوی ئەوەن مەبەستی خاوەنەکانیان لێیان خێرو بەرژەوەندی گشتی بێو خێرو بێرەکەی بۆ بەرژەوەندی ئیسلامو موسوڵمانان بێو لە نووسینو خوێندنو فێربوونیاندا مەبەستی دونیاییان تێدا بەرچاو نەگیرێ!

سود وەرگرتن لە عیلمو زانیاری بەروبوومی دڵسۆزیو ئیخلاصە تێیدا، بۆ ئەوەی هەنگاوەکانی جێگیر بنو خودا پشتیوانی بێ.

٢- ڕەوشتی جوان، موفەسیر وەکوو مامۆستاو تەربییە دادەر وایە، ئەدەب دادانو ئامۆژگاری مەبەستی خۆی ناپێکێ، مەگەر موئەدیبو مامۆستاکە نمونەی ئەخلاقی جوانو ڕەوشتی بەرز بێ، چونکە وا دەبێ قسەیەکی ناشیرین لە مامۆستاکەیەوە قوتابی وا لێ دەکا گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی نەگرێو لە ڕێبازی سود وەرگرتن لێی لابداو ڕێڕەوی فکرو بیروبۆچوونی بگۆڕێ.

٣- گوێ ڕادێریو پابەندبوونو تێکۆشانو کارکردن بەو زانیارییەی بڵاوی دەکاتەوە.

بێگومان عیلمو زانیاری کەسێك خۆی پابەندی بێو کاری پێ بکا پتر قبوڵ دەکرێ لەلایەن قوتابیو شاگردانیەوە لە کەسێك زانیاری بەرزی هەبێو زۆر زاناو شارەزا بێ بەڵام خۆی پابەندی زانیارییەکەی خۆی نەبێ، پەرێز پاکیو ڕەوشت بەرزی وا دەکا موفەسیرەکە چاوی لێ بکرێو ببێتە قودوەی حەسەنەو هەر زانیارییەکی دەیدا بە گوێگرەکانی لە بواری ئاییندا لێی وەردەگرنو لە دڵیاندا دەچەسپێ.

زۆرجار وادەبێ خەڵك دوور دەکەونەوەو هەڵدەسڵەمنەوە لە وەرگرتنی عیلمو زانیاری لە کەسێکی زاناو باڵادەست لە عیلمو زانستدا لەبەر ئەوەی ڕەوشتی ناشیرینەو کار بە زانیاری خۆی ناکاو قسەی هەیە بێ کردەوە.

٤- گەڕان بەدوای ڕاستیداو خاوەنی زەبتو ڕەبت و ڕەبت لە گێڕانەوەو نەقڵ کردنی دەقەکاندا، قسەیەك ناکاو شتێك نانووسێ ئیللا کە دەیڵێو دەینووسێ لە دڵنیاییو بڕوابوونەوە سەرچاوە دەگرێو هەوڵ دەدا تەصحیفو خوارو خێچی تێدا نەبێ.

٥- تـەواضـوع‌و خـۆ بەكـەمزانین‌و نـەرم‌ونیانی لـە هەڵس‌وكەوتـدا، چونكە توندڕەوی‌و خودپەسەندی‌و خۆبەزلزانی لەمپەرێكی تۆكمەن لەنێوان زاناو سودوەرگرتن لە زانیارییەكەی!

٦- نەفس بەرزی، پێویستە مرۆڤی زاناو خاوەن مەعریفە خـۆی بـەرز رابگری‌و خۆی نەخزێنێتە كاری پوچ‌و بێهودە، كاتی بـەنرخی خـۆی لـەكاری ناشایستەدا بەسەر نەبا، وریا بـێ نەكەوێتـە ژێـر كۆنترۆڵی جاهو دەسـەڵات‌و نەبێتە سواڵكەرو دەست پانكەرەوە لەبەردەم فەرمانڕەواو ساماندارانـدا، چاو لـە سـەلەفی صـاڵح بكـاو قەناعـەتی بـە بەشـی خـۆی هـەبێ‌و لـە ڕێگـای نامەشروعەوە هەڵپەی بەدەستهێنانی ماڵ‌و سامانی دونیا نەكا.

٧- حەقگۆو ڕاستگۆ بێ، لە پێناو حەقگوتن‌و حەق چەسپاندا كۆ لە هیچ نەكاتەوە، بێگومـان گـەورەترین جیهـاد گـوتنی كەلیمـەی حەقـە لـەڕوی فەرمانڕەوای ستەمكاردا.

٨- جـوان نیـشاندانی دیمـەن‌و هەیئـەتی خـۆی، پۆشـاك‌و سەروسـیمای خۆی ڕێك‌وپێك بكا، بێگومان دیمەنی ئاوا هەیبـەت‌و ویقـار دەداتـە موفەسـیر لە مەظهەری گشتی‌دا، لە دانیشتن‌و ڕۆیشتنی‌دا بەشێوەیەكی سروشتی.

٩- لەسەرخۆی‌و تێفكرین بـۆ چـوونە نـاو تەفسیر، پەلەپـەل نـەكا لـە قسە هەڵڕشتندا، بەڵكوو بـە هێواشـی دەسـت پـێ بكا بـچێتە نـاو باسـەكەوەو لەسـەرخۆ، مانـای ئایەتـەكان شـی بكاتـەوە، بـە زمـانێكی ڕەوان وشـەكان دەربڕێ‌و مەخرەجی حەرفەكان بەرچاو بگرێ.

١٠- هـەتا لـەخۆی زانـاتر لـەبواری تەفـسیردا ئامـادە بـێ، ئـەو دەسـت پێشخەری نـەكا، بـە ئامـادەبوونی ئـەوان ئـەم دەم لـە تەفـسیرەوە نـەدا، دوای مردنیـشیان مافیـان بەرچاوبگرێ‌و ڕەهنومـایی خـەڵك بكـا بـۆ خوێندنـەوەی كتێبەكانیان.

١١- خۆئامادەکردن بۆ تەفسیر بەشێوەیەکی باش‌و تۆکمە ئەمجار پلە بەپلە بچێتە ناو باسەکەوە، وەکوو ئەوە سەرەتا ئەسبابی نزول باس بکا، ئەمجار مانای کەلیمات‌و شەرحی ڕستەو تەرکیب بکا، لایەنی بەلاغەی کەلامەکان پەیڕەو بکا، بۆ ڕونکردنەوەی مانای ئایەتەکە پەنا بەرێ بۆ هەندێ ئیعراب بەگوێرەی پێویست، ئەمجار بێتە سەر مانای گشتی ئایەتەکەو پەیوەستی بکا بە ژیانی کۆمەڵگای سەردەمی خۆیەوە، پاشان ئەحکامی ئایەتەکە دەربێنێ.

ئەوەشی لەبیر نەچێ موناسەبەو ڕەبتی نێوان ئایەتەکان ڕون بکاتەوە، هەروا موناسەبەی نێوان سورەتەکانیش بەگوێرەی پێویست دیاری بکا.

## سەرهەڵدانی تەفسیرو گەشەکردنی‌و بەرەو پێشەوە چوونی

سوننەتی خودای بالآدەست وا جاری بووە بۆ هەر گەل‌و نەتەوەیەك بە زمانی خۆیان پێغەمبەریان بۆ بنێرێ، بۆ ئەوەی بە باشی لە پەیامەکەی بگەن‌و لە ئاخاوتنی حالی بن ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ............ – إبراهيم/٤﴾ هەروەها سوننەتی خودا واهاتووە ئەو نامە ئاسمانییەی بۆسەر پێغەمبەرەکەی نازڵ کردووە بە زمانی پێغەمبەرو نەتەوەکەی بێ.

جا ئەگەر زمانی حەزرەتی موحەممەد (درووودی خودای لەسەر بێ) عەرەبی بێ، ئەوە بێگومان ئەو نامە ئاسمانییەی بۆی نازلکراوە بە زمانی عەرەبی بووەو قورئان بۆخۆی بەڕونی ئەم ڕاستیەی ڕاگەیاندووە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنْ الْمُنذِرِينَ ، بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ – الشعراء/١٩٢ – ١٩٥﴾.

وشـەو جوملـەكانی قورئـان بـە زمـانی عـەرەبین، وجوهـو شـێوازی مەعناكانی قورئان وجوهو شێوازی ئاخاوتنی وەكوو ئـەو ئاخاوتنـە وایـە: كـە عـەرەب بـەكاریان هێنـاوە، جـا ئەگـەر چـەند وشـەیەكی كـەمی تێـدا هـەبن بیروبۆچوونی زانایان بەرامبەریان جوداواز بـن لـەوەدا ئـاخۆ لـە لوغـەتی تـر وەرگیراون‌و كراون بـە عـەرەبی، یـان عـەرەبی نـەژادن‌و لـە لۆغـاتی نەتـەوەی تریشدا بەكارهێندراون؟ بێگومان هـەبوونی ئـەم دیاردەیـە ئەوەنـدە كاریگـەر نیـە قورئـان لـەوە دەربهـاوێ كـە عـەرەبی بـێ، قورئـان بـە هـەبوونی چـەند وشەیەكی ناعەرەبی لە عەرەبییەتی خۆی ناشۆرێ.

ئەوەی زانایان لەسەری یەكدەنگن ئەوەیە: ئەوانە چەند كەلیمەیەكن لە واقیعدا عەرەبین‌و لە زمانی نەتەوەی تریشدا بەكارهێنراون، واتـە: چـەند وشەیەكن هاوبەشن لەنێوان زمـانی عـەرەبی‌و زمـانی نەتـەوەكانی تـردا، ئـەم رایە لەلایەن زانا گەورەكانی تەفسیر پەسـەند كـراوە، ئـەوەتا ئیبنـو جـەریری طـەبـەری گـەورە موفەسـیری قورئـان ئامـاژە بـەم رایـە دەكـاو دەڵـێ: وشـەی (كفلین) لە ئایەتی ﴿يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ – الحديد/٢٨﴾ بە مانا (ضعفان من الأجر) دێ لە زمـانی حەبەشـەدا، ئایـەتی ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ – المزمل/٦﴾ گوتراوە بە زمانی حەبەشە ئەگەر مرۆڤ شەو هەڵسا دەگوترێ: (نشأ الرجل) پیاوەكە شەو لە خەو هەڵسا ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي – سبأ/١٠﴾ وشـەی (أوبی) بـە زمانی حەبەشە بە مانـا (سـبحی)یـە، واتـە: ئـەی كێوەكـان تەسـبیحات بكـەن، ئایەتی ﴿فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ – المدثر/٥١﴾ وشەی (قسورة) بە زمـانی حەبەشـە بە مانا شێر دێ، ئایـەتی ﴿حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ – هود/٨٢﴾ ﴿حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ – الحجر/٧٤﴾ گـوتراوە وشـەی (سـجیل) وشـەیەكی فارسـییەو عـەرەب كردوویانە بە عەرەبی‌و لە زمانی خۆیاندا بەكاریان هێناوە.

طـەبـەری ئـەم نمونانـەی بـە ڕیوایـەت هێنـاون، پاشـان ئـەوەی ڕونكردۆتەوە: كە هیچ كـەس نـەیگوتووە ئـەم وشانەو نمونـەیان عـەرەب لـە

زمانی خۆیاندا بەکاریان نەهێناون، بەڵکوو هەر ئەوەیان گوتووە ئەم وشەیە بە زمانی حەبەشە ئەو مەعنایە دەگەیەنێ، ئەم وشەیە بە زمانی عەجەمی ئەو مەعنایەی هەیە، ئەوەش ئاشکرایە: کە برێ لەفظ زۆر زمانی جیاجیا تێیاندا هاوبەشن‌و بەکاریان هێناون وەکوو (درهم، دینار، الدواة، القلم، القرطاس) ئەمانە لە زۆر لوغەتدا بەکارهێنراون، هیچ بەڵگەیەکیش نیە لەفظێك لەو نمونانە بکاتە ملکی لوغەتێك‌و لەوەوە گوازرابێتەوە بۆ لوغەتێکی تر!!

هیچ کام لەو دوو جینسە لەپێشتر نیە بۆ ئەوەی ببێتە بنەماو ئەصڵ بۆ ئەو لەفظەو لەوێوە نەقڵ کرابێ بۆ لوغەتەکەی تر، هەرکەسێ ئیدیعای شتی وا بکا دەعوای بێ دەلیلەو لەخۆیەوە دەیڵێ.

## تەفسیر لەسەردەمی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)و هاوەڵانی‌دا

پەروەردگار بۆخۆی بەرعودەی ئەوە بووە بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە قورئانی بۆ بەیان بکاو بۆیشی بپارێزێ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ – القيامة/١٧ – ١٩﴾ لەسەر ئەم ئەساس‌و بنەمایە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بەکورتی‌و بەدرێژی لە قورئان حاڵی بووەو بە تەواوی تێی گەیشتووە، ئەرکی سەرشانیشی بووە بۆ هاوەڵانی رون بکاتەوە تێیان بگەیەنێ ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ – النحل/٤٤﴾.

هاوەڵانیش تا ئەندازەیەك لە قورئان حاڵی دەبوون‌و لە مەبەستەکانی دەگەییشتن، چونکە بەزاراوەو زوبانی ئەوان نازڵ بوو بوون، هەرچەندە لە وردیات‌و نهێنییەکانی نەدەگەییشتن! ئیبنو خەلدون لە مقدمەکەی‌دا دەڵێ: بێگومان قورئان بە لۆغەتی عەرەب نازڵ بووە، بە

ئوسلوبو شێوازی بەلاغەتی ئەوان راگەیەندراوە، هەموویان تێی دەگەییشتن، لە مەعناکانی حاڵی دەبوونو موفرەداتو تەرکیبی شارەزابوون. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا جوداوازییان هەبوو لە تێگەییشتن لێی، هەیانبوو وەکوو یەکێکی تریان لە مەعناکانی حاڵی نەدەبوو، ئەو شارەزاییو تێگەییشتنەی ئەمیان هەیبوو، ئەویان نەیبوو. ئەوەتا ئەبو عوبەیدە لەکتێبی (ألفضائل)دا لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب لەسەر مینبەر ئایەتی (وفاكهة وأبًا)ی خوێندەوە، دوایی وتی: دەزانین (فاكهة) چیەو ماناکەی ئاشکرایە، بەڵام ئاخۆ مەبەستی بە (أبًا) چی بێ؟ پاشان هەندێ بەخۆیدا چووەوەو بیری کردەوە فەرمووی: (ان هذا لهو التكلف يا عمر).[1] هەر ئەبو عوبەیدە لە طەریقی موجاهیدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: کە فەرموویەتی: من نەمدەزانی مانای (فاطر السموات والأرض) چیە؟ هەتا ڕۆژێك دوو عەرەبی دەشتەکی هاتنە لام دەربارەی بیرێکی ئاو کێشەیان هەبوو، یەکیان وتی: (أنا فطرتها، يقول أنا ابتدأتها) واتە: من لەنەبووەوە بیرەکەم هەڵکەندوەو سازاندومە ئاوی لێ دەربهێندرێ.

بۆیە ئیبنو قوتەیبە وتوویەتی: عەرەب هەموویان لەیەك ئاستدا نین دەربارەی تێگەییشتن لەهەموو ئەوەی قورئان لەخۆی گرتووە لە (الغريب والمتشابه) بەڵکوو هەندێکیان باشتر لەهەندێکیان پەییان بە مەبەستو ماناکانیان بردوە.[2]

هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی خۆیان بۆ تەفسیری قورئان ئیعتیمادیان دەکردە سەر:

١- قورئان خۆی، چونکە ئەگەر لەجێگایەکدا بابەتەکەی بە موجمەلی هێنابێ، لەشوێنێکی تردا بە تەفصیلو رونکراوەیی هێناویەتی، ئایەتێك

---

[1] الاتقان ج٢/١١٣.

[2] التفسير والمفسرون ج١/٣٦.

حوكمێكی موطلەق‌و رەها، یان عام‌و گشتگیری هێناوە، پاشان ئایەتێكی تر نازڵ كراوە حوكمە موطلەقەكەی سنوردار، یان تایبەت كردوە، ئەم حاڵەتانە ئەوەن كە پێیان دەگوترێ تەفسیری قورئان بە قورئان. بۆ ئەم حاڵەتە نموونەی زۆر هەن، چیرۆكەكانی قورئان بەشێوەیەكی گشتی لەهەندێ جێگادا بەكورتی هاتون‌و لەهەندێ جێگای تردا بەدورو درێژی. هەروەها ئایەتی ﴿أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ – المائدة/١﴾. ئایەتی ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ الْمَيْتَةُ – المائدة/٣﴾. هەروەها ئایەتی ﴿لا تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ – الأنعام/١٠٣﴾. ئایەتی ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ – القيامة/٢٣﴾ تەفسیری كردۆتەوە.

٢- تەفسیركردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بێگومان حەزرەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕونكەرەوەی قورئانە، هاوەڵان هەمیشە دەگەڕانەوە بۆ تەفسیری ئەو، هەركە تێگەیشتن لە ئایەتێكیان لێ دەبوو بە ئیشكال دەچوونە خزمەتی بۆ شیكردنەوەی‌و زانینی مەبەست‌و مانای دروستی.

لە ئیبنو مەسعودەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت كراوە دەڵێ: كە ئایەتی ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ – الأنعام/٨٢﴾ نازڵ بوو هاوەڵان بەلایانەوە قورس بوو چوونە خزمەتی‌و عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! كێمان هەیە ستەم لە خۆی نەكاو توشی تاوانكردن نەبێ. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموون: وشەی (ظلم) ئەو مەعنایە ناگەیەنێ كە ئێوە لێی تێگەیشتوون، وشەی (ظلم) لە ئایەتەكەدا بە مانا هاوەڵدانانە بۆ خودا، ئەی ئەوەنیە بەندەی راستاڵی خودا: كە ئامۆژگاری كوڕەكەی كرد وتی ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ – لقمان/١٣﴾.

هەروەها وابووە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی پێویستدا بە ویستی خۆی مەعنای هەندێ ئایەتی بۆ رون كردونەوە؛ لە

عوقبەی کوڕی عامیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر مینبەر: کە ئایەتی ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ – الأنفال/٦٠﴾ی خوێندەوە فەرمووی: «أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ».[1] بزانن مەبەست بە (قوة) ڕاهێنانو تیربازیو تەدریب کردنە.

لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْكَوْثَرُ نَهْرٌ أَعْطَانِيهِ اللَّهُ فِي الْجَنَّةِ».[2] کەوثەر چۆمێکە لە بەهەشتدا خودا پێی بەخشیوم.

بێگومان کتێبەکانی سوننەت هەریەکەیان بەشێکی کتێبەکەیان تەرخان کردووە بۆ تەفسیرکردنی قورئان بە مەئثور واتە: بەو حەدیثانەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتکراون دەربارەی تەفسیر، خودا بۆخۆی فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلاَّ لِتُبَيِّنَ لَهُمْ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ – النحل/٦٤﴾.

هەندێ ئایەتی قورئان هەن بەبێ ڕونکردنەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەعناکەی نازاندرێ، وەکوو شیکردنەوەی جۆری فەرمانو نەهیەکانی قورئانو ئەندازەی ئەوەی خودا لەسەری فەرزکردوینو لە ئەحکامو واجبات، ئەم ڕونکردنەوە تەفسیرانە مەبەستی پێغەمبەرن (دروودی خودای لەسەر بێ): کە دەفەرموێ: «أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ».

٣- تێگەیشتنو هەوڵدانی هاوەڵان خۆیان لە قورئان.

هاوەڵان هەرکاتێك لە قورئاندا تەفسیری ئایەتێکیان وەگیر نەکەوتبێو لە سوننەتی پێغەمبەریشدا هیچیان دەست نەکەوتبێ هەوڵو

---

[1] أخرجه مسلم وغيره.

[2] أخرجه أحمد ومسلم.

كۆششی خۆیان خستۆتە گەڕ بۆ ئەوەی بتوانن لە ڕوانگەی تێگەیشتنی خۆیانەوە تەفسیری ئایەتەکە بکەن، بێگومان هاوەڵان عەرەبی رەسەن‌و خالیصن، زۆرباش عەرەبییان زانیوە، بەجوانی تێی گەیشتوون‌و شارەزای وجوهو شێوازەکانی بەلاغەی زمانی زگماکی خۆیان بوون، بە باشی لە ئیشارات‌و دەلالەتی لۆغەتی خۆیان حاڵی بوون.

کۆمەڵێك لە هاوەڵان لەبواری تەفسیردا ناوبانگیان هەبووەو تێیدا قوڵبوونەوە، لەوانە چوار خولەفای راشیدین، ئیبنو مەسعود، ئیبنو عەبباس، ئوبەی کوڕی کەعب، زەیدی کوڕی ثابیت، ئەبو موسای (الأشعری) عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، خاتو عائیشە (رەزای خودایان لێ بێ).

هەڵبەتە هەموویان لە یەك ئاستدا نەبوون، کەم تا زۆر جوداوازییان هەبووە، لە تەفسیرەکاندا ڕیوایاتی جۆراوجۆر هەن پاڵ ئەم هاوەڵانەو غەیری ئەوان دراوە، لە زۆر شوێنی جیاجیای تەفسیرەکانی قورئاندا بە تایبەتی ئەوانەیان: کە تەفسیر (بالمأثور)ن ڕیوایەتی جۆراوجۆر لە هاوەڵانەوە ڕیوایەتکراون: کە لەڕوی سەنەدەوە صەحیح‌و زەعیفیان تێدایە.

ئاشکرایە تەفسیر بە مەئثور لە هاوەڵانەوە نرخی تایبەتی خۆی هەیە، جەماوەری زانایان پێیان وایە تەفسیری صەحابی حوکمی حەدیثی مەرفوعی هەیە، ئەگەر تەفسیرەکەی لەو جۆرانە بوو پەیوەندی بە ئەسبابی نزولەوە هەبوو، هەروا هەرشتێك مەجالی ئەوەی تێدا نەبوو بخرێتە بواری رەئیو بۆچوونەوە، ئەگەر لەوشتانە بوو مەجالی رەئیی تێدا هەبوو، ئەوە حوکمی حەدیثی مەوقوفی هەیە، بەمەرجێ تەفسیرەکە پاڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەدا.

حەدیثی مەوقوف لەسەر صەحابی لەبواری تەفسیردا گرنگی خۆی هەیەو هەندێ لە زانایان بە پێویستیان زانیوە وەربگیرێ، چونکە هاوەڵان

ئەهلی لوغەو زمانی عەرەبین، شایەتی حاڵو قەرائینـەکان بـوون: کـە ڕویـان داوەو ئایەتەکە دەربارەیان نازڵ بووە، ئەو حاڵو قەرینانە تایبـەت بـوون بـە ئەوانەوە، هەروەها تێگەیشتنی صەحیحو دروستیان هەبووە بۆ قورئان.

ئیمـامی زەرکەشـی لـە کتێبـی (البرهـان)دا دەڵـێ: پێویـستە بزانـدرێ قورئـان دوو بەشـە، بەشـێکی لـە ڕێگـەی نـەقڵو ڕیوایەتـەوە تەفـسیر کـراوە، بەشەکەی تری تەفسیر نەکراوە.

بەشـی یەکـەم تەفـسیرەکەی، یـان لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسەر بێ) هاتووە، یان لە هاوەڵانییەوە، یان لە گەورە زاناکانی تابیعینەوە.

یەکــەمیان: کــە لــە پێغەمبــەرەوە (دروودی خــودای لەســەر بــێ) ڕیوایەتکراوە، ئەوە لێکۆڵینەوە لە ڕشتەو سەنەدەکەیدا دەکرێ.

دووەمیان: کە لە هـاوەڵانو تابیعینـەوە ئـەنجام درابـێ، لـە تەفـسیری صەحابییەکە ورد دەبینەوە، ئەگەر لەڕوی لوغەتو زمانەوانییەوە تەفسیری کردبووو، ئەوە ئەوانـە ئـەهلی لوغـەتنو بـەبێ سێو دوو لێکـردن پـشتی پـێ دەبەستین، یان لە ئەوەوە تەفسیری کردبوو: کـە شـایەتی هۆکـاری نـازڵبوونو حـاڵو قەرینــەی نازڵبوونەکــە بــووە، دووبــارە پــشتی پــێ دەبەســترێو تەفسیرەکەیمان قبووڵە.[1]

ئیبنو کەثیر لـە پێشەکی تەفـسیرەکەیدا دەڵـێ: ......... جـا ئەوکاتـە ئەگەر لە قورئاندا، یان لە فـەرموودەی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بێ) تەفسیری ئایەتەکەمان وەگیر نەکەوت دەگەڕێینەوە بۆ ئەقوالی هـاوەڵان، چونکە گومان لەوەدا نیە ئـەوان لـە کەسـانی دی شـارەزاترن بـە مەعناکـەی، بـەهۆی ئـەوەی شـایەتی ئـەو حـاڵاتو قەرینانــە بـوون: کـە هـەر بـۆ ئـەوان ڕەخساوە دەربارەی ئایەتەکە، زیاد لەوەش ئەوان خاوەنی تێگەیشتنی تـەواوو زانیاری صەحیحو کرداری باش بوون، بە تایبەتی گەورە هاوەڵانو زاناکانیـان

---

[1] الإتقان ج٢/١٨٣.

وەکوو خەلیفە راشیدینەکانو ئیمامە موجتەهیدەکانیان: کە هیدایەتدراوو هیدایەتدەر بوون، هەروەها زانای پایەبەرزیان لە نموونەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خودا لە هەموویان ڕازی بێ.

هەڵبەتە لە عەصری هاوەڵاندا هیچ شتێك لەبواری تەفسیردا نەنووسراوەتەوە، بەڵکوو تەدوینو نووسینەوە بەشێوەی بەرچاو لە چەرخی دووەمی کۆچیدا دەستی پێکرا، تەدوینی تەفسیر فەرعو لقی تەدوینی فەرمووده بوو، بەڵام دووبارە بەشێوەیەکی مونەظەمو ڕێكوپێكو گشتگیر نەبوو، بەڵکوو ناوە ناوە تەفسیر بۆ هەندێ ئایەت ڕیوایەتکراون بەبێ تەرتیبو ڕیزبەندی بۆ ئایەتو سوورەتەکانی قورئانو تەفسیرکردنەکەشیان هەموو قورئانی نەگرتۆتەوە.

## تەفسیر لەسەردەمی تابیعیندا

جاوەکوو بڕێ لە گەورە هاوەڵان لەبواری تەفسیردا ناوبانگیان پەیدا کردووە، بڕێ لە گەورە تابیعین لەبواری تەفسیردا ناوو شۆرەتیان بڵاو بۆتەوە، هەڵبەتە تابیعین لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) تەفسیریان وەرگرتووەو بە قوتابی ئەوان دەژمێردرێن، هەروەها پشتیان بەو سەرچاوانە بەستووە: کە لە سەردەمی پێش خۆیانەوە بۆیان ماوەتەوەو پێیان گەیشتووە وێڕای زانیاری خۆیان: کە لە ئاکامی ئیجتیهادو تێفکرین بۆیان دەستەبەر بوبوو.

مامۆستا محمد حسین الذهبی، دەڵێ: بێگومان ئەو موفەسیرانە بۆ تێگەیشتن لە قورئانو تەفسیرکردنی پشتیان بە تێگەیشتنی خۆیان لە خودی قورئانو تەفسیری ئەم ئایەت بۆ ئەو ئایەت بەستووە، هەروەها پشتیان بەو ڕیوایەتانە بەستووە: کە هاوەڵان لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتیان کردووە، هەرروەها لەو ئەقوالو تەفسیرانەی هاوەڵان خۆیان

بۆ قورئانیان کردووەو ئەمان لێیانەوە ڕیوایەتکردون هەروەها لەو تەفسیرو ڕیوایەتانەی ئەهلی کیتاب لە کتێبەکانیاندا چەسپاندویانن، ئەمانەو وێڕای ئەو زانیاری‌و مەعلوماتەی خودا دەرگای لەسەر کردبوونەوە لەڕێگەی ئیجتیهادو تێفکرین لە نامەی خودادا.

بێگومان کتێبەکانی تەفسیر زۆرێك لە ئەقوال‌و رەئیی تابیعینیان بۆ ڕیوایەت کردوین کە لە بواری تەفسیردا بە رەئیی‌و ئیجتیهادی خۆیان وتویانەو نەیانگەیاندۆتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، یان بە یەکێ لە هاوەڵانی ڕێزداری.

لەوەپێشیش وتمان: ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتکراوە لەبواری تەفسیری قورئاندا، یان لە هاوەڵانییەوە ڕیوایەتکراوە، تەفسیری هەموو ئایەتەکانی قورئانی نەگرتۆتەوە، بەڵکوو تەفسیرەکەیان شمولی ئەو ئایەتانەی کردووە: کە خەڵکانی سەردەمیان بە زەحمەت لێیان حاڵی بوون، ئەمجار تا ڕۆژگاریان لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوور کەوتبێتەوە ئایەتە مەعنا نەزانراوەکان پتر بوون، هەتا خەڵکی لە عەصری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و هاوەڵان دوور کەوتبنەوە ئایەتی مەعنا غامیض‌و نارون‌و نائاشکرا، پتر بوون‌و ئەوانەی خەریکی تەفسیر بوون زیاتر پێویستیان بەوە بووە ئەم کەم‌وکوڕیانە پڕ بکەنەوە، بە ئەندازەی زیادبوونی غموض لە ئایەتەکانی قورئان ئەوانیش تەفسیریان فراوان کردووە.

ئەمجار چینی دوا ئەوان هاتن، پەرەیان بە تەفسیردا تا پلە بەپلەو قۆناغ بەقۆناغ تەفسیریان تەواوکرد، ئەم موفەسسیرانە پشتیان بەزانیاری خۆیان بەستبوو لەبواری لوغەی عەرەبی‌و شێوە قسەو ئاخاوتنیان لە تەعبیرو گفت‌وگۆیاندا، هەروەها پشتیان بەو ڕوداوانە بەستبوو کە لە ڕۆژگاری نازڵبوونی قورئاندا ڕویان دابوو لەلای ئەمان ببونە ڕوداوی واقیع‌و

چەسپاو، گەلێ شتی تریش لە ئەسبابی تێگەیشتن و هۆکاری بەحث و لێکۆڵینەوە.[1]

بێگومان فتوحاتی ئیسلامی بەرفراوان بوو، بەهەموو لایەك پەلی هاویشت، زۆرێك لە زانا گەورەکانی هاوەڵان لە مەدینەوە گواستیانەوە بۆ ئەو دەڤەرو شارو وڵاتانەی لەسەردەستی جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام ڕزگار کرابوون، هەریەکێ لەم گەورە هاوەڵانە تەفسیرو زانیاری خۆی هەبوو بۆ ئایەتەکانی قورئان، هەریەکەیان قوتابی و شاگردی لێ بوونەوەو کەوتنە ماناکردنی قورئان بۆ قوتابییەکانی و تەفسیری ئەو ئایەتانەی پێویستیان بە تەفسیر بوو، لەسەر دەستی ئەوان کۆمەڵانی قوتابی لە تابیعین فێری تەفسیر بوون، لە ئاکامی ئەم واقیعەدا بەشێوەیەکی سروشتی قوتابخانەی جیاجیا لە تەفسیردا سەریان هەڵداو جێگیر بوون.

لە مەککەدا قوتابخانەی ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) دروستبوو کۆمەڵێك قوتابی تێدا گردبوونەوە سەرگەرمی وەرگرتنی زانیاری تەفسیر بوون لە خزمەت ئیبنو عەبباسدا، کۆمەڵێك لە قوتابییەکانی لە مەککەدا ناوبانگیان دەرکرد، لەوانە سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عیکریمە (مەولای ئیبنو عەبباس) هەروەها طاوسی کوڕی کەیسانی الیمانی و عەطائی کوڕی ئەبی رەباح، ئەمانە هەموویان لە مەوالی بوون، ئەمانە لەڕوی ڕیوایەتکردن لە ئیبنو عەبباسەوە جوداوازییان هەیە لەوەدا هەیانە زۆری ڕیوایەت هەن و هەیانە کەم، لەلایەکی ترەوە زانایان راجیاییان هەیە لە ئەندازەی متمانەکردن بە ڕیوایەتەکانیان و پەنا بردن بۆیان، ئەوەی دەربارەی، شتی گرنگ ڕیوایەتکرابێ، عیکریمەیە، زانایان ئیختیلافیان هەیە لە پشت بەستن بە ڕیوایەتەکانی، هەرچەندە هەموو

---

[1] التفسير والمفسرون ج١/٩٩ — ١٠٠.

شایەتی ئەوەی بۆ دەدەن: کە یەکێکە لەوانەی خاوەنی زانیاریو فەضلو ڕێـز بووە.

لە مەدینەشدا ئوبەی کوڕی کەعب لەبواری تەفسیردا لە کەسانی تـر پـتر ناوبـانگی دەرکـردو زۆر ڕیوایـەتی لـەم بـوارەدا لێـوە ڕێوایـەتکراوە، لـە قوتابییەکانی لەوانەی تابیعی بوون ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ زانیارییان لێ وەرگرتووە، زەیدی کوڕی ئەسلەمو ئەبولعالیـەو موحەممەدی کوڕی کـەعبی (القرظی) بوون.

لە عێراقیشدا قوتابخانەی ئیبنو مەسعود دروستبوو: کە زانایـان ئـەم قوتابخانە بە بنەماو (نواة)ی قوتابخانەی عەقڵو ڕەئی دادەنێنو زۆرێـك لـە ئەهلی عێراق لە چینی تابیعین لەبواری تەفـسیردا خۆیـان خـەریك کـردووەو تەمەنی خۆیانیان تێدا صەرف کـردووە، کۆمـەڵێکیان ناوبانگیـان دەرکـردووە، لەوانە عەلقەمەی کوڕی قەیس، مەسروق، الأسودی کوڕی زەید، مرّة الهمذانی، عامر الشعبی، الحسن البصری، أبو العالیة، قتادە بن الدعامە السدوسی.

ئەم زاتانە ئاماژەمان بۆ کردن، موفەسسیرە بەناوبانگەکانن لـە چینی تابیعینو لە گەورە شارەکانی جیهـانی ئیـسلامی ئـەو سـەردەمەدا سـەرگەرمی فێرکــردنو بڵاوکردنــەوەی تەفــسیری قورئــان بــوون، ئــەمانیش کۆمــەڵێك قوتابییـان لێ کۆببوونـەوەو لـە خزمەتیانـدا سـەرگەرمی خوێنـدنی تەفـسیر بـوون، بەمانـە دەگوترێ: ئـەتباعی تـابیعین، ئـەمانیش تەمـەنی خۆیـان لـەم بوارەدا بەسەر برد، ئەمانە توراثو کەلەپورێکی پیرۆزو نـەمریان بـۆ بـەجێ هێـشتووینو زانایـانی دوا ئـەوان چـین دوا چـین قـەرزداری ئـەم پیـاوە گەورانەی ئیسلامنو خودا پاداشی بەخێریان بداتەوە.

ئـەمجار زانایـانی ئیـسلام ڕاجیاییـان هەیـە لـەوەدا ئـاخۆ تەفـسیری تابیعین لـە شـتێکدا نەیگێڕنـەوە بۆسـەر پێغەمبـەر (درووردی خـودای لەسـەر

بێ) یان بۆ سەر هاوەڵان ئایا تەفسیریان وەردەگیرێ، یان هەندێ جار ئەقوالیان رەتدەکرێتەوە؟

کۆمەڵێك لە زانایان پێیان وایە هەموو تەفسیرێکیان لێ وەرناگیر، چونکە ئەوان وەکوو هاوەڵان شایەتی قەرائین ئەحوالو ئەو بارودۆخە نەبوون: کە قورئانی تێدا نازڵ بووە، کەوابێ دروستەو وێدەچێ کەوتبنە هەڵەوەو مەبەستەکەیان نەپێکابێ.

زۆربەی موفەسسیرینی دوا خۆیان، پێیان وایە تەفسیریان وەردەگیرێو مەقبولە، چونکە ئەوان ئەو مەعنای تەفسیرەی کردوویانە لە هاوەڵان وەریان گرتووەو هیچ کاتێ لە خۆیانەوە شتیان نەگوتووە.

رەئی راجیحو پەسەند ئەوەیە ئەگەر زاناکانی تابیعین لەسەر شتێك یەکدەنگ بوون، ئەوە لەسەر ئێمە پێویستە وەری بگرینو لەو تەفسیرە لانەدەین بۆ تەفسیرێکی تر.

ئیبنو تەیمییە دەڵێ: شوعبەی کوڕی ألحجاجو هی تریش وتوویانە: ئەقوالی تابیعین لە فروعیاتدا حوججەو بەڵگە نیە، دەی چۆن لە تەفسیردا دەبێتە حوججە؟؟ مەبەستی ئەوەیە ئەقوالی تابیعین نابێتە بەڵگە لەسەر غەیری خۆیان لەوانەی رای پێچەوانەی ئەوانیان هەیە، ئەمە ڕاستە، وەلێ ئەگەر ئەوان لەسەر شتێك یەکدەنگ بوون، ئەوە گومان لەوەدا نیە: کە دەبێتە بەڵگە، ئەگەر راجیاییان تێدا بوو ئەوە قەولی هەندێکیان نابێتە بەڵگە لە هەندێکی تریان، هەروەکوو چۆن نابێتە بەڵگە بەسەر ئەوانەی دوا چینی خۆیان دێن، بەڵکوو دەبێ بگەڕێینەوە لوغەتی قورئان خۆی، یان فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)، یان عومومی لوغەی عەرەب، یان ئەقوالی هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ).[1]

---

[1] مقدمة إبن تيمية فى اصول التفسير ص٣٠٨ بشرح عثيمين.

## تەفسیر لەسەردەمەكانی تەدویندا

نووسینەوەی زانستەكان لە ئاخرو ئۆخری سەردەمی ئەمەوییەكانو سەرەتای خەلافەی عەباسییەكان سەری هەڵدا، پشكی گەورە لەم بوارەدا بەر فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەوت، نووسینەوەی فەرمووده بەسەر چەند (باب)ی جۆراوجۆردا دابەش كرا، (باب)ێك لەو بابو سەرەباسانەی كتێبەكانی سوننەتی بەسەردا دابەشكرا باسی تەفسیری قورئان بوو.

كەوابێ لەم سەرەتای تەدوینەدا كتێبی تایبەتیو سەربەخۆ لە تەفسیردا نەنووسران، قورئان بە تەرتیبو سەرلەبەر، ئایەت ئایەتو سوورەت سورەت لەسەرتاوە بۆ كۆتایی تەفسیر نەكرا.

ئیتر لەم ڕۆژگارانەدا ئاستی گرنگی پێدانی كۆمەڵێك لە زانایان بەر ڕیوایەتی تەفسیری ڕیوایەتكراو لەخودی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، یان لە هاوەڵانەوە، یان لە تابیعینەوە، پەرەی سەندو هەڵكشا، ئەمە وێڕای گرنگی پێدانی ئەو كۆمەڵە زانایە بە كۆكردنەوەی حەدیثو تەدوین كردنی، ئەوانەی پێشەنگی ئەم كۆمەڵە بوون: یەزیدی كوڕی هارون السلمی كۆچكردوی ساڵی/١١٧ی كۆچی، شوعبەی كوڕی الحجاج كۆچكردوی ساڵی،١٦٠ی كۆچی، وەكیعی كوڕی الجراح كۆچكردوی ساڵی/١٩٧ی كۆچی، سەفیانی كوڕی عویەینە كۆچكردوی ساڵی/١٩٨ی كۆچی، روح بن عباده البصری كۆچكردوی ساڵی/٢٠٥ی كۆچی، عبدالرزاق بن همام كۆچكردوی ساڵی/٢١١ی كۆچی، آدم بن أیاس كۆچكردوی ساڵی/٢٢٠ی كۆچی، عبد بن حمید كۆچكردوی ساڵی/٢٤٩ی كۆچی بوون.

بە نووسراویو كتێبی سەربەخۆ، تەفسیری ئەم زاتانەمان پێ نەگەیشتووە، بەڵكوو ئەوەی پاڵ ئەوان دراوە لە تەفسیری (بالمأثور)دا بەئێمە گەیشتووە: كە لەلایەن زانایانەوە لەدوا ئەوان داندراون.

هەڵبەتە لەدوا ئەوانە کەسانێك هاتنە گۆڕەپانی بواری تەفسیرەوە: کە بەبێ ئەوەی تەفسیر بکەنە (باب)ێك لە بابەکانی کتێبەکانی فەرموودە، بەڵکوو بە تایبەتی کتێبیان تێدا داناون‌و کردیانە عیلمێکی سەربەخۆو لە حەدیثیان جیاکردەوە، تەفسیری قورئانیان بەشێوەی تەرتیبی موصحەف ئەنجامدا، لەسەرتاوە بۆ کۆتایی قورئانیان تەفسیر کرد، یەکێ لەئەمانە: ئیبنو ماجە کۆچکردوی ساڵی/٢٧٣ی کۆچی، ئیبنو جەریری الطبری کۆچکردوی ساڵی،٣١٠ی کۆچی، ئەبو بەکری کوڕی المنذر النیسابوری کۆچکردوی ساڵی/٣١٨ی کۆچی، ئیبنو ئەبی حاتەم کۆچکردوی ساڵی/٣٢٧ی کۆچی، الحاکم کۆچکردوی ساڵی/٤٠٥ی کۆچی، ئەبو بەکری کوڕی مەردەویهی کۆچکردوی ساڵی/٤١٠ی کۆچی.

تەفسیری هەموو ئەم زاتانە بەشێوەی ئیسناد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، یان بۆ سەر هاوەڵان، یان بۆ سەر تابیعین‌و ئەتباعی تابیعین ڕیوایەتکراون، هەندێ جار لەگەڵ ئیسنادەکە ئەگەر ڕاوبۆچونی جیاجیا هەبن، تەرجیحی ڕەئیەکیان بەسەر ڕەئیەکی تردا داوە، وێڕای دەرهێنانی بڕێ ئەحکام‌و دیاریکردنی ئیعراب لەکاتی پێویستدا.

ئەم دیاردە بە زەقی لە تەفسیری ئیبنو جەریری تەبەریدا دەبیندرێ ئەمجار دوا ئەوان کۆمەڵێك موفەسسیر هاتن، ئەمانیش لە چوارچێوەی تەفسیر بالمأثوردا تەفسیریان نووسین، بەڵام ئەوان ڕشتەو ئیسنادەکانیان کورتکردنەوە، ئەقوال‌و ئارای جۆراوجۆریان خزاندە ناو تەفسیرەکانیانەوە بەبێ ئەوەی ئەقوال‌و ڕەئیەکان پاڵ بێژەرەکانیان بدەن، بەمەش تێکەڵی‌و پێکەڵی لە ڕەئیەکاندا دروست بوو، ڕای ڕاست‌و ناڕاست لێك هەڵنەهاوێراو جۆرە چەواشەکاری‌و تەم‌و مژێك هاتە کایەوە!!

ئیتر لەوەدوا زانستەکان بە گشتی‌و عولومی ئیسلامی بە تایبەتی بەرفراوانبوون‌و گەشەکردنیان بەخۆوە بینی‌و تەدوین کران، لق‌و پۆپیان لێ

بـۆوە، ئیختیلافـاتو رای جیـاواز هاتنــە کایــەوە مەســەلەی جۆراوجـۆری هەستیار لە زانستی کەلامدا وروژێندران، تەعەصوبی مەزهەبی سەری هەڵدا، زانـستەکانی فەلـسەفەی عـەقڵی تێکـەڵاوی عولـومی نـەقڵی بـوون، گرۆهـی جۆراوجۆر لەناو موسوڵمانانـدا پەیدا بوون، هەر فیرقـەو گرۆهێکی ئیـسلامی هەوڵی دەدا بیروبۆچوونەکانی خۆی بچەسپێنیو بەسەر لایەنی بەرامبەریدا زاڵـی بکـا، تـەپو تـۆزی ئـەم کێـشمە کێـشمە بـواری تەفسیریـشی گرتــەوە، موفەسـسیرەکان لـەخۆ کـەوتنو ئەسـپی خۆیـان لـەم مەیدانـەدا هـەلینگ دا، پـشتیان بـە زانیـاری تێگەیـشتنی شەخـصی خۆیـان بەسـتو هەریەکـەیان لـە ئاشێك باراشی خۆی دەهاڕیو بیروبۆچوونی جۆراوجۆریان لەناودا پەیدا بوو، کەوتنە ژێر کاریگـەری (الأصطلاحات العلميـة) زاراوە زانـستیەکانەوە، هـەروا بیروبۆچوونە مەزهەبییەکانو ئـەقافە فەلـسەفییەکانیش کاریگـەری خۆیـان هەبوو لەسەریان.

موفەسسیرەکان هەریەکە لەلای خۆیـەوە هـەوڵی دەدا ئـەو بیروبـاوەڕە جیاجیانــەو عولومــەکانی ســەردەم بخزێنێتــە نــاو تەفـسیرەکەیەوە، ئــەو موفەسـسیرەی لـەبواری عولـومی عـەقڵیدا شارەزایی هـەبووبێ، لـە نووسـینی تەفسیرەکەیدا گرنگی داوە بە ئەقوالی حوکـەماو عولـەمای کـەلامو فەلـسەفە، نموونـەی ئیمـام فـەخرەدینی رازی، ئـەوەی لـە زانـستی فیقهـدا دەسـتی بـاڵای هەبووبێ تەفسیرەکەی پڕ کردووە لە مەسائیلی فیقهیو ئارای فوقەها، وەکوو (الجصاص والقرطبي).

ئــەوەی لــە مێــژوودا شــارەزا بووبــێ، تەفـسیرەکەی هـاخنیوە لــە سەرگورشتەو ئەخبار، ئەمثالی (الثعلبي والخازن) ئەوانەی لە زانستی کەلامـدا رای جیاوازو شارەزایان هەبووە هاتوون کەلامی خودایان تـەئویل کـردووە بـە جۆرێـك لەگـەڵ مەزهەبەکـەیان بگونجـێ، وەکـوو (الرمـاني، الجبـائي، القاضي عبدالجبار، الزمحشري) لە موعتەزیلەکان.

(ملا محسن الكاشی) له شیعەی ئیمامی (الإثنا عشرية)، موفەسسیری صوفی مەشرەب هاتووه مەعنای باطنو سەیرو سەمەرەی بۆ ئایەتەکان داناوە، وەکوو ئیبنو عەرەبی: کە هاتووه بۆ زۆر ئایەت مەعانی ئیشاراتو ئەودیو دەقی داناوەو زۆرجار بە تەکەللوفو سەپاندن نەبێ لە مەبەستەکانی حاڵی نابی! چونکە ئەو بۆ زۆر ئایەت دوو مەعنا بڕیار دەدا مەعنای ظاهیرو مەعنای باطن، زۆرێکیش لە موفەسسیرە شیعە مەزهەبەکان ئەم ڕێبازەیان پەیرەو کردووە.

ئەمە وێڕای گرنگیدان بە زانستەکانی نەحوو صەرفو بەلاغە: کە موفەسسیرەکان خزاندیانە ناو تەفسیرەکانیانەوە، ئاوا بەم جۆرە کتێبەکانی تەفسیر لە دوو توێی خۆیاندا زانیاری بەنرخو بێ نرخیان تێ خزێندرا، زانیاری صاڵحو فاسید، بەسودو زیانبەخش، پێویستو ناپێویستیان لە دوو توێی خۆیاندا هەلگرتبوو، هەر موفەسسیرێك لەلای خۆیەوە شتی وای خستە ناو تەفسیری ئایاتی قورئانەوە: کە ئەوە هەڵناگرێو بەزۆرە ملیو تەکەللوف بەسەریا دەسەپێنێ بۆ سەرخستنی مەزهەبی خۆیو ڕەتدانەوەی بەرامبەر، بەمجۆرە تەفسیر ئەرکی سەرەکی خۆی: کە هیدایەتو شارەزاییکردنو زانینی ئەحکامە ئاینییەکانە لەدەستدا، بۆیە هەندێ لە زانایان لە نرخاندنی هەندێ لە تەفسیرەکان فەرموویانە (فیه کل شيئ سوى التفسير) جگە لە تەفسیری ئایەتەکانی قورئان هەموو شتێکی تری تێدایە.

بەمجۆرە تەفسیر بە ڕەئی پەرەی سەندو بەسەر جۆری تەفسیر بالمأثوردا زاڵ بوو، ئیتر لە چاخە بەشوێن یەکدا هاتووەکاندا تەفسیر بە ڕەئی قۆناغەکانی خۆی بڕیو پاشینە لە پێشینە بە کورتی، یان بە درێژی، بەشێوەی تەعلیق، یان بەبێ تەعلیق زانیارییان گواستەوە بۆ ناو تەفسیرەکانیان، هەتا وای لێ هات شێوە تەفسیری سەردەم هاتە کایەوە، ئەوەبوو هەندێ لە موفەسسیرین گرنگیان بە پێداویستی سەردەم دا، لە

(ملا محسن الكاشي) له شيعەی ئيمامی (الإثنا عشرية)، موفەسسيری صوفی مەشرەب هاتووه مەعنای باطنو سەيرو سەمەرەی بۆ ئايەتەكان داناوه، وەكوو ئيبنو عەرەبی: كە هاتووه بۆ زۆر ئايەت مەعانی ئيشاراتو ئەوديو دەقی داناوەو زۆرجار بە تەكەللوفو سەپاندن نەبێ له مەبەستەكانی حالّی نابی! چونكە ئەو بۆ زۆر ئايەت دوو مەعنا بڕيار دەدا مەعنای ظاهيرو مەعنای باطن، زۆرێكيش له موفەسسيرە شيعە مەزهەبەكان ئەم ڕێبازەيان پەيرەو كردووه.

ئەمە وێڕای گرنگيدان بە زانستەكانی نەحوو صەرفو بەلاغە: كە موفەسسيرەكان خزانديانە ناو تەفسيرەكانيانەوه، ئاوا بەم جۆرە كتێبەكانی تەفسير لە دوو توێی خۆياندا زانياری بەنرخو بێ نرخيان تێ خزێندرا، زانياری صالّحو فاسيد، بەسودو زيانبەخش، پێويستو ناپێويستيان لە دوو توێی خۆياندا هەلّگرتبوو، هەر موفەسسيرێك لەلای خۆيەوە شتی وای خستە ناو تەفسيری ئاياتی قورئانەوه: كە ئەوە هەلّناگرێو بەزۆرە ملیو تەكەللوف بەسەريا دەسەپێنێ بۆ سەرخستنی مەزهەبی خۆیو ڕەتدانەوەی بەرامبەر، بەمجۆرە تەفسير ئەركی سەرەكی خۆی: كە هيدايەتو شارەزاييكردنو زانينی ئەحكامە ئاينييەكانە لەدەستدا، بۆيە هەندێ لە زانايان لە نرخاندنی هەندێ لە تەفسيرەكان فەرموويانە (فيه كل شيئ سوى التفسير) جگە لە تەفسيری ئايەتەكانی قورئان هەموو شتێكی تری تێدايە.

بەمجۆرە تەفسير بە ڕەئی پەرەی سەندو بەسەر جۆری تەفسير بالمأثوردا زالّ بوو، ئيتر لە چاخە بەشوێن يەكدا هاتووەكاندا تەفسير بە ڕەئی قۆناغەكانی خۆی بڕیو پاشينە لە پێشينە بە كورتی، يان بە درێژی، بەشێوەی تەعليق، يان بەبێ تەعليق زانيارييان گواستەوە بۆ ناو تەفسيرەكانيان، هەتا وای لێ هات شێوە تەفسيری سەردەم هاتە كايەوه، ئەوەبوو هەندێ لە موفەسسيرين گرنگيان بە پێداويستی سەردەم دا، لە

تەفسیرەكانیاندا پەردەیان لەسەر هەندێ لەو شتانەی قورئان لەخۆی گرتوون لــەبواری ژیــانی كۆمەڵایــەتیو بنــەماكانی تەشــریعو تیۆرەكــانی زانــست هەڵدایــەوەو خــستیاننە ڕوو، وەكــوو تەفــسیری (الجـواهر، المنـار، فـی ظـلال القرآن).

## تەفسیری مەوضوعی

لــە بەرامبــەر گەشــەكردنو بــەرفراوانبوونی تەفــسیری گــشتی لــە چاخەكانی تەدویندا، تەفسیری مەوضوعی بـە هەنـدێ باسی تایبـەت، شـان بەشانی تەفسیرە گشتییەكان قۆناغەكانی خۆیان بڕی، ئـەوەبوو ئیبنولقـەیمی ئەلجـەوزی (التبیـان فـی أقـسام القـرآن)ی نووسـی، ئـەبو عوبەیـدە كتێبێكـی نووســی تاییبــەت بــوو بــە (مجـاز القــرآن)، راغیبــی ئەصـفەهانی (مفــردات القــرآن)ی نووســی، ئـەبو جەعفـەری (النحـاس) كتێبـی لـە بـواری (الناســخ والمنــسوخ)دا نووســی، ئەبولحەســەنی الواحــدی (أســباب النــزول)ی نووســی، (الجـصاص) كتێبـی لـە بـواری (أحكـام القـرآن)دا نووسـی، ئـیتر لەسـەردەمی تازەشــدا باســە قورئانییــەكان بــەردەوام بەشــوێن یەكــدا دێــنو لـــە پەرمســـەندندانو بـــە قـــەبارەی جیاجیـــاو كـــورتو درێـــژ دەخرێنـــە كتێبخانەكانــەوە، هەریەكــەیان بــەگوێرەی میــزاجو زانیــاری نووســەرەكەی تەفسیری هەندێ ئایەتی قورئان كردووەو لایـەنێكی ژیـانی كۆمەڵایـەتی، یـان بوارێكی زانستی خستۆتە بەرباسو لێكۆڵینەوە.

## چینەکانی ڕاڤەکەرانی قورئان (طبقات المفسيرين)

لەبەر ڕۆشنایی زانیاری پێشوو دەتوانین چینەکانی موفەسسیرین بەم جۆرەی خوارەوە ڕیزبەند بکەین:

١- موفەسسیرین لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوانەی لەم پێڕە لەبواری تەفسیردا ناوبانگیان دەرکردووە، چوار خەلیفە راشیدینەکانو ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەبباسو ئوبەی کوڕی کەعب، زەیدی کوڕی ثابیتو ئەبو موسای ئەشعەریو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو ئەنەسی کوڕی مالیكو ئەبو هورەیرەو جابیرو عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی العاص ڕەزای خودا لە هەموویان بێ بەگشتی، لەناو خەلیفە راشیدینەکاندا عەلی کوڕی ئەبو طالیب لەهەموویان زیاتر تەفسیری لێ ڕیوایەتکراوە.

ڕیوایەت لە بواری تەفسیردا لە سێ خەلیفەکەی تر زۆر کەمو دەگمەنە، هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەوان پێش ئیمام عەلی کۆچی دواییان کردووە، هەر ئەمەش هۆکاری ئەوەیە زۆر بە کەمی لە حەزرەتی ئەبو بەکرەوە ڕیوایەتی حەدیث کراوە.

موعەممەر لە وەهبی کوڕی عەبدوڵڵا ئەویش لە ئەبو طوفەیل ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: ئامادەبووم ئیمام عەلی وتاری دەدا دەیفەرموو: (بە ئارەزوی خۆتان پرسیارم لێ بکەن، سوێندم بەخودا لە هەرشتێك پرسیارم لێ بکەن بەگوێرەی پێویست وەڵامتان دەدەمەوە، لەبارەی قورئانەوە پرسیارم لێ بکەن، سوێندم بەخودا هیچ ئایەتێك نیە ئیللا من دەزانم ئایا بە شەو نازڵ بووە، یان بە ڕۆژ، لە دەشتو سارادا نازڵ بووە، یان لە کێو شیوو دۆڵ).

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خودای لێ بێ) لە ئیمامی عەلیش زیاتر ڕیوایەتی لێوە کراوە، ئەوەتا ئیبنو جەریرو هی تریش لێیەوە ڕیوایەتیان کردووە: کە گوتوویەتی: (سوێندم بەو خودایەی جگە لە ئەو خودای تر نین، ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان نازڵ نەبووە ئیللا من دەزانم بۆچیو

دەربارەی چی نازڵ بووە، لەکوێ نازڵ بووەو کەی نازڵ بووە؟ خۆ ئەگەر بزانم لە شوێنێك کەسێك هەیە لەمن زیاتر شارەزای قورئانەو بەسواری ولاغ دەتوانم بچمە خزمەتی، یەکسەر خۆم دەپێچایەوەو خۆم دەکوتا بۆلای) دەربارەی ئیبنو عەبباس لەوەدوا سەربەخۆ باسی دەکەین.

٢- موفەسسیرین لە پێڕی تابیعین، ئیبنو تەیمییە دەڵێ: ئەهلی مەککە لە هەموو کەس زیاتر شارەزای تەفسیرن چونکە لە قوتابخانەی ئیبنو مەسعودا پێگەیشتوون، لەوانە موجاهید، عطاء بن رباح، عیکریمە مەولای ئیبنو عەبباس، سەعیدی کوڕی جوبەیر، طاوس و هی تریش، لە کوفەدا هاوەڵ و قوتابیانی ئیبنو مەسعود زۆر شارەزای تەفسیرن، لە مەدینەشدا شارەزاترین بواری تەفسیر (زەیدی کوڕی ئەسلەم)ە، ئەو زاتەی: کە کوڕی خۆی (عبدالرحمن بن زەید) عیلمی لێ وەرگرتووە، هەروا مالیکی کوڕی ئەنەسیش قوتابی ئەو بووە، هەروەها هەندێ لە هاوەڵ و قوتابی ئیبنو مەسعودیش لە خزمەتیا بەهرەمەند بوون، لەوانە: علقمة، الأسود بن زید، إبراهیم النخعی، الشعبی، هەر لەم پێڕە کۆمەڵێکی تر لە تەفسیردا بالادەست بوون، لەوانە: الحسن البصری، عطاء بن أبی مسلم الخراسانی، محمد بن کعب القرظی، أبوالعالیة، رافیع بن مهران الریاحی، الضحاك بن مزاحم، عطیة بن سعد العوفی، قتادة بن دعامە السدوسی، الربیع بن أنس، السدی، ئەمانە هەموویان زانا پێشینەکانی تابیعینن لەبواری تەفسیردا، زۆربەی مادەی تەفسیرەکانیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەرگرتووە.

٣- لەدوای ئەمان چینێکی تر هاتوون زۆربەیان تەفسیرەکانیان بریتین لە کۆکردنەوەی ئەقوالی صەحابەو تابیعین، وەکوو سەفیانی کوڕی عویەینەو وەکیعی کوڕی الجراح، شعبە بن الحجاج، یەزیدی کوڕی هارون،

عبدالرزاق، آدم بن أبى أياس، إسحاق بن راهويه، عبد بن حميد، روح بن عباده، أبو بكر بن أبى شيبەو هى تريش.

٤- پاش ئەمان چەند تاقمو پێڕی تر سەریان هەڵدا لەوانە: عەلی کوڕی ئەبو طەلحە، ئیبنو جەریری الطبری، ئیبنو ئەبی حاتەم، ئیبنو ماجە، الحاکم، ئیبنو مەردەوەیهی، أبو الشیخ بن حبان، إبن المنذر، ئەمانە هەموویان چینی دواینی تابیعینن، هەموو تەفسیرەکانیان پاڵ صەحابەو تابیعینی پێش خۆیان دەدەن جگە لە ئیسنادو ڕیوایەتەکە هیچ راوبۆچوونی خۆیانیان تێدا دەرنەبڕیوە، جگە لە ئیبنو جەریر، ئەو ئەقوالو رەئیەکان ئاراستە دەکاو هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا تەرجیح دەدا، ئیعرابی هەندێ رستەو ئایەت دەکا، ئەحکام دەردێنێ، بەم دیاردانە ئیبنو جەریر لەوانی تر جیا دەبێتەوە.

٥- ئەمجار چینێکی تر موفەسسیر سەریان هەڵدا تەفسیرەکانیان هاخنی بە فەوائیدی لوغەویو وجوهی ئیعرابو قیرائاتی وەها: کە ئیسنادەکانیان حەذف کرابێ، واتە: قیرائاتی بێ روشتە، جارجارەش وابووە کابرا رەئیەکی خۆی ئیضافە کردووە، وەکوو ئەبو ئیسحاقی الزجاجو ئەبو عەلی فارسیو ئەبوبەکری النقاشو ئەبو جەعفەری النحاس.

٦- دوا ئەمان کۆمەڵێك لە موفەسسیرین پەیدابوون بە (المتأخرين) ناوزەد دەکرێن لەوانی تر جیا دەکرێنەوە، ئەمان ئیسنادەکانیان کورتکردنەوە، ئەقوالی بێ ئیسنادو پچڕ پچڕیان خزاندە ناو تەفسیرەکانیان، لێرەوە ئەقوالی دەخیلو ڕیوایەتکراو لە بێگانەوە خرانە ناو تەفسیرەوەو راستو هەڵە تێکەڵاو بوو.

٧- پاشان حاڵ بەوە گەیشت: هەرکەسێك شتێکی بە خەیاڵدا هات خستیە ناو تەفسیرەوە، هەر مەعنایەکی بەسەر دڵدا رابرد کردی بە تەفسیرو چەسپاندی، دوا ئەوان کەسانێك هاتنە ناو گۆڕەپانی تەفسیرەوەو

وایـانزانی ئـەو زادەی خـەیاڵو مـەعنا داتاشـراوانەی پـێش خۆیـان ئەصـڵو بنــەمایان هەیــەو بڕبــڕەی تەفــسیرنو ڕیوایــاتو تەفــسیری ڕیوایــەتکراو لەســەلەفی صــاڵحیان پاشـگوێ خـستو وەلا نـا، گوێیـان نـەدا بـە تەفـسیری ئەوانەی پێشەنگو رابەرن لەبواری تەفسیردا.

شێخی سیوطی دەفەرموێ: لە تەفسیری ئایەتی ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضَّالِّينَ – الفاتحة/٧﴾ یانزە قەولم بینیوە، لە کاتێکدا ئەوەی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خۆیەوەو لە هەموو هاوەڵانو تابیعینـەوە واریـد بـووە ئەوەیـە مەبەسـت بـە ﴿غَيْـرِ الْمَغْـضُوبِ﴾ یـەهودو ﴿وَلا الـضَّالِّينَ﴾ نەصـارایەو تەفـسیری تریـان بـۆ نـەکردووە، تەنانـەت ئیبنـو ئـەبی حاتـەم فەرموویەتی: لەمەدا موفەسـسیرین یەکدەنگنو پـێم وایـە هـیچ ئیختـیلافو راجیایی لەناویاندا نیە.

٨- لـەدوای ئـەوان کۆمــەڵێك موفەســسیرین پەیـدابوون، شـارەزاییان لەبڕێ زانستو علومدا هەبووە، هەیانـە کتێبـە تەفـسیرەکەی پڕکـردووە بـەو زانیارییەی تێیدا شارەزایەو حـەزی لێیـەو بـەس! وەکوو ئـەوە قورئـان بۆیـە نـازڵ بووبـێ ئـەو عیلمـەی تێـدا بـڵاو بکرێتـەوە، لەکاتێکـدا قورئـان کیتـابی ئیرشادو هیدایەتەو دەستوری ژیانەو کەتـەلۆکی بوونـەوەرەو هـەموو شـتێکی تێدا ڕونکراوەتەوە.

دەبینین کابرای نەحوی لە تەفسیرەکەیدا مەبەستی ئـەوەڵو ئـاخری ئیعــرابو زۆرکردنــی جۆرەکــانی ئیعرابــە موحتەمــەلو مەزەندەکراوەکانــە، هەرچەندە ئەو ئیعرابانـە شـازو نـاجۆرو دوور لـە واقیعـیش بـن، هـەوڵ دەدا چەندێکی بۆ بکرێ قەواعیدی نەحوو مەسەلەکانیو خیلافو رای نەحوییان تێیاندا لە بەناو تەفسیرەکەیدا گرد بکاتەوە، وەکوو ئەبو حەییانی تەوحیدی لە (البحر والنهر)دا پەیڕەوی کردووە.

بابای مێژوو نووس‌و ئیخباری هەموو هەواڵو تەقەڵلایەکی ئەومیە تەفسیرەکەی سیخناخ بکا لە چیرۆك‌و سەرگورشتەو راگواستنی هەواڵو دیرۆکی رابردوان بە چاك‌و خراپ‌و راست‌و درۆ، وەکوو (الثعلبی) پەیرەوی کردووە.

بابای شەرعزانیش هاتووە هەموو فیقهی خزاندۆتە ناو تەفیسرەکەیەوەو زۆر بەڵگەی فیقهی‌و ئارای فەقیهەکانی هێناوەتە ناو تەفسیرەکەیەوە: کە لە واقیعدا هیچ پەیوەندی ئەو مەسئەلە فیقهییانە بە تەفسیری ئایەتەکەوە نیە، جاری واهەیە بە هێنانەوەی بەڵگە فیقهییەکانیشەوە نەوەستاوە بەڵگەی جوابی بەرامبەرەکانیشی هێناوە، وەکوو ئەوەی شێخی قورطوبی پەیرەوی کردووە.

ماهیرو زانا لە علومی عەقڵی‌دا بە تایبەتی ئیمام فەخری رازی هاتووە تەفسیرەکەی پڕکردووە لە ئەقوالی حوکەماو فەلاسیفە، لە باسێکدا دەرچووە یەکسەر چووەتە باسێکی ترەوە، بەجۆرێك جاری وا هەیە تۆ دەبینی تەفسیرەکە بەهیچ جۆرێ لەگەڵ مەوریدی ئایەتەکەدا رێك ناکەوێ، بۆیە ئەبو حەییان لە تەفسیری بەناو (البحر المحيط)دا دەڵێ: ئیمامی رازی زۆر شتی دوورو درێژی خستۆتە ناو تەفسیرەکەیەوە: کە پێویست نیەو چ پەیوەندی بە تەفسیرەوە نیە! بۆیە هەندێ لە عولەما بۆ هەڵسەنگاندنی تەفسیرەکەی وتوویانە (فيه كل شيئ إلا التفسير) هەموو شتێکی تێدایە تەفسیر نەبێ.

کابرای بیدعەچی لە تەفسیرکردنی قورئاندا جگە لە تەحریف‌و چەواشەکاری لە مانای ئایەتەکاندا هیچ مەبەستی تری نیە، ئەوەی گرنگە بەلای ئەوەوە مانای ئایەتەکان وا ئاراستە بکا لەگەڵ مەزهەبە فاسیدو بیدعەچیەکەی‌دا بگونجێ، بەجۆرێك ئەگەر مانایەکی دوور بۆ ئایەتەکە لە ئاسۆ بەدی بکا خێرا دەیقۆزێتەوەو دەیکاتە کەرەستەی خۆی، ئەگەر جێ

پێیەکی دۆزییەوە تۆزێك مەجالی ئەوەی هەبوو پەل بهاوێ دەست لە عاست خۆی بۆ دەکوتێو پەنای بۆ دەبا! وەکوو نەقڵ کراوە لە ئیمامی (البلقینی)یەوە دەربارەی تەفسیری کەششاف وتویەتی (إستخرجت من الكشاف اعتزالاً بالمناقيش) یەکێ لەو شوێنانە هاتووە لە تەفسیری ئایەتی ﴿فَمَنْ زُحْزِحَ عَنْ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ – آل عمران/١٨٥﴾ وتوویەتی (أی فوز أعظم من دخوله الجنة؟) بەم تەفسیرەی ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە: کە ڕۆژی قیامەت خودا نابیندرێ.

هەر بەم جۆرە مولحیدو بێدینان: کە لە بواری تەفسیردا دەنووسن ئەوانیش هەموو هەوڵێکی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی فیکرەی خراپو ناپەسەندی خۆیان بخەنە ناو تەفسیرەکەیانەوە.

٩- ئەمجار سەردەمی ڕاپەڕینو بەرخودان هاتە کایەوە سەردەمی نەهضەی ئەدەبیو تازەگەریو پێشکەوتنی عیلمو زانست پەیدابوو، زۆر لە موفەسسیرەکانی قورئان شێوازی تازەیان ڕەچاوکرد، زۆر گرنگیان بە ئوسلوبی هەست هەژێنو تەڕو زەرکەفتکراودا، هەوڵیاندا عیبارەتی جوانو ئەدەبی بەکار بێنن، لەهەمان کاتدا گرنگیان بە بوارەکانی کۆمەلایەتی دا، بیروبۆچوونی سەردەمو تازە بابەتو مەزاهیبی تازەگەریو هەڵسەنگاندنیان بە شێوازی ئەدەبی خستە ناو تەفسیرەکانیان، بەجۆرێك تەفسیرەکانیان سیمەی ئەدەبیو کۆمەلایەتییان بەسەردا زاڵ بوو، ئالا هەلگری ئەم جۆرە تەفسیرانە (شێخ محمد عبدو محمد رشيد رضاء محمد مصطفى المراغیو سيد قوطبو محمد عزة دروزه) بوون بەهەندێ جوداوازی لەنێوانیاندا.

شایانی باسە شێخ جەلالەدینی سیوطی کۆچکردوی ساڵی/٩١١ی کۆچی، کتێبێکی داناوە لەژێر ناوی (طبقات المفسرين) لە دیباجەکەیدا دەڵێ: لەم کتێبەدا موفەسسیرین لە هاوەڵانو لە تابیعینو ئەتباعی تابیعینو موفەسسیرین لەوانەی هاوچەرخو تازەنو موفەسسیرینی ئەهلی سوننەو

موفەسسیرین لە فیرقە جیاجیاکان وەکوو موعتەزیلەو شیعەو ئەمثالی ئەوان دەخەمە ناو کتێبەکەمەوە، ئاماژە بۆ شریتی ژیانو سەردەمیان بۆ ئوسلوبو شێوازی تەفسیرەکانیانو خاڵی هاوبەشو جوداکەرەوەیان دەکەم.

وەڵێ تەواوی نەکردووە، ئەوانەی خستونیە ناو کتێبەکەیەوە، تەنها سەدوسیو شەش تەرجەمەیە بەگوێرەی پیتی هیجا ڕیزبەندی کردوون.[١]

شێخ ئەبو سەعید (صنع الله الكوزة كنانی) کۆچکردوی ساڵی/٩٨٠ی کۆچی کتێبی (طبقات المفسسیرین)ی نووسی، هەر لەم بوارەدا أحمد بن محمد الندوی لە عولەمای چەرخی یانزە کتێبێکی نووسی، هەروا (الحافظ شمس الدین بن محمد بن علی بن أحمد الداوودی المصری) کۆچکردوی ساڵی/٩٤٥ی کۆچی کتێبی بەناوبانگی خۆی (طبقات المفسیرین)ی نووسی لە ڕاستیدا ئەم کتێبە فراوانترین نووسینە لەم بوارەدا: کە کتێبخانەی ئیسلامی پێی ئاشنابووبێ، لەم کتێبە ناوازەدا شێخ داودی ژیاننامەی زانا موفەسیرەکانی تا سەرەتای چەرخی دەیەمی کۆچی زۆر زانستانە ڕیزبەند کردووە، حاجی خەلیفە لە (کشف الظنون)دا دەڵێ ئەم کتێبە باشترین کتێبە: کە لەم بوارەدا نووسراوە.[٢]

## تەفسیر بالمأثورو تەفسیر بە ڕەئی

تەفسیر بە مەئثور بریتییە لەو تەفسیرکردنەی پشت بە ڕیوایەتی صەحیحو نەقلکراو ببەستێ بەگوێرەی ئەو پلەو قۆناغانەی لەوەپێش لە باسی مەرجەکانی موفەسسیردا باسکران، لە تەفسیرکردنی قورئان بە قورئان،

---

[١] لەم ساڵانەدا عەلی محمد عمر تەحقیقی کردو مەکتەبەی وهبە لە قاهیرە بە چاپی گەیاند.

[٢] مکتبە وهبە، لە قاهیرە لە دوو بەرگدا بە تەحقیقی علی محمد عمر بەچاپی گەیاندووە.

یان تەفسیرکردنی بە فەمووده، چونکە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕونکەرەوەی نامەی خودایە، یان بە ئەقوال‌و ڕیوایەتی هاوەڵان، چونکە هاوەڵان زاناترین کەسانێکن بە کەلامی خودا، یان بە قەول‌و رای تابییعین چونکە غالب وایە ئەوان ئەوماناو تەفسیرانەیان لە هاوەڵان وەرگرتبێ.

ئەم جۆرە تەفسیرە ئەوەی تێدا بەرچاو دەگیرێ هەرچی ئاثارێك لەبارەی ئایەتەکەوە ڕیوایەتکراوە، باسی بکا، بەبێ هەبوونی ئەصڵ‌و ئەساسێك لە ڕیوایەتی صەحیح مەعنای هیچ ئایەتێك نەکرێ، خۆ بپارێزێ لە هەر مەعناو تەفسیرێك: کە نەقڵی صەحیحی تێدا نەهاتبێ.

ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ: پێویستە ئەوە بزاندرێ: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ماناو مەبەستەکانی قورئانی بۆ هاوەڵان شی کردۆتەوە، وەکوو چۆن چۆنیەتی نوتقکردن بە لەفظەکانی بۆ ڕون کردونەوە، ئایەتی قورئان: کە دەفەرموێ: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ — النحل/٤٤﴾ شمولی ئەم‌و ئەو دەکا واتە: لەفظو مەعنا.

ئەبو عەبدورڕەحمانی (السلمی).[1] دەڵێ: ئەوانەی قورئانیان فێردەکردین وەکوو عوسمانی کوڕی عەففان‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو هی تریش بۆیان گێڕاینەوە دەیانگوت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دە ئایەتمان دەخوێندو فێریان دەبوین، وازمان نەدەهێنا تا چاك چاك ڕەوانمان دەکردن‌و کارمان پێ دەکردن؛ دەیانگوت: ئێمە فێری قورئان دەبووین لە هەردوو بوارەکەدا بە عیلم‌و عەمەلەوە تێیاندا قاڵ دەبووین، بۆیە ماوەیەکی زۆر خەریکی لەبەرکردنی سورەتێك دەبوون.

---

[1] ناوی (عبدالله بن حبيب التابعي المقرئ)ە ساڵی/٧٢ی کۆچی، کۆچبار بووە، ئەم زاتە غەیری (ئەبو عبدالرحمن السلمي)یە: کە صۆفییەو ساڵی/٤١٢ی کۆچی مردووە.

ئەنەس دەفەرموێ: پیاو تا سورەتی (البقرة و آل عمران)ی لەبەر دەکرد زۆر تێدەکۆشاو ماندو دەبوو (كان الرجل إذا قرأ البقرة وآل عمران جدّ فينا) رەواه أحمد فی سنده.

ئیمام مالیك لە (الموطأ)دا دەڵێ: ئیبنو عومەر هەشتساڵی تەواو خەریکی لەبەرکردنی سورەتی (البقرة) بووە، چونکە خودا فەرموویەتی: ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ – ص/٢٩﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ – محمد/٢٤﴾ ئاشکراشە تێفکرینو لێ وردبوونەوە لە کەلام بەبێ تێگەیشتن لە ماناکەی نایەتە جێ، لەلایەکی تر عادەو نەریت دژی ئەوەیە کابرا لە ڕۆژێکدا لە زانستێکدا (پزیشکی بێ، یان ریازیو ماتماتیك) کتێبێك بخوێنێتەوەو هیچ هەوڵی لێ تێگەیشتنو شەرحو راڤەی نەدا، دەی کەوابێ ئەتۆ چ دەڵێی بەرامبەر کەلامی خودا: کە کتێبی هیدایەتو پاراستنی موسوڵمانانەو بەهۆی ئەوەوە بەختەوەری دونیاو قیامەتیان دەست دەکەوێ.[1]

## راجیایی دەربارەی تەفسیر بە مەئثور

تەفسیر بە مەئثور جەمسەرەکەی لەسەر ئەو ڕیوایەتە صەحیحانەیە: کە لە صەدری ئەم گەلە ئیسلامەوە ڕیوایەتکرابێ، هەڵبەتە ئیختیلاف دەربارەی تەفسیر لەناو ئەو موفەسیرانەی چینی یەکەم بە نیسبەت دوا خۆیان زۆر کەمو دەگمەن بووە، زۆربەی زۆری جوداوازییەکەیان لەڕوی تەعبیرەوە بووە، ئەگینا لەڕووی مەعناوە جیاوازییان لەناودا نەبووە، یان لە شێوەی تەفسیری عام بە برێ لە ئەفرادەکانی بووە بەشێوە تەمثیل.

ئیبنو تەیمییە دەڵێ: راجیاییو خیلاف لەبواری تەفسیردا لەناو سەلەفدا زۆر کەمو دەگمەنە، ئەغلەبی ئەو خیلافەی لە ناویان سەری

---

[1] الإتقان ج٢/١٧٦.

هەڵدابێ، ئیختیلافی دژ بەیەك و تەضاد نەبووە بەڵكوو ئیختیلافی تەعبیرو تەنەوع بووە، ئەمەش دوو جۆرە:

یەكەمیان: ئەوەیە هەریەكەیان تەعبیر لە مانا و مەبەستی عیبارەتێكدا بێتەوە جوداوازبێ لە عیبارەتی ئەوی تریان، موسەمماكەش یەكێك بێ، وەكوو تەفسیر كردنیان بۆ ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ – الفاتحة/٦﴾ هەندێكیان وتوویانە مەبەست شوێنكەوتنی قورئانە، هەندێكی تریان وتوویانە مەبەست ئیسلامە، لە ئاكامو واقیعیشدا هەردوو رەئیەكە دەبنەوە بەیەك، چونكە ئایینی ئیسلام بریتییە لە شوێنكەوتنی قورئان وەلێ یەكەمیان ئاماژەی بۆ وەصفێك كردووە جودایە لە وەصفی ئەویتریان.

دووەمیان: ئەوەیە: هەر یەكێ لەو موفەسسیرانە بۆ ناو گشتییەكە لەسەر شێوەی تەمثیل هەندێ لە نەوعەكانی باس بكاو هۆشداری بداتە گوێگرەكەو ئاگاداری بكاتەوە بۆ ئەو نەوعە، نموونەی ئەمە ئەو تەفسیرانەن دەربارەی ئایەتی ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ – فاطر/٣٢﴾ گوتراوە مەبەست بە (السابقون) ئەوانەن نوێژەكانیان لەسەرەتای كاتەكانیان بەجێ دێنن، مانای (مقتصد) ئەو كەسەیە لە ناوەندی كاتی نوێژەكاندا نوێژ دەكا (الظالم لنفسه)یش ئەوكەسەیە نوێژی عەصر دوادەخا تا كاتی زەردەپەڕ، ئەمە تەفسیرێك بۆ ئایەتەكە، ڕیوایەتێكی تر هەیە دەڵێ: (السابقون) ئەوانەن وێڕای دەركردنی زەكات لە ماڵو سامانیان صەدەقەو خێریش دەكەن، (مقتصد) ئەو كەسەیە: كە هەر زەكاتی فەرز دەداو خێرو صەدەقە ناكا، (الظالم لنفسه)یش ئەو كەسەیە كە زەكات نادا.[1]

---

[1] الإتقان ج٢/١٧٧.

وادەبێ ئیختیلافەکە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ: کە خودی لەفظەکە بۆ دوو مەعنا دژ بە یەك دەگونجێ وەکوو لەفظی (عسعس) کە بە مانا هاتنی شەوو ڕۆیشتنی دێ، بۆ هەردوو مەعناکە دەگونجێ، یان ئیختیلافەکە لەوەوە سەرهەڵدەدا ئەو لەفظانەی بەکاریان دەهێنێ بۆ تەعبیردانەوە لە مەعانی لێك نزیکن، وەکوو ئەوە لە هەندێ ڕیوایەت وشەی (تبسَلَ) بە مانا (تحبَس) هاتووە، لە هەندێ ڕیوایەتی تردا بە مانا (ترهن) هاتووە هەردوو مەعناکانیش لێك نزیکن.

## خۆپاراستن لە ئیسرائیلیات

وادەبێ هەبوونی ئیختیلاف بێسودەو زانینی هیچ پێویست نیەو تەمەن بە فیڕۆدانە، وەکوو ئەوە برێ لە موفەسسیرین کەوتوونە ڕاجیایی لە نەقڵکردنی ئیسرائیلیات لە ئەهلی کیتابەوە، وەکوو راجیاییان دەربارەی ناوی ئەصحابولکەهف و ڕەنگی سەگەکەیان ژمارەی ئەصحابولکەهف، پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْماً بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِمْ مَا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ فَلا تُمَارِ فِيهِمْ إِلاَّ مِرَاءً ظَاهِراً – الكهف/٢٢﴾.

هەروا ئیختیلافو راجیاییان لە ئەندازەی کەشتی نوحو جۆری ئەو دارەی کەشتییەکەی لێ دروستکرا، هەروا راجیاییان دەربارەی ناوی ئەو کوڕەی حەزرەتی خضر کوشتی، ناوی ئەو باڵندانەی پەروەردگار بۆ حەزرەتی ئیبراهیمی زیندوکردنەوە، جۆری ئەو درەختەی عەصای موسای لێ دروستکراوە......هتد ئەو جۆرە شتانە، هەموو ئەو شتانەی باسمانکردن ڕێبازی زانیاری بۆیان نەقڵو ڕیوایەتی صەحیحە، کەوابێ ئەوەی بە نەقڵی صەحیحو ڕیوایەتی صەحیح لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەر بێ) پێمان بگا، قبوڵ دەکرێ، ئەگینا لەسەری دەوەستینو تا ڕون نەبێتەوە

بڕیاری قبولکردنیو رەتکردنەوەی نادەین، هەرچەندە نەفسی مرۆڤی موسوڵمان بەو ڕیوایەتانەی لە هاوەڵانەوە نەقڵ دەکرێن ئارام دەگرێ، لەم ڕووەوە ئەوان کەمتر لە تابیعین ڕیوایەت لە ئەهلی کیتابەوە نەقڵ دەکەن.[١]

## حوکمی تەفسیر بە مەئثور

تەفسیر بە مەئثور ئەو جۆرە تەفسیرەیە: کە پەیڕەویکردنی پێویستەو پەسەندە، چونکە ڕێگەیەکی صەحیحو دروستە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری راستو دروست، ئەمینترین ڕێگایە بۆ ئەوەی نەکەوینە زەلەو هەڵەوە، بمانپارێزێ لە لادان لەزانینی مانای کیتابی خودا، بێگومان لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) ڕیوایەتکراوەو فەرموویەتی: (تەفسیر چوار جۆرە؛ جۆرێکیان لە سیاقی کەلامەکە عەرەب لێی حاڵی دەبن، جۆرێکیان دەبێ هەموو کەس بیزانێو کەس بیانووی نەزانینی نیە، جۆرێکیان زاناو عولەما نەبێ لێی حاڵی نابنو نایزانن، جۆرێکیشیان هەر خودا دەیزانێو بەس).

ئەو جۆرەی عەرەب لە سیاقی کەلامەکە لێی حاڵی دەبن ئەوەیە پەیوەندی بە لوغەتی خۆیانەوە هەیە بە سەلیقەی عەرەبی خۆیان تێی دەگەن.

ئەو جۆرەی کەس بیانووی نەزانینی نیە، ئەوەیە تێگەیشتن لە مەعناکەیو زانینی مەبەست زوو خۆ دەکوتێ بۆ ناو زەینی مرۆڤ، بەتایبەتی ئەگەر دەقەکان لەوانە بوون کە شەرائیعی ئەحکام لەخۆ دەگرنو بەڵگەی تەوحیدو یەکتاپەرستیان تێدایەو هیچ غموضو تەمو مژێکیان بە دەورەوە نیە، ئەم جۆرە دەقانە هەموو کەسێك مانای تاكو تەنهایی خودایان لێ بەدی دەکا هەرکەسێك گوێی لە ئایەتی ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ –

---

[١] لە حەدیثدا هاتووە «إِذَا حَدَّثَكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَلاَ تُصَدِّقُوهُمْ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ».

محمد/١٩﴾ دەزانێ مەعناكەی ئەوەیە: كە خودا تاكو تەنیاو بێ هاوتایە، هەرچەندە ئەوە نەزانێ: كە ئەم دەقە بەشێوازی نەفیو ئیستثناء وارید بووەو حەصرو كورتهەڵێنان دەگەیەنێ.

ئەو دەقانەی هەر خودا ماناو مەبەست لێیان بە حەقیقەت دەزانێ ئەو دەقانەن: كە پەیوەندییان بە مەغیباتەوە هەیە، وەكوو حەقیقەتی رابوونی قیامەتو حەقیقەتی روحو ئەوجۆرە شتانە.

ئەو تەفسیرانەی عولەما دەیانزانن، ئەوانەن دەگەڕێنەوە بۆ تێفكرینو ئیجتیهادو لێكۆڵینەوەیان: كە پشت دەبەستن بە بەڵگەو دەلیلو قەرینەوە، نەك رەئی موجەرەدو بەس وەكوو رونكردنەوەی موجمەلو تایبەتكردنی عامو ئەوجۆرە شتانە.

ئیبنو جەریری طەبەریش ئەم مەفهومەی بە عیبارەتێكی تر دەربڕیوەو دەڵێ: بێگومان بە ئاشكرا قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەكا: كە ئەوەی خودا نازڵی كردووە بۆ سەر پێغەمبەری خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لە قورئان، بەشێكی مەعناو مەبەست لێی، بەبێ رونكردنەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازاندرێ، وەكوو مەعنای هەموو ئەو ئەمرانەی لەخۆی گرتوون لەوەدا ئاخۆ بۆ وجوبن، یان بۆ نەدبن، یان ئیرشادو رێنومایی دەگەیەنن، هەروا هەموو جۆرەكانی نەهی، وەظائیفی مافو ئەندازەو سنوورەكانی، چەندییەتی فەرزەكانی، ئەندازەی پێویستی بڕێ مەخلووقاتی بۆ هەندێ مەخلووقاتی، هەرچی لەم شێوە بێ لە ئەحكامی ئایەتێك: كە مەعناكەی بەبێ بەیانكردنی پێغەمبەرو رونكردنەوەی ئەو بۆ ئوممەتەكەی نەزاندرێ، ئەمە تەفسیرو مەعنایەكە بۆ كەس دروست نیە قسەی تێدا بكا بەبێ رونكردنەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یان تەئویلی ئەو زاتە بە نەصێك لەسەر ئەو مانایە، یان بە دەلالەتێك: كە دیاریكردووە بۆ ئەوەی میلەتەكەی شارەزا بكا بۆ تەئویلكردنی.

هەندێ ئایەت هەیە جگە لە خودای تاك و تەنها كەس مانای نازانێ وەكوو روداوی داهاتوو ئەوكاتانەی لەمەودوا دێن، وەكوو كاتی هاتنی قیامەت و نەفخی صورو دابەزینی حەزرەتی عیسای كوڕی مەریەم و ئەم جۆرە شتانە ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ لا تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ – الأعراف/١٨٧﴾.

هەندێ ئایەت هەن هەركەسێ شارەزای زمانی عەرەبی بێ تەفسیرەكەیان دەزانێ، هەركەسێك بتوانێ ئیعرابی رستەكانی بكاو ناوی شتەكان بزانێ بەناوە لازمەكەی خۆیان جگە لە لەفظە موشتەرەكەكان، مەوضوعاتەكان بە صیفەتەكانی خۆیان بناسێ بەشێوەیەك لەشێوەكان تێیان دەگا. بێگومان ئەمە شتانێكن كەس نیە عەرەبی بزانێ، نەیانزانێ، نموونەی ئەمە ئەوەیە بیسەرێك گوێی لە قورئان خوێنێك بێ بلێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ (١١) أَلا إِنَّهُمْ هُمْ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لا يَشْعُرُونَ – البقرة/١١ – ١٢﴾ یەكسەر ئەو بابایە تێدەگا فەساد شتێكە پێویستە خۆی لێ بپارێزێ (ئیصلاح)یش شتێكە پێویستە ئەنجام بدرێ و كردنی كارێكی سودبەخشە هەرچەندە ئەو مەعنایانە نەزانێ: كە خودا كردونی بەهۆی ئیفسادو گەندەڵی، هەروا ئەو مەعنایانەی كراون بەهۆكاری ئیصلاح.[1]

---

[1] تەفسیری طەبەری ج١/٧٤ – ٧٥.

## تەفسیر بە رەئی

تەفسیر بـە رەئـی ئـەو جـۆرە تەفـسیرەیە: کـە موفەسـسیر تێیـدا بـۆ رونکردنەوەی مەعنا پشت بە تێگەیشتنی تایبەتی خۆی دەبەستێو بە رەئـی خۆی مەعناکە دەردێنێ، هەڵبەتە تێگەیشتنێك: کە لەگەڵ روحی شەریعەتدا یەك بگرێتەوەو پشت بە دەقەکانی ببەستێ بە تەفسیر بە رەئی ناژمێردرێو لـەم جۆرە تەفـسیرە نیـە، چـونکە رەئیـەکی موجـەڕەد: کـە هـیچ شـایەدێك پـشتگیری نـەکا، وێدەچـێ چەواشـەکاری کـردن بـێ لـە کیتـابی خـودادا، بۆیـە زۆربەی ئەوانەی تەفسیریان بە رەئی کردووەو بەم گیانە دەستیان بۆ قورئان بردووە، لە ئەهلی بیدعەو فیرقەی چەواشەکاربوونو پـەیڕەوکاری مەزهـەبی بەتاڵ بوونو دەستیان بۆ قورئان بردووەو بە رەئی خۆیان تەئویلیان کردووە پـەیڕەوی مەزهـەبی صـەحابەو تابیعینیـان نـەکردووەو لـە تەفـسیری ئـەوان مانایان هەڵنەگوازتووە، نە لە رەئـیو نـە لـە تەفـسیریان چـاویان لـە سـەلەفی صالّح نەکردووە، تەفسیریان نووسیوە لەسـەر بنـەمای مەزهـەبو بیروبـاوەڕی خۆیان، وەکـوو تەفـسیری (عبـدالرحمن بـن کیـسان الأصـم)و الجبـائیو قاضـی عبدالجبارو الرمانیو الزمخشریو وێنەکانیان.

ئەم زاتانەی تەفسیریان بە رەئی کـردووە، تێیانـدا هەیـە بـە زیرەکـی خۆیو زانایی نۆرماڵیو جوانی عیبارەتی، مەزهەبەکەی خۆی خزاندۆتـە نـاو کـەلامێكو بـەجۆرێك دایرشـتووە بەسـەر زۆرکـەسدا تێـی پەڕانـدووەو وایکردووە قسەکانی رەواجی هەبێو گوێی بۆ بگیرێ، وەکوو خاوەنی کەششاف کردوویەتی، فیکرە ئیعتیزالیەکەی خۆی چەسپاندوەو برەوی پێداوە.

هەرچەندە هەنـدێ لـەم خـاوەن مەزهەبـە بـەتاڵو بیدعەچییانە لـە هەندێکی تریان نەرمترو میانەڕەوترنو زۆر شویان لێ هەڵنەکێشاوە، هەنـدێ لەو موفەسسیرانەی بە رەئی تەفسیریان نووسیوە لـە ئـەهلی کـەلامن، هـاتوون هەرچی ئایاتی ئەسمائوصیفاتە وایان تەئویل کردوون لەگـەڵ مەزهەبەکـەیان

بگونجێ، ئەمانە لە ئەهلی سوننەو جەماعەت نزیکترن تا موعتەزیلە، وەلێ ئەوانیش: بەجۆرێك کاردەکەن پێچەوانەی مەزهەبی صەحابەو تابیعینە، دەبنە هاوشانی موعتەزیلەو کەسانی تر لە ئەهلی بیدعەتو مەزهەبی نادروست.

## حوکمی تەفسیر بە ڕەئی

هەڵبەتە ئاشکرایە: کە تەفسیرکردنی قورئان بە موجەرەدی ڕەئیو ئیجتیهاد، بەبێ ئەوەی بنەمایەکی هەبێ حەرامو نادروستەو نابێ دەستی بۆ بەرێ، قورئان بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ – الإسراء/٣٦﴾ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ قال في القرآن برأيه أو بما لا يعلم فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».[1]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە «مَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِرَأْيِهِ فَأَصَابَ فَقَدْ أَخْطَأَ» کەسێك تەفسیرێك بۆ قورئان بکا بە ڕەئی خۆی ئەگەر ڕاستیش بێ هەر هەڵەی کردووە.

هەر بۆیە سەلەفی صالح زۆر خۆیان پاراستووە لە تەفسیرکردنی قورئان بەبێ ئەوەی زانیارییان پێی هەبێ، یەحیای کوڕی سەعید لە سەعیدی کوڕی (المسيب)ەوە ڕیوایەتی کردووە: کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی تەفسیری ئایەتێك لە قورئان، فەرموویەتی: ئێمە لە خۆمانەوە دەربارەی تەفسیری قورئان هیچ ناڵێین.

ئەبو عوبەید (القاسم بن سلام) ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: ئەبو بەکری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی مەعنای (الأب) لە ئایەتی ﴿وَفَاكِهَةً وَأَبًّا – عبس/٣١﴾ وتی: (أي سماء تظلني وأي أرض تقلني؟

[1] أخرجه الترمذي والنسائي وابو داود وقال الترمذي هذا حسن.

إذا قلت فى كلام الله مالا أعلم) چ ئاسمانێك لەسەر سەرم دەبێ‌و چ زەوییەك هەڵم دەگرێ ئەگەر من بەبێ ئەوەی زانیاریم هەبێ دەم لە تەفسیرکردن‌و مانا لێدانەوەی کەلامی خودا بدەم؟

تەبەری دەڵێ: ئەم ڕیوایەت‌و هەواڵانە دەبنە بەڵگەو شایەت لەسەر راستی ئەوەی لەوەپێش گوتمان: کە ئەو جۆرە تەئویل‌و تەفسیرەی قورئان: کە بەبێ ئەوەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بە دەقێك بۆی رون کردبینەوە، یان نیشانەیەکی دانابێ دەلالەت بکا لەسەر مەعناکەی، نەزاندرێ، بۆ کەس دروست نیە لەخۆیەوە بە رەئی دەمی تێوەداو مەعنای بکا، بەڵکوو هەرکەسێك ئاوا بە رەئی تەفسیری بکا ئەگەر مەعنای حەقیقەتیشی بپێکێ بە هەڵە چووە، لەو تەفسیرەی بە رەئی خۆی کردوویەتی، چونکە پێکانەکەی پێکانی دڵنیایی‌و یەقین نیە، بەڵکوو پێکانەکەی پێکانی مەزەندەو گومانە، کەسێکیش لە بواری ئایینی خودادا: بەگومانەوە قسەبکا، شتێك لەسەر خودا دەڵێ: کە نازانێ وایە، یان وانیە، پەروەردگاریش لە قورئاندا ئەوەی حەرام کردووەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ – الأعراف/٣٣﴾.[1]

ئەم ئاسارو ڕیوایەتانەو هی تریش: کە لە ئەئیمەی سەلەفەوە ڕیوایەتکراون نیشانەی ئەوەن: کە ئەو زاتانە خۆیان پاراستووە لەوە قسە لە تەفسیر بکەن دەربارەی ئەوەی زانیاری یەقین‌و دڵنیاییان نەبێ، وەلێ کەسێك قسە دەربارەی شتێك بکا: کە زانیاری هەبێ لەڕوی لوغەوی‌و ئیصطیلاحی شەرعییەوە، ئەوە هیچ حەرەجێکی تێدا نیە، هەربۆیە لە ئەوانیش‌و غەیری ئەوانیش چەند قەول‌و تەفسیرێك ڕیوایەتکراوە، ئەمەش چ مونافاتێکی تێدا

---

[1] تەفسیری تەبەری ج١/٧٨ – ٧٩.

نیـه، چـونکه ئـەوان قسەیان کـردووە دەربـارەی ئـەوەی زانیویانـەو ئـەوەی نەیانزانیوە لێی بێدەنگ بوون.

ئەمەش ئەرکی سەرشانی هەموو مرۆڤێکە، کاری لەوە خراپتر ئەوەیە کابرا تەفسیر بە مەئثوری صەحیح پاشگوێ بخا، پەنا بۆ تەفسیری بـە رەئـی بەرێ.

ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ: بە کورتیو پوختی کەسێك لـە مەزهـەبی هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ)و ڕیوایـەتی تـابیعینو تەفسیرو تەئویلیان لابدا بۆ رای پێچەوانەی ئەوان، بێگومان بـە هەڵـە چووە، بـەڵکوو بیدعەچییە، چـونکە بێگومـان هـاوەڵانو تـابیعین لـە هـەموو کـەس زیاتر شارەزای تەفسیری قورئان بوونو مەعناکەیان زانیـوە، هەروەکوو چۆن لـە هـەموو کـەس زانـاتر بـوون بـەو پەیامـە حەقـەی خـودا کـە بـە پێغەمبەرەکەیدا ناردویە.

شـێخی طـەبـەری فەرموویـەتی: شـیاوترین کەسـانێك بـەوەی حـەق بپێکنو شارەزای تەئویلی قورئـان بـن، ئـەو کەسـانەن لـە تـەئویلو تەفسیردا بەڵگەیان واضیحو بەهێزە: کـە ئاکـامی زانـینو عیلمەکـەیان دەگەڕێتـەوە بـۆ خـودی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەك بـاقی ئومەتەکـەی، سەرچاوەی زانینی تەفسیرەکەیان ئـەو حـەدیثو خەبەرانـەن: کـە دەچـنەوە سـەر پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ)و چەسـپاوە کـە لـە ئـەوەوە ڕیوایـەتکراون، جـارێ لـەڕوی نەقڵـەوە ئـەوە عەدالـەتو ئیثباتیـان حاشـا هەڵنەگرە، بە تایبەتی لـەو بوارانـەدا: کـە نـەقڵی (مـستفیض) دەربارەیـان لـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەچەسـپابێ، یـان لـە ڕوی دەلالـەتی نەصبکراو لەسەر صەحیحییان.

هــەروەها شــیاوترین تەفــسیر تەفــسیری ئەوانەیــە بەڵگــەکانیان صــەحیحترین بەڵگــەو دەلیلــە لــەڕوی تەرجەمــەو ڕونکردنــەوەوە: کــە

زانیارییەکەی لەڕوی زمانەوانی پەیدا کردووە، جا بە شایەتهێنانەوە لە شیعرو ئەدەبی عەرەبیدا، یان لە قسەو باسو سەرگورشتەو زاراوەی باوو بەربڵاویان، جا ئەو تەئویلکەرو موفەسسیرە هەرکەسێك بێ، بەمەرجێك تەئویلو تەفسیرەکەی لە چوارچێوەو سنووری ئەقوالی سەلەف لە هاوەڵانو ئیمامانی صەحابە دەرنەچێ، هەروا لە ڕیوایەتی نەقڵ کراوی تابیعینو عولەمای ئومەت تێپەڕ نەکا.[1]

## ئیسرائیلیات

دیانەتی یەهود سەرچاوەی ڕۆشنبیریو زانیارییان تەوراتە، مەسیحیەکانیش سەرچاوەی ثەقافییان ئینجیلە، کە ئایینی ئیسلام هات کەسانێك لە جولەکەو لە مەسیحی هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامو موسوڵمان بوون.

هەڵبەتە ئەمانە: کە موسوڵمان بوون پاشخانی ثەقافەی ئایینی خۆیان بە زەقی تێدا ماوەتەوەو لەبیریان نەچۆتەوە، قورئانی پیرۆزیش زۆر ڕوداوو باسو خواسێك کە لە تەوراتو ئینجیلدا هەن، لەخۆی گرتوون، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە چیرۆكو سەرگورشتەی پێغەمبەرانو بەسەرهاتی گەلە پێشینەکانەوە هەیە، بەڵام قورئان پوختەی ئەو چیرۆکانەی هێناونو هەدەفو ئامانجی عیبرەتو پەند لێ وەرگرتنو ئامۆژگارییەو نەچۆتە ناو تەفاصیلو جوزئیاتی چیرۆكو ڕوداوەکانەوە، نەهاتووە مێژووی ڕوداوەکانو ناوی شارو گوندو ئەشخاصەکان دەست نیشان بکا، بەڵام تەورات بە پێچەوانەوە بە دوورو درێژی دەستی بۆ ئەو لایەنانە بردووە چۆتە ناو تەفاصیلو جوزئیاتی ئەو شتانەوە، ئینجیلیش بەهەمان شێوە!

---

[1] تەفسیری تەبەری ج١/٩٣.

جـا كـه ئـەهلى كيتـاب موسـوڵمان بـوون‌و هاتنـه نـاو كۆمـەڵگاى ئيـسلامييەوە، لەگـەڵ خۆيانـدا ئـەم ڕۆشـنبرييە ئـايينى‌يـەى خۆشـيان لـە ئـەخبارو چـيرۆكى ئـايينى هێنايـە نـاو سـەقافەى ئيـسلامييەوە، شـتێكى ئاشكراشە ئەوان كاتێك چيرۆكەكانى قورئان دەخوێننەوە، پەنا دەبەن بۆ ئەو تەفصيلاتەى لـە كتێبـەكانى خۆيانـدا هەيـەو تێكـەڵاوى ئـەوەى نـاو قورئـانى دەكەن.

بێگومان سەرەتا هاوەڵانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسـەر بـێ) لـە ئاسـت ئـەوەى دەبيـسترا لـە ئـەهلى كيتـاب دەربـارەى ئـەو چيرۆك‌و ڕوداوانـە هەڵوێيستەيان دەكرد، ئيمتيثالى فـەرمووودەى پێغەمبـەريان دەكـرد (درووودى خـوداى لەسـەر بـێ) كـە پێـى فـەرموو بـوون «لاَ تُـصَدِّقُوا أَهْـلَ الْكِتَـابِ ، وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ وَقُولُوا (آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا)».[1] بڕوا بە ئـەهلى كيتـاب مەكـەن‌و بە درۆشيان مەخەنەوە، بڵێن: ئێمـە ئيمانمـان بـەوە هێنـاوە كـە بۆمـان نـازڵ كراوە.

وادەبوو حيوارو گفتوگۆ لەنێوان هـاوەڵان‌و ئـەهلى كيتابـدا دەربـارەى تەفاصـيل‌و جوزئيـاتى ئـەو ڕوداوانـە دروسـت دەبـوو، هـاوەڵان بـڕێ لـەو مەعلوماتەى لەجولەكەو مەسـيحيەكانييان وەردەگـرت بەمـەرجێ پەيوەنـدى بـە عەقيـدەو ئەحكامـەوە نەبوايـە، پاشـان لـەناو خۆيانـدا دەيانگێڕايـەوەو تێكـەڵاوى ئامۆژگاريـەكانى خۆيانيـان دەكـرد چـونكە وا تێگەيـشتبوون كـە كارێكى موباحەو دەچێتە ژێر مەفهومى فـەرموودەى پێغەمبـەرەوە (درووودى خوداى لەسەر بێ): كە فەرموويەتى: «بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَـةً ، وَحَـدِّثُوا عَـنْ بَنِـي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِـنَ النَّـارِ».[2] چيتان پـێ دەڵـێم وەرى بگـرن‌و لـە منـەوە بـە خـەڵكى بگەيـەنن، تەنانـەت ئەگـەر

---

[1] أخرجه البخارى.

[2] أخرجه البخارى.

ئایـەتێکی قورئـانیش بـێ، قـسەی بـەنو ئیـسرائیلی بـۆ خـەڵکی بگێڕنـەوە بەدرۆیان مەخەنەوە، هەرکەسێك بەدەم منـەوە قسە هەڵبەسـتێ با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بکا.

هەڵبەتـە مەبەسـتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـە ڕیوایەت کردن لە ئەهلی کیتاب چیرۆك‌و سەرگورشتەیەکە ئیحتیمالی راستی هەبێ‌و ئیحتیمالی درۆی هەبێ.

کەوابێ دژایەتی‌و تەعاروض لەنێوان حەدیثەکاندا نیـە، ئـەو هـەواڵ‌و سەرگورشتانەی ئەهلی کیتاب دوای موسوڵمان بوونیان گێڕاویانەتـەوە، پێیـان دەگـوترێ: (ئیـسرائیلییات) بەشـێوەی تـەغلیب (پاسـاودانی لایـەنی جولەکـە بەسەر لایەنی نەصرانی‌دا) لەم ڕووەوە نەقڵ کردن لە جولەکەوە زۆرتر بووە لـە نـەقڵ کـردن لـە مەسـیحیەکانەوە، چـونکە هـەر لەسـەرەتای ئیـسلامەوە جوولەکە پتر تێکەڵاوی مووسوڵمانان بـوون، چونکە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کـرد بـۆ مەدینـە زۆرێـك لـە دانیـشتوانی مەدینـەو دەوروبەری جولەکە بوون.

هاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لـەبواری تەفسیری قورئانـدا زۆر بــە کــەمی‌و دەگمــەن نــەبێ زانیارییــان لــە ئــەهلی کیتــاب وەرنەگرتووە، ئەخباری جوزئی ئەوانیان نەکردووە بـە بەشێك لە تەفسیری قورئان. کە سەردەمی تابیعین هـات‌و زۆر کـەس لـە ئـەهلی کیتـاب موسـوڵمان بوون، تابیعینەکان زۆر شتیان لێ وەرگرتن پاشـان موفەسـسیرەکانی دوا ئـەوان بـە شــەغەف‌و حــەزەوە، ملیــان لــە ڕاگواسـتنی ئیـسرائیلییات نـا بـۆ نـاو تەفسیرەکانیان!!

ئیبنـو خەلـدون دەڵـێ: ڕاڤەکـەرانی قورئـان کـە حـەزیان لـە زانینـی شـتێك دەبـوو لـەو شـتانەی نەفـسی ئـادەمیزادی حــەزی لێیــە دەربــارەی هۆکارەکـانی دروسـتبوونی کـەون‌و سـەرەتای خەلیقـەو نهێنـی‌یـەکانی بـوون،

دەربـارەی ئـەم شـتانە بـە زۆری پرسـیاریان لـە ئـەهلی کیتـاب دەکـردو دەیانەویست سود لە عیلمو زانیاری ئەوان وەربگرن، ئەوانیش ئەهلی تەورات بوون لە جولەکەو ئەوانەی پابەندی ئایینی ئەوان بـوون لـە نەصارا......... ئـیتر تەفسیرەکانی قورئـان پـڕ بـوون لـە زانیـاریو ڕیوایـەتی نـەقڵ کـراو لـە ئەوانەوە.[1]

ئـەم موفەسـسیرانە: کـە شـتیان نـەقڵ کـردووە لـە ئـەهلی کیتـاب لێکۆڵینـەوەو بەدواداچـوونیان بـۆ ئـەو هـەواڵو ڕیوایاتـە ئیـسرائیلیانە نەکردووە، گومانیش لەوەدا نیە کە زۆرێـك لـەو ڕیوایـەتو ئەخبارانـە پـوچو بێ بناغەن، بۆیە پێویستە لەسەر ئەوانەی کتێبی ئەوانە دەخوێنێتەوە شتی بێ سود پاشگوێ بخـا، شـتێك پێویـست نـەبێ نـەقڵی نـەکا، ڕیوایـەتێك دڵنیـا نەبی لەڕاستیو دروستی نەیخاتە ناو نووسینی خۆیەوە، خەبەر راسـت نـەبێ پشتی پێ نەبەستێ.

شایانی باسە زۆرترین ئەو ڕیوایەتـە ئیسرائیلیانە لـە چوار کەسـەوە ڕیوایەتکراون ئەوانیش بریتین لە عەبـدوڵلای کـوڕی سـەلام، کـەعب الأحبـار، وەهب بـن مونبـە، عبـدالملك بـن عبـدالعزیز بـن جـریج، بێگومـان تێڕوانینـی زانایانی ئیسلام دەربارەی بڕیاردان بەسەر ئەم چوار زاتـەداو متمانـە کـردن پێیان، جوداوازە، هەیانە لە کەداریان دەکەنو رەخنەیان لێ دەگرنو گومانیان دەخەنە سەر، هەیشە متمانەیان پێ دەکاو بەسەرچاوەی زانستیان دەزانن.

زۆربـەی خـیلافـو راجیـایی لـە دەوری کـەعب الأحبـار چـڕ بوونـەوە، عەبدوڵلای کـوڕی سـەلام لـە هـەموویان پـتر جێگـای ڕێـزو متمانـە پێکردنـە، ئیمـامی بوخـاریو هـی تـریش لـە زانایـانی بـواری حـەدیث ئیعتیمادیـان پـێ کردوون، ئەو تۆمەتو ڕەخنانـەی ئاراسـتەی کـەعبی ئـەحبارو وەهبـی کـوڕی مونبە کراوە ئاراستەی عەبدوڵلای کوڕی سەلام نەکراوە.

---

[1] بڕوانە کتێبی (التفسیر والمفسیرون ج١/١٧٧).

## تەفسیری صوفی

ئەگەر مەبەست بە تەصەوف سلوکی خودا پەرستی شەرع پەسەند بێ، تەصەوفێك بێ صەفای نەفس دەستەبەر بكاو وا لەمرۆڤ بكا روو لەزەرق و بەرەقی جوانی دونیا وەرگێڕێ پەیڕەوكردنی تەقەششوف و لێبڕان بۆ خودا پەرستی بكاتە دیدەنی خۆی، ئەوە بێگومان كارێكی پەسندو مەقبووڵ و مەرغوبە، بەڵام تەصەوف ئەمڕۆ بووەتە فەلسەفەیەكی نەظەری تایبەت و هیچ پەیوەندییەكی بە وەرع و تەقواو تەقەششوفەوە نیە.

ئەمڕۆ فەلسەفەی تەصەوف كۆمەڵێك ئەفكارو هەڵس و كەوتی لەخۆگرتووە، رێك پێچەوانەی ئیسلام و عەقیدەی ئیسلامە، ئێمەیش لێرەدا ئەم جۆرە تەصەوفەمان مەبەستەو هەر ئەمیش كاریگەری خۆی لەسەر تەفسیری قورئان داناوە.

شێخ محیدینی ابن عربی بە زەعیم و رابەری تەصەوفی فەلسەفی نەظەری دادەنرێ، ئەم زاتە پێشەوای ئەوانەیە: كە تەفسیری ئایەتی قورئان دەكەن بەشێوەو شێوازێك لەگەڵ بیروبۆچونە صوفیانیەكەی بگونجێ، جا ئەم شێوە تەصەوفەی لە تەفسیرە مەشهورەكەیدا چەسپاندبێ، یان لەو كتێبانەدا دركاندبیەتی كە پاڵی دەدرێن و بە بەرهەمی ئەو حسێب كراون، وەكوو كتێبی (ألفصوص). ئەم زاتە یەكێكیشە لەوانەی هەڵگری تیۆری (وحدة الوجود)ن.

بۆنموونە ئایەتی: ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَاناً عَلِيّاً – مريم/٥٧﴾: كە دەربارەی حەزرەتی ئیدریس دەدوێ بەم جۆرە تەفسیری كردووەو دەڵێ: (وأعلى الأمكنة المكان الذي تدور عليه رحى عالم الأفلاك، وهو فلك الشمس، وفيه مقام روحانية ادريس)..... پاشان دەڵێ: (واماعلوا المكانة فهو لنا أعني المحمديين، كما قال تعالى: ﴿وَأَنْتُمْ الأَعْلَوْنَ وَاللّٰهُ مَعَكُمْ – محمد/٣٥﴾ في هذا العلو وهو يتعالى عن المكان لاعن المكانة).

هەر (ابن عربي) لە تەفسیری ئایەتی سەرەتای سورەتی (النساء)دا ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ – النساء/١﴾. دەڵێ ئەوەی لێتان دەرکەوتووە بیکەنە مەتاڵو ئامێری خۆپارێزی بۆ خودای خۆتان، ئەوەی لێتان شاراوەیە: کە خودای خۆتانە، بیکەنە ویقایەو مەتاڵ بۆ خۆتان، چونکە شتەکە زەمو مەدحە، کەوابێ ببن بە ویقایە لە زەمو لۆمەدا، بیکەنە پارێزگاری خۆتان لە حەمددا، دەبن بە ئەدیبو ڕۆشنبیری شارەزاو عالەمی.

ئەم جۆرە تەفسیرانە دەقەکان تێیاندا لەسەر ظاهیری خۆیان تەفسیر ناکرێن، بەڵکوو تا بینەقاقا نقومی تەئویلاتی باطنی دەکرێن، مەعنای دوور لە واقیعو نەگونجاویان بۆ دەکەن، کە لە ئاکامدا ئەم جۆرە مەعنایانە دەبنە هۆی سەرلێ شێوانو ئیلحادو لادان لە راستە ڕێبازی ئیسلام.

## تەفسیری ئیشاریو ئیل نیشان

لەناو پیری ئەو صۆفیانەدا کەسانێك هەن لافی ڕیازەی گیانی لێ دەدەنو ئیدیعای ئەوە دەکەن: کە صۆفی لەڕێگەی ئەو خەڵوەتو ریازەتەوە دەگاتە پلەو مەقامێك مەعنای ئەودیوی عیبارەتەکانی بۆ کەشف دەبنو شارەزای ڕەمزو ئیشاراتی قودسی دەبێ، لە هەورو ئاسمانی غەیبەوە مەعانی سوبحانی دادەبارنە سەر دڵیو باطنی روناك دەبێ، ئەم جۆرە تەفسیرە پێی دەگوترێ: تەفسیری ئیشاری، ئەوان پێیان وایە هەموو ئایەتێك مەعنایەکی ظاهیرو مەعنایەکی باطنی هەیە، مەعنا ظاهیرەکەی ئەوەیە زیهن بۆی دەچێو پەی پێ دەبا پێش مەعنای تر، مەعنای باطن ئەوەیە لەو دیو پەردەوە لەشێوەی ئیشاراتی خەفیدا خۆی دەنوێنێو جۆرێکە لەسەر لێ شێوان، وەلێ ئەگەر مانا دەرهێنانو دۆزینەوەی مانای جوانو گونجاو بوو، لەگەڵ موقتەضای ظاهیر دەهاتەوە، لە واقیعیشدا شایەدێکی هەبوو پشتگیری

راستی ئەو مەعنایەی دەکرد بەبێ هەبوونی دژایەتی ئەوە مەقبولو وەرگراوە.

نموونەی ئەمە ئەو ڕیوایەتەی ئیبنو عەبباسە (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ): کە دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەزرەتی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لە یانەو مەجلیسدا منی لەگەڵ پیاوماقوڵانی قوڕەیشدا دادەنیشان، بڕێ لەو پیاوماقوڵانە لە دڵی خۆیاندا بەو هەڵوێستەی ئیمام عومەر ناڕازی بوونو دەیانگوت: چیە ئەم کوڕە لەگەڵ ئێمەدا دادەنیشێنێ؟ ئێمە کوڕی وامان هەیە لە تەمەنی ئەودایە!! حەزرەتی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕاستە ئەو بە تەمەن منداڵە وەکوو ئێوە دەڵێن، ئیتر لەوەدوا ڕۆژێك بانگی ئیبنو عەبباسی کردو لەگەڵ پیاو ماقوڵەکانی قوڕەیشدا داینیشاند، زانیم بۆیە بانگی کردووم شتێکیان نیشان بدا، ئەوەبوو ڕوی کردە قوڕەیشییەکانو فەرمووی: ئێوە چۆن تەفسیری سورەتی ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ.................﴾ دەکەن؟ هەندێکیان ووتیان: خودا لەم سورەتەدا فەرمانی پێ کردووین حەمدو سوپاسی بکەینو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەین: کە بەسەر دوژمندا سەری خستینو یارمەتی داین، دەرگای ڕەحمەتو سەرکەوتنی لێ کردینەوە، هەندێکی تریان بێدەنگ بوونو هیچیان نەگوت، ئەمجار ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕوی لەمن کردو فەرمووی: ئەتۆش ئەی ئیبنو عەبباس! ئاوا دەڵێیو وا تەفسیری دەکەی؟ دەڵێ: منیش وتم: نا، من وا مانای ناکەم، وتی: ئەی تۆ چۆنی تەفسیر دەکەی؟! وتم نازڵبوونی سورەتەکە، نیشانەی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم سورەتە ئەوەی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاگەیاند: کە ئەجەلی هاتووە، پێی فەرموو: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ نیشانەی کۆتایی هاتنی تەمەنی تۆیە ئەی موحەممەد! ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ

وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾ ئیمام عومەر فەرمووی: منیش هەر ئەو مانایەم لێ داوەتەوە.

ئیبنو قەییم وتوویەتی: تەفسیری زانایان بۆ قورئان سێ جۆرە، تەفسیری لەفظەکان لە ڕوی لوغەوە: کە ئەمەیان زانا موتەئەخیرینەکانی تەفسیر پەیڕەوییان کردووە، تەفسیر لەسەر مەعنا، ئەمەشیان دابو نەریتی زاناکانی سەلەفە، تەفسیر لەسەر رەمزو ئیشارات: کە زۆر لە صۆفیەکان پەنایان بۆ بردووەو کەسانی تریش دەستیان بۆ بردووە.

**هەڵبەتە تەفسیر بەشێوازی ئیشارات هیچ خراپییەکی تێدا نیە بە مەرجێ چوار مەرجی تێدا بێنەجێ:**

١- پێچەوانەی مەعنای ئاشکرای ئایەتەکە نەبێ.

٢- مەعناکە خۆی لەخۆیدا صەحیحو دروست بێ.

٣- لە لەفظەکەدا ئاماژەو تیلنیشانێك بۆ مەعناکە هەبێ.

٤- لەنێوان تەفسیری ئیشاریو مەعنای ئایەتەکە رەبتو تەلازم هەبێ، جا ئەگەر ئەم خاڵانە لە تەفسیرەکەدا کۆبوونەوە تەفسیرێکی جوانو مەقبوولە.[1]

---

[1] لە گرنگترین تەفسیری ئیشاری، تەفسیری (التستری)یە، چاپ کراوە، هەروا (حقائق التفسیر) نووسینی (ئەبو عبدالرحمن السلمی الصوفی)یە چاپ نەکراوە (عرائش البیان فی حقائق القرآن) نووسینی (أبو محمد الشیرازی)یە چاپکراوە (التأویلات النجمیە) نووسینی نەجموددین دایەو (علاء الدین السمنانی)یە چاپ نەکراوە، تەفسیری (إبن عربی)یە چاپکراوە.

# غرائب التفسير

خەڵکانێك هەن حەزیان لە نووسینی تەفسیری غەریبو ناوازەیە، هەرچەندە لە راستیش دوور بکەوێتەوە ڕێبازێکی پڕ قورتو پێچ پەیڕەو بکا، ئیتر هاتوون بەرعودەی شتێك بووە لە توانایدا نیە جێبەجێی بکا، بیرو هۆشی خۆیان لە کارێکدا جەڕەبابە دەدەنو دەیانەوێ بیزانن: کە تەوقیفییە هەر خودا دەیزانێ، دوای بیرکردنەوەو ماندوبوونێکی زۆر هیچ دەستکەوتێکیان نیە جگە لەوەی عەقڵی خۆیان لەدەست داوە، یان خۆیان بەبێ عەقڵو گومڕا نیشان داوە، لەو تەفسیرە سەیرو سەمەرانە: کە بۆ ئایەتی قورئانیان کردووە جێگای پێکەنینە ئەمانەن:

١- تەفسیری ئەو کەسەی هاتووە (الم)ی ئاوا تەفسیر کردووە دەڵێ: (ألف) واتە خودا پێغەمبەری دروست کردو کردی بە پێغەمبەر ڕەوانەی کرد بۆ سەر خەڵك، مانای (لام) سەرڕەقو ئینکاریکەران لۆمەی پێغەمبەریان کردو پەیامەکەیان رەتکردەوە، مەعنای (میم) ئەوانەی بڕوایان پێ نەکرد کەوتنە وڕێنەکردنو بوختان هەڵبەستن بۆی.

٢- تەفسیری ئەوانەی ئاوا تەفسیری (حم عسق)یان کردووە دەڵێن: (ح) ئاماژەیە بۆ جەنگی نێوان عەلیو معاویە، (میم) ئاماژەیە بۆ خەلافەی خەلیفە مەروان لە ئەمەوییەکان (ع) ئاماژەیە بۆ خەلافەتی عەباسییەکان (س) ئاماژەیە بۆ فەرمانڕەوای (السفيانية) (ق) پێشەوایەتی (مهدی)و شوێنکەوتنیەتی.

٣- ئەو تەفسیرەی (إبن خورك) بۆ ئایەتی ﴿وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي – البقرة/٢٦٠﴾ کردوویەتیو دەڵێ: حەزرەتی ئیبراهیم برادەرێکی هەبوو بەوە وەصفی کردووە: کە دڵیەتی واتە: بۆ ئەوەی ئەو هاوڕێو برادەرەم دڵنیا بێ: کە زیندوبوونەوە هەیە کاتێك بەچاوی سەر بە ئاشکرا ببینێ: کە خودا چۆن مردوو زیندو دەکاتەوە.

٤- تەفسیری ئەبو معاذ النحوی: کە تەفسیری ئایەتی ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنْ الشَّجَرِ الأَخْضَرِ نَاراً – یس/٨٠﴾ واتە: ئەو کەسەی لە ئیبراهیمەوە نورێکی بۆ بەدیهێناون: کە حەزرەتی موحەممەدە ﴿فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ﴾ ئەمجار ئێوە ئایین لە ئەو زاتە وەردەگرن.

## پێناسەی گرنگترین کتێبەکانی تەفسیر

کتێبخانە ئیسلامیەکان هاخنددراون لە کتێبی تەفسیر بە مەئثورو کتێبی تەفسیر بە رەئیو تەفسیری سەردەم: کە تێکەڵە لە هەردوو جۆری تەفسیر بە مەئثورو بە رەئی، هەندێ لەم تەفسیرانە لەهەندێکی تریان مەشهورترنو پتر لە بەردەستی خوێنەراندان.

## گرنگترین تەفسیری نووسراو بەشێوەی تەفسیر بە مەئثور

١- ئەو تەفسیرەی پاڵ ئیبنو عەبباس دراوە.

٢- تەفسیری ئیبنو عویەینە.

٣- تەفسیری ئیبنو ئەبی حاتەم.

٤- تەفسیری ئەبی الشیخ ئیبنو حبان.

٥- تەفسیری ئیبنو عطیە.

٦- تەفسیری ئەبی اللیث السمرقندی (بحر العلوم).

٧- تەفسیری ئەبی ئیسحاق (الکشف والبییان عن تفسیر القرآن).

٨- تەفسیری ئیبنو جەریری تەبەری (جامع البیان فی تفسیر القرآن).

٩- تەفسیری ئیبنو ئەبی شەیبە.

١٠- تەفسیری البغوی (معالم التنزیل).

١١- تەفسیر أبی الفداء الحافظ إبن کثیر (تفسیر القرآن العظیم).

١٢- تەفسیری الثعالبی (الجواهر الحسان فی تفسیر القرآن).

١٣- تەفسیری الشوكانی (فتح القدیر).

ئێستا فەهرسەی‌و وەصفی بۆ هەندێ لەم تەفسیرانە دەكەین.

## ١- تەفسیری ئیبنو عەبباس

ئەم تەفسیرە پاڵ ئیبنو عەباس دراوە، لە بەرگێكی قەبارە گەورەدا لە میصر چەند جارێك چاپكراوە لەژێر ناوی (تنویر المقیاس من تفسیر إبن عباس) ئەبو طاهر؛ محمد بن یەعقوب الفیروز آبادی الشافعی، خاوەنی قاموسی (المحیط) كۆی كردۆتەوە.

لە ڕاستی‌دا ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوكی بێ) بەوە مەشهور بووە: كە تەرجومانی قورئانە، عومەری كوڕی خەتتاب متمانەی بە تەفسیرەكەی هەبووەو زۆر ڕێزی لێ گرتووە، لە هەندێ شوێندا لە ئەهلی كیتاب شتی وەرگرتووە بەڵام بە مەرجێك دژی قورئان نەبووبێ، واتە: لە شتێكدا قورئان‌و تەورات‌و ئینجیل دژایەتییان لەگەڵ یەك نەبووبێ، زانیاری لێ راگواستوون، بەڵام زۆر بە كەمی‌و سنووردار.

ڕۆژهەڵاتناس جوڵد زیهر لە كتێبی (المذاهب الإسلامیة فی تفسیر القرآن) ئیبنو عەبباسی بەوە تۆمەتبار كردووە: كە زۆر مەعلوماتی لە ئەهلی كیتاب وەرگرتووە، ئەحمەد ئەمینیش لە كتێبی (فجر الإسلام)دا هەمان تۆمەتی پاڵداوە، مامۆستا (محمد حسین الذهبی) لە كتێبی خۆی‌دا (التفسیر والمفسرون)دا تۆمەتی ئەو دوو نووسەرەی رەتكردۆتەوەو بەبێ بناغەی حسێب كردوون.

ئیبنو عەبباس وەكوو هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە گشتی هەرگیز لە شتێكدا پەیوەندی بە عەقیدەوە هەبووبێ پرسیاری لەو عولەمایانەی ئەهلی كیتاب نەكردووە: كە موسوڵمان بوون، هەروا لەبارەی ئوصوڵی دین‌و فروعی دینیشەوە پرسیاری لێ نەكردوون، تەنها

ئەوەندەنەبێ لەبرێ چیرۆكو ئەخباری وادا: كە بەڕاستی زانیبن، ڕیوایەتەكانیانی قبوڵ كردووە.

ئیبنو عەبباس بەوە لە هاوەڵانی جیا دەبێتەوە: كە بۆ تێگەیشتن لە قورئان گەڕاوەتەوە بۆ شیعری عەرەبی، چونكە زۆرباش لۆغەتی عەرەبی زانیوەو شارەزای دیوانی شیعریان بووە، لەزۆر ڕێگاوە ڕیوایەت لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوكی بێ) ڕیوایەتكراون، هەیانە ڕیوایەتی صەحیحەو هەیانە زەعیفە، بێگومان زانایان بەدواداچوونیان بۆ ئەم ڕیوایەتانە كردووەو ئەندازەی بەهێزیو بێ هێزی ئەو ڕیوایەتانەیان دیاری كردووە، مەشهورترین ڕشتەو سەنەدی ئەم ڕیوایەتانە ئەمانەن:

١- ڕێبازو سەنەدی معاویە بن صالح، لە عەلی كوڕی طەلحەوە لە ئیبنو عەبباسەوە، ئەم ڕشتەو سەنەدە باشترین ڕێبازو سەنەدێكە: كە لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكرابێ، دەربارەی ئەم سەنەدەیە: كە ئیمام ئەحمەد فەرموویەتی: بێگومان لە میصر پەڕاوێك هەیە لەبواری تەفسیردا عەلی كوڕی ئەبو طەلحە ڕیوایەتی كردووە، ئەگەر پیاو سەفەر بكا بۆ میصر بۆ دیتنی ئەو پەڕاوەو بەهرەمەندبوون لێی، شتێك نیە بە زۆر بژمێردرێ.[1]

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم پەڕاوە لای ئەبو صالح نووسەری (الليث) بوو، ئەبو صالح لە (معاویە بن صالح) ئەویش لە عەلی بن أبی طەلحە ئەویش لە ئیبنو عەبباس ڕیوایەتی كردبوو، ئەم ڕیوایەتە لای بوخاری لە ئەبو صالحەوە ڕیوایەتكراوە، بوخاری ئیعتیمادی كردۆتە سەرو بەشێوەی تەعلیق لەسەر ئیبنو عەباس چەسپاندویەتی.

٢- ڕشتەو سەنەدی قەیسی كوڕی مسلم الكوفی لە (عطاء بن السائب)ەوە لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوە، ئەم سەنەدو

---

[1] الإتقان ج٢/١٨٨.

ڕشتەیەش صەحیحەو لەسەر مەرجی هەردوو پیری فەرموووده مەقبولو وەرگیراوە.

٣- ڕشتەو ڕێبازی ئیبنو ئیسحاق (خاوەنی سیره) لە محمەد بن أبی محمد مولى آل زيد بن ثابت لە عەکرەمە، یان لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەمەش ڕێبازو سەنەدێکی باشەو ئیسنادەکەی جوانو مەقبوولە.

٤- ڕشتەو سەنەدی إسماعيل بن عبدالرحمن السدی الکبیر.

ئەم زاتانە جاری وا دەبێ لە ئەبو مالیكو جاری وایش هەیە لە ئەبو صالح، لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا.

دەربارەی ئیسماعیل السدی رای جوداواز هەن، ئەو تابیعیو شیعە مەزهەبە، شێخی سیوطی دەڵێ: زۆر لە ئیمامەکانی وەکوو الثوریو شوعبە ڕیوایەتیان لێوە کردووە، وەلێ ئەو تەفسیرەی کۆی کردۆتەوە لە (أسباط بن نصر) ڕیوایەتی کردووە (أسباط)یش عولەما دەربارەی رای جیاوازیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نموونەترین تەفسیر، تەفسیری (السدی)یە

٥- رشتەو سەنەدی عبدالملك بن جریج لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) ئەم ڕێبازو سەنەدە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، چونکە جورەیج لە تەفسیری هەموو ئایەتێکدا صەحیحو ناصەحیحی ڕیوایەت کردووە، چاكو خراپی خزاندۆتە ناو تەفسیر کردنەکەیەوە.

٦- سەنەدو رشتەی (ضحاك بن مزاحم الهلالی) لە ئیبنو عەبباسەوە، ئەم سەنەدە مەقبوول نیە چونکە الضحاك لە متمانە پێکردندا راجیایی هەیەو هەموو زانایان پەسەندی ناکەن، سەنەدەکەی بۆ سەر ئیبنو عەبباس دابڕانی تێکەوتووە، چونکە الضحاك بۆخۆی بەخزمەت ئیبنو عەبباس نەگەیشتووە، ئەمجار ئەگەر ڕیوایەتی (بشربن عمارە)ش بخرێتە پاڵ لە

(ئـەبی روق عـن الـضحاك) ئـەوە ڕیوایەتەکـە بـە زەعیـف دادەنـرێ چـونکە (بشر)یش زەعیفە.

٧- روشـتەو سـەنەدی (عطیـة الـصوفی) لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ئـەم ریوایەتەش مەقبول نیە، چونکە (عطیة) زەعیفـە، هەرچـەندە هەنـدێ جار الترمذی ریوایەتەکانی ئەوی بەجوان داناوە.

٨- ڕێبـازو سـەنەدی (مقاتـل بـن سـلیمان الأزدی الخراسـانی)، موقاتیـل زەعیفـە، ریوایـەت لـە موجاهیـدو لـە (الـضحاك)دەکـا، فەرموودەشـی لێ نەبیستوون، زیاد لە یەکێکیش بەدرۆزنیان داناوەو کەس متمانەی نـەداوەتێ. فیکرەی تەجسیمو تەشبیهیشی لێوە دەگێڕنـەوە، ئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل فەرموویەتی: من پێم خۆش نیـە هیـچ لـە (مقاتـل بـن سـلیمان)ەوە ریوایـەت بکەم.

٩- روشتەو سەنەدی (محمد بن السائب الکلبی) لەئەبی صالح لە ئیبنو عەبباسـەوە، ئـەم رشـتەیە زەعـیفترین روشـتەو سـەنەدە (ألکلبـی) لـەبواری تەفـسیردا بەناوبانگـە، بـەڵام دەربـارەی گـوتراوە کـۆڕا هەیـە لەسـەرئەوەی حـەدیـث لێ وەرگرتنـی واز لێ بێنـدرێ، جێگـای متمانـە نیـە، حـەدیثـەکـانی نانووسـرێنەوە، تەنانـەت کۆمـەڵێك لـە عولـەما تۆمـەتی حـەدیـث دانانیـشی دەخەنـە پـاڵ، بۆیـە ئیمـامی سیوطی لـە (الاتقـان)دا دەڵێ ئەگـەر ریوایـەتی (محمـد بـن مـروان الـسدی الـصغیر) خرایـە پـاڵ روشـتەو سـەنەدی (ألکلبـی) سەنەدەکە دەبێتە سەنەدو زنجیرەی درۆ!!

لەو تەفسیرەی پـاڵ ئیبنـو عـەبباس دراوە دەردەکـەوێ زوربـەی زۆری ئەوەی لە ئیبنو عەبباس لە تەفسیرەکەدا لێوەی ریوایەتکراوە ئەگـەر نـەڵێین هـەمووی، دەچـنەوە سـەر (محمـد بـن مـروان الـسدی الـصغیر، عـن محمـد بـن السائب الکلبی، عن أبي صالح عن ابن عباس) زانیشمان ئەندازەی متمانەکردن بەریوایەتی (السدی الصغیر) لە (الکلبی)یەوە چەندە!!

## ٢- جامع البيان في تفسير القرآن للطبرى

ئیبنو جەریری تەبەری یەکێکە لەو زانا گەورەو قەڵەم بەبرشتانەی لەزۆر زانستی ئیسلامیدا داهێنانو سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، کەلەپۆرێکی ئیسلامی بەنرخی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە، چەرخ دوا چەرخو چین دوا چین لەپێشینەوە گواستراوەتەوە بۆ پاشینە تا بەئێمە گەیشتووە. بێگومان ئیبنو جەریر بەهۆی دوو کتێبە ناوازەکەیەوە لەمێژوودا (تاریخ الامم والملوك)و لە تەفسیردا (جامع البيان في التفسير القرآن) ناوبانگێکی بەرچاوی بەدەستهێناوە ئەم دوو شاکارەی تەبەری لە گرنگترین سەرچاوەکانی زانستین، بەڵکوو کتێبەکەی لە تەفسیردا لەلای ئەوانەی گرنگی بە تەفسیری (بالمأثور) دەدەن سەرچاوەی یەکەمو ناوازەیە.

تەفسیری ئیبنو جەریر لەسی بەرگی قەبارە گەورەدا خۆی دەبینێتەوە، بێگومان ئەم تەفسیرە دەگمەنو بەنرخە تا ئەم ساڵانەی دوایی دەرنەکەوتبوو، لەبەر دەستی خوێنەراندا نەبوو بە مەفقودو لەناوچوو حسێب دەکرا، پاشان خودا بۆی تەقدیر کردبوو بکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی، ئەوەبوو نوسخەیەکی دەستنووسی لەلای فەرمانڕەوای (حائل)؛ ئەمیر حمود بن عبدالرشید، کە یەکێك بوو لە فەرمانڕەوایانی وڵاتی نەجد، دەرکەوتو لەم ساڵانەدا چاپکرا، ئیتر دائیرەتولمەعاریفێکی ناوازە لەبواری (التفسير بالمأثور)دا کەوتە بەردەستمان.

بێگومان تەفسیری تەبەری تەفسیرێکی گەورەو بەنرخە، هەرکەسێك گرنگی بە تەفسیر بدا لێی بێ ئیحتیاج نابێو دەبێ کتێبخانەکەی پێ برازێنێتەوەو هەمیشە بۆ تەفسیری قورئان بۆی بگەڕێتەوە. شێخی سیوطی لەباسی ئیبنو جەریردا دەفەرموێ: (کتێبەکەی): مەبەستی تەفسیرەکەیەتی — بەنرخترین تەفسیرو گەورەترین تەفسیرە، کتێبخانەیەکە بۆ خۆی، رەئیی ئەمو ئەو دێنێو پێکیان دەگرێو بەرامبەر بەیەکیان دەکاو تەرجیحی

هەنـدێكیان دەدا بەسـەر هەندێكیانـدا هەنـدێ جـار دەسـت بـۆ ئیعـرابو دەرهێنانی حوكمی شەرعیو ئوصولی دەبـا، كـەوابێ تەفـسیرەكەی بـالآ دەسـتە بەسەر تەفسیری زانایانی پێشینداو هیچیان ناگەنە ئاستی ئەو.

شـێخی نـەوەوی دەفـەرموێ: ئوممـەتی ئیـسلامی كۆڕایـان هەیـە لەسەرئەوە تا ئێستا تەفسیری تەبەری شاكارەو نموونەی دانەنراوە.[1]

بێگومـان تەفـسیری تەبـەری یەكـەم سەرچـاوەی تەفـسیرە بـەكاملی بەئێمە گەیشتبێ، چونكە بێگومان لەبواری تەفـسیردا پـێش ئـەو زۆر هـەوڵو تەقەللادراوە بـەلام هیـچیان بەئێمـە نەگەییـشتووە مەگـەر لـەدوو تـوێی ئـەم تەفسیرەی تەبەریدا.

دابو نـەریتی ئیبنـو جـەریر لـە تەفـسیرەكەیدا ئەوەیـە: كەدەیـەوێ ئایـەتێك تەفـسیربكا دەڵـێ: (ألقـول في تأویـل قولـه تعـالى كـذا وكـذا) ئـەمجار دەستدەكا بە تەفسیری ئایەتەكەو شـەرحی دەكـا ئیستیـشهاد دەكـا بـەوەی بـە سـەنەدو روشـتەی خـۆی لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەرەوە یـان لـە (التـابیعین)ەوە تەفسیر بەمەئثور نەقڵ دەكا، هەرچی دەربارەی ئایەتەكە ریوایـەتكرابێ ئـەو دەیهێنـێو رایـدەنوێنێ، هـەر بەوەندەشـەوە ناوەسـتێ ریوایـەت بكـاو بـەس، بەڵكوو تەرجیحی ئەم ریوایەت بەسەر ئـەو ریوایەتـدا دەداو ریوایەتـەكان لـە (كـەوو بێـژینگ) دەدا، هەنـدێ جـار بـەگوێرەی پێویـست لایـەنی ئیعـرابو دەرهێنانی حوكمیش پاشگوێ ناخا.

بێگومـان جـاری وا هەیـە رەخنـەی بنیاتنـەر لەسـەنەدەكە دەگـرێ، جەرحو تەعدیل لە راوییەكاندا دەخاتەكارو لەئاكامدا ئـەم بـەعادڵو ئـەو بـە ناعادڵ لەقەڵەم دەداو ریوایەتی ئەوانە رەتدەكاتەوە كە متمانـەی بـە راسـتو دروستی ریوایەتەكانیان ناكا.

---

[1] الاتقان ج٢/١٩٠.

ئیبنـو جـەریر گرنگـی بـەبواری قیرائـات‌و ئاراسـتەکانیانیش دەدا، دەگوترێ: کتێبێکی تایبەتیشی لەبواری قیرائاتدا داناوە. وێڕای ریوایەتکردنی بـۆ ئـەخباری وەرگـیراو لـە قەصـەص‌و سەرگورشـتەی ئیـسرائیلی، زۆرجـار ریوایەتەکان دەخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو لێك هەڵاواردن!

وێڕای ئەوانە هەموو، ئیبنـو جـەریر وێـڕای گرنگـی دان بەریوایـەتی مەنقولی جۆراو جۆرەوە پشت بە ئیـستیعمالاتی لۆغـەویش دەبەسـتێ شیعری کۆن‌و سەردەمی جاهیلی دەکاتە شایەت‌و بەڵگە، گرنگـی بـە ئـاراو مـەزاهیبی نـەحوییان دەدا، پـەنا دەبـا بـۆ لۆغـەتی بـاوو صـەحیحی عـەرەب‌و دەیانکاتـە دادوەرو حاکم بۆ چەسپاندنی ئەو ریوایەتەی بەلایەوە صـەحیحە. ئـەحکامی فیقهی سەرو ناو دەکاو هەوڵ دەدا بگاتە ئاکام‌و رای صەحیح بەدەست بێنـێ. ئەقوالی عولەماو مەزهەبەکانیان دەخاتەڕوو رەئیێك هەڵدەبژێرێ بـۆ خـۆی‌و تەرجیحی دەدا. موناقەشەی مەسائیلی عەقیدەو باوەڕ دەکـا، موناقەشـەیەکی وردو زانستیانە هەوڵ دەدا رەدی فـیرەق‌و مـەزاهیبی ئـەهلی کـەلام بداتـەوەو مەزهەبی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت سەربخاو برەوی پێ بدا.

ئەم تەفسیرە پـیرۆزە یەکـەمجار لـە(دار المعـارف)ی میـصر چاپکرا بـە تـەحقیق‌و ئیخراجێکـی زانـستیانە، مامۆسـتا ئەحمـەد موحەممـەد شـاکیر تـەخریجی حـەدیثـەکـانی کـردوە، وەلێ بەداخـەوە ئـەم چـاپەی بـەو شـێوە تەواونەکرا.[1]

---

[1] لەم ساڵانەی دواییدا ئەم تەفسیرە بەزۆر شێوە چاپکرا تازەترین چاپی چاپی (دار ابن الجوزی)یە، بە تەحقیق‌و تەخریجی مامۆستا (أحمد محمد شاکر)و (محمود محمد شاکر) لەبیست‌و حەوت بەرگی قەبارە ٢٤×١٧سم دا ساڵی/٢٠٠٨ی زایینی بەچاپ گەیشتووە.

## ٣- المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز لابن عطية

ئیبنــو عــەطییــە لــە قازییــە بەناوبانگــەکانی ئەندەلوســە. لــە خانەوادەیـەکی ئاشـنا بـە عـیلمو زانـستدا پـەروەردە بـووە، یـەکێك بـووە لـە شەرعزانە گەورەکانی رۆژگاری خۆی، لە عولومی حـەدیـثو تـەفـسیرو لۆغـەو ئەدەبدا پسپۆڕو شارەزا بووە، دڵ وریـاو زیـرەكو تێگەییـشتوو بـووە، یـەکێك بووە لەزانا بەناوبانگو گەورە پیاوانی مەزهەبی مالیك. کتێبەکـەی لـەبواری تەفسیردا ناوی (المحرر الوجیز في تفسیر الکتاب العزیز)ە.

بێگومان ئیبنو عەطییە تەفسیری (بالمنقول)ی کۆکردۆتەوەو لەکـەوو بێژنگی داونو پوختەی کردونو خولاصـەیەکی لێ هەڵبـژاردووە، ئـەمجار لـەو گیانــە زانــستییە فــوارە بەســتووەی تێیــدا بەرجەســتە بــوو بــوو وردبینــیو تێگەییـشتنی وای بـۆ پەیـدا بـوو بـوو بتوانـێ تەفـسیرێکی وا بـەهێزو رەوان بخاتـەڕو بـە تەفـسیری نـاوازەو سـەرکەوتوو بـژمێردرێ. ئـەم تەفـسیرە لـە دە جڵدی قەبارە گەورەدا رەنگی داوەتەوەو تا ئێستا بەدەستنووسی ماوەتەوە.[1]

شـێخ (محمـد الـذهبی) دەڵـێ لـە (دار الکتـب المـصریة)دا چـوار بـەرگ دەســت دەکــەون. ئــەم تەفــسیرە نــاوو ناوبــانگی خــۆی هەیــە، زۆر لــە موفەســسیرینەکان نــەقڵیان لێــوە کــردوە، زۆر گرنگــی داوە بــە شــەواهیدی ئەدەبیو یاساو قەواعیـدی نـەحوی ئـەبو حـەیان لەپێـشەکی تەفسیرەکەیدا موقارەنەو بەرامبەریکردنی لەنێوان ئەم تەفسیرەو تەفـسیری زومەحـشەریدا ئەنجام داوەو دەڵێ: کتێبی ئیبنو عەطییە زۆر جـوان نـەقڵ کـراوەو باشـترین تەفــسیری ریوایــەتکراوو کــۆکراوەو پاڵفتــەکراوە، لــەکتێبی زومەحــشەری پوختەترو قوڵترە.

---

[1] ئەم تەفسیرە ساڵی/٢٠١٠ بە تەحقیقو تەخریجی هانی الحاج، (دار التوفیقیـە للـتراث) لەمیصر بە چاپکەیەندراوە لەپێنج بەرگی قەبارە (٢٤×١٧سم)دا کەوتۆتە بازاڕەوە.

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە موقارەنەیەك لەنێوان ئەو دوو تەفسیرە دەكاو دەفەرموێ: تەفسیری ئیبنو عەطییە لە تەفسیری زومەخشەری باشترو بەسودترە، صەحیحترە لەڕوی ڕیوایاتو لێكۆڵینەوەوە، دوور لە بیدعەت، هەرچەندە ئەمیش هەندێ لە بیدعەتی لەخۆ گرتووە، بەڵكوو تەفسیری ئیبنو عەطییە زۆر لە تەفسیری زومەخشەری باشترە، بەڵكوو دەتوانم بڵێم لەهەموو تەفسیرەكان پەسەندترە، راجیح ترە.

هەر شێخی ئیسلام دەفەرموێ: تەفسیری ئیبنو عەطییەو هاوشێوەكانی پتر شوێن رای ئەهلی سوننەو جەماعەت كەوتوونو لە راوو بۆچوونی بیدعەچییاندا زۆر لە تەفسیری زومەخشەری سەلامەترە، خۆ ئەگەر بهاتبایە راوو بۆچوونی سەلەفی دەربارەی تەفسیر باس بكردایەو بیخستایە ناو دووتوێی تەفسیرەكەیەوە، وەكوو خۆیو بێ دەستلێدان نەقڵی بكردایە، تەفسیرەكەی زۆر جوانترو پوخت تر دەبوو، چونكە ئەم واتە: ئیبنو عەطیە زۆرجار لە تەفسیری ئیبنو جەریر نەقڵ دەكا – هەڵبەتە ئەم تەفسیرە وێڕای ئەوەی تەفسیرێكی گەورەو پیرۆزە – بەڵام هەندێ جار دەبینین ئەوەی ئیبنو جەریر لە سەلەفەوە نەقڵی كردووە ئەم نەقڵی ناكا، لەجیاتی ئەوە دێ ئەقوالی ئەوانە نەقڵ دەكا: كە پێی وایە ئەوە قەولی (محقیقینە) مەبەستیشی بەوانە كۆمەڵێك زانای عیلمی كەلامن ئەوانەی قاعیدەو یاسای عیلمەكەیان بەشێوازێك ئاراستە كردووە دەشوبهێتە ڕێبازی موعتەزیلەكان هەرچەندە ئەهلی كەلام زۆر لە موعتەزیلە نزیكترن لە ئەهلی سوونەو جەماعەت.[١]

---

[١] مقدمة إبن تيمية في أصول التفسير ص٣٣.

## ٤- تەفسیری ئیبنو کەثیر (تفسير القرآن العظيم)

عمادالدين أبو الفداء بن عمر وبن كثير ئیمامێکی گەورەو حافظیکی ناودار بووە، لای ئیبنو تەیمییە خوێندویەتی، لە زۆر راوو بۆچووندا شوێن ئەو کەوتووە، زانایان شایەتییان بۆ ئیبنو کەثیر داوە بەوەی خاوەنی عیلمو زانیارییەکی زۆرو رەهابووە لەبواری تەفسیرو حەدیثو مێژوودا، کتێبەکەی لە بواری مێژوودا (البداية والنهاية) سەرچاوەیەکی رەسەنو ئەصیلو بڕوا پێکراوە لە مێژووی ئیسلامیدا.

کتێبەکەشی لە تەفسیردا (تفسير االقرآن العظيم) لە بەناوبانگترین کتێبی نووسراوە لە تەفسیری (بالمأثور)دا بە پلەی دووەم دێ لەدوای تەفسیری طەبەری، بەرنامەو خیطەی لە تەفسیرەکەیدا بەمجۆرەیە: تەفسیری ئایەتەکان بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و بە ئاثارو ڕیوایەتی هاوەڵانو تابیعین دەکا هەموو ئەقوالو ئاثارەکان پاڵ خاوەنەکانیان دەداو یاساو ڕیسای جەرحو تەعدیلیان تێدا وەگەڕ دەخاو ڕەخنەی بنیاتنەریان لێ دەگرێ، هەندێ رەئیو ڕیوایەت بەسەر هەندێکی تریاندا پاساو دەدا هەندێ ڕیوایەت بە زەعیف دادەنێو هەندێکی تریان بە صەحیحو پەسەند لە قەڵەم دەدا.

تەفسیری ئیبنو کەثیر لە تەفسیرەکانی تر جیا دەبێتەوە بەوەی ئاماژە دەکا: کە تەفسیر (بالمأثور) زۆرجار ڕیوایەتی ئیسرائیلیاتی تێکەڵاو دەبن، هەروەها ئەقوالی عولەما لەبواری ئەحکامی فیقهیدا دەخاتە ڕوو موناقەشەی مەزهەبەکان دەکاو هەندێ جار بەڵگەکانیشیان دەخاتە ڕوو.

تەفسیری ئیبنو کەثیر لەگەڵ تەفسیری بەغەوی (معالم التنزيل)دا چاپ کراوە، بەجیاو سەربەخۆش لەچوار جلْدا چاپ کراوە، شێخ ئەحمەد شاکر پێش لەدونیا دەرچوونی سەنەدەکانی لێ لابردو چاپی کرد، لەم ساڵانەشدا بە قەبارەی جیاجیا چاپکراوە.

## مەشهورترین کتێبەکانی تەفسیر بە ڕەئی ئەمانەن:

١- تفسير عبدالرحمن بن كيسان الأصم.

٢- تفسير أبى على الجبائى.

٣- تەفسیری قاضی عبدالجبار.

٤- تفسير الزمحشرى (الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل، وعيون الأقاويل فى وجوه التأويل).

٥- تفسير فخرالدين الرازى (مفاتيح الغيب).

٦- تفسير إبن فورك.

٧- تفسير النسفى (مدارك التنزيل وحقائق التأويل).

٨- تفسير الخازن (الباب التأويل فى معانى التنزيل).

٩- تفسير البيضاوى (أنوار التنزيل وأسرار التأويل).

١٠- تفسير أبى حيان (البحر المحيط).

١١- تفسير الجلالين؛ جلال الدين المحلى وجلال الدين السيوطى.

جەلالەدینی ئەلمەحەلی لەسەرتای سورەتی (الكهف)وە دەستی پێکردو تەفسیری نووسی تا گەیشتە سورەتی (الناس)و ئەمجار دەستی کرد بە سورەتی (الفاتحة) تەواوی کردو کۆچی دوایی کردو نەگەیشتە ئەوەی مابوو لە قورئان تەفسیری بکا، ئەمجار جەلالەدینی سیوطی هاتو تەفسیرەکەی تەواوکرد، لە سورەتی (البقرة)وە دەستی پێکرد تا کۆتایی سورەتی (الإسراء) سورەتی (الفاتحة)شی خستە کۆتایی تەفسیری (جلال الدين المحلى)یەوە بۆ ئەوەی پەیوەست بێ بە تەفسیرەکەیەوە.

زۆرجار بڕێ کەس هەڵە دەکەن لەم دابەشکردنەی تەفسیری (جلالين) بەسەر دوو (جلال الدين)ەکەدا.

١٢- تفسير القرطبى (الجامع الأحكام القرآن).

١٣- تفسير أبى السعود (إرشاد العقل االسليم إلى مزايا الكتاب الكريم).

١٤- تفسير الآلوسي (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني) لەمەودوا فەهرەسەیەکی وەصفی بۆ هەندێ لەم تەفسیرانە دەکەین:

## ا- مفاتح الغيب للرازي

ئیمام فەخرەدینی ئەلرازی یەکێکە لە زانا موتەبەحیرەکانی ئیسلام، یەکێکە لەوانەی لە زانستی نەقلیو عەقلیدا هەلکەوتەیەکی دونیای ئیسلامەو ناوو ناوبانگێکی گەورەو بەرفراوانی لە جیهانی ئیسلامیو عەقلکاریدا بەدەستهێناوە، زۆر بەرهەمی بەسودو زانستی لەدوا جێماوە، گرنگترین دانراوەکانی تەفسیرە بەرفراوانو گەورەکەیەتی: کە ناوی لێناوە (مفاتيح الغيب) ئەم تەفسیرە لە هەشت بەرگی قەبارە گەورەدا خۆی دەنوێنێ، هەندێ راووبۆچوون هەن ئاماژە بەوە دەکەن: کە فەخری رازی تەفسیرەکەی تەواو نەکردووە، راووبۆچوونی جوداواز هەن دەربارەی ئەو جێگایەی فەخری رازی لە تەفسیرەکەی گەیشتویەتی.

هەروا رای جیاواز هەن لەوەدا ئاخۆ کێ لە زانایان دوای رازی تەفسیرەکەی تەواو کردووە، شێخ محمد الذهبي تەعلیقی هەیەو دەڵێ: ئەوەی دەتوانم بیڵێم وەکوو حەلێك بۆ ئەم راجیاییانە، ئەوەیە ئیمام فەخری رازی تەفسیرەکەی تا سورەتی (الأنبياء) نووسیوە، دووای ئەو (شهاب الدين الخوبي) هاتووە دەستی کردووە بە تەواوکردنی تەفسیرەکە، بەڵام ئەمیش بۆی تەواو نەکراوە، ئەمجار (نجم الدين القمولي) هات تەفسیرەکەی تەواو کرد، وێشدەچێ هەر (الخوبي) تەفسیرەکەی تەواو کردبێ (القمولي) کتێبێکی تری رازی تەواو کردبێ، ئەمەش وەردەگیرێ لە عیبارەتی صاحیبی (كشف الظنون).[1]

---

[1] التفسير والمفسرون ج١/٢٩٣.

له ڕاستی‌دا هەرکەسێك ئەم تەفسیرە بخوێنێتەوە هیچ جوداوازییەك لە ڕوی مەنهەج و مەسلەکەوە لەنێوان ئەصڵ تەکمیلەدا بەدی ناکاو ئوسلوب و نەفەسەکە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.[1]

ئیمام فەخرالدین گرنگی داوە بە دەستنیشانکردنی موناسەبات لەنێوان ئایەتەکانی قورئان و لەنێوان سورەتەکانی‌دا، زۆرجار لە تەفسیر لادەداو دەست دەکا بە هاخنینی تەفسیرەکەی لە عولومی ریاضی و سروشتی و ئاسمانشوناسی و فەلسەفی و ئیلاهیات، لەسەر شێوازی بەڵگە هێنانەوەی فەیلەسوف و قوتابخانە عەقڵییەکان راوبۆچوونی مەزاهیبە فیقهی‌یەکان دەخزێنێتە ناو دوو توێی تەفسیرەکەیەوە: کە لە واقیعدا هیچیان لەبواری تەفسیردا نین.

لە ڕاستی‌دا تەفسیرەکەی ئیمام فەخر مەوسوعەیەکی زانستی‌یە لە زانستی کەلامدا، لە زانستی بوونەوەرو سروشتدا، بەمەش گرنگی خۆی لەبواری تەفسیردا لەدەست داوە.

## ٢- البحر المحيط لأبي حيان

ئەبو حەییانی ئەندەلوسی غەرناطی یەکێك بووە لە ناودارو شارەزاکانی جیهانی ئیسلامی و لەبواری لوغەتدا بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرێ، لەبواری زانیاری زانستی تەفسیرو حەدیث و بایوغرافی ریجالی حەدیثداو زانیاری دەربارەی چین و توێژەکان، بە تایبەتی هی مەغریبییەکان دەستی باڵای هەبووە، بەرهەمی زۆرو ناوازەی لەدوای خۆی جێ هێشتووە، هەرە گرنگەکەیان تەفسیرەکەیەتی بەناوی (البحر المحيط) ئەم

---

[1] بۆیە پرۆفیسۆر د.محسن عبدالحمید: کە تێزی دکتۆراکەشی لەسەر رازییە بەناوی (الرازي مفسراً) پێی وایە هەموو تەفسیرەکەی تەواو کردووە.

تەفسیرە لەھەشت بەرگی قەبارە گەورەدایەو بەچاپ گەیەندراوەو لەبەردەستی خوێنەراندایە.

ئەبو حەییان لەم تەفسیرەدا گرنگی داوە بە وجوھو لایەنەکانی ئیعرابو مەسائیلی نەحو بەشێوەیەکی بەرچاو، خیلافاتی نەحوییان باس دەکاو بە درێژیو بەرفراوانی موناقەشەیان دەکاو بەلگەو دەلیلەکانیان رادەنووێنێ، بەجۆرێك وای لێ ھاتووە کتێبەکەی لە کتێبی نەحو بچێ تا لە کتێبی تەفسیر.

وادەبێ ئەبو حەییان لە تەفسیرەکەیدا لە تەفسیری کەشافو تەفسیری ئیبنو عەطییە مەعلومات رادەگوێزێ بەتایبەتی لەبواری نەحوو وجوھی ئیعرابدا، زۆر جاریش رەئیەکەیان رەتدەکاتەوە، ھەندێ جاریش شالاّوی نەقد ئامێزو ھەلّمەتی توندوتیژ دەباتە سەر زومەخشەری، ھەرچەندە جارجاریش شایەتی ئەوەی بۆ دەدا: کە مەھارەتو شارەزاییەکی کەم وێنەی ھەیە لە دەرخستنی رەوانبێژی قورئانو ھێزو توانای دیاریکردنی مەسئەلە بەلاغیەکان، لەھەمان کاتدا زۆر ناڕازییە لەو مەسئەلە ئیعتیزالیانەی زومەخشەری ئاماژەیان پێدەداو رەخنەی توندی ئاراستە دەکاو بە ئوسلوبێکی سیحراویو گالّتە ئامێز رەئیەکانی رەتدەداتەوە، لە ھەموو ئەم رەخنەو رەتدانەوەیەیدا پشت بە کتێبی (التحرير والتحبير لأقوال أئمة التفسير) دەبەستێ: کە بەرھەمو دانراوی مامۆستاکەی (جمال الدين أبى عبدالله محمد بن سليمان المقدسى)یە: کە بە (إبن النقيب) ناسراوە.

ئەبو حەییان لەم مامۆستایەوە ذیکر دەکا: کە گەورەترین کتێبی لە عیلمی تەفسیردا داناوەو ژمارەی جلّدەکانی دەگاتە سەد جلّد، یان لێی نزیك بۆتەوە.

## ٣- الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الاقاويل فی وجوه التأويل للزمخشری

زومەخشەری زانایەکی تاقانەو عەبقەری بووە بەتایبەتی لەبواری نەحوو لوغەو ئەدەبو تەفسیرو بەلاغەدا، راوبۆچوونەکانی لە زمانی عەرەبیدا دەکرێنە شایەدو زانایان ئیستیشهادیان پێ کردوونو دەکەن، چونکە وردبینی ئەصالەتیان لەخۆ گرتووە.

زومەخشەری لەڕوی بیروباوەڕەوە موعتەزیلەیە، لەڕوی فیقهیەوە حەنەفی مەزهەبە، کتێبی کەشافی داناوە بۆ پاڵپشتی مەزهەبو عەقیدەکەی.

ئاڕا ئیعتیزالیەکانی لە تەفسیرەکەیدا نیشانەی زیرەکیو لێهاتوویی و مەهارەتیەتی، ئەو ئیشاراتو تیلنیشانی دوورو ناوازە دێنێ بۆ ئەوەی مەعنای ئایەتەکە بخاتە ناویەوەو بیکاتە هۆکاری سەرکەوتنو بەرزبوونەوەی باڵانسی مەزهەبەکەیو رەتدانەوەی بەرامبەرو خەصمەکانی، وەلێ لەڕوی لۆغەوییەوە، پەردەی لەسەر ئوسلوبی جوانو ناوازەی قورئان هەڵداوەتەوە، سیحری بەلاغەی قورئانی دەرخستووە، بەهۆی ئەو باڵادەستیو شارەزاییو هێزە گشتگیریو قوڵبوونەوەی هەیبوە لە عولومی بەلاغەو بەیانو ئەدەبو نەحوو صەرفدا، لە ڕاستیدا ئەو زاتە مەرجیعو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی لۆغەی عەرەبی بووە، ئەو بۆخۆی لە پێشەکی تەفسیرەکەیدا ئاماژە بەوە دەکا: کە ئەم دیاردانەی تێدا کۆبوونەوەو هەموو ئەو صیفەتە زانستیانەی بە تەواوی کۆنترۆڵ کردوونو تێدا بەرجەستە بوون.

ئەو بۆخۆی لە پێشەکییەکەدا دەڵێ: هەرکەسێك دەست بۆ تەفسیر بەرێو بیەوێ تەفسیر بنووسێ ناتوانێ رۆبچێتە ناو برێ حەقائقو وردەکاری تەعبیری ئەو کەلامە مەگەر پیاوێك بێ لە دوو عیلمی سەرەکیو گرنگو

تایبەت بە قورئاندا شارەزاو ماهیر بێ، ئەو دوو عیلمەش عیلمی مەعانو عیلمی بەیانن، دەبێ ماوەیەکی زۆر ئەسپی خۆی هەلینگ دابێو زەمانێك پێیانەوە خەریك بووبێو تەمەنی خۆی تێدا خەرج کردبن، دەبێ پاڵنەرو هاندەرێکی بەهێز هەڵینابێ بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونو خەرجکردنی وزەو توانای لە پێناو بەدەستهێنانی زانیاری لەبواری زانینی وردەکاری ناو ئەو قورئانەی (حجة الله)یەو نیشانەی دەسەڵاتی رەهایی خودایە، دەبێ بە حەماسەوە سوور بێو هەوڵ بدا ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ خەڵکی رون بکاتەوە، ئەمەش کەی؟ دوای ئەوەی لەباقی عیلمەکانی تردا بەشی خۆی بە تەواوی وەردەگرێ، دوو شتی گرنگ لە خۆیدا کۆدەکاتەوە: تەحقیقو لەبەرکردن، دەبێ زۆر بخوێنێتەوە، موراجەعەو گەڕانەوەی بۆ سەرچاوە زۆر بێ، زۆر شەنو کەوی کردبێ، رەخنەی لێ گیرابێو رەدی دابێتەوە، قاڵ بووبێو لە هەموو بوارەکانی زانستی پێویست بۆ تەفسیر لە بۆتە درابێ، سوارچاکی مەیدانی عیلمی ئیعراب بێ، رابەرو پێشەنگو مامۆستای قوتابیانو هەڵگرانی قورئان بێ، وێڕای ئەمانە هەموو سروشت کراوەبێ، جڵەوی سروشتی بەدەست خۆی بێ، توندڕەوو هەڵچوو نەبێ، کانو قەریحەی زانیاری سەربەخۆ بێو لاساییکەرەوە نەبێ.

ئیبنو خەلدون کتێبی کەشافی زومەخشەری شی دەکاتەوە، لەو کاتەیدا: کە باسی ئەوە دەکا چ تەفسیرێك پەنای بۆ دەبرێو چ تەفسیرێك لەسەر بنەمای زانینی لوغەتو ئیعرابو بەلاغە نووسراوە.

دەڵێ: جوانترین کتێبو ناوازەترین نووسراو: لەناو کتێبەکانی تەفسیردا: کە ئەو فەننو زانستانەی بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش لەخۆ گرتبن، کتێبی کەششافی زومەخشەرییە لە ئەهلی خوارەزمی عێراق، وەلێ ئەوەندە هەیە نووسراوەکەی لەبواری عەقیدەدا بەگوێرەی ئەهلی ئیعتیزالەو هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی بەڵگە ئاراستە بکا لەسەر مەزهەبە

فاسیدەکەی موعتەزیلە لە هەرکاتێکدا توێژینەوە لە ئایەتی قورئاندا بکاو ڕێبازەکانی بەلاغە تاوتوێ بکا، بیروباوەڕە ئیعتیزالییەکەی زەق دەکاتەوە داکۆکی لێ دەکا.

بۆیە (محقیقین)ی ئەهلی سوننە خۆی لی دەبوێرن بە لادان لە ئایینی هەژمار دەکەن، هۆشداری دەدەنە موسوڵمانان بۆ ئەوەی بە حەزەرەوە لێی بڕوانن!.

لە هەمان کاتدا دان بە باڵادەستی زومەخشەریدا دەنێن لەبواری زمانەوانیو بەلاغەتدا، جا ئەگەر ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوەو دەیەوێ سودی زانستی لێ وەربگرێ، دەبێ شارەزای مەزاهیبە سوننیەکان بێو بتوانێ بە باشی داکۆکی لە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەت بکا، ئەوە خوێندنەوەی کەشافو تێڕوانینی بۆ ئەو جۆرە کەسانە هیچ زیانێکی تێدا نیە، چونکە ئەمینو دڵنیایە: کە توشی هەڵەنگوتنو سەرسم نابێ، دەی با ئەو جۆرە کەسانە هەل لە دەست نەدەنو خۆیان لە خوێندنەوەی بێ بەش نەکەن، هەوڵ بدەن موتالای بکەن، سودی زانستی لێ بەدەست بێنن لەبەر ناوازەیی ئەو فەنو ئوسلوبەی زمانەوانی تێدا ڕەچاو کراوە.

بێگومان لەم ڕۆژگارانەدا ڕاڤەو شەرحێکی بەنرخی تەفسیری کەشافمان بەدەست گەیشتووە، نووسینی زاتێکە خەڵکی عێراقەو ناوی (شرف الدین الطیبی)یە لە ئەهلی تەورێزی عێراقی عەجەمە، زۆر زانستانەو وردەکاریانە شەرحی کەشافی کردووە، بەشوێن وشەو ڕستەکانیدا قوڵبۆتەوەو بابەتیانە دواوە، بەرەنگاری مەزهەبە ئیعتیزالیەکەی بۆتەوە بە بەڵگەی بەهێزو بۆڕدەر ڕەئیەکانی زومەخشەری ڕەتکردۆنەوە، ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە بەلاغە لە ئایەتەکەدا بەو شێوە دێتە جێ: کە ئەهلی سوننەو جەماعەت ئاراستەی دەکەن نەك بەو شێوەیەی موعتەزیلەکان دەیبینن، بەڕاستی (الطیبی) شەرحێکی ناوازەی لە کەششاف کردووەو وای لێ کردووە

زۆر سودبەخش بێ، وێڕای ئەوەش لەزۆر فنونی بەلاغە دواوە (وفوق كل ذی علم علیم).[1]

## بەناوبانگترین کتێبە تەفسیرەکانی سەردەمی تازە

بێگومان موفەسسیرینە پێشینەکان مافی تەواویان دابوو بە کتێبە تەفسیرەکانیان، بە تەفسیری مەنقول‌و مەعقول ڕازاندبوویاننەوە، بە بەحث‌و لێکۆڵینەوەی لوغەوی‌و بەلاغی‌و نەحوی‌و فیقهی‌و مەزهەبی‌و کەونی‌و فەلسەفی هاخنیبوویانن‌و  توانای عیلمی خۆیانیان تێدا رۆنابوون.

پاشان ئەو هیمەت‌و وزەو لێبڕانە کەمی کرد، کۆمەڵێك بەناو موفەسسیر هاتنە گۆڕەپانەکەوە، بەکورتکردنەوە، یان نەقڵ کردن، یان لەباردن‌و رەتکردنەوە، یان پیاهەڵدان‌و تەرجیح دان کەوتنە وێزەی تەفسیرە کۆنەکان بەبێ ماندوو بوون خۆیان خستە رێزی موفەسسیرینەوە شتێکی وایان لە تەفسیر زیادنەکرد.

پاشان ئەم رابوونە عیلمییەی چەرخی تازە هاتەکایەوە، زۆر بواری زانستی گرتەوەو شمولی تەفسیریشی کرد، کۆمەڵێك لەزانایانی ئیسلام قۆڵیان لێ هەڵماڵی‌و لەژێر رۆشنایی پێشکەوتنی عیلم‌و زانستدا تەفسیریان نووسین، لەوانە:

---

[1] مقدمة إبن خلدون ص/٤٩١، شایەنی باسە ساڵی/٢٠١٣ی زاینی لەسەر ئەرکی (جائزة دبی للقرآن الكريم) ئەم کتێبە لە حەفدە بەرگدا چاپکراوە بەناوی (فتوح الغیب فی........................)

## ١- الجواهر في تفسير القرآن، للشيخ طنطاوى جوهرى:

شێخی طنطاوی جەوهەری زۆر حەزی لەزانستە کەونییەکان بوو، چ بەخوێندنەوە یان چ بەنووسین‌و وانە گوتنەوە تێیاندا. لەسەرەتا مامۆستاو وانەبێژبووە لە مەدرەسەی (دار العلوم)ی میصردا، بڕێ ئایەتی قورئانی بۆ قوتابییەکانی شی دەکردەوە، لەبڕێ گۆڤارو ڕۆژنامەشدا تەفسیری هەندێ ئایەتی بڵاودەکردەوە پاشان ئەم مەلزەمەو پەڕەگرافانەی کۆکردنەوەو کون‌و کەلێنەکانی پڕکردنەوەو ڕێکی خستن‌و کتێبی (الجواهر في التفسير القرآن)یان لێ پێکهات‌و بەچاپ گەیەندرا.

بێگومان شێخی طنطاوی لەم تەفسیرەدا زۆر گرنگی بەزانستە کەونییەکان داوە، لەزۆر ڕووەوە دەستی بۆ (عجائب الخلق) بردوە، لە تەفسیرەکەیدا ئەوە دەچەسپێنێ: کە لەقورئاندا زیاد لەحەوت صەدو پەنجا ئایەتی عیلمی هەن، موسوڵمانان هەڵدەنێ لەو ئایەتانە وردببنەوە: کە ئاماژە بۆ علومی کەونی دەکەن‌و بیانخەنە بەر باس‌و لێکۆڵینەوە، هانی موسوڵمانان دەدا کار بەناوەڕۆکیان بکەن‌و پێی وایە خەریکبوون بەلێکۆڵینەوە لەو ئایەتانەدا لەئێستادا لەهەموو کارێکی تر لەپێشترو پێویست ترە تەنانەت لەفەرزە ئاینییەکانیش! ئەوەتا بەزەقی بانگەشەی ئەوە دەکا کارکردن‌و لێکۆڵینەوە لەئایەتە کەونییەکاندا زۆر لەفێربوونی زانستی میرات لەپێشترەو دەڵێ: خۆزگە بمزانیایە بۆچی قوڵی خۆمان هەڵناماڵین بۆ لێکۆڵینەوەو خۆ خەریککردن بە ئایەتە کەونییەکانی قورئان بۆچی ئەو گرنگییەی باوك‌و باپیری ئێمە دابوویان بە ئایەتەکانی میرات، ئێمە بەهەمان نەفەس هەمان گرنگی نادەین بە ئایەتی زانستە کەونییەکان؟!

وەڵێ من دەڵێم: سوپاس بۆ خودا! تۆی خوێنەر لەم تەفسیرەدا پوختەی زانستەکانی سەردەم دەخوێنییەوە، دڵنیابە خوێندنەوەو توێژینەوە لەم زانستانەدا گەورەترو پیرۆزترە لە لێکۆڵینەوە لەزانستی میرات

بەشکردندا. چونکە فێربوونی زانستی فەرائیض فەرزی کیفایەیە، بەڵام فێربوون و لێکۆڵینەوە لەم زانستانەی سەردەم بۆ زیاتر خودا ناسینەو فەرزی عەینە لەسەر هەر کەسێك بتوانێ کاریان تێدابکا.

ئەمجار طنطاوی هەوای لەخۆ بایی بوون دەیگرێ و شولی لێ هەڵدەکێشێ و دەست دەکا بەلۆمەو سەرزەنشتکردنی موفەسسیرەکانی رابردوو، دەڵێ: بێگومان ئەم زانست و زانیارییانەی خستومانە ناو تەفسیری قورئان هەمان ئەو زانست و زانیارییەیە: کە جاهیل و نەزانە لەخۆبایی بووەکانی فوقەها پچوکەکانی ئیسلام لێی بێ ئاگابوون و خۆیان لێ گێل کردبوو، ئەمڕۆ سەردەم سەردەمی شۆڕش و (انقلابە)، ڕۆژگاری دەرخستنی حەقیقەت و زانستە، ڕۆژگارێکە عیلم و زانست گەشەی کردوەو دەرکەوتووەو خۆی دەنوێنێ. خودایش ئەگەر بیەوێ بەندەکانی شارەزا دەکا بۆ ڕێبازی ڕاست و دەیانخاتە سەر ڕاستەڕێ. لەڕاستیدا ئەم موفەسسیرە لە تەفسیرەکەیدا چەواشەکاری ئەنجام داوە، تەفسیرەکەی پڕکردووە لەوێنەی درەخت و ڕوەك و گیانلەبەران و مەناظیری سروشتی و تەجرەبەو ئەزمونگەری زانستەکان، کتێبەکەی کەبەناو تەفسیری قورئانە دەڵێی کتێبێکی مەدرەسییە لەزانستەکاندا، لای خۆی حەقائیقی ئایینی ڕوون دەکاتەوە، ناچێ لەسەرچاوە ڕەسەنەکانی توراثی ئیسلامی زانیاری وەربگرێ، پەنا دەبا بۆ قسەکانی ئەفلاتون لە جمهورییەتەکەدا، دەچێ لە ڕەسائیلی (اخوان الصفا)وە شت ڕادەگوێزێ، ڕیاضیات بەکاردێنێ بۆ تەفسیری ئایەتەکان، هەوڵ دەدا ئایەتەکان بەگوێرەی تیوری زانستی تازە ڕاڤە بکا، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو نابێ چاوی لێ بقوچێندرێ.

بەبڕوای ئێمە شێخی طنطاوی جەوهەری خراپەو تاوانی لەبواری تەفسیردا ئەنجامداوە، لەکاتێکدا خۆی لای وایە کارێکی باش و پیرۆزی کردووە، لەڕاستیدا تەفسیرەکەی لای زۆربەی ڕۆشنبیران پێشوازی لێ نەکراو

مەقبوول نەبوو، چونکە تەعەسسوفو لەحەق لادانی تێدایە، مەعنای وای بۆ هەندێ ئایەت کردووە بەهیچ جۆرێ ئەو مەعنایە بۆ ئەو ئایەتە نابێو ناگونجێ، ئەم بەزۆرە ملێ بەسەریدا سەپاندووە، بۆیە وەصفی ئەم تەفسیرەش بەهەمان ئەو وەصفە کراوە کەبۆ تەفسیری رازی کراوە (فیه کل شیئ الا التفسیر) جگە لەتەفسیر هەموو شتێکی تری تێدایە.

## ٢- تفسیر المنار للسید محمد رشید رضا:

بێگوما شێخ محمد عبده، راچەنینو رابوونێکی زانستی پیرۆزی هێنایە گۆڕێ، بەبیرکردنەوەو بەخۆدا چوونەوەیەکی ئیسلامیانەو سەردەمیانە هاتە مەیدانی بزوتنەوەو دەعوەی ئیسلامییەوە، بەروبوومی ئەم رابوونە زانستییە ئایینیە لەقوتابییەکانیدا رەنگی دایەوە، ئەم رابووونە لەسەر بنەماکانی وەعی ئیسلامی بنجی بەستو لقو پۆپی هاویشتن، لەئاکامی دەرککردنی مەفاهیمە کۆمەڵایەتییەکانی ئیسلام سەری هەڵداو گەشەی کرد، لە هەستکردن بەو راستییەی کە ئەم ئایینە چارەسەری پێیە بۆ نەخۆشیو مەشاکیلە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەم ئەم حەرەکە نوێخوازە پیرۆزە ئیسلامییە خۆی دەرخست، بێگومان بناغەی ئەم شۆڕشە ئیسلامییە لەبزوتنەوە ئیسلامییەکەی جەمالوددینی ئەفغانییەوە دروست بوو، ئەو جەمالوددینەی خۆرهەڵاتی شڵەقاندو لەخەوی بێداری رایپەڕاندن.

ئەو زاتەی شێخ محمد عبده قوتابیو شاگردی بوو لەخزمەتیا بەهرەمەند بوو پێگەییشت، شێخ محمد عبده لەزانکۆی ئەزهەر دەرسی تەفسیری بەقوتابیەکانی دەگوتەوە، زۆرێك لەقوتابیانی ئەوەندە تامەزرۆی محازەرەو دەرسەکانی بوون، نەیاندەتوانی لێی دابڕێنو واز لەگوێگرتن لەدەرسەکانی بێنن، لەناو قوتابییەکانیشیدا (شێخ محمد رشید رضا) لەهەموانیان پتر سووربوو لەسەر ئامادەبوونی لەکۆڕو دەرسەکانیدا،

لەهــەموانیان زیــاتر لێــبڕا بــۆ گــوێگرتن لــەموحازەرەکانی نوســینەوەو کۆنترۆڵکردنیان.

بــەجۆرێك دەتوانــدرێ بگــوترێ میراتگــری یەکــەمو بــێ رکابــەر بــوو بۆزانیــاری شــێخ محمــد عبــدە، بــەروبوومی ئــەم مولازەمــەو لەخزمــەت خوێندنەی کە لە تەفسیرەکەیدا دەرکەوت کە بەناوی (تفسير القرآن الحكيم) ناوزەد کراو بە (تفسير المنار) مەشهوور بوو: کە نیسبەتی درا بۆلای (مجلد المنار) کە شێخ رشید رضا دەری دەکرد.

شــێخ رشــید رضــا لەســورەتی (البقــرة)وە دەســتی بــە تەفــسیرکردنی قورئان کرد لەسورەتی یوسف لە ئایەتی (١٠١)دا کۆتایی پێ هاتووە، لەسەر ئایەتی ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنْ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ – يوسف/١٠١﴾ وەستاوە چونکە مەرگ بەربینگی پێ گرتو ماوەی نەدا تەفسیرەکە هەمووی تەواو بکا، ئەوەی نووسراوە لەسەرەتای سورەتی (البقرة)ەوە تا ئایەتی (١٠١) سورەتی یوسف لەدوانزە بەرگدا چاپکراوە.

تەفسیری المنار تەفسیرێکە بەریوایاتی مەئثور لە سەلەفی صالحی ئومەتی ئیسلامەوە، لە هاوەڵانو تابیعیینەوە دەوڵەمەند کراوە، بەزمانێکی پاراوو رەوان، بە ئوسلوبو شێوازێکی بەلاغەت ئامێز نووسراوە، بەئاراستەکردنی سوننەنە خوداییەکان لەکۆمەڵگادا رازێنراوەتەوە، راڤەی ئایەتەکان دەکا بەشێوازێکی رائیعو سەرنج راکێش، مەعناکان بەعیبارەتی سەهلی مومتەنیع دەخاتە روو، زۆر لە موشکیلاتەکانی تەفسیر روونەکاتەوە، رەددی گومانگەلێکی زۆری ناحەزانی ئیسلام دەداتەوە، لەژێر رۆشناییی هەددی قورئاندا نەخۆشییەکانی کۆمەڵ چارەسەردەکا.

شێخ رشید رضا بۆخۆی ئەوە دەدرکێنێ: کەئامانجی لەنووسینی ئەم تەفسیرە ئەوەیە موسوڵمانان لەقورئان حاڵی بین لەم رووەوە: کە دەستووری

ئایینێکه خەڵکی شارەزا دەکا بۆ گرتنەبەری ڕێبازێك کە بەختەوەری دونیاو کامەرانی قیامەتیانی تێدا دەستەبەر دەبێ.

## ٣- في ظلال القرآن للسيد قطب:

بێگومان حەرەکەو رابوونی (اخوان المسلمین): کە شەیخی شەهید حەسەن بەنا دەیمەزراند، بەگەورەترین شۆڕشی ئیسلامی سەردەم دادەنرێ، کاریگەرترین حیزبی ئیسلامییە لەجیهانداو ئەمە راستییەکی حاشا هەڵنەگرەو ناحەزانیشی ناتوانن ئینکاری ئەو فەزڵو هۆشیارکردنەوەی بکەن: کە لەعالەمی ئیسلامی‌دا هێنایە کایەوەو لەرۆژی سەرهەڵدانییەوە تا ئێستا لەسەرتاسەری جیهان رۆڵی ئەرێنی دەگێڕێو کاریگەری خۆی لەدەست نەداوە رۆژ دوای رۆژ گەنج دەبێتەوەو پەل دەهاوێ.

شۆڕشی ئیخوانولموسلمین هێزو تاقەتی گەنجانی موسوڵمانی تەقاندەوە بۆ خزمەتی ئیسلامو بەهێزکردنی شەریعەتیو بەرزکردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) بیناکردنی مەجدو شکۆمەندی گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ ژێر دەستی ئیسلام.

چەندێك بگوترێ دەربارەی ئەو رووداوانەی تووشی ئەم جەماعەتە بووە، بێگومان کاریگەری ئەمان لەڕووی فیکرەوە کەس نییە بڵێ وانیە.

لەم جەماعەتە زانایەکی تاقانە، بیردۆزێکی ئەلمەعیو بەتوانا دەرکەوت، ئەویش شەهید سید قطبە، ئەو شەهیدەی فیکری ئیسلامی لە فەلسەفەدا رانواندو پەردەی لەسەر مەفاهیمە راستو دروستەکانی لاداو بەئاشکراو بەڕوونی مەفهوومەکانی ئیسلامی رونکردنەوە، ئەم زاتە بەشەهیدی گەڕایەوە بۆلای خودا، لەپێناو ئایینەکەی‌دا پلەی شەهادەتی بەدەست هێنا، لەدوای خۆی توراثیکی فیکری رەسەنی جێ هێشت،

لەپێشەنگی ئەو بەرهەمە بەنرخانەی تەفسیری (في ظلال القرآن)ە ئەم کتێبە تەفسیرێکی تەواوی ژیانە لەژێر رۆشنایی قورئانو هەدیی ئیسلام.

ئەم زانا شەهیدە لەژێر سێبەری قورئانی حەکیمدا ژیاوە — وەکوو لەناونانی تەفسیرەکەیدا دەردەکەوێ - شیرینی قورئانی هەڵمژیوەو تەعبیری لە هەستەکانی خۆی بەئەوپەڕی راستگۆییەوە داوەتەوە لەئاکامدا گەیشتۆتە ئەوە: کە مرۆڤایەتی ئەمڕۆ لە بەدبەختیو چارە رەشیدا دەژین، بەهۆی ئەو مەزاهیبە روخێنەرانەوە کە سەرجەم دونیای گرتۆتەوەو هەمیشە ئادەمیزاد لە سیراعو کێبڕکێدایەو لەهەموو ئاقارێکەوە خوێن دەچۆڕێو مرۆڤایەتی لەم بەدبەختیو چارە رەشییە بەگەڕانەوە بۆ ئیسلام نەبێ رزگاری نابێ.

لەپێشەکی تەفسیرەکەیدا دەڵێ: لەژێر سایەی قورئاندا کۆتاییم بەفەترەیەکی ژیانم هێناو بڕوای تەواوم بۆ پەیدابوو: کە چاکسازی لەم زەوییەدا نایەتەدیو ئەم مرۆڤایەتییە راحەتو ئاسوودەیی بەخۆیەوە نابینێو ئەم ئینسانە دڵ ئارامی بۆ دەستەبەر نابێ، سەرکەوتنو پێشکەوتن نایەنەدی پاکیو گونجان لەگەڵ سونەنەکانی کەونداو لەگەڵ فیترەتی ژیاندا نابینێ مەگەر بە گەڕانەوە بۆ لای خوا. گەڕانەوەش بۆلای خودا — وەکوو لە في ظلال القرآن دا دەردەکەوێ — یەك شێوەو یەك وێنەی هەیە. یەك رێگای هەیەو بەس، یەکەو دووی نیە!!

بێگومان ئەو گەڕانەوە گەڕانەوەیە بە ژیان لەهەموو بوارەکانیداو بەهەموو جۆرەکانیەوە بۆ مەنهەجو دەستوری خودا، ئەو مەنهەجەی خودا بۆ خۆی خەریتەی کێشاوە بۆ مرۆڤایەتی، لەنامەی پیرۆزی خۆیدا وێنای کردووە، ئەویش بریتییە لەوەی ئەو نامەیەی ناوی قورئانە لەژیانی خۆیاندا تەنفیذی بکەن بیکەنە دادوەرو پابەندی بنو بە موو لێی لانەدەنو هەموو کاروبارێکی ژیانیان بەپێی ئەو نامە خودایییە جێبەجێ بکەن. ئەگینا فەسادو گەندەڵی لەزەویدا بەرپا دەبێ، بەدبەختیو چارە رەشی سواری شانی

مرۆڤایەتی دەبێ، مرۆڤەکان هەموویان لەناو زلکاوی ژیاندا لەناو قوڕدا لەژێر سایەی جاهیلیو نەزانیدا کات بەڕێ دەکەن بەدبەختیو چارە رەشی بۆخۆیان دەهێننە دی، جاهیلییەتێك بالاّ دەست دەبێ، لەجیاتی خودا هەواو ئارەزۆ دەپەرستڕێ. (فان لم یستجبوا فاعلم) بێگومان ئحتیکام بۆ مەنهەجی خودا لەنامەکەیدا سوننەتو تەطەوع نیە، شوێنی بە تاقیکردنەوەش نیە، بەڵکوو یان ئیمان، یان بێ ئیمان. حەدی ناوەند نیە. ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنْ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ ، إِنَّهُمْ لَنْ يُغْنُوا عَنكَ مِنْ اللَّهِ شَيْئاً وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ – الجاثية/١٨–١٩﴾.

لە روانگەی ئەم راستیانەوە مامۆستای شەهید سید قطب رێڕەوێکی بۆخۆی داناوە، ئەو سەرەتا تارمایییەك بەگشتی لە سورەتەکە دەخاتە ڕوو، بەشەکانی سورەتەکە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئامانجەکانی ڕووندەکاتەوە، مەبەستەکانی رادەنوێنێ، پاشان دەست دەکا بە تەفسیرکردنی ئایەتەکان، سەرەتا ڕیوایەتی مەئثوری صەحیحو راست رادەگوێزێ، خۆ لەباسو خواسی زمانەوانی دەپارێزێ ئیکتیفا بە ئیشارەتێکی عابیرو سەردەستەکی دەکاو بەس، بە دەگمەن نەبێ لا لە لایەنی بەلاغیو فەلسەفی ناکاتەوە، ئەو هەوڵ دەدا هەستەکان بوروژێنێ، وەعیو تێگەیشتن بە خەبەر بێنێ، تەصیحەی مەفاهیمەکان بکا، ئیسلام بە ژیانەوە ببەستێتەوە، یان بڵێ: ژیان بە ئیسلامەوە پەیوەست بکا.

تەفسیری (فی ظلال القرآن) بە دوو شێوەو قەبارە چاپکراوە، چاپێکی لە هەشت بەرگدایەو چاپێکی لە شەش بەرگدا، چەند جارێك لەچاپ دراوەو رۆشنبیران پێشوازی باشیان لێ کردووەو کەم کتێبخانە هەیە ئەو تەفسیرە پیرۆزەی لەخۆ نەگرتبێ.

لە راستیدا ئەم تەفسیرە سامانێکی فیکری کۆمەڵایەتی ئەدەبی دەوڵەمەندە، هیچ موسوڵمانێکی ئەمڕۆ لێی بێ ئاتاج نیە!!.

## ٤- التفسير البياني للقرآن الكريم: نووسینی عائیشة عبدالرحمن (بنت الشاطئ):

یەکێك لە ئافرەتە ڕۆشنبیرە هاوچەرخەکانمان: کە ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە لەبواری ئەدەبی عەرەبیو فیکری کۆمەڵایەتیدا، دوکتۆرە (عائیشە عبدالرحمن)ە: کە نازناوی (بنت الشاطئ)ی هەڵگرتووە.

ئەم خانمە ئەرکی دەرس گوتنەوەی لە کۆلیجی ئادابی قاهیرەو کۆلیجی تەربیە (للبنات)ی لە ئەستۆ گرت، بەشێك لەو دەرسانەی دەیگوتنەوە تەفسیری بڕێ کورتە سورەتی قورئان بوو، دوایی ئەم محاضراتانە کۆکرانەوە چاپکران لەژێر ناوی (التفسیر البیانی للقرآن).

(بنت الشاطئ) لە تەفسیرەکەیدا گرنگی داوە بە بەیانی عەرەبی، لە پێشەکی کتێبەکەیدا باسی ئەوە دەکا: کە ئەم ڕێبازەی دۆزییەوە بۆ ئەوەی چارەسەری موشکیلەی موسوڵمانان بکا لە ژیانی ئەدەبیو لۆغوییاندا، دەڵێ: من ئەم باسەم خستۆتە ڕوو، لە موئتەمەری نێودەوڵەتی ڕۆژهەڵاتناساندا ساڵی/١٩٦٤ لە هیند، بابەتی محاضەرەکەم کە لە بەشی توێژینەوە ئیسلامییەکاندا ئاراستەی کۆڕەکەم کرد، بریتی بوو لە (مشكلة الترادف اللغوى فى ضوء التفسير البيانى للقرآن الكريم) بوو، دەڵێ: من لەم توێژینەوەمدا ئەوەم ڕون کردەوە: کە من دوای بەدواداچونێکی ورد بۆ موعجەمی ئەلفاظی قورئانو تێفکرینو لێکۆڵینەوە لە بارەی دەلالەتکردنی ئەو ئەلفاظانە هەریەکەیان لە سیاقو شوێنی خۆیدا، گەیشتمە ئەم ئاکامە: کە قورئان لەفظ بەکاردێنێ بە دەلالەتێکی سنووردار کە مومکین نیە لەفظیك لەشوێنی لەفظیکی تر دابندرێ دەربارەی یەك مەعنای وا: کە قاموسە لوغەوییەکانو کتێبەکانی تەفسیر کۆمەڵێك وشەی بۆ کۆ دەکەنەوە کەم یان زۆر لەو وشانە بە ئەلفاظی مترادفەیان دادەنێن.

ئەم خانمە ڕەخنە لەوە دەگرێ: کە لەخوێندنو دیراسەی ئەدەبیدا مامۆستاو قوتابی خۆیان خەریك دەکەن بە شیعری موعەلەقاتو حەماسیاتو ڕوناکەنە دیراسەی قورئانو ئاستی ئەدەبی خۆیانی پێ بەرز ناکەنەوە، پاشان دەڵێ: ئێمە لە زانکۆدا ئەم خەزێنە بەنرخە: کە دەرسی تەفسیرە پاشگوێ دەخەینو گرنگی پێ نادەین، کەم کەسمان هەیە هەوڵ بدا قورئان بخاتە ناو پرۆسەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، لە جیاتی دیوانەکانی شیعری عەرەبیو پەخشانی گەورە ئەدیبانی بەیانی عەرەبی، گرنگی بە قورئان بدا، ئەو ئەرکەی ئێمە تێیدا کەمتەرخەم بووینو لە دەستمان چوو ئەوان لە کیسی خۆیانی نەدەن.

هەڵبەتە تەفسیری بەیانی هەوڵو تەقەلّایەکی پیرۆزەو گرنگی پێدانی بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستانەی (بنت الشاطئ) کردوونی بە ئامانجو هەوڵی بۆ داون لە قازانج زیاتر هیچی تری لێ ناکەوێتەوە، هەڵبەتە ئەم هۆزانڤانە بەڕێزە لەم بوارەدا پشت بە ئەو تەفسیرانە دەبەستێ: کە گرنگیان داوە بە لایەنەکانی بەلاغەی قورئانیو بە ئەدەبێکی بەرزو راقی تەعبیر لە مەبەستەکان دەداتەوە.[1]

---

[1] ترسی ئەوە هەیە لە پەیڕەویکردنی ئەم جۆرە تەفسیرەدا لایەنەکانی تری قورئان: کە زۆرو هەمەجۆرن، پاشگوێ بخرێن، وەکوو نهێنیەکانی ئیعجازی قورئان لە ماناکانیدا، لە تەشریعاتەکانیدا، لە ئەحکامەکانیدا، هەروا مەبادیئەکانی بۆ فەراهەم هێنانی ژیانی بەختەوەر بۆ مرۆڤایەتی، هەروا ترسی ئەوەشی تێدایە دەقی قورئانی وەربگیرێ وەکوو دەقێکی ئەدەبیو مامەڵەی دەقی شیعرێك، یان پەخشانێکی لەگەڵدا بکرێ، چونکە دیراسەی دەقە ئەدەبیەکان پشت بە زەوقی لۆغەوی دەبەستێو ئەمەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جوداوازیو بەرزونزمی تێدایە، ئاشکراشە قورئان کتێبی هیدایەتە نەك ئەدەب.

هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بە سەلیقەو تێگەیشتنی عەرەب زمانی خۆیان لە قورئان حاڵی دەبوون‌و دەیانزانی بەم ئایەتە، یان بەو ئایەتە مەبەستی چیە؟ جارجارەش ئەگەر لە مانای ئایەتێك حاڵی نەبوونایە دەگەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ماناکەی بۆ ڕون دەکردنەوە.

کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد فەقیهە گەورەکانی صەحابە بە قیادەی خەلیفە راشیدینەکان ڕێنمویی ئوممەتیان خستە سەرشانی خۆیان، هەندێ قەضایاو ڕوداو هاتنە کایەوە لەوەپێش ڕویان نەدابوو، ئەگەر شتێکی وایان بهاتایە پێش دەگەڕانەوە بۆ قورئان بۆ ئەوەی حوکمی ئەو ڕوداوە تازە دەربێنن، هەموویان یەکدەنگ دەبوون لەسەر مانایەك‌و ئیجماعیان لەسەر دەکرد، کەم واهەبووە لەکاتی تەعاروضی دوو دەقدا خیلافیان لەناودا بەرپا بێ، وەکوو راجیاییان دەربارەی عیددەی ئافرەتی سکپڕی مێرد مردو، ئایا عیددەی بە دانانی سکەکەیەتی، یان بە تێپەڕبوونی چوار مانگ‌و دە شەوە، یان بە دوورترین کاتە لەم دوو ماوە، کامەیان زۆرتر بوو ئەوە دەبێتە کاتی تەواوبوونی عیددەکەی؟!

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً – البقرة/٢٣٤﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُوْلاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ – الطلاق/٤﴾ هەبوونی ئەم حاڵەتانە هەرچەند کەم‌و نادر بوون سەرەتای پەیدابوونی خیلافی فیقهی بوو لە تێگەیشتنی ئایەتەکانی ئەحکام: کە سەردەمی چوار ئیمامە سەر مەزهەبەکان هات هەر ئیمامێك ئوصول‌و قاعیدەو یاسایەکی پەیڕەوکرد بۆ دەرهێنانی ئەحکام لە مەزهەبەکەیدا، ئیتر لەوەدوا ڕوداوی تازەو جۆراوجۆر

هاتنە کایەوە، مەسائیلەکان بەرفراوانو هەمە جۆر بوون، راوبۆچوون لە تێگەیشتنی برێ ئایاتدا زۆر بوو، بەهۆی جوداوازی نێوان وجوهو چۆنیەتی دەلالەتکردنی دەقەکە لەسەر حوکمەکە بەبێ ئەوە دەمارگیری بۆ مەزهەبی تێدا بەرچاو بگیرێ بەڵکوو بەهۆی پابەندبوونو پەیرەوی کردنی ئەوەی فەقیهەکە بەلایەوە حەقو راستە.

هیچ کامێکیش لەو خاوەن مەزهەبو فەقیهانە ئەگەر بۆیان دەرکەوتبێ: کە رای حەقو راست لای غەیری خۆیەتی زۆر بەسنگ فراوانیيەوە وازی لە رای خۆی هێناوەو گەڕاوەتەوە بۆ رای حەق.

ئەم حاڵەتو دابو نەریتە ئاوا بەردەوام بوو تا سەردەمی تەقلیدو دەمارگیری مەزهەبی هاتە کایەوە، ئیتر شوێنکەوتەی مەزهەبەکان هەوڵو کۆششی خۆیان کورت هەڵێنا لەسەر ڕونکردنەوەی مەزهەبی خۆیانو سەرخستنی بەسەر مەزهەبەکەی تردا، تەنانەت ئەگەر لە ڕێگەی ئەوەشەوە بێ: کە مانایەکی مەرجوحو دوور بۆ ئایەتەکە دابنێو مانا صەحیحو نزیکەکەی پاشگوێ بخا، تەفسیری فیقهی بۆ ئایەتەکانی ئەحکام لە قورئاندا سەری هەڵدا، ئیتر وابووە دەمارگیری مەزهەبی توندو توندڕەوی بەخۆوە بینیوەو وابووە کەمێ خاو بۆتەوە!

ئیتر هەتا سەردەمی تازە ئەم مەنهەجو پرۆگرامە ئاوا بەردەوامەو پەیڕەوی دەکرێ، ئەمەش پێی دەگوترێ: (التفسير الفقهي) گرنگترین کتێبی تەفسیری ئەم بوارە ئەمانەن:

١- أحكام القرآن للجصاص

٢- أحكام القرآن للكيا الهراس.

٣- أحكام القرآن لابن العربي.

٤- الجامع لأحكام القرآن للقرطبي.

٥- الاكليل في استنباط التنزيل للسيوطي.

٦- التفسيرات الأحمدية في بيان الآيات الشرعية لملاجيون.

٧- تفسير آيات الأحكام للشيخ محمد السايس.

٨- تفسير آيات الأحكام للشيخ محمد الشنقيطي.

٩- أضواء البيان للشيخ محمد الشنقيطي.

ئێستاش لێره بەملاوه فەهرەسەی وەصفی بۆ ئەو کتێبانه دەکەین.

## ١- أحكام القرآن للجصاص:

ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی عەلی (ألرازی) مەشهوور بـه (ألجصاص) ئەم نازناوەی لەوه وەرگرتووه: که کاری کەچکاری کردوه. ئەم زاته یەکێکه له ئیمامەکانی فیقهی حەنەفی له چەرخی چوارەمی کۆچیدا، ئەم کتێبەی جەصاص یەکێکه له کتێبەکانی تەفسیری فیقهی بەتایبەتی لای حەنەفییەکان.

دانەر لەم کتێبەدا کاری خۆی کورت هەڵێناوه لەسەر تەفسیری ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان به ئەحکامی فەرعییەوه هەیه ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك دێنێ، پاشان بەریوایەتی مەئثور شەرحییان دەکا، هەر مەسەلەیەکی فیقهی لەو مەسائیله فیقهییانەی پەیوەندییان به ئایەتەکەوه هەبێ، بەدورو نزیك، باسی کردوه خیلافاتی مەزهەبی دێنێو شییان دەکاتەوه، مرۆڤ: که ئەو کتێبه دەخوێنێتەوه وادەزانێ کتێبێکی فیقهی دەخوێنێتەوه نەك کتێبی تەفسیر.

جەصاص دەمارگیرییەکی توندڕەوانەی بۆ مەزهەبی حەنەفی هەبوه، ئەم دەمارگیرییەی وای لێ کردووه زێدەڕۆیی و تەعەسوف بەکاربێنێ بۆ تەفسیری ئایەتەکانی ئەحکام و تەئویلیان بکا بۆ سەرخستنی مەزهەبەکەی، زۆر بەتوندی ڕەددی نەیارەکانی مەزهەبی حەنەفی دەداتەوه، زۆر پێچ و پەنای نالەبار دەکا بۆئەوه تەئویلێك بسازێنێ و مەزهەبی خۆی سەربخا،

تەنانــەت جــاری واهەیــە تــەئویلی وادەکــا خوێنــەر دەتۆرێنــێو درێــژە بەخوێندنــەوەی عیبارەتەکــەی نــادا، چــونکە لــەکاتی موناقەشــەکردنی مەزهەبەکانی تر قسەی زۆر روشێنەر دەکاو چرنوکی بەئازار دەگرێ.

جەصاص بـەگوێرەی تەفسیرەکەی وادەردەکـەوێ لـەرووی عەقیـدەوە بیروباوەڕی موعتەزیلەی هەیـە، بۆنموونـە لـە تەفسیری ئایـەتی ﴿لا تُدْرِكُـهُ الأَبْصَارُ – الأنعام/١٠٣﴾. دەڵێ: ماناکەی ئەوەیە، چاو نایبینێ، ئەمـە جۆرە مەدحێکە بەوە کە نەفی بینینـی دەکا بەچاو، وەکوو چۆن دەفـەرموێ: ﴿لا تَأْخُـذُهُ سِـنَةٌ وَلا نَـوْمٌ – البقـرة/٢٥٥﴾. هەرشـتێکیش خـودا بەنـەفی کردنـی لەخۆی مەدح بێ، بێگومان چەسپاندنی دژەکەی زەمو نەقصە، بەهیچ حاڵێك دروست نیە ئیثباتی نەقیضەکەی بکەین. جا کـەخودا مـەدحی خـۆی دەکا بەوەی بەچاو نابیندرێ، بەهیچ جۆرێـك دروسـت نیـە پێچەوانەکەی ئیثبـات بکەین بۆی، چونکە بەوە صیفەتی نـەقص بـۆ خـودا بڕیـار دەدەیـن. دروست نیە بڵێین: ئایەتەکە تەخصیص دەکرێ بە ئایەتی ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِـرَةٌ، إِلَـى رَبِّهَا نَـاظِرَةٌ – القيامـة/٢٢-٢٣﴾ ئیحتیمـالی چـەند مانایـەکی هەیـە، لەوانـە: چاوەڕوانی پاداش، وەکوو لەکۆمـەڵێك لـە عولـەمای سـەلەفەوە ریوایـەتکراوە، جـا کـە ئیحتیمـالی تـەئویلی هـەبوو دروسـت نیـە بیکـەی بـە ئیعـتیراضو رەتدانــەوە بۆســەر شــتێك: کــە رێگــای تــەئویل کردنــی تێدانــەبێ، ئــەو ئەخبارانەی دەربارەی بینینی خـودا ریوایـەتکراون – ئەگـەر صـەحیح بـن – مەبەست لێیان زانیارییە، واتە زانیارییەك کە شوبهەو گومانی تێکەڵاو نـەبن شـكو رارایـی تێدانـەبێ. چـونکە وشـەی (رؤيـة) لـە لۆغـەت بـەمانا (عـیلمو زانیاری) هاتووە.[1]

---

[1] بڕوانە أحكام القرآن للجصاصا ج٣/٥.

ئەم کتێبە تەفسیرە لەسێ جلْدا چاپکراوە، هەرکەسێ بیەوێ دەتوانێ پەیدای بکاو بیخوێنێتەوەو سەرچاوەیەکی گرنگی فیقهی حەنەفییە.

## ٢- أحكام القرآن لابن عربي:

ئەبوبەکر موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد (العافری، الأندلسی، الاشبیلی) یەکێکە لە ئیمامە گەورەکانو زانایانی ئەندەلوس کە خاوەنی زانیارییەکی بەرفراوان بووە، ئەم زاتە لەسەر مەزهەبی ئیمام مالیکە، کتێبەکەشی (أحکام القرآن) گرنگترین تەفسیری فیقهییە لەلای زانایانی مالیکی.

(ابن عربی) لە تەفسیرەکەیدا پیاوێکی میانەڕەوو خاوەن ویژدانە، دەمارگیری بۆ مەزهەبی خۆی تێدا نیە، بۆ ڕەتدانەوەی ئاڕای دژەکانی توندڕەویو تەعەسسوف بەکارناهێنێ وەکوو (ألجصاص) پەیڕەوی کردووە، هەرچەندە چاوی قوچاندوە لەهەموو هەڵەیەکی زانستی کە لە موجتەهیدێکی مالیکییەوە سەری هەڵدابێ.

ئەم زاتە لە کتێبەکەیدا راو بۆچوونی زانایان لەسەر تەفسیری ئایەتەکە باس دەکاو تەنها ئەو ئایەتانە تەفسیر دەکا کە ئەحکامیان لەخۆگرتووە، بەیانی ئیحتیمالاتە جۆراوجۆرەکان دەکا: کە مەزهەبە فیقهییەکان خستویاننەڕوو، خاڵ بەخاڵ تەفسیری ئایەتەکە دەکاو بۆ هەموو خاڵێك عینوانێك دادەنێ، بۆ نموونە دەڵێ: (المسألة الأولى ... المسألة الثانية...) ئاواو بەو جۆرە، زۆر بەکەمی لە ڕەتدانەوەی موخالیفەکانیدا توندڕەوی بەکاردێنێ، بۆ نموونە لە تەفسیرکردنی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ – المائدة/٦﴾ دەڵێ: مەسئەلەی یانزەهەم فەرموودەی خودا (فاغسلوا) شافیعی – کە لەلای هاوەڵانی وەکوو (محمد بن عدنان) وایە لە ڕەوانبێژیدا بەڵکوو ئەوو ئەبو حەنیفەو غەیری ئەویش

پێیان وایە وشەی (غسل) بریتییە لەوەی ئاو بەو شتەدا بکەی کە دەیشۆی بەبێ دەست لێ خستن. بێگومان ئێمە لە مەسائیلی خیلافدا پووچی راو بۆچوونی ئەو زاتانەمان بەیان کرد، هەروا لە سورەتی (النساء)یشدا ئەوەمان خستە روو: کە رەئیەکەیان فاسیدەو وانیەو ئەوەمان چەسپاند کە (غسل) بریتییە لەئاو پێداکردنی ئەو شتەی دەتەوێ بیشۆی‌و وێڕای دەست لێخستن‌و هەلگلۆفتن‌و شتی وا.[1]

ئیبنولعەرەبی لە تەفسیرەکەی‌دا بۆ دەرهێنانی ئەحکام، هەمیشە لۆغەت دەکا بە حاکم‌و لەوێوە زانیارییەکانی خۆی ئاراستە دەکاو خۆی دەپارێزێ لە ئیسرائیلیات‌و داوا دەکا ئەو جۆرە ریوایەتانە رەفزبکرێن‌و نەخرێنە ناو باس‌و لێکۆڵینەوە، هەروەها رەخنەی بنیاتنەر لە حەدیثی زەعیف دەگرێ‌و هۆشداری دەدا لەوەی پەنای بۆ ببرێ‌و بکرێتە کەرەسەی باسی ناو تەفسیر.

ئەم کتێبە چەند جارێك چاپکراوە، هەندێ جار لەدوو بەرگداو هەندێ جار لەچوار بەرگداو بەئاسانی لەبەردەستی خوێنەران دایە.

## ٣- الجامع الاحكام القرآن لابي عبدالله القرطبي:

ئەبو عەبدوڵلا: (محمد بن أحمد بن ابي بكر بن فرح الأنصاری الخزرجي الأندلسی) یەکێکە لەزانا فەقیهە تاقانەکانی مالیکی، بەرهەمی زۆری هەیە، بەناوبانگترینیان کتێبی تەفسیرەکەیەتی: (الجامع الأحكام القرآن).

شێخی قورطوبی لە تەفسیرەکەی‌دا تەنها ئایەتەکانی ئەحکامی تەفسیر نەکردووە، بەڵکوو بە تەرتیب هەموو قورئانی تەفسیر کردووە،

---

[1] بڕوانە ج١/٢٣٢.

تەفسیر کردنەکەشی زۆر لایەنی گرتوونەوە، سەبەب نزولی باس کردووە، جۆرەکانی قیرائاتی راگواستوون، دەستی بۆ ئیعراب بردووە وشەی غەریبی شەرح کردووە، هەموو قەولەکان پاڵ بێژەرەکانیان دەدا، نەکەم نەزۆر چیرۆكو سەرگورشتەی موفەسسیرەکانو ئەخباری مێژوو نووسان باس ناکاو پاشگوێی خستوون، مەعلومات لەزانا پێشینە متمانە پێکراوەکان نەقڵ دەکا، بەتایبەتی لەو زانایانەی لەبواری ئەحکام کتێبیان نووسیون، لەئیبنو جەریرو ئیبنو عەطیەو ئیبنولعەرەبیو الکیاهراسو ئەبوبەکری (الجصاص).

قورطوبی لەباسی ئایەتی ئەحکامدا زانستی خۆی پەخش دەکا، مەسەلە خیلافیەکان دێنێو بەڵگەی هەموو رەئیەکان دەخاتەڕوو تەعلیقیان لەسەر دەدا هەرگیز تەعەصوبو دەمارگیری بۆ مەزهەبەکەی کە مالیکییە، لە تەفسیرەکەیدا بەرچاو ناکەوێ، بۆ نموونە لە تەفسیری ئایەتی ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ - البقرة/١٨٧﴾ لە مەسەلەی دوانزەهەمی تەفسیری ئایەتەکەدا - دوای ئەوەی راجیایی زانایان دیاری دەکا دەربارەی حوکمی کەسێك لەرۆژی رەمەزاندا لەبیری بچێ: کە بەرۆژووە شت بخوا، ئەوە دێنێ: کە لای ئیمام مالیك رۆژووەکەی دەشکێو پێویستە رۆژووەکەی قەزابکاتەوە - دەڵێ: بەلای غەیری مالیکەوە رۆژووەکەی ناشکێ هەرکەسێك نەزانێ بەرۆژووە شت بخواو بخواتەوە رۆژووەکەی ناشکێ، من دەڵێم: ئەم رایە صەحیحەو بەم شێوەش جەماوەری زانایان فەرموویانە: بێگومان کەسێك لەبیری بچێ کە بەرۆژووە شت بخواو بخواتەوە قەزاکردنەوەی لەئەستۆ نیەو رۆژووەکەی تەواوو صەحیحە، ئاماژە بە حەدیثی ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا أَكَلَ الصَّائِمُ نَاسِيًا أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ سَاقَهُ اللَّهُ تَعَالَى إِلَيْهِ وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِ».

ئەتۆ دەبینی شێخی قورطوبی بەم رایە پێچەوانەی مەزهەبی خۆی بڕیاری

داوەو بە ئەوپەڕی بەرپرسیارییەوە ویژدانی خۆی بەکارهێناوەو مافی داوە بەکەسانێك كە لەسەر مەزهەبی ئەو نین.

قورطوبی لەبواری عەقیدەشدا رەددی فیرقەکان دەداتەوە، راوبۆچووونی موعتەزیلەو قەدەری‌و رافیضیەکان‌و فەلاسیفەکان‌و صوفییە توندرەوو غولاتەکان دەداتەوە، بەلام بە ئوسلوبێکی ناسك‌و بە ئەدەب‌و بە ویژدانێکی زیندوو بە نەرم‌و نیانی، بەلکوو ویژدانی پالی پێوە دەنێ داکۆکی لەوانەش بکا: کە ئیبنولعەرەبی هێرشی کردونە سەر لەوانەی خیلافی مەزهەبەکەی بوون، سەرزەنشتی دەکا لەسەرئەوەی بە عیباراتی هەست بریندارکەر هێرشی کردۆتە سەر زانایانی ئیسلام‌و هێلی سووری بەزاندووە، کاتێکیش بۆ خۆی رەخنە دەگرێ رەخنەکانی زۆر بنیاتنەرو ناسك‌و پاك‌و بێ گەردن، لەچوار چێوەی ئەدەب‌و عیفەت دەرناچێ.

بێگومان ئەم کتێبە بەنرخە (ألجامع الأحكام القرآن) تاپێش ماوەیەکی کەم لە کتێبخانەکاندا نەبوو موسولمانان لە زانیاریەکانی ناوی بێ بەش بوون، خواو راستان (دار الكتب المصرية) مەردانە لەخۆ کەوت‌و بەچاپی گەیاندو ئێستا بەچەند قەبارەو چاپی جیا جیا لەبەردەستی خوێنەرانە.

## ٦) بایوغرافی بۆ هەندێ لە موفەسسیرە مەشهورەکان

١) ئیبنو عەبباس نەسەب‌و ژینامەی: ناوی عبداللهیەو کوڕی عەبباس کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم، کوڕی عبدالمناف (القرشی، الهاشمی)یە کوڕی مامی پێغەمبەرە (درووودی خودای لەسەر بێ) دایکی ئوممولفضل (لبابة بنت الحارث الهلالية)یە ئیبنو عەبباس لەدایك بووە بەسێ ساڵ پێش هیجرەت، یان پێنج ساڵ پێش کۆچ. لەوکاتەدا بنو هاشم‌و بەنو موطلب لە مەککە وەدەر نرابوون‌و لە شیعبی ئەبو طالیبدا خرابوونە ژێر گەمارۆوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئەو ساڵەی حەزرەتی عوسمان شەهیدکرا حەجی کردووە.

لەشەڕی (صفین)دا بەرپرسی لای چەپی لەشکربووە. ئیمام عوسمان کردبووی بەوالی بەصرە، لەسەر ئەو پۆستە مایەوە تا شەهیدبوونی ئیمامی عەلی، دوایی عەبدوڵڵای کوڕی الحارث کرا بەوالی بەصرەو ئیبنو عەبباس رۆیشتەوە بۆ حیجاز. ساڵی شەصتو پێنج، یان حەوت، لە طائیف وەفاتی کردووە، رایەکیش هەیە دەڵێ ساڵی شەصتو هەشت لەدونیا دەرچووە، بەلای جمهورەوە ئەم رایە راستە، واقیدی دەڵێ: هیچ خیلافو راجیایی لەنێوان زانایاندا نیە: کە ئیبنو عەبباس لە (الشعب)دا ئەوکاتەی قورەیش بەنو هاشمیان خستبووە ژێر گەمارۆو حەصارەوە هاتۆتە ژیانەوە، ئەوکاتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدونیا دەرچوو ئەو تەمەنی سیانزە ساڵ بوو.

## پلەوپایەو زانیاری ئیبنو عەبباس

ئیبنو عەبباس بە تەرجومانی قورئان مەشهور بووە، نازناوی (حبر الامة) زانای ئوممەتی موسوڵمان، سەرۆکی راڤەکارانی قورئانی هەبووە. ئەوە بەیهەقی لەکتێبی (الدلائل)دا لە ئیبنو مەسعودەوە نەقڵ دەکا گوتویەتی: (نعم ترجمان القرآن ابن عباس). ئیبنو سەعد بە روشتەیەکی صەحیحو پەسند ریوایەتێکی لە یەحیای کوڕی سەعیدی الأنصاری ریوایەتکردوە دەڵێ: کاتێ زەیدی کوڕی ثابیت وەفاتی کرد ئەبو هورەیرە فەرمووی: «مات حبر الأمة، ولعل الله أن يجعل في ابن عباس خلفا».

بێگومان ئیبنو عەبباس لەناو گەورە گەورانی هاوەڵاندا هەرچەندە بەتەمەن منداڵ بووە، بەهۆی عیلمو تێگەییشتنی پلەو پایەیەکی بەرزی بۆ

خۆی دەستەبەر کردبوو، دوعاو پاڕانەوەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی هاتۆتە دی.

لە حەدیثی صەحیحدا هاتووە، خۆی ریوایەتی کردوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباوەشی گرتمو فەرمووی: «أللّهم علمه الحكمة» خودایە شارەزای بکەو زانیاری حیکمەتی فێربکە.

لە موعجەمی (البغوی)و سەرچاوەی تریش لە ئیمام عومەرەوە ریوایەتکراوە: کە هەمیشە ئیمام عومەر ئیبنو عەبباسی لەخۆی نزیك دەکردەوەو دەیفەرموو: من بۆ خۆم پێغەمبەرم بینیوە ئەی عەبدوڵلا بانگی کردیو دەستی موبارەکی بەسەردا هێنایو تفی خۆی خستە ناو دەمتەوە فەرمووی: «اللّٰهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ». خودایە لەئایینەدا شارەزای بکەو زانیاری تەئویلو تەفسیری فێربکە.

ئیمامی بوخاری لەرێگەی سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەبباسەوە، دەفەرموێ: خەلیفە عومەر لە مەجلیسدا منی لەگەڵ پیاو ماقوڵانی قوڕەیشدا دادەنیشاند، هەندێ لەرێش سپییەکانیان لەدڵی خۆیاندا پێیان ناخۆش بوو، تێیاندا هەبوو دەیگوت چییە عومەر لەگەڵ ئێمەدا ئەم کوڕە گەنجە دادەنیشێنێ؟ ئێمە کوڕمان هەیە لەتەمەنی ئەودایە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: راست دەکەن، ئەوەی ئێوە دەیڵێن وایە. رۆژێك بانگی پیاو ماقوڵانی قوڕەیشی کردو ئیبنو عەبباسیشی خستە نێویانەوە، ئیبنو عەبباس دەڵێ: من وادەزانم بۆیە بانگی منی کردو لەگەڵ ئەواندا داینیشاندم بۆئەوەی ئاستی زانیاری منیان نیشان بدا. کە دانیشتین رووی تێکردینو فەرمووی: ئێوە چۆن مانای سورەتی ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ..... – النصر/١﴾ دەکەن، هەندێکیان وتیان: خودا فەرمانی پێکردووین حەمدو ثەنای بکەینو داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین لەکاتێکدا: کە یارمەتی داوینو بەسەر دوژمندا سەری خستووینو رێگای بانگەوازی بۆ والا کردوینو مەککەی بۆ

رزگارکردین. هەندێکیشیان بێدەنگ بوونو هیچ قسەیەکیان نەکرد. ئەمجار عومەر پێی گوتم: ئەتۆش ئەی ئیبنو عەبباس هەر ئاوا مانای دەکەی؟ وتم: ئەوە ئاماژەی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەری تێدایە، خودا ئەوەی پێ ڕاگەیاند، فەرمووی: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ ئەو نیشانەی هاتنی ئەجەلی تۆیە ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾. عومەر وتی: منیش هەر ئەو مانایەم زانیوەو ئەو ڕایەم هەیە کەتۆ دەیڵێی.

تەفسیرەکەی: بێگومان لەبواری تەفسیری قورئاندا زۆر ڕیوایەت لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوون.

ئەوەی لێیەوە نەقڵ کراوە دەربارەی تەفسیر لە تەفسیرێکی موختەصەردا کۆکراوەتەوە پێی دەگوترێ (تفسير ابن عباس) لەم تەفسیرەدا ڕیوایاتو ڕێبازو سەنەدی جۆراو جۆر هەن، وەلێ جوانترین ڕێبازو سەنەد، ڕێبازی عەلی کوڕی ئەبو طەلحەی هاشمی‌یە لەخودی ئیبنو عەبباسەوە، بوخاری لە صەحیحەکەیدا پشتی بەم سەنەدو ڕێبازە بەستووە، لە ڕوشتەو ڕێبازە باشەکان ڕێبازی قەیسی کوڕی موسلیمی کوفییە لە عەطائی کوڕی (السائب)ەوە.

لە تەفسیرە درێژەکاندا ئەو ڕیوایەتانەی ئیسناد دراون بۆلای ئیبنو عەبباس مەجاهیلو نەناسراون، لاوازترین ڕێبازو سەنەد ڕێبازی (ألكلبي)یە لەئەبو (صالح)ەوە. (ألكلبي) ئەبو نەصر (محمد بن السائب) کۆچکردوی ساڵی ١٤٦ی کۆچی. جا ئەگەر ڕیوایەتی محمەدی کوڕی مەڕوان (ألسدى الصغير) کۆچکردوی ساڵی ١٨٦ی کۆچی خرایە پاڵ ڕیوایەتی (ألكلبي) ئەوە لەڕاستی‌دا دەبێتە زنجیرەیەك درۆو دەلەسە. هەروا ڕێبازی موقاتیلی کوڕی سولەیمانی کوڕی بیشری (ألأزدى) وەلێ (ألكلبي) بەسەر ئەودا پاساو دەدرێتەوە، لەم ڕووەوە لە سەنەدی موقاتیل دا مەزاهیبو ڕاوی چروكو متمانە پێ نەکراو زۆرن.

رێبـازێکی تـر بـۆ ریوایـەتی تەفـسیری ئیبنـو عـەبباس طـەریقـی (ألـضحاك)ی کـوڕی (مـزاحم الکـوفی)یـە لـەئیبنو عەبباسـەوە، بەشـێوەی (منقطع) چونکە (مزاحم) ئیبنو عەبباسی نـەدیوە، جا ئەگـەر ریوایـەتی بیـشری کوڕی عـەمارە خرایـە پـاڵ رێبـازی الـضحاك، ئـەوە سـەنەدەکە پـتر زەعیفی تێدا رودەدا چونکە بیشر بۆ خۆی بتمانە پێ نەکراوو زەعیفە.

ئەگەر ریوایەتەکەی لە ریوایەتی (جویبیر) بوو لە (الضحاك)ەوە ئەوە پـتر زەعیفـی تێـدا دێتـە جـێ، چـونکە (جـویبیر) ریوایـەتی مـەتروكو زۆر زەعیفە.

رێبــازێکی تــری ریوایــەتی تەفــسیری ئیبنــو عــەبباس طــەریقــی (ألعوفی)یە لە ئیبنو عەبباسەوە، ئیبنو جەریرو ئیبنـو ئـەبی حاتـەم زۆریـان لەم سەنەدە ریوایەتکردووە (ألعـوفی) زەعیفـە بـەڵام زۆرنـا، هەنـدێ جاریش تیرمیذی بەجوانی داناوە.

بـەم شێوە خوێنـەر دەتوانـێ: کـە لێکۆڵینـەوە لـەرێبازو سـەنەدەکاندا بکا، بـاشو مـەقبول لـە زەعیـفو مـەتروك جیابکاتـەوە، چـونکە هەرچـی لـە ئیبنــو عەبباســەوە ریوایــەت کرابــێ بــە صــەحیحو چەســپاو نــاژمێردرێ، لەوەپێشیش لەباسی تەفسیرەکەیدا ئەم باسەمان پتر شی کردەوە.

## ٧ موجاهیدی کوڕی جەبر

**نەسەبو ژیـانی:** نـاوی موجاهیـدی کوڕی جـەبری (المكی أبـو الحجـاج المخزومـی المقـرئ) مـەولای الـسائب بـن أبـی الـسائب)ە، ڕیوایـەتی لـە عـەلیو سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەقـاصو هەرچـوار عەبـدوڵڵاکانو رافیعـی کـوڕی خودەیجو خاتو عائیشەو ئوممو سـەلەمەو ئـەبی هـورەیرەو سوراقەی کـوڕی مالیكو عەبدوڵڵای کوڕی (الـسائب المخزومـی)و خـەڵکێکی زۆری تـر، عـەطاء ڕیوایــەتی لێ کــردووە، هــەروا عەکرەمــەو عــەمری کــوڕی دینــارو قــەتادەو

سـولەیمان ئەلئـەحوەلو سـولەیمان (الأعمـش)و عەبـدوڵڵای کـوڕی (الکـثیر القارئ)و هی تـریش ڕیوایـەتیان لێ کـردووە، ساڵی (٢١)ی کۆچی لەسـەردەمی خەلافـەتی عومـەردا (رەزای خـودای لێ بـێ) لـە دایـك بـووە، سـاڵی (١٠٢) یـان (١٠٣)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە، یـەحیای کوڕی القطان دەڵێ: سـاڵی سـەدو چواری کۆچی وەفاتی کردووە.

## پلەوپایەی ئەم زاتە

موجاهیـد سـەرۆکی موفەسـسیرینەکانە لەچـینی تابیعینـە، سـێ جـار تەفـسیرەکەی لـە ئیبنـو عـەبباس وەرگرتـووە، هـەر بۆخـۆی دەڵـێ: سـێ جـار هەموو قورئانم لای ئیبنو عەبباس دەور کردۆتـەوە، لەسـەر هـەموو ئایـەتێك دەوەستام، دەربارەی هەموو ئایـەتێ پرسـیارم لێ دەکـرد؛ دەربـارەی چـی نـازڵ بووە؟ چۆن نازڵ بووە؟ ئیمـامی الثـوری دەفـەرموێ: ئەگـەر لـە موجاهیـدەوە تەفـسیرت بۆهـات وەری بگـرەو بەسـتە، ئیبنـو تەیمییـە دەفـەرموێ: بۆیـە ئیمـامی شـافیعیو بوخـاریو زانـای تـریش ئەوەنـدە ئیعتیمادیـان لەسـەر تەفسیرەکەیەتی.

ئـەبو حاتـەم دەڵـێ: موجاهیـد هیـچی لـە خـاتو عائیـشە نەبیـستووە ڕیوایەتی لەوەوە بە مورسەل دەژمێـردرێ، هـەروا دەڵـێ: ڕیوایـەتی موجاهیـد لە سەعدو موعاوییەو کەعبی کوڕی عوجرە، مورسـەلن، ئـەبو نـەعیم دەڵـێ: (یحي القطان) گوتوویەتی: ڕیوایەتە مورسەلەکانی موجاهیـدم پێخۆشـترن لـە موررسەلەکانی عەطاء، قەتادە گوتوویەتی: زاناترین موفەسسیر لە ژیانا مابێ موجاهیدە، ئیبنو سەعد دەڵێ: موجاهید متمانە پێکراوبوو، فەقیهو زانا بوو، زۆری فەرمووده ڕیوایەتکردون، ئیبنو حیبان دەڵێ: موجاهید فەقیهو واریعو عابیـدو ورد بـوو، لـە بـواری تەفـسیردا ئیمـامی (الـذهبی) لـە کۆتـایی ژیانامەکەیدا دەڵێ: ئیجماعی ئوممەت لەسەر ئـەوە چەسـپاوە: کـە موجاهیـد

رابەرو پێشەوایەو قسەو ڕیوایەتی دەکرێنە بەڵگە، وتوشیەتی عەبدوڵڵای کوڕی کوثەیر لە خزمەتیا خوێندویەتی.

جا: کە ئیمامی (الثوری) دەڵێ: ئەگەر لە موجاهیدەوە تەفسیرت بۆ هات وەری بگرەو بەستە، مەعنای ئەوە ناگەیەنێ هەرچی پاڵ ئەو درا بێ، هەرچی بگوترێ: (عن موجاهد) بێ سێو دوو وەری بگرین! نەخێر نابێ وەها بیر بکەینەوە، چونکە موجاهیدیش وەکوو کەسانی دی وایە لەو راویانەی حەدیثیان لێ نەقڵ کراوە، وادەبێ یەکێك ڕیوایەتی لێ کردووە زەعیفەو متمانەی پێ ناکرێ، کەوابێ زۆر پێویستە پشکنینو تەحەڕڕی بۆ بکرێ دەربارەی سەلامەتی سەنەدەکە، ئەمیش وەکوو ئیبنو عەبباس دەربارەی ئەو ڕیوایەتانەی لێیەوە دەکرێ.

## ٣ ئیبنو جەریری تەبەری (الطبری)

**نەسەبو ژیاننامەی:** ناوی (محمد بن جریر بن یزید بن خالد بن کثیر بن أبو جعفر الطبری)یە، لە بناغەدا ئامولیە، لە بەغدا لەدایك بووەو لەوێشدا مردووە، ساڵی/٢٢٤ی کۆچی هاتۆتە کۆڕی ژیانەوە، ساڵی/٣١٠ی کۆچی کۆچباری ئەو دونیا بووە، زانایەکی تاقانەو کەم وێنە بووە، زۆری ڕیوایەت کردوون، زۆر وردبینو شارەزا بووە لە گێڕانەوەی ڕیوایاتو شەنو کەو کردنیانو تەرحیحدانی ئەم ڕیوایەت بەسەر ئەو ڕیوایەتدا، دەستێکی باڵای هەبووە لە مێژوو بایوغرافی ریجالی حەدیثو بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان.

**بەرهەمو کتێبە دانراوەکانی:** ئیبنو جەریر زۆری بەرهەم هەن، لە کتێبە مەشهورەکانی (جامع البیان فی تفسیر القرآن) تاریخ الأمم والملوك و هەواڵو بەسەر بوردەیان، الآداب الحمیدة والأخلاق النفسیة وتاریخ الرجال، وإختلاف الفقهاء وتهذیب الآثار، وکتاب البسیط فی الفقه، والجامع فی القرآن، وکتاب التبصیر فی الأصول.

**تەفسیرەکەی**: بێگومان کتێبەکەی لە تەفسیردا (جامع البیان فی تفسیر القرآن) باشترین تەفسیرو بە نرخترینە، سەرچاوەیەکی ئەصڵو رەسەنە لەبواری تەفسیر بە مەئثوردا، دابو نەریتی ئیبنو جەریر لە تەفسیرکردندا بەمجۆرەیە، تەفسیر دەهێنێو پاڵ صەحابەی دەدا، یان پاڵ تابیعین، یان ئەتباعی تابیعینی دەدا، دەست بۆ ئەقوالی جۆراوجۆر دەباو هەندێکیان تەرجیح دەدا بەسەر هەنێدێکیاندا.

بێگومان عولەمای موعتەبەرو بەناوبانگی جیهانی ئیسلامی کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە: کە تەفسیری ئیبنو جەریر لەوێنەی دانەنراوەو تاکە تەفسیری بواری خۆیەتی.

ئیمامی نەوەوی لە تەهذیبەکەیدا وتوویەتی: کتێبی ئیبنو جەریر لە تەفسیردا تاقانەی بواری خۆیەتیو تا ئێستا کەس نەیتوانیوە کتێبی ئاوا دابنێ، تەفسیری ئیبنو جەریر لە تەفسیرەکانی تر جیا دەبێتەوە بەوەی ئەحکام دەردێنێ، ئاماژە بۆ ئیعرابی خەفیو موشکیل دەکا، بەمەش تەفسیرەکەی دەکەوێتە ژوور تەفسیرەکانی هاوەڵانیەوە، ئیبنو کەثیر زۆربەی نەقڵەکانی لە ئیبنو جەریرەوەیە.

## ٤ ئیبنو کەثیر

**نەسەبو ژیاننامەی**: ناوی ئیسماعیلی کوڕی عومەر (القرشی إبن کثیر البصری ثم الدمشقی، عمادالدین أبو الفداء الحافظ المحدث الشافعی) ساڵی/٧٠٥ی کۆچی لە دایك بووە، ساڵی/٧٧٤ی کۆچی، دوای ژیانێکی پڕ عیلمو زانست لە دونیا دەرچووە، بێگومان ئیبنو کەثیر فەقیهێکی وردو موحەدیثیکی لێهاتوو مێژوونوسێکی لێزانو موفەسسیرێکی خاوەن زەبتو رەبت بووە، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەربارەی، فەرموویەتی: بێگومان ئیبنو کەثیر یەکێکە لە موحەدیثە فەقیهەکان، هەروا دەربارەی دەڵێ:

بەرهەمەكانی لە ژیانی خۆیدا بەناو وڵاتی ئیسلامیدا بڵاوبوونەوە، لە دوای وەفاتیشی جیهانی ئیسلامی سودی لێ بینیوە.

**بەرهەمەكانی**: یەكێك لە بەرهەمەكانی ئیبنو كەثیر كتێبی (البداية والنهاية)یە لەبواری مێژوودا، ئەم كتێبە لە سەرچاوە پڕ بایەخو گرنگەكانە بۆ مێژوونوسان هەروا كتێبی (الكواكب الدراری فی التأريخ) لە كتێبی (البداية والنهاية) هەڵی بژاردووە، (تفسير القرآن، والإجتهاد فی طلب الجهاد) هەروا كتتێبی (جامع المسانيد) و (السنن الهادی لأقوم السنن) و (الواضع النفيس فی مناقب الإمام محمد بن إدريس).

**تەفسیرەكەی**: موحەممەد رەشید رەضا دەربارەی تەفسیرەكەی وتوویەتی: ئەم تەفسیرە لە بەناوبانگترین تەفسیرە لەڕوی ئەوەوە: كە گرنگی داوە بە ڕیوایەتكردن لە موفەسسیرینی سەلەفەوەو ڕونكردنەوەی مەعنای ئایەتەكانو ئەو ئەحكامانەی لەخۆیان گرتوون، خۆی پاراستووە لەو شتانەی لەو بابەتانەی كەسانی دی درێژەیان پێداوە، لە مەباحیثی ئیعرابو نوكتەو فنونی بەلاغە، یان تێكەڵكێشكردنی زانیاری غەیری تەفسیر: كە بۆ تێگەیشتن لە قورئان پێویست نینو نابنە هۆی پەندو ئامۆژگاری.

یەكێك لە تایبەتمەندیەكانی ئەم تەفسیرە ئەوەیە تەفسیری قورئان بە قورئان دەكا، لەهەموو تەفسیرەكانی تر بۆ ڕونكردنەوەی تەفسیری ئایەتەكە زیاتر ئایاتی تر دەهێنێ كە لە مەعنادا موناسەبەیان بە یەكەوە هەبێ، ئەمجار زۆر فەرموودەی (مەرفوع) كە پەیوەندیان بە تەفسیری ئایەتەكەوە هەیە، بەیانی ئەو حەدیثانەش دەكا: كە ئیحتیجاجیان پێ دەكرێ، ئەمجار پەنا دەبا بۆ ئاثاریو صەحابەو ئەقوالی تابیعینو چینی دوا ئەوان لە عولەمای سەلەف.

تایبەتمەندیەكی تری ئەم تەفسیرە ئەوەیە بیری خوێنەرانی دەخاتەوە: كە لە تەفسیر بالمأثوردا زۆر شتی نەشیاوو ئیسرائیلیات هەیە،

بەکورتی هۆشداری دەدا بۆ ئەوەی بە حەزەرەوە تەعامولیان لەگەڵ بکرێ، هەندێ جاریش شتە مونکەرەکانی ئیسرائیلیات دیاری دەکا، خۆزگە زیاتر بەدواداچوونی بکردایە بۆ ئیسرائیلیاتەکان، یان وازی بێنایە لە ئیرادکردنی شتێك: کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەو پشکنین هەیە.

## ٥ فخردين الرازی

**نەسەبو ژیاننامەی:** ناوی محمد بن عمر بن الحسن التميمی البكری الطبرستانی الرازی فخرالدين المعروف بإبن الخطيب الشافعی الفقيه.

ناوبراو ساڵی/٥٤٣ی کۆچی لەشاری (الری) هاتۆتە ژیانەوە، ساڵی/٦٠٦ی کۆچی لە شاری هورات وەفاتی کردووە، زانیاری ئایینیو زانیاری عەقڵی خوێندووە، زۆر گرنگی بە زانیاری مەنطیقو فەلسەفە داوە، لەبواری زانیاری کەلامدا زۆر مەشهور بووە، لەهەموو ئەو زانیاریانەدا نووسینو شەرحو تەعلیقاتی هەیە، بە یەکێك لە فەیلەسوفەکانی سەردەمی خۆی هەژمار کراوە، تا ئێستاش بەرهەمەکانی سەرچاوەی گرنگن بۆ ئەوانەی ناوی فەلاسیفەی ئیسلامییان لێ نراوە.

**بەرهەمەکانی:** فەخرودینی رازی بەرهەمی زۆری هەیە یەکێك لە بەرهەمە شاکارەکانی (مفاتيح الغيب فی تفسير القرآن)ە، هەروا کتێبێکی تری هەیە بە ناوی (أسرار التنزيل وأنوار التأويل).[1] (إحكام الأحكام)

---

[1] زۆر کەس وایان زانیوە ئەم کتێبە تەفسیری قورئانە، بەڵام لە واقیعدا ئەمە کتێبێکە لەبواری عەقیدەدا لەبەر ڕۆشنایی قورئان، ئەمە دوا بەرهەمی رازییەو لەکۆتایی ژیانی نووسیویە، بەتەمابووە ئەم کتێبە لەچوار جلْدا تەواو بکاو هەر بەرگەی لە عیلمێکدا بێ بەڵام: کە گەیشتۆتە ئاخرو ئۆخری بەرگی یەکەم وەفاتی کردووە، ئەم کتێبە (ئەم بەرگی یەکەمە) تاقە نوسخەی لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی لە سلێمانیدا هەیە،

(المحصل فى أصول الفقه، والبرهان فى قراءة، ودرة التنزيل وغرة التأويل فى لآيات المتشابهات، وشرح الإشارات والتنبيهات لإبن سينا، وأبطال القياس، وشرح القانون لإبن سينا، والبيان والبرهان فى الرد على أهل الزيغ والطغيان، وتعجيز الفلاسفة، ورسالة الجوهر، ورسالة الحدوث، وكتاب الملل والنحل، ومحصل أفكار المتقدمين والمتأخرين، من الحكماء والمتكلمين فى علم الكلام، وشرح المفصل للزمخشرى).

**تەفسیرەکەی:** بێگومان زانستە عەقڵییەکان بە زەقی لە تەفسیرەکەیدا رەنگیان داوەتەوەو زۆربەی زۆری تەفسیرەکەیان داگیرکردووە، رازی تەفسیرەکەی تێکەڵ کردووە لە زانیاری پزیشکیو مەنطیقو فەلسەفەو حیکمەت، بە جۆرێك لە مەعناکردنی قورئانو روحی ئایەتەکان چووەتە دەر، شتی وای لە دەقی قورئان بار کردووە: کە قورئان بۆ ئەوە نازڵ نەکراوە، هاتووە بە زۆرە ملێو تەکەللوف مەسائیلی علومی عەقڵیو زاراوەی عیلمی هاخنیوەتە ناو تەفسیرەکەیەوە، بەمەش تەفسیرەکە لایەنی روحیو هیدایەتی لەدەست داوە، بۆیە هەندێ لە عولەما وتوویانە (فیه کل شیئ إلا التفسیر) جگە لە تەفسیر هەموو شتێکی تێدایە.

## الزمخشرى

**نەسەبو ژیاننامەی:** ناوی القاسم محمود بن عمر الخوارزمی الزمخشری، لە بیستو حەوتی مانگی رەجەبی ساڵی/٤٦٧ی کۆچی لە گوندی زومەخشەر لە دایك بووە: کە گوندێکە لە گوندەکانی خوارەزم، لە دەڤەرو وڵاتی خۆیدا دەستی بەخوێندن کردووە، لە پێناو بەدەستهێنانی عیلمو زانیاری چووە بۆ بوخارا، زانیاری ئەدەبی لە مامۆستای (شێخ منصور أبی

---

بەندە لەگەڵ دوو مامۆستای تردا تەحقیقمان کردووە تا ئێستا دووجار چاپکراوە، چاپی یەکەم لە بەغداو جاری دووەم لە بیروت.

مضر) وەرگرتووە، پاشان سەفەری کردووە بۆ مەککەی پیرۆزو ماوەیەکی زۆر لە پەنا مەسجیدولحەرامدا سەرگەرمی خوێندن بووە، نازناوی (جاراللە)ی لەمەوە پاڵ دراوە، هەر لە پەنا کەعبەدا تەفسیرەکەی (الكشاف عن حقائق عوامض التنزيل وعيون الأقاويل) داناوە، ساڵی/٥٣٨ی کۆچی لە جورجانیەی خوارزم لە دونیا دەرچووە، ئەمەش دوای گەڕانەوەی لە مەککە بۆ خوارزم.

برێ لە زانایان لاواندویانەتەوە بە چەند دێڕە شیعر لەوانە:

**فأرض مكة تذرى الدمع مقلتها**

**حزناً لفرقة جارالله محمود**

**زانیاریو بەرهەمەکانی**: زومەخشەری رابەرو ئیمامێکە لە ئیمامەکانی لوغەو زانیاری مەعانیو بەیان، زۆرجار خوێنەر دەبینێ لە کتێبی نەحوو بەلاغەدا ئیستیشهاد بە زومەخشەری دەکرێو لە کتێبەکانی شت نەقڵ دەکرێ بۆ بەڵگە هێنانەوە بەراو بۆچوونەکانی.

دەڵێن: زومەخشەری لە کەشافەکەیدا، یان لە (أساس البلاغة)دا ئاوای گوتووە، بێگومان زومەخشەری خاوەنی رەئیەوحوججەیە لەزۆر بواری لوغەوی و بەلاغەدا، لەو کەسانە نیە لاسای کەسانی دی دەکەنەوەو زانیاری کۆدەکەنەوە نەقڵی دەکەن، بەڵکوو خاوەنی رەئی خۆیەتیو خەڵکانی تر لاسایی دەکەنەوەو زانیاری لێوە نەقڵ دەکەن.

زومەخشەری دانراوو بەرهەمی هەن لەبواری حەدیثو تەفسیرو نەحوو لوغەو مەعانیو بەیانو زانستی تریش لەوانە: تەفسیری (الكشاف) و (الفائق فی تفسير الحديث) و (المنهاج فی الأصول) (والمفصل فی النحو) و (أساس البلاغة فی اللغة) و (رؤوس المسائل الفقهية).

**بیروباوەڕی زومەخشەری**: ناوبراو حەنەفی مەزهەبە لەبواری عەقیدەدا موعتەزیلەیە، ئایەتەکانی قورئان بەگوێرەی مەزهەبەکەیو بیروباوەڕەکەی، بە پێچو پەناو لەفودەوەران، تەفسیر کردووە، زانای تایبەتی

نەبێ هەستی پێ ناکا، موعتەزیلەو برا موعتەزیلەکانیان بەوە لەقەڵەم دەدا: کە لە پێڕو تاقمی ڕزگار بووی ڕۆژی قیامەتن.

**تەفسیرەکەی**: بێگومان کتێبی کەششاف دانراوی زومەخشەری لە بەناوبانگترین تەفسیرێکە بە رەئی دانرا بێ لەلایەن موفەسسیرینەوە، باشترین بەرهەمی ئەوانەیە لە زمانی عەرەبیدا شارەزابوون، ئالوسیو ئەبو مسعودو نەسەفیو موفەسسیرینی تریش لە تەفسیرەکانیاندا زانیاری لێوە نەقڵ دەکەنو ناوی دەهێنن، مەسائیلە ئیعتیزالییەکانی لە تەفسیرەکەیدا زۆرن.

زانای بەناوبانگ (أحمد النير) لە کتێبێکیدا بەناوی (الإنتصاب) هەنگاو بە هەنگاو بەدوایدا هاتووەو پەردەی لەسەر راوبۆچونەکانی هەڵداوەتەوە، لەهەر شوێنێکدا مەحموودی زومەخشەری باوەڕە ئیعتیزالییەکەی درکاند بێ، ئەحمەد لێی لە هەراداوەو موناقەشەی دەکاو ڕای بەرامبەری دێنێو ڕەدی دەداتەوە، هەر وەکوو چۆن لەبواری تری زمانەوانیو بەلاغەو شتی وادا موناقەشەی دەکا.

بێگومان لەم ساڵانەی دواییدا (المكتبة التجارية) لە میصر تەفسیری کەشافی چاپکردەوە (مصطفى حسين أحمد) ناوێك تەصمیمی چاپەکەی کردبوو، چوار کتێبی لە پەراوێزدا لە تەکیا چاپکردبوو، یەکێکیان کتێبی (الإنتصاب)ی أحمد النير بوو، دووەمیان کتێبی (الشاف فی تخريج أحاديث الكشاف للحافظ إبن حجر العسقلانی) بوو، سێیەمیان حاشیەی شێخ محمد عليان المرزوقی بوو بەناوی (حاشية علی تفسير الكشاف كالإنصاف) چوارەمیان (مشاهد الإنصاف علی شاهد الكشاف) ئەمیش نووسینی مەرزوقی ناوبراو بوو.

بێگومان زومەخشەری زۆرێك لە بیروباوەڕی موعتەزیلەی بە ئیشارەو تیلنیشان لەگەڵ تەفسیرەکەی تێکەڵکێش کردووە، لەوەپێش

ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد: کە (البلقینی) وتوویەتی (إستخرجت من الکشاف إعتزالاً بالمناقیش).

## ١٧ الشوكانی

**نەسەبو ژیاننامەی:** ناوی (القاضی محمد بن علی بن عبدالله الشوكانی الصنعانی)یە، مامۆستایەکی موجتەهیدو لێهاتوو بووە بەوە مەشهور بووە سوننەتی پێغەمبەری (دروودی خودای لەسەر بێ) زیندو کردۆتەوەو بیدعەی قەلاچۆ کردووە، یەکێك لە نازناوەکانی (ناصر السنة) (قامع البدعة)یە.

ناوبراو ساڵی/١١٧٣ی کۆچی لە شاری (هەجرە شەوکان) چاوی بە دونیا هەڵێناوە، لەشاری صەنعاءدا پێگەیشتووە، قورئانی خوێندووە، ئەمجار پەرەی بە خوێندن داوە، لەلای مامۆستایانی پایە بڵند خوێندویەتی زۆر متونی نەحوو صەرفو بەلاغەو ئوصولو ئادابی بەحثو موناظەرەی خوێندووەو لەبەری کردوون، هەتا وای لێ هات بوو بە ئیمامێك بە پەنجە ئاماژەی بۆ کراوە، ئیتر لێ بڕاوە بۆ خوێندنەوەو دەرس وتنەوە تا لە ساڵی/١٢٥٠ی کۆچی، دونیای بێ بەقای بەجێ هێشتو ماڵئاوایی کرد.

**مەزهەبو بیروباوەڕی:** ئیمامی شەوکانی لەسەرە مەزهەبی ئیمام زەید دیراسەی فیقهی کردو بووبە فەقیهێکی گەورەی ڕۆژگاری خۆی، کتێبی دانان کاری فتوای بەڕێوە برد، لەبواری حەدیثدا کەوتەلێکۆڵینەوە، هەتا بووە بالآترین زانای سەردەمی خۆیو پێوەندی تەقلیدی لە ئەستۆوو دەستی خۆی داکەند، بوو بە یارمەتیدەری سوننەتو ڕکابەری سەرسەختو کۆڵنەدەر لە بەرامبەر ئەوانەی دژی حەدیثو کارپێ کردنی بوون.

پێی وابوو تەقلید حەرامەو پێویستە ئیجتیهاد بکرێو دەرگای لێکۆڵینەوەو ئیجتیهاد دانەخرێ، تەنانەت کتێبی دانا بەناوی (القول المفيد فى أدلة الإجتهاد والتقليد).

**لە بەرهەمەکانی**: یەکێك لە بەرهەمە ناوازەکانی تەفسیرەکەیەتی بەناوی (فتح القدير)، شەرحی (نيل الأوطار) کە بەسەر کتێبی (منتقى الأخبار)ی مجدالدين ئیبنو تەیمییە کردوویەتی، لە ڕاستیدا ئەم شەرحە لە باشترین ئەو کتێبانەیە: کە لە بواری حەدیثدا نووسراوە لەسەر شێوەی بابەکانی فیقهی ئیسلامی، هەروا کتێبی (إرشاد الفحول)و فتواکانیو تەفسیرەکەی (فتح القدير) کە لە واقیعدا تەفسیرێکە تەفسیر بە مەئثورو تەفسیر بە رەئی لەخۆ گرتووە، فیقهی دەقەکانی قورئانی دەست نیشان کردووە، پشتی بە تەفسیری موفەسسیرە گەورەکانی رابردوی وەکوو النحاس، ئیبنو عەطیەو قورطوبی بەستووە، ئەم تەفسیرە ناوازە چەند جار چاپکراوەو لەهەموو وڵاتێکی جیهانی ئیسلامی دەست دەکەوێ.

بەیارمەتی خودا رۆژی {٢٠١٥/٨/٧} لە پاکنووسی ئەم بەرهەمەم بوومەوە هیوادارم خودا بیکاتە توێشووی قیامەتم و جێگای رەزامەندی خوێنەرانیش بێ

## پێڕستی سەرەباسەکان

کتێبخانەی کوردی لە بواری زانستەکانی قورئاندا زۆر هەژارە و بەدەگمەن نەبێ بە زمانی کوردی لەم بوارەدا هیچ نەنووسراوە و لە زمانی تریشەوە هیچی وا وەرنەگێڕدراوە، لەکاتێکدا ئەم بوارە لە هەرە پێشەوەی بوارە گرنگەکانی زانستە ئیسلامییەکانە، چونکە باس لە سەرچاوەی یەکەمی ئایینی ئیسلام دەکا بە ئوصول و فروعیەوە، ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە پێش هەموو شتێك گرنگی بەم زانستە بدەن و شارەزایی تێدا پەیدا بکەن.

نرخ: 12000